# ڕۆح

## بە کوردی

## ابن قیم الجوزی

و/ مصدق محسن

بەکەم جاپ



## ناسنامەی کتێب


ناو: ﴿الروح﴾ ڕۆح.

بابەت: پەروەردەکردنی دەروون.

نووسەر: ابن قيمّ الجوزيّة.

وەرگێر: مصدق محسن.

پێداچونەوە: وەرگێڕ.

کاری کۆمپیوتەر: نووسینگەی MOM - ۲٦٤٨٩٠٧ ٠٦٦/ N.

پاك نوسكردن: وەرگێڕ.

چاپخانە: ڕۆژهەلات

چاپ: یەکەم ٢٠١٢.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

بەرهەم: ﴿١٢٢﴾.

نرخ: ١٠٠٠٠ دینار.

بۆ: فرۆشتن و بلاوکردنەوە: ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ / M.

بۆ: هونەرکاری وچاپکردن: ٠٧٥٠١١٨١٩١٩ / M.





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٩٣٠) ی ساڵی (٢٠١٢) ی پێدراوە




# ڕۆح

دانانی:

شمس الدين ابن قيمٍّ الجوزيَّة

ساڵی (٧٥١ کۆچی) کۆچی دوایی کردووە

وەرگێڕانی:

مصدق محسن

یەکەم چاپ هەولێر ٢٠١٢

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ (الإسراء: ٨٥)

(پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی ڕۆح (كە چیەو چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێكە لە فەرمانی پەروەردگارمو بەدەست ئەوە ((من نازانم چیەو چۆنە))و هیچتان پێ نەبەخشراوە لە عیلمو زانست تەنها شتێكی كەم نەبێت)

• پێشەکی:

به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

کتێبی (ڕۆح) لەبەر دەستدایە؟

به ناوی ئەو خوایەی کانگای ڕەحمەتو سۆزو بەزەییە، وە درودو سەلام بڕژێتە سەر گیانی دوایین پێغەمبەر، و لەسەر ئالو بەیتو بنەماڵە بەڕێزەکەی و گشت سەحابەو هاوەڵەکانی.

بێگومان ڕاستیو ناوەرۆکی ڕۆح لەو بابەتانەیە کەوا فەیلەسوفو زاناکانی شپرزە کردووە، وە هەموویانی سەرقاڵ کردووە، وە ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەوانەو شاعیرەکانیش سەرقاڵن بە ماهیەتی ڕۆح.

ئێستاکەش هەر هەوڵدەدەن- بەبێ سوود- بۆ پەردە هەڵدانەوە لەو نهێنیە پەنهانە نەرمو نیانە..

ڕەنگە لەبیریان چووبێت یاخود لە بیر خۆیان بەرنەوە ئەو فەرمودەیەی خودای گەورە کە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾(الإسراء: ٨٥) واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح، بڵێ ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارمو بەدەست ئەوە (نازانم چییەو چۆنە).ئەمەش ئاگاداریو ڕوون کردنەوەیەکە کەوا ڕۆح نهێنیەکی خودایی یەو بە تەواوەتی پەیوەستە بە خودای پاکو بێگەرد.

وە کتێبی (ڕۆح) کێشەی ڕۆح چارەسەر دەکات، ووتەکانی پێشینەکانو پاشینەکان هاتووەو جۆرەکانی ڕۆح لە قورئاندا ئاشکرا دەکات، وە باسی ووتەکانی زانایانو فەیلەسوفەکانو ئەوانەی قسە دەکەن دەربارەی ڕۆح، وە باسی نیشانەو شوێنەواری ڕۆح دەکات، و زۆر شتی دیکەش.

## یەکەم: ژیاننامەی ابن القیّم[1].

پێشەوا شمس الدِّين محمد كوڕی أبي بكر، أبو عبدالله، الزُّرعيّ، الدمشقيّ، الحنبليّ، لە ساڵی (٦٩١ کۆچی) لە دیمەشق لە دایك بووە، واتە: پاش ئاشکرا بوونی خاچپەرستەکان بە ساڵێك. ناوبانگ پەیداکردنی بە (إبن القیم الجوزیە)، چونکە باوکی سەرپەرشتیاری قوتابخانەی جەوزیە بوو کەوا محی الدین یوسف کوڕی عبدالرّحمن الجوزی دایمەزراند ئەویش لە ساڵی (٦٥٦ کۆچی) کۆچی دوایی کرد.

شمس الدّین ابن القیم لە ماڵێکی خاوەن عیلمو زانستو ئاین پەروەر پێگەیشتووە، هەر لە منداڵیەوە داوای زانستی کردووە، و چووە بۆ میسر بۆ دەستکەوتنی عیلمو زانست. وە هاوەڵو هاوڕێی (شێخی ئیسلام) إبن تیمیە بووە، و لە کانیاوی زانستەکەی ئاوی خواردۆتەوە، خۆشەویستی ئەو بەسەریدا زاڵبووە، و هەردەم لە کارەکانیدا سەری دەخست، وە تێکۆشینو ئیجتیهادەکەی وەردەگرت، (١٦ ساڵ) هاوڕێیەتی کردو لەگەڵیدابوو.

- **ستایش کردنی زانایان بەسەریدا:**

* **إبن کثیر** دەڵێت: (خوێنەرێکی چاكو خاوەن خوڕەوشتێکی بەرز بوو، زۆر حەزی بە هاوڕێیەتی دەکرد، ئیرەیی و حەسادەتی بە کەس نەدەبرد، وە ڕقو کینەی لەسەر هیچ کەسێك نەبوو).

* **برهان الدّین الزُّرْعي** دەڵێت: (لە ژێر ڕووی ئاسمانداکەس عیلمو زانستی لەو فراوانتر نەبوو)[2].

---

(١) سەیری ژیاننامەکەی بکە لە: الوافي بالوفيات: ٢/ ٢٧١، والدرر الكامنة: ٤/ ٢١؛ بغية الوعاة: ١/ ٦٢، هدية العارفين: ٢/ ١٥٨، الإعلام: ٦/ ٢٨٠.

(٢) شذرات الذهب: ٦/ ١٦٩.

* الـسَّخاوي دەڵێت: (بليمەت، دەمڕاستو تێگەیشتوو، وە پێشکەوتوو لە فراوانی زانستەکەی... سەرۆکی هاوەڵانی إبن تیمیە بـوو، بـەڵکو ئـەو چـاکەیەك بـوو لـە کردەوە چاکەکانی) [٣].

## • شوێنەواری وە عیلمی زانستەکەی:

إبن القيّم شوێنەوارێکی زۆری بۆ ئێمـە بـەجێ هێـشتووە، وە جیاکردنـەوەو پـۆلێن کردنەکانی لە نێوان بەشەکاندا پەسندو ویستراوە، لە کارەکانی زۆر پشوو درێژ بوو، هەروەك إبن حجر[٤] وادەڵێت.

لە جیاکردنەوەو پۆلێن کردنی باسەکاندا لەوانە:

* أحكام أهل الذمة.
* إعلام الموقعين عن رب العالمين.
* إغاثة اللهفان من مصائد الشيطان.
* أخبار النساء.
* بدائع الفوائد.
* تحفة المودود.
* روضة المحبين ونزهة المشتاقين.
* زاد المعاد في هدي خير العباد.
* الوابل الصَّيب من الكلم الطيب.

وە زۆری تریش لە پۆلێن کردنە دەگمەنەکانی کەوا سودێکی زۆری هەیە.

---

(٣) التاج المكلل: ٤١٩.

(٤) الدرر الكامنة: ٣/ ٤٠٣.

- **ووتەو بۆچوونەکانی زانایان لەبارەی کتێبی ڕۆح دا:**

* آلوسي دەڵێت: (کتێبێکی زۆر بە سوودە، بەڕاستی بۆ ڕۆح گیان دەبەخشێت، دڵو دەروون پێی دەگەشێتەوە).

* بوقاعّي دەڵێت: (کتێبێکی گەورەو بەکەڵکە، شکۆدارو بەڕێزە، زۆر بەسوودە، هیچ شتێك وەکو ئەو ماناکانی پۆلێن نەکراوە).

* الغنیمی دەڵێت: (کتێبی ڕۆح کتێبێکی سەر سوڕهێنەرە هەر کەسێك بیەوێت زانستی لێوە فێربێت ئەوا لە کەناری دڵنەوایی‌و پشووی دەروونی‌و سەقامگیریدا دەبێت).

- **دووەم: کتێبی (ڕۆح)**

## ١- تێکڕای کتێبی (ڕۆح)ی إبن القیّم:

دروستی تێکڕای کتێبەکان کە بۆ دانەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆمان ئاشکرا دەکات لە چوارچێوەی ئەو سەرچاوانەدا کە بۆ دانەر وەرگێڕدراوە، وەرگێڕانو توێژینەوە کەوا دانەر لە ژیانیدا بەسەری بردووە.

ئێمەش لێرەدا هەندێ سەرچاوە دەهێنینەوە کەوا بە نیسبەت کتێبی (ڕۆح)ی إبن القیّم بلاوکراوەتەوە، کە گەلێك زۆرن، لەوانە:

* الوافي بالوفيات: ٢/ ١٧٠.

* البداية والنهاية: ١٤/ ٢٣٤.

* النجوم الزاهرة: ١٠/ ٢٤٩.

وە لەو سەردەمە نوێیەشدا:

* الأعلام: ٦/ ٥٦.

* خطط الشام، محمد کرد علي: ٤/ ٥١.

* دائرة المعارف الأسلامية: ١٣/ ٤٧٢.

### ٢- بەرپەوو پرۆگرامەکەی:

إبن القيّم كتێبەكەی بۆ (٢١) کاروبار دابەش کردووە، وە بە گوێرەی درێژیو کورتیو پایەی ووتارەکە جیاکراوەتەوە.

هەندێك لە کاروبارەکانی بۆ چەند وەرز دابەش کردووە، وە باسی گیانی کردووە، جا سوودو کەڵکی داوەتیو وەستاییو کارامەیی پێوە دیارە، باسی گیانی زیندووەکانو مردووەکانی کردووە، وە باسی ئێشو ئازاری گۆڕو ئارامگرتنی ڕۆحەکان دەکات، وە هەروەها باسی ووتەکانی زانایانی کردووە بە لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنێکی سەرسوڕهێنەر.

### ٣- چاوگەو سەرچاوەکانی:

چاوگەو سەرچاوەکانی إبن القيّم گەلێك زۆر بوون، گرنگترینیان (قورئانی پیرۆز)ە ، پاشان (الصحاح) وە (السنن) وە (المسانيد)ی نووسیوە، وە هەندێك کتێبی دیکەی نووسیوە وەك (التفاسير) و کتێبی (المنامات)ی إبن أبي الدنيا بەجۆرێك زۆربەی لە (إبن القيّم)ی گواستۆتەوە.

- **سێیەم: ئیشو کارەکانمان لەو کتێبەدا**

١- لە نێوان ژمارەیەك لە لەبەرگیراوە چاپکراوەکاندا بەراوردمان کردووە، لەوانە دروستەکەیان هەڵبژاردووەو چەسپاندوومانە.

٢- ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆزو، فەرموودەکانی پێغەمبەرمان (درودی خوای لەسەر بێت) دەرهێناوە.

٣- هەندێك لە ووشە هەڵەو خەیاڵیەکانمان هەڵچن کردووەو ڕێکمان خستووە، وە نیشانەکانی ژمارەکردنی دروستمان بۆی داناوە.

٤- ناوونیشانەکانمان بۆ وەرزەکان داناوە لەنێوان دوو چەماوە، وەك ئەمە { }.
وە لە کاروبارەکاندا جیامان کردۆتەوە.

٥- هەندێك نیشانەمان داناوە وەك، *** ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کۆتایی هاتنی کاروبارەکان.

٦- لێکۆڵینەوەیەکمان لە ئەو (کتێبەی لەبەر دەستدایە) پێشکەش کردووە.

لە خودای گەورە دەپارێمەوە ئەم کارەم بۆ بنوسێت لە ئامادەکردنی عیلمو زانستێکی بەسوود، وە کەڵكو سوود بداتەوە، و خودای گەورە بە پاكو پوختی بیگێڕێتەوە، وە لە هەموو کەس شایستەترە لێی داوا بکەیت، وە هەر خۆشی پەیمانی داوە بە وەڵام دانەوە.

سوپاسو ستایش بۆ ئەو خودایەی کەوا کۆتاییەکەی هێشتاو بەردەوام پێدەکات ..... وە سەرەتایەکەشی کۆتایی نایەت ...... سوپاسو ستایش هەر شایستەی خوایەو بۆ خوایە، کە خاوەن پەروەردگاری هەموو جیهانیانو هەموو بوونەوەرە.

عبدالرحمن المصطاوي

نووسیویەتی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

{پێشەکی کتێبەکە}[٥]

سوپاسو ستایش بۆ خودای بەرزو مەزن، کە کاربەجێو زاناو دانایە، میهرەبانو لێخۆشبووە.

سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایەو کە خاوەنو پەروەردگاری هەموو جیهانیانو هەموو بوونەوەرە، بەخشندەو، دلۆڤانە، کانگای ڕەحمەتو میهرەبانیە، خاوەنو سەرداری ڕۆژی پاداشتو سزایە، کە بێگومان خودای گەورە ئادەمیزادی لە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە، پاشان لە جێگەیەکی پارێزراوو لە باردا کە (مندالّدانی دایکە) لە شێوەی نوتفەیەکی زۆر بچووکدا دایمەزراندووە، پاشان تۆوەکەی کردووە بە خۆ هەلّواسەرێك (سەرمێکوتەیەك)ی ڕەنگ ڕەش بۆ ئەوانەی چاودێریو تەماشاکارن، پاشان خۆهەلّواسراوەکەمان کردووە بە پارچە گۆشتێك، ئەو پارچە گۆشتەش بە ئەندازەی پارویەکە، ئینجا (شێوازی) گۆشتپارەکەمان گۆڕیوە بە پەیکەری ئێسك بە شێوەیەکی جۆراو جۆرو وێنەو بابەتی جیاواز بۆ ئەوەی ئەو بینا پتەوەی لەسەر بوەستێت، پاشان بە گۆشت پەیکەری ئێسکەکەمان داپۆشیوە هەروەكو لەبەرکردنی پۆشاکێك بۆ ئەو، ئەوسا لە شێوەیەکی تردا دەرمان هێناوە (کە شێوەی ئادەمیزادێکی ڕێكو پێکەو ڕۆحی پێ بەخشراوە)، بەڕاستی خوای مەزن بەرزو پیرۆزو موبارەکەو چاکترین بەدیهێنەرو چاکترین دروستکارە.

پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە تواناکەی هەموو دەسەلاّتێکی تەنیوەتەوە، وە خواستو ویستی ئەو خودایە لە دروستکراوەکانو بەڕێوەبردنی کاروبارەکاندا، و

(٥) ئەو پێشەکیە نزیکترین (پێشەکیەکانی) شێوازی (إبن القيّم)ە چونکە زۆر پێشەکی دیکەمان بینیوە لەو کتێبە لە نوسخە چاپکراوەکان کەوا بەراوردمان کردووە خودای گەورەش زاناترە.

هەر زاتی خۆی تاكو تەنیاو خاوەنو سەرداری ئاسمانەكانو زەویە، ئەوەی بیەوێت دروستی دەكات ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاء لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (آل عمران: ٦). واتە: (ئەو خودایە زاتێكە نەخشەی ڕوخسارتان لە منداڵدانەكاندا دەكێشێت چۆن بیەوێت، هیچ پەرستراوێكی بەڕاست نیەجگە لەو خودایەو ئەو زاتە باڵادەستو داناو كاربەجێیە).

وأشهَدُ أنْ لا إله إلا الله وَحدهُ لا شَريكَ لـه، خودای گەورە زاتێكە ڕادەبەرو شكۆدارو مەزنە لە وێكچوون یاخود شتێك لە وێنەی ئەودانیە، وە بەرزو بێ هاوتایەو دوورە لە هەر هاوەڵو یارمەتیدەرێك، وە بەرزو پیرۆزە لەبارەی لەیەكچوونی دروستكراوەكانی، ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾ (الشورى: ١١). واتە: (هیچ شتێك نیە لەوێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت هەر ئەویش بیسەرو بینایە).

وَأشهَدُ أنَّ محمداً عبده وَرَسوله، وە چاكترینی {دروستكراوەكانە}، و دەستپاكو ڕاستگۆیە لەسەر ئەو سروشەی كە بۆی هاتووە، دەمڕاستو تێگەیشتووە لەسەر خواپەرستیەكەی، وە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ ڕەحمەتو بەزەییو بەخشندەیی هەموو جیهان، و پێشەنگی كارو كردەوەی چاكەكانە، وە ڕاستگۆیە لەسەر هەموو ئادەمیزاد بەگشتی، بۆیە خودای گەورەو فریشتەكانیو پێغەمبەرەكانی سەڵاواتیان لەسەر لێداوە، سەڵاتو سەلامو بەرەكەت بڕژێتە سەر گیانی پێغەمبەرمان محمد ﷺ.

جا ئەم كتێبە پێكهاتووە لەسەر بیستو یەك كاروبار (المسألة) دەربارەی ڕۆحو ئەوەی پەیوەندی بە ڕۆحەوە هەیە.

***

## ئـايا مردووەكان دەزانن كە زيندووەكان سەردانيان دەكەن و وە سەلاميان لىٚ دەكەن ياخود نا؟

إبن عبدالبر دەڵێت: دەركەوتووە لە پێغەمبەرﷺ كە فەرموويەتی: (مَا مِن مُسلِمٍ يَمرُ على قَبرِ أخِيهِ كانَ يَعرفهُ في الدُّنيا فيسلمُ عَلَيهِ إلاّ رَدَّ اللهُ عَلَيهِ روحهُ حتَّى يرد عَلَيهِ السَّلام) (٦).

واتە: (هيچ موسڵمانێك نيە كەوا بەلای گۆڕی برايەكەيدا تێپەڕێت كە لـە دونيـادا دەيناسىٚ كاتێك سەلامی لێدەكات ئيللا خودای گەورە ڕوحەكەی بۆ دەگەڕێنێتـەوە تاوەكو وەڵامی سەلامەكەی دەداتەوە). ئەمەش دەقێكە كەوا دەيناسێت و وەڵامی سەلامەكەی دەداتەوە.

لە هەردوو سەحيحەكەدا لەبارەی ئەم حەديسەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) چەند ڕوويەكی جۆراو جۆری هەيە: ئەمـەش پەيوەنـدی بـە غـەزای بـەدرەوە هەيە كاتێك كافرەكان لەو شەڕەدا دەكوژرێن، لـە (قليـب) پێيـان دەگـات، پاشـان لەسەر لاشەكانيان دەوەستیٚ و بە ناوەكانی خۆيـان بانگيـان دەكـات: (ئـەی فلانـی كوڕی فلان، وەيان فلانی كوڕی فلان، يان ئەوەتان بينی كە خـودای ئێـوە بەڕاسـتی پەيمانی بە ئێوە دابوو؟ چونكە من ئەوەم بينی كە خودای من بەڕاستی بەڵێنی پـیٚ دابووم). جا ئيمامی عمر بە پێغەمبەری ووت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، تـۆ قـسە لەگـەڵ كـیٚ دەكـەيت لـە كاتێكـدا ئەوانـە لاشـەكايان بۆگـەنی كـردووە، جـا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (وَالَّذي بَعـثني بِالحَقِّ مَـا أنـتُم بِـأسَمَع لَمَّا أقُـول مِـنهُم وَلكنَّهم لايَستَطيعُونَ جواباً) (٧). واتە: (سوێند بەو كەسەی بـە حـەق مـنی ڕەوانـە كردووە ئێوە لەوانە باشتر گوێتان لیٚ نيە كە چيان پیٚ دەڵـێم بـەڵام ئـەوان نـاتوانن وەڵام بدەنەوە).

---

(٦) سەيری: فيض القدير: ٥/ ٤٨٧ بكە.

(٧) موسلم ڕيوايەتی كردووە (٢٨٧٣)، وە سەيری: فتح الباری: ٧/ ٣٠٠ بكە.

هەر لە پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە کە فەرموویەتی: (أن المَيت يَسمَعُ قرع نعال المشيعين لهُ إذا انصَرَفوا عَنهُ)[8]. واتە: (مردوو گوێی لە دەنگی نەعلی ئەو کەسانەیە کە ناشتوویانە لە کاتێ بەجێی دەهێڵن).

وە پێغەمبەرﷺ ئوممەتەکەی ڕاسپاردووە کە سەلام لە ئەهلی گۆڕستان دەکەن وا سەلامیان لێ بکەن وەك ئەوەی قسەیان لەگەڵ دەکەن: (السَّلامُ عَلَيكُم دار قَوم مؤمنين)[9]. وە ئەم قسەیەش بۆ یەکێکە کەوا گوێی لێبێتو عەقلی هەبێت، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر ئەم قسەکردنە لە پلەو پایەی قسەکردن لەگەڵ کەسێکی ونبوو، وبێگیان بێت.

پێشینەکان هەموویان کۆکن لەسەر ئەم ڕایە، وە زۆر نیشانەی یەك بەدوای یەکدا لەو بارەیەوە دەرکەوتووە بەوەی کەوا کەسی مردوو هەست بە سەردانی کەسێکی زیندوو دەکات بۆ لای و مژدەشی پێ دەدات.

أبوبکر عبدالله کوڕی محمد کوڕی عبید بن أبی الدنیا لە کتێبی (القبور)[10]. لە بەشی زانینو هەست کردنی مردووەکان بەسەردانی زیندووەکان دەڵێت: محمد کوڕی عون بۆ ئێمەی گێڕایەوە، کەوا یحیی کوڕی یمان بۆمانی گێڕاودتەوە، لە عبداللە ی کوڕی سمعان، لە زەیدی کوڕی أسلم، ئەویش لە عائشەﷺ دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (مَا مِن رَجل يَزورُ قَبرَ أخيهِ وَيَجلِسُ عِندهُ إلا استأنس بهِ وردَّ علَيه حتَّى يَقُوم)[11]. واتە: (هیچ پیاوێك نیە کاتێك سەردانی گۆڕی براکەی دەکات و لە لای دادەنیشێت ئیللا هۆگری دەبێتو گوێی لێ دەگرێت تاوەکو هەڵدەستێت).

---

(٨) سەیری: فتح الباری: ٣/ ٣٠٥، مسند أحمد: ٢/ ٣٤٧ بکە.

(٩) موسلم ریوایەتی کردووە.

(١٠) سەیری: سیر أعلام النبلاء: ١٣/ ٤٠٦، وە هدیة العارفین: ١/ ٤٤٢ بکە.

(١١) شرح الصدور: ٢٧٣.

محمد کوڕی قدامة الجوهری بۆمانی گێڕایەوە، کەوا معن کوڕی عیسی القزاز بۆی گێڕاوینەتەوە، ئەویش لە هشام کوڕی سعد بۆی گێڕاینەوە، ئەویش لە زەید کوڕی أسلم، ئەویش لە ئەبو هوریرە‌ﷺ دەڵێت: ئەگەر پیاوێك بەلای گۆڕی براکەیدا تێپەڕێت‌و بیناسێت جا سەلامی لێ بکات ئەوا ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوەو دەیناسێتەوە، بەڵام ئەگەر بەلای گۆڕی کەسێکدا بڕوات‌و نەیناسێت جا سەلامی لێبکات ئەوا مردووەکە سەلامەکەی وەردەگرێتەوە.[١٢]

محمد کوڕی الحسین بۆمانی گێڕایەوە، کەوا یحیی کوڕی بسطام المصغر ئەویش گێڕایتیەوە، کەوا مسمع بۆ منی گێڕایتەوە، کەوا پیاوێك لە بنەماڵەی عاصم الجحدری دەڵێت: من لە خەومدا پاش مردنی بە دوو ساڵ عاصم الجحدریم لە خەودا بینی، پێم ووت: ئەی تۆ نەمردووی؟ ووتی: بەڵێ. جا پێم ووت: ئەی تۆ لە کوێی؟ ووتی: سوێند بەخوا من ئێستا لە باخێك لە باخەکانی بەهەشتم، من‌و یەکێك لە هاوەڵەکانم هەموو شەوانی هەینی‌و چێشتەنگاوەکەی کۆ دەبینەوە لەگەڵ بکر بن عبدالله المزنی، جا هەواڵی ئێوەم پێ ڕادەگەیەنێت، ووتی: ووتم: لاشەکانتان یان ڕۆحەکانتان؟ ووتی: ئەی هاوار، لاشەکان تووشی کارەسات‌و گرفتار بوون بەڵکو ڕۆحەکان بەیەکتر دەگەن. ووتی: ووتم: جا ئێوە دەزانن کاتێك ئێمە سەردانتان دەکەین؟ ووتی: بەڵێ دەزانین ڕۆژانی هەینی هەر هەمووی، وە ڕۆژانی شەممە تاوەکو هەڵاتنی ڕۆژ، ووتی: ووتم: جا چۆن جگە لە ڕۆژەکان ئەم ڕۆژە هەرهەمووی؟ ووتی: ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ چاکەو گەورەیی ڕۆژی هەینی[١٣].

محمد کوڕی الحسین بۆی گێڕاینەوە، کەوا بکر کوڕی محمد بۆی گێڕامەوە، ئەویش دەڵێت جسر القصاب بۆ ئێمەی گێڕایەوەو ووتی: هەموو بەرەبەیانی شەموان لەگەڵ محمد کوڕی واسع دەبووم تا دەهاتینە ناو گۆڕستان جا لەسەر گۆڕەکان

---

(١٢) سەرچاوەی پێشوو: ٢٧٣.

(١٣) سەیری المنامات (٥٨) لابن أبي الدنيا بکە.

دەوەستاین، ئەوسا سەلامیان لێ دەکەین‌و دوعایان بۆ دەکەین، پاشان ئەوێ بە جێ دەهێلن، ئینجا ڕۆژێـك ووتم: ئـەی ئەگـەر ئـەو ڕۆژە بـووە دووشـەم! ووتـی پێـی ڕاگەیاندووم کەوا مردووەکان دەزانن ڕۆژانی هەینی و ڕۆژێـك پـێش‌و ڕۆژێـك دوای ئەو خەڵکی سەردانیان دەکەن.

دەڵێت محمد بۆی گێڕامـەوە، ئـەویش دەڵێـت عبـدالعزیزی کـوڕی أبـان بـۆمی گێڕایەوە ووتی: سفیان الثوري بۆ ئێمـەی گێڕایـەوە ووتـی: سـەبارەت بـە ضـحاك قسەی بۆ من کردو ووتـی: هەرکەسـێك ڕۆژی شـەممە پـێش ڕۆژ هـەڵات سـەردانی گۆڕێك بکات ئەوا مردووەکە دەزانێت کە سەردانی کردووە، جا پێیان ووت: ئەمـە چۆن دەبێت؟ ووتی: ئەمەش بۆ گەورەیی‌و پلەو پایەی ڕۆژی هەینی یە[١٤].

خالد کوڕی خلاش بۆ ئێمەی گێڕایەوە، ئەویش دەڵێت جعفر کوڕی سلێمان بۆمـانی گێڕایەوە، ئەویش لە أبی التیاح ووتی: مطرف دەچوو بـۆ بیابـان، جـا ئەگـەر ئـەو ڕۆژە هەینی بووایە بەشەو دەڕۆیشت ووتی: گوێم لە أبا التیـاح بـوو دەیـووت: بـە ئێمەی ڕاگەیاند کەوا جێ دەستی قاچی ئـەو ڕوونـاك دەبـۆوە، ئینجـا ئـەو شـەوە دەمایەوە هەتا ئەگەر هاتوو لەلای گۆڕسـتانیش بوایـە لەبـەر خـەوهاتن وەنـەوزی دەداو لەسەر ئەسپەکەی سەری دەلەرایەوە، جـا ئـەهلی گۆڕسـتانی بـینی هـەموو خاوەن گۆڕێك لەسەر گۆڕەکەی دانیشتووە، جـا ووتیـان: ئـەوە (مطـرف)ە ڕۆژانـی هەینی دێت، ووتم: ئایا ئێوە لەلای خۆتان دەزانن ڕۆژی هەینی یە؟ ووتیـان: بـەڵێ، وە دەشزانین کاتێك باڵندە بێرەدا دێت چی دەڵێت ووتم: چی دەڵێت؟ ووتیان: دەڵێت: سەلام سەلام[١٥].

محمد کوڕی الحسین بۆمی گێڕایەوە، ئەویش دەڵێت یحیی کوڕی أبـی بکـر بـۆمی گێڕایەوە، دەڵێت الفضل کوڕی موفق کـوڕی خـاڵی سـفیان کـوڕی عیینـە ووتـی:

(١٤) سەیری: أهوال القبور، لأبن رجب: ص ٢٠٣ بکە.

(١٥) شرح الصدور: ٣٠٠.

کاتێك باوکم مرد زۆر خەمبارو دڵگیر بووم، بۆیە هەموو ڕۆژێ دەچوومە سەر قەبرەکەی، دوایی بە ویستی خوا لەم بارەیەوە کەمتەرخەمیم کرد، ئینجا نووستم، جا بینیم هەروەك چۆن گـۆڕی باوکم بکرێتـەوە، وەك ئـەوە وابێـت لـە گۆڕەکـەی دانیشتبێتو کفنەکەی لەخۆی ئاڵاندبوو وەك دیـمەنێکی مـردوو ووتـی: وەك ئـەوە وابوو کاتێك بینیم دەگریام، ووتی: ئەی کوڕەکەم، بـۆ ئێـستا کـەم دێـت بـۆ لام؟ ووتم: ئایا تۆ دەزانیت کە من دێم بۆ لات؟ ووتی: هیچ جارێك نەهاتووی ئیللا مـن زانیوومە، وە هەر جارێك دێیت بۆ لام من پابەند دەبم بە تۆو پێت دڵ خـۆش دەبم، وە بە دوعـای تـۆ دەورو پـشتم لـە سـەرم ئاسـان دەبێـت ووتـی: لـەو ڕۆژەوە زۆر دەچوومە لای[١٦].

دەڵێت محمد بۆمی گێڕایەوە، ئەویش دەڵێت یحیی کوڕی بسطام بۆمی گێڕایـەوە، ئەویش لە عثمان کوڕی سورة الطفـاوي ووتی: دایکـی لـە ئافرەتـە خواپەرستەکان بوو، کەوا پێیان دەووت: ڕاهبە واتە ئافرەتی ئاییندار، ووتـی: کاتێـك مـردن لێـی نزیك بووەوە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، ووتی: ئەی پاشـەکەوتو کارکردەوەکەم، وە ئەوەی پشتم پێ بەستووی لە دونیاو پاش مـردنم، لـەکاتی مردنـدا خەجاڵـەتو شەرمەزارم نەکەیت، و لە قەبرەکەم نەمکەیتە دڕندەو کێوی، ووتی: جا ئەو ئافرەتە مرد، بۆیـە هـەموو ڕۆژانـی هـەینی دەچـوومە لای، دوعـام بـۆ دەکـرد، و داوای لێخۆشبوون لەوی‌و لە ئەهلی گۆڕستانەکەم دەکرد، ڕۆژێك لـە خـەودا بینـیم، پـێم ووت: دایکە تۆ چۆنیت؟ ووتی: ئەی کوڕەکەم بەڕاستی مردن ئەشکەنجەو ئـازارێکی زۆری هەیە، بەڵام من سوپاس بۆ خودا لە بەرزەخێکی زۆر بەرزمو بە ڕەیحان فـەرش کـراوە، وە گـوڵی سـوندس‌و درەوشـاوە دەکەینـە سـەرینی خۆمـان تـاوەکو ڕۆژی زیندوبوونەوە جا پێم ووت: ئایا پێویستیت بە شـتێك هەیـە؟ ووتـی: بـەڵێ، ووتم: چییە؟ ووتی: ئەو سەردانەی ئێمەت دەکردو دوعات بۆ دەکردین وازی لێ مەهێنە،

---

(١٦) سەرچاوەی پێشوو ٣٠١.

چونكه من مژدەم پێ دەدرێت بە هاتنت لـە رۆژانـی هـەینی. و پـێم دەڵـێن ئـەی ئافرەتی خواپەرست ئەوە كورەكەتە قەبوڵمان كرد، جـا دڵخـۆش دەبم، وە هـەروەها مردووەكانی دەوروپشتیشم بە هاتنت دڵخۆش دەبن(١٧).

محمد كوڕی عبدالعزیز كوڕی سلێمان بۆمـانی گێڕایـەوە، ئـەویش لـە بـشیر كـوڕی منصور، ووتی: كاتێك سەردەمی پەتای تاعوون بوو پیاوێك هەبوو جیاواز بـوو لـە خەڵكی بۆ چوونە سەر گۆڕستان، لەكاتی نوێژی سەر مردوو ئامـادە دەبـوو، كـاتێ ئێوارەش دادەهات لەبەر دەرگای گۆڕستان دەوەستا، جا ووتی: خـودای گـەورە بـە دڵتەنگیو بەزەیی غوربەتیتان دەزانێو لە بێزاریو زیان گەیاندن بتان پارێزێت، وە كردەوە چاكەكانتان قەبووڵ بكات، لەم ووشانە زیاتر هیـچی تـری بەوانـە نـەووت. ووتی: ئەو شەوەم لەوێ بەسەر برد، جا چوومەوە ماڵەوە، نەچـوومەوە لای ئـەهلی گۆڕستان دوعا بكەم هەروەك پێشتر دوعـام دەكـرد ووتـی: لـەو كاتـەدا نووسـتمو خەڵكێكی زۆر هاتنە لام، ووتم: ئێوە كێنو چ پێویستیەكتان هەیە؟ ووتیـان: ئێمـە ئەهلی گۆڕستانین ووتم: جا چ پێویستیەكتان هەیە؟ ووتیان تۆ لە كـاتی چـوونەوەت بۆ ماڵەوە دیاریت پێشكەش بە ئێمە كرد ووتم: ئەم دیاریانە چ بوون؟ ووتیـان: ئـەو دوعایانـەی كـەوا دەتكـرد ووتـی: ووتم: مـن جـارێكی تـر دەگەڕێمـەوە. ووتـی: لەوساكەوە هیچ كاتێك وازم لەوێ نەدەهێنا(١٨).

محمد بۆمی گێڕایەوە، ئەویش لە أحمد كوڕی سـهیل، ئـەویش لـە ڕشـید كـوڕی سعد، ئەویش لە پیاوێك، ئەویش لە یزید كوڕی حبیـب كـەوا سـلیم كـوڕی عمـیر بەلای گۆڕستانێك تێپەڕی تەنگە تاوی میزكردن بوو، هەندێك لە هاوەڵانی پێیـانی ووت: كاتێك لێـرە لەسـەر گۆڕسـتانەكە دانیـشتم میـزم كـرد بـەناو هەنـدێك لـە كەلێنەكان جا گریاو پاشان ووتی: پاكو بێگەردی بۆ ئەو خودایە، سوێند بەخوا من

(١٧) سەرچاوەی پێشوو: ٣٠.

(١٨) سەرچاوەی پێشوو: ٣٠٠.

ئەوەندەی شەرم لە مردووەکان دەکەم ئەوەندەش شەرم لە زیندووەکان دەکەم، جا ئەگەر بهاتبا مردوو هەستی بەمە بکردایە ئەوا شەرمی لەو کارە دەکرد.

وە ڕایگەیاندووە کەوا مردو هەست بە ئیش‌و کاری خزم‌و خوشك‌و برا زیندووەکانی دەکات، عبدالله کوڕی المبارك ووتی: ثور کوڕی یزید بۆمی گێڕایەوە، ئەویش لە إبراهیم، ئەویش لە أبی أیوب ووتی: کارو کردەوەی زیندووەکان لەسەر مردووەکان ڕەنگ دەداتەوە، ئەگەر بینیان ئەم کارە چاکە ئەوا مردووەکان دڵخۆش دەبن‌و مژدە دەدەن، وە ئەگەر خراپەیەکیان بینی دەڵێت: تووخودا پێداچوونەوەی پێبکە[19]. وە إبن أبی الدنیا باس دەکات، لە أحمد کوڕی بن أبـی الحـواری ووتـی: محمدی برام بۆی گێڕامەوە ووتی: عباد کوڕی عباد چووە لای إبراهیم کوڕی صالح کە ئەو لە فەلەستین بوو، جا ووتی: ئامۆژگاریم بکە، ووتی: بەچی ئامۆژگاریت بکەم خودای گەورە کارو کردەوەت چاك بکات؟ پێی ڕاگەیاندم کەوا کارو کردەوەی زیندووەکان لەسەر خزمی مردووەکان ڕەنگ دەداتەوە، سەیرە چۆن کارو کردەوەت لەسەر پێغەمبەری خوداﷺ کاریگەر دەبێت[20]. جا إبراهیم ئەوەندە گریا تاوەکو ریشی تەڕ بوو.

إبن أبی الدنیا ووتی: محمد کوڕی الحسین بۆ منی گێڕایەوە، ئەویش لە خالد کوڕی عمرو الأموي، ئەویش دەڵێت صدقە کوڕی سلێمان الجعفری بۆمانی گێڕایەوە ووتی: هەندێك کارو کردەوەی ناشیرینم هەبوو، جا باوکم مرد، زۆر پەشیمان بوومەوە لەوەی کە کردبووم، ووتی پاشان من لە ڕێی ڕاست لام دابوو هەڵخلیسکا بووم، جا باوکم لە خەودا بینی، ووتی: ئەی کوڕەکەم، من هیچ دڵخۆش نیم بە تۆ، کارو کردەوەکانت لەسەرمان ڕەنگ دەداتەوە ئێمە کارەکەی تۆمان بە کارو کردەوەی پیاوچاکان دەشوبهاند، کەچی ئەم جارە شەرمم لەو کردەوەت دەکردەوە

(١٩) سەیری: المنامات، لإبن أبي الدنیا: ٢١ بکە.

(٢٠) شرح الصدور: ٣٤٣.

هەر شەرمێکی زۆریش، جا مردووەکانی دەوروپشتم خەمبار نەکەیت‌و منیش شەرمەزار نەکەیت، ووتی: لەوساکەوە ئەمەم گوێ لێبووکە لە کوفەدا دراوسێم بوو- لە دوعاکانیدا دەیووت: بەخودای گەورە ڕوو لە دەرگات دەکەم لەجیاتی ئەو لێت دەپاڕێمەوە کەوا گەڕانەوەی بۆ نیەو کەمتەرخەم نابم لە کارو کردەوەی چاك ئەی چاکەکاری چاکەکاران و ئەی چاکترین بەزەیی‌و لە هەموو کەس بەخشندەتر[21].

ئەمەش بابەتێکە شوێنەوارێکی زۆری لای سەحابەکان بەجێ هێشتووە،
هەندێك لە ئەنسارەکان کە خزمی عبداللە کوڕی ڕواحة بوون دەیووت: ئەی خودای من پەنا بەتۆ دەگرم لە کارو کردەوەیەك کە عبداللە ی کوڕی ڕواحة پێی شەرمەزار بکەم، ئەمەش لەو کاتەی دەیگوت لەپاش شەهیدبوونی عبداللە ی کوڕی ڕواحة بوو[22].

ئەمەش بەسە کەوا ناوی بنێین میوان سەلام لە میوانداری بکات، هەڵبەتە ئەوان هەست دەکەن کاتێك میوانەکە بەناوی خۆیان بانگیان دەکەن، چونکە ئەگەر میواندار نەزانێت کەوا یەکێك سەردانی دەکات بانگ ناکات‌و بڵێت: سەردانی کردووە، ئەمەش شتێکی ڕەواو ماقووڵە کە یەکێك سەردانی یەکێك دەکات لە هەموو نەتەوەو گەلاندا، وە هەروەها سەلام لێکردن لەوان، چونکە سەلام کردن لەسەر یەکێك کە هەست نەکات‌و نەزانێت لەوەی کە سەلامی لێ دەکرێت ئەمە شتێکی مەحاڵە، پێغەمبەرﷺ، ئوممەتەکەی خۆی فێرکردووە ئەگەر هاتوو سەردانی گۆڕستانەکان بکەن دەبێت بڵێن: (سَلام عَلَيكُم أهل الدِّيار مِنَ المؤمِنين والمسلِمين، وإنَّا إن شَاء الله بِكم لاحِقُون، يَرحم الله المستَقدِمين مِنَّا وَمِنكم

---

(٢١) ميزان الأعتدال: ١/ ٦٣٥.

(٢٢) شرحالصدور:٣٤٣.

والمستأخرين، نَسألُ اللهَ لَنا وَلَكم العافية) [٢٣]. واته: (سەلامی خواتان لیّ بیّت ئەی خاوەن ماڵ لە ئیمانداران‌و موسڵمانان، وە ئێمەش بە وویستی خوای گەورە پێتان دەگەین بەزەیی خوای گەورە لە پێش ئێمەدا بێت و ئەوەی لە دوای ئێمەش دێت، داوا لە خوای گەورە دەکەم لە ئێمەو ئێوەش خۆش ببێت).

ئەو سەلام کردنەو قسە کردن‌و بانگکردنە بۆ یەکێکە کە بوونی هەبێت‌و گوێ بگرێت‌و قسە بکات و ئەقڵی هەبێت‌و وەڵام بداتەوە، نەك سەلام لە کەسێك بکەیت‌و ئەوەی سەلامی لیّ دەکرێت نەتوانێت وەڵام بداتەوە، وە ئەگەر پیاوێك دوعای بۆ یەکێك لە خزمەکانی بکات‌و ببیسن وە بزانن کە ئەمە دوعای بۆ کردوون ئەوا پێی دڵخۆش دەبێت.

یزید کوڕی هارون دەڵێت: کەوا سلێمان التیمي پێی ڕاگەیاندووین، ئەویش لە أبي عثمان النهدی کەوا إبن ساس ڕۆژێك لەگەڵ جەنازەیەك دەرچوو وە جلێکی سوك‌و سادەی لەبەردابوو، پاشان لە قەبرەکە بوونەوە، ووتی: جا دوو ڕکعەت نوێژم کردوو پاشان شانم خستە سەر قەبرەکە، سوێند بەخوا کەوا دڵم بەئاگا هاتەوەو گوێم لە دەنگێك بوو لەناو قەبرەکە هات: ئاگات لێم بێت ئەزیەتم مەدە چونکە ئێوە قەومێکن کارو کردەوە دەکەن بەڵام نازانن، کەچی ئێمە دەزانین بەڵام کار ناکەین، وە کارو کردەوەکانم وەك‌و ئەو دوو ڕکعەتەی تۆیە لای من لە ئەوهاو ئەوها خۆشەویستترە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە مردوویەك زانیوویەتی بە پاڵدانەوەی پیاوێك لەسەر قەبرەکەی وە بە دوعاکردنی لەبۆ مردووەکە [٢٤].

وە إبن أبي الدنیا دەڵێت: الحسین کوڕی علي العجلي بۆمی گێڕایەوە، ئەویش لە محمد بن الصلت بۆی گێڕاوەتەوە، ئەویش لە إسماعیل کوڕی عیاش، لە ثابت کوڕی سلیم، أبو قلابە بۆی گێڕاوەتەوەو دەڵێت لە شامەوە بەرەو بەسرە دەچووم، لە

---

(٢٣) مسلیم(٩٧٤)،وابن ماجة(١٥٤٧) ریوایەتیان کردوە.

[٢٤] - شرح الصدور:٢٨٥

گۆڕستانێك دابەزیم، تارەتی خۆم کردوو دوو ڕکعەت نوێژم بەشەو کرد، پاشان سەری خۆم لەسەر قەبرێك داناو نووستم، پاشان بەئاگا هاتمەوە، کەوا خاوەنی قەبرەکە سکالای لە من دەکردو دەیووت: لە شەوێوە تۆ منت ئەزیەت داوە، پاشان ووتی: ئێوە کارو کردەوە دەکەن بەلام نازانن‌و بێ خەبەرن، بەلام ئێمە دەزانین کەچی توانای ئیشکردنمان نیە، پاشان ووتی، ئەو دوو ڕکعەتەی ئێوە کردتان خێری زیاترە لە دونیاو ئەوەی تیایەتی، پاشان ووتی: خوا پاداشتی ئەهلی دونیا بە خێر بداتەوە، سەلامی ئێمەیان پێ ڕابگەیەنن، لە کاتێکدا بە دوعاکانیانەوە دێنە لای ئێمە نورو رووناکیان ئەوەندەی چیاکانە.

حسين العجلى بۆمی گێڕایەوە، ئەویش لە عبداللە کوڕی نمیر، ئەویش لە مالك کوڕ مغول، لە منصور، ئەویش لە زید کوڕی وهب، ووتی، دەرچووم بەرەو گۆڕستانێك‌و لێی دانیشتم، پاشان پیاوێکیش هاتە لای گۆڕێك‌و دەستکاری کردو ڕێکی خست، پاشان هاتە لای من، جا دانیشت، دەڵێت: ووتم: ئەو گۆڕە هی کێ یە؟ ووتی: هی براکەمە پێم ووت: براکەت؟ ئینجا ووتی: لە پێناوی خودا برامە لەکاتی نووستنمدا لە خەودا بینیم، جا ووتم: فلان لە خەوتا بینیت! سوپاس‌و ستایش بۆ خودای هەموو جیهان، ووتی: منیش پێم ووت: چونکە من دەتوانم پێی بڵێم تۆ بۆ من لە دنیاو ئەوەی تیایەتی خۆشەویستتری، پاشان ووتی: ئایا نابینیت کاتێك من دەنێژن، فلانەکەس هەستاو دوو ڕکعەت نوێژی کرد، چونکە من دەبێت بتوانم دوعایان بۆ بکەم چونکە ئەوە بۆ من لە دونیاو ئەوەی تیایەتی خێری زیاترە.

دەڵێت أبوبكر التيمى بۆمی گێڕایەوە، ئەویش لە عبداللە کوڕی صالح، ئەویش لە الليث کوڕی سعد، ئەویش لە حميد الطويل کەوا بۆی گێڕاوەتەوە، لەمطرف کوڕی عبداللە الحرشى، ووتی: لەسەردەمی ئەودا لەگەڵ الربيع دەرچووین، جا ووتمان: ڕۆژی هەینی دەردەچین بۆ بینینی ئەو دەشتو دەرە، ڕێگاکەمان کەوتە سەر گۆڕستانێك ووتی: جا چووینە ناوی و جەنازەیەکمان لەناو گۆڕستانەکە بینی، ووتم:

با بەدیار ئەو جەنازەیەوە بین، تۆزێك بەدیاری وەستاین، ووتی: ئینجا چوومە لایەك لە نزیك گۆڕەکە، دوو ڕکعەت نوێژم بە سووکی کرد کە لە پاكو بێگەردیەکەی زۆر ڕازی نەبووم، پاشان زۆر خەوم هاتو خەوالّوو بووم خاوەنی گۆڕەکەم بینی قسەی لەگەڵم دەکرد، ووتی: تۆ دوو ڕکعەت نوێژت کرد لە پاكو بێگەردیەکەی ڕازی نەبووی؟ ووتم: هەر ئاوا بوو؟ ووتی: کارو کردەوە دەکەن بەڵام نازانن، کەچی ئیمە دەزانین بەڵام ناتوانین کار بکەین، ئەگەر من بتوانیایە دوو ڕکعەتم وەك دوو ڕکعەتەکەی تۆ بکردایە ئەوا بۆمن خێری لە دونیاو ئەوەی تیایەتی بە تێکڕایی زیاتر بوو، جا ووتم: ئەوانە کێن لەناو ئەو گۆڕانە؟ ووتی: هەموویان موسڵمانن، و هەموویان کاری خێریان کردووە،

ئینجا ووتم: ئەی کێ لێرە لەهەموویان باشترە؟ ئەو ئیشارەتی بۆ قەبرێك کرد، ئینجا بە خۆمم ووت: ئەی خودایە دەری بهێنە بۆم قسەی لەگەڵدا دەکەم. ووتی: کوڕێکی گەنج لە قەبرەکە هاتە دەرەوە، پێم ووت: تۆ لێردا لە هەموویان باشتری؟ ووتی: ئەوان وا دەڵێن، ووتم: ئەم شتە چاکەت بەچی دەستکەوتووە، سوێند بە خوا لەو تەمەنە بچووکە هیچی وات لێ نابینم کەوا بڵێم: ئەم کارە چاکەیەت بە حەجو عەمرەو جیهاد لە پێناوی خوداو کارو کردەوەی چاك دەستکەوتبێت؟ ووتی: تووشی زۆر کارەساتو ناخۆشی هاتم بەڵام سەبرم لەسەریدا گرت، ئەمەش ئەو گەورەیە لەمەدا دەبینم[٢٥].

ئەمەش لە سەحیحدا جێگیرو سەلمێندراوە کەوا مردوو هاوڕێو هۆگری ئەو کەسانە دەبێت کە لە گەڵیدا دەبن تاوەکو پاش ناشتنی.

موسلم لە سەحیحەکەیدا لە ووتەیەکی عبدالرحمن کوڕی شماسە المهری دەڵێت: چووینە سەردانی عمرو کوڕی عاص، ئەو لە کاتێکدا لە سەرەمەرگ دابوو، زۆر دەگریا، جا ڕووی خۆی بۆ لای دیوارەکە وەرگێڕا، تاوەکو کوڕەکەی پێی ووت:

---

(٢٥) سەرچاوەی پێشوو: ٣٦٥.

باوکە گیان بۆچی دەگریت؟ ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مژدەی ئەو شتانەی پێ نەداویت؟ ڕووی خۆی وەرگێڕاو ووتی: باشترین شت کەوا خۆمانی بۆ ئامادە بکەین ئەوەیە کە بڵێین (أشـهد أنْ لا إلـهَ إلا الله وأنَّ محمداً رَسُول الله) مـن کـاتی خـۆی لەسەر تاریکایدا بووم، منتان بینی کە هیچ کەسێك لە من توندترو زیاتر ڕقی لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەبۆوە، زۆر حەزم دەکرد کە شوێنەکەیم بدۆزیبایەوە ئەو کاتە دەمکوشت، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتە بمردمایە ئەوا لە ئەهلی دۆزەخ دەبووم، جا کاتێك خودای گەورە ئیسلامی لەناو دڵم جێگیر کرد بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتم، ووتم: دەستت درێژکە با پەیمانت بدەمێ، جا پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاستی درێژ کرد، ووتی: جا دەستیم گوشی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مالَك یا عمرو؟) واتە: (ئەوە چیتە ئەی عەمرو؟) ووتی: ووتم: دەمەوێت مەرج دابنێم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: (تشترط ماذا) واتە: (مەرجی چی دادەنێیت؟) ووتم: کەوا لێم خۆشبیت، فەرمووی: (أما عَلِمتَ أنَّ الإسـلامَ يهـدم مَـا كان قَبله، وَأنَّ الهِجرَة تهدم مَا كانَ قبلها، وأنَّ الحَجَّ يهدم مَا كانَ قبلـه؟) واتە: (ئایا نەتزانیووە کەوا ئیسلام ئەو کارو کردەوانەی پێش لەناو دەبات، وکۆچکردنیش ئەو کارو کردەوانەی پێش خۆی لەناو دەبات، و حەجکردنیش ئەو کارو کردەوانەی پێش خۆی لەناو دەبات؟) وە هیچ کەسێك بۆ من لە پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستر نیە، و هیچ کاتێك ئەو لە پێش چاوەکانم وون نابێت، وە هەرگیز نەمدەتوانی ڕێزو گەورەیی ئەو لە چاوەکانمدا پڕ بکەم، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتەش مردم لە خودا دەپاڕێمەوە کەوا لە ئەهلی بەهەشت بم، وە ئەگەر پرسیاریشم لێبکرێت کەوا وەسفی بکەم ناتوانم چونکە چاوەکانم پڕ لە بینینی ئەو نەبوو، پاشان هەندێك شتمان هەیە نازانم حاڵمان چۆن دەبێت تێیدا، جا ئەگەر من مردم ئەوا شیوەن و لاوانەوەو ئاگرم بۆ دروست مەکەن، ئەگەر منیشتان بە خاك سپارد ئەوا خۆڵم بەسەردا بکەن و بەپێی توانا لە دەورەم ڕاوەستن و قوربانیەك سەر ببڕن و گۆشتەکەی

دابەش بکەن تاوەکو هۆگرو هاوڕێتان بم، و سەیر بکەمو بزانم کەوا پێغەمبــەرەکانی خودای گەورە چۆن گەڕاونەتەوەو بە خۆیاندا چوونەتەوە[٢٦].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا مــردوو هــۆگرو هــاوڕێی ئامــادەبووان دەبێــت لەلای گۆڕەکەی و پێیان دڵخۆش دەبێت.

له کۆمەڵێك پێشینەکاندا باسکراوە کەوا ئەوان وەسیەت دەکەن کە لە کاتی بــە خاك سپاردنیان لەلای گۆڕەکانیان قورئان بخوێنن، عبدالحق دەڵێت: ڕیوایەت دەکات کەوا عبدالله کــوڕی عمــر فــەرمان.دەکــات لــە لای گۆڕەکــەی ســورەتی (البقــرة) بخوێنێت[٢٧].ئەوەی لەسەر ئەو ڕایە بێت العــلاء کوڕی عبدالرحمن بوو، وە ئیمــامی أحمد یەکەجار ئەو شتەی سەرزەنشت کرد، پاشان لێی پەشیمان بووەوە.

الخلال لە (الجامع) دەڵێت: لەلای گۆڕەکان قورئــان بخــوێنن، العبــاس کــوڕی محمــد الدوری هەواڵی پێمان داوە، ئەویش لە یحیی کــوڕی معــین، ئــەویش مبــشر الحلبی گێڕاویەتەوە، ئەویش لە عبدالرحمن کوڕی العلاء کوڕی اللجلاج گێڕایــەوە، ئــەویش لە باوکی دەڵێت: باوکم ووتی: ئەگەر من مردم لەناو گۆڕ دامــبنێ، وە بڵــێ: بــسم الله، وە لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خــوا ﷺ، و خــۆڵم بەســەردا بکــە، لەســەر گۆڕەکەم سەرەتای وە کۆتایی سورەتی (البقــرة) بخوێنــە، چونکە من گوێم لە عــبدالله ی کوڕی عمر بوو وای دەووت.

عباس الدوری وتی: پرســیارم لــە أحمــد کــوڕی حنبــل کــرد ووتم: هــیچ شــتێك دەخوێنیت لەسەر گۆڕ؟ ووتی: نەخێر، پرســیارم لــە معــین کــرد ئــەو قــسەیەی بــۆ گێڕامەوە.

الخلال وتی: الحسن کوڕی أحمد البراق بۆمی گێڕایــەوە، ئــەویش لــە علــی کــوڕی موسی الحداد، پیاوێکی ڕاستگۆ بوو، ووتی: لەگەڵ أحمد کوڕی حنبلو محمد کــوڕی

---

(٢٦) موسلیم ڕیوایەتی کردووە: (١٢١).

(٢٧) التذكرة، القرطبي: (٨٠).

قدامة الجوهر بووم له بەڕێکردنی جەنازەیەکدا، کاتێك مردووەکە بە خـاك سـپێردرا پیاوێکی کوێر لەلای گۆڕەکە دانیـشتو قورئـانی خوێنـد، أحمـد پێـی ووت: ئـەوە چییە، خوێندنەوەی قورئان لەسەر گۆڕ بیدعەیە، جا کاتێك لە گۆڕستانەکە هاتینـە دەرەوە محمد کوڕی قدامة بە أحمد کـوڕی حنبلـی ووت: ئـەی بـاوکی عبـدالله چـی دەڵێی لەبارەی مبشّر الحلبی؟ ووتی: جێی باوەڕە، ووتی: ئایا هیچ شتێکت لەبارەی ئەو گوێ لێبووە؟ ووتی: بەڵێ، مبـشر لـەبارەی عبـدالرحمن کـوڕی العـلاء کـوڕی اللجلاج هەواڵی پێمدا، لە باوکیەوە کەوا وەسیەتی کردووە ئەگەر بـەخاکی سـپارد لەلای سەری سەرەتای و کۆتاییەکەی سوورەتی (البقرة) بخوێنێت، ئەو دەڵێت: گوێم لە إبن عمر بوو هەمان وەسیەتی کرد، جا أحمد پێی ووت: بگەڕێوە و بـە پیاوەکـە بڵێ با بخوێنێت[٢٨].

الحسن کوڕی الصباح الزعفراني ووتی: پرسیارم لە شـافعی کـرد رحمه الله لـەبارەی خوێندنەوەی قورئان لەلای گۆڕ ووتی: خراپ نییە[٢٩].

الخلال باسیکردووە لە الشعبی ووتی: ئەنسارەکان کاتێك مردوویەکیان لـێ دەمـرد جیاوازو ناکۆك بوون کەوا لەلای گۆڕەکەی قورئان بخوێنن، ووتی: أبو یحیـی الناقـد هەواڵی بە منداو ووتی: گوێم لە الحسن کـوڕی الجـروی بـوو ووتـی: بـەلای گـۆڕی خوشکەکەمدا تێپەڕیم، سوورەتی (تبارك)ەم لەلای خوێند {واتە: سـوڕەتی الملـك} کەوا ئەو باسی دەکرد، جا پیاوێك هاتە لامو ووتی: من خوشکی تۆم لەخەودا بینی دەیووت: خودای گەورە پاداشتی چـاکە بـە أبـا علـی بداتـەوە، کـەوا سـوودم لـە سوورەتەکەی بینی کە خوێندی.

الحسن کوڕی الهیـثم بۆ منی باس کرد، گوێم لە أبا بکر کـوڕی الأطـروش کـوڕی کچی أبی نصیر کوڕی التمار بوو دەیووت: پیاوێك ڕۆژی هەینی دەچێتە لای گـۆڕی

---

(٢٨) سەرچاوەی پێشوو: ١٩٢.

(٢٩) شرح الصدور: ٤٠٣.

دایکی‌و سوورەتی (یس) دەخوێنێت، هەندێك ڕۆژێکی دیکەش هات سوورەتی (یس)ی خوێند، پاشان ووتی: ئەی خودایە من پاداشتی ئەو سوورەتەم دابەش کرد بۆ هەموو ئەهلی گۆڕستانەکە، کاتێك ڕۆژی هەینی دیسان چووە سەر گۆڕەکە ئافرەتێك هاتە لای، ووتی: تۆ کوڕی فلان ئافرەتی؟ ووتی: بەڵێ، ئافرەتەکە وتی: کچێکم هەیە لێرە مردووە لە خەومدا بینیم لەسەر لێواری گۆڕەکەی دانیشتووە، جا ووتم: بۆچی لێرە دانیشتووی؟ کچەکەم ووتی: کەوا کوڕی فلانە ئافرەت هاتە سەر گۆڕی دایکی‌و سوورەتی (یس)ی خوێند، جا پاداشتی خێرەکەی کردە سەر هەموو گۆڕستانەکە، لەوکاتەدا ڕۆحمان ئارام بوودوە، یان خودای گەورە لێمان خۆشبووە، یان شتێك لەو بابەتەیە.

هەروەها لە النسائي و لە حەدیسکی معقل کوڕی یسار المزني دا، ئەویش لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، کەوا دەفەرمووێت: (إقرَؤوا ((یس)) عِندَ مَوتاکُم)[30]. واتە: (سوورەتی ((یس)) لەسەر مردووەکانتان بخوێنن) ئەمەش لەوانەیە مەبەستی بێت لە خوێندنەوەی قورئان لەکاتی گیانەڵاو لەسەرەمەرگ دابێت‌و لەلای ئامادەبێت، وەك ئەوەی دەفەرمووێت: (لقنُوا مَوتاکُم لا إلهَ إلا الله)[31]. واتە: (مردووەکانتان تەلقین دەن یاخود فێری بکەن بە لا إلهَ إلا الله)، ئەمەش لەوانەیە مەبەستی بێت لە: خوێندنەوەی قورئان لەلای گۆڕەکان بێت، فەرموودەی یەکەمیش پەسەندترە لە بەرئەم هۆیانە:

یەکەم: ئەمەش هاوتایە لەگەڵ ئەم فەرموودەیە: (لقنوا مَوتاکُم لا إلهَ إلا الله).

دووەم: سوودو کەڵکی بۆ مردووەکە بە خوێندنەوەی ئەو سوورەتە ئەمەی تیایە لە یەکتاپەرستی‌و گەڕانەوە بۆ لای خودای گەورەو مژدە پێدانە بە بەهەشت بۆ خاوەنی باوەڕبوون بە تاك‌و تەنیایی خوداو بەختەوەری ئەو کەسەی مردووەکەی لێ مردووە

---

(٣٠) سنن أبي داود (٣١٢١)، وە مسند أحمد: ٥/ ٢٦.

(٣١) سنن أبي داود (٣١١٧)، وە إبن ماجة (١٤٤٥)، وە مسند أحمد: ٣/ ٣.

وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ*بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ﴾ (يس: ٢٦-٢٧). واتە: (خۆزگە قەومەكەم بیانزانیایە سەرئەنجامی ئیمان چۆنەو كەوتوومەتە ناو چ نازو نیعمەتێكەوە* بەهۆی ئەوە كە پەروەردگارم لێم خۆشبووەو خستمیە ڕیزی ڕیز لێگیراوانەوە) ئەمەش مزگێنی دەداتە ڕۆح بەم كارو كردەوانەی كە ئەنجامی داوە بۆیە خوای گەورە حەز دەكات پێی بگات وە ئەویش حەز دەكات بە خودای گەورە بگات، چونكە ئەو سوورەتە دڵی قورئانە[٣٢].تایبەتمەندیەتێكی سەرسوڕهێنەری هەیە لە خوێندنی ئەو سوورەتە لەلای مردوو.

أبو فرج كوڕی الجوزی باسی كردووەو دەڵێت: ئێمە لەلای باوكمان بووین كە پیاوێكی بە تەمەن بوو، لە سەرەمەرگدابوو، لە دوا كاتدا سەیری ئاسمانی كردوو پێكەنی، ئینجا ووتی: ﴿يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ*بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ﴾ (يس: ٢٦-٢٧) و ئەمری خوای كرد[٣٣].

سێ یەم: ئەمە كارو كردەوەیەكی خەڵكە وە داب‌و نەریتێكی كۆن‌و نوێی ئەوانە كەوا سوورەتی (يس) لەسەر مردووەكانیان دەخوێنن.

چوارەم: سەحابەكان رضي الله عنهم ئەگەر تێبگەیشتان لەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (إقرَؤا ((يس)) عِندَ مَوتاكُم)، ئەوا لەسەر قەبرەكان دەیان خوێند، كاتێك ئەوێیان بەجێ دەهێشت، ئەو كارەش شتێكی ئاسایی‌و بەناوبانگ بوو لە نێوانیاندا.

پێنجەم: كەڵك‌و سوودیشی بە گوێ گرتنی لە خوێندنی سوورەتەكەوە دڵ‌و بیرو هۆشی ئامادەو جێگیر دەبێت لەكاتی خوێندنەوەیدا لە دوا ساتەكانی لە دونیادا ئەمەش مەبەستەكەیە، بەڵام خوێندنەوەی لەسەر قەبرەكەی، ئەوا هیچ پاداشتێكی

(٣٢) سەیری: سنن الترمذي (٢٨٨٧) بكە.

(٣٣) سەیری: كتێبی (الثبات عند الممات) لە إبن الجوزي لاپەرە: ١٨١ بكە.

نابێت، چونکە پاداشت یان بە خوێندنەوەی قورئانە یاخود بە گوێ گرتنە، ئەمەش کارو کردەوەیەکە بێگومان پچڕاوە لە مردوودا.

هەروەها الحافظ أبو محمد عبدالحق الأشبيلي لەسەر ئەمەدا لێکیداوەتەوەو دەڵێت: ئەوەی هاتووە کەوا باسکراوە کە مردووەکان پرسیار لە زیندووەکان دەکەنو قسەو کارەکانیان دەزانن، پاشان ووتی: أبو عمر کوڕی عبدالبرّ لە حەدیسێکی إبن عباس باسیکردووە، لە پێغەمبەرﷺ: (مَا مِنْ رَجُل يَمر بقبرِ أخيه المؤمن كانَ يَعرِفه فيسلم عَليهِ إلاّ عرفه ورد عَلَيهِ السَّلام) [٣٤]. واتە: (هیچ پیاوێك نیە کاتێك بەلای گۆڕی برا ئیماندارەکەی تێدەپەڕێتو دەیناسێت و سەلامی لێدەکات ئیللا مردووەکە دەیناسێتەوەو وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە). ئەم حەدیسەش لە أبي هورەیرە ڕیوایەت کراوەو دەفەرموویێت: (إنْ لَم يَعرفه وَسلم عَليهِ ردَّ عليه السلام). واتە: (بەڵام ئەگەر نەیناسێتو تەنها سەلامی لێبکات ئەوا وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە).

دەڵێت: لە عائیشە رضي الله عنها ڕیوایەت کراوە، کەوا دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (مَا مِنْ رَجُل يَزورُ قَبر أخيه فَيَجلِس عِنده إلاّ إستأنس به حتى يقوم) [٣٥]. واتە: (هیچ پیاوێك نیە کاتێك سەردانی گۆڕی براکەی دەکاتو لەلای دادەنیشێت ئیللا هۆگرو هاوڕێی دەبێت تاوەکو هەڵدەستێت).

أبو الحافظ أبو محمد لەو بابەتەدا نارەزایی دەربڕیووە بەوەی أبو داود لە (سنن)ەکەی لە حەیسێکی أبو هورەیرە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) فەرموویەتی: (مَا مِنْ أحَدٍ يسلّم عليَّ إلاّ رد الله عليَّ روحي حتى أردَّ

---

(٣٤) سەیری: فیض القدیر: ٥/ ٤٨٧، وە شرح الصدور: ٢٧٣ بکە، ئەم حەدیسەش لە پێشەکی کاروباری یەکەم لەو پەرتوکەدا باسکراوە.

(٣٥) شرح الصدور: ٢٧٣.

عَليهِ السَّلام) [٣٦]. واته: (هيچ كەسێك نيە كاتێك سەلامم لىٚ دەكات ئيللا خوداى گەورە رۆحەكەم بۆ دەگەڕێنێتەوە تا وەكو وەڵامى سەلامەكەى دەدەمەوە).

ووتى: جا سلێمان كوڕى نعيم دەڵێت: پێغەمبەرم ﷺ لە خەودا بينى ووتم: ئەى پێغەمبەرى خودا، ئايا ئەو كەسانەى دێنە لات و سەلامت لىٚ دەكەن وەڵاميان دەدەيتەوە؟ فەرمووى: (نَعم وأردّ عَلَيهِم). واته: (بەڵێ وەڵاميشيان دەدەمەوە).

پێغەمبەر ﷺ فێرى دەكردن كاتىٚ دەچنە گۆڕستانەكان بڵێن: (السَّلامُ عَلَيكَ يَا أهلَ الدّيار) [٣٧].

دەڵێت: ئەمەش بەڵگەيە لەسەر ئەوەى كەوا مردوو دەزانێت كىٚ سەلامى لێدەكات و كىٚ دوعاشى بۆ دەكات.

أبو محمد دەڵێت: لەلايەن فضل كوڕى الموفق باسكراوە و دەڵێت: من دەچوومە سەر گۆڕى باوكم جار لە دواى جار زياتريش لەمە، جا ڕۆژێك تەرمێكم ديت لە گۆڕستانەكە كەوا بە خاكيان دەسپارد، منيش پەلەم بوو بۆ هەندىٚ كارى پێويستى و نەگەڕامەوە، جا كاتێك شەو داهات لە خەومدا بينيم، پێى ووتم: ئەى كوڕەكەم، بۆ نەهاتيە لام؟ پێم ووت: بابە گيان، ئايا تۆ دەزانيت كەوا من دێم بۆ لات؟ ووتى: ئا سوێند بە خودا كوڕەكەم، هێشتا چاوم لە تۆيە كاتێك لە هەيوانەكە دەردەچيت تاوەكو دەگەيتە لام و لەلام دادەنيشيت و هەڵدەستيت [٣٨].

إبن أبى الدنيا دەڵێت: إبراهيم كوڕى بشار الكوفى بۆى گێڕاەوە ووتى: الفضل كوڕى الموفق بۆمى گێڕايەوە جا باسى چيرۆكەكەى كرد [٣٩].

---

(٣٦) سنن أبو داود (٢٠٤١).

(٣٧) سەيرى: موسلم (٩٧٤) بكە، ئەم حەديسەش باسكراوە.

(٣٨) أحوال القبور: ٢٠٤.

(٣٩) المنامات: إبن أبى الدنيا: ٣٠-٣١.

له عمرو کوڕی دینارەوە وەرگیراوەو دەڵێت: هیچ مردوویەك نیە ئیللا دەزانێت کەوا لە پاش خۆی خانەوادەی سەردانی دەکەن، کەوا ئەوان دەیشۆنو کفنی دەکەن، ئەویش سەیری ئەوان دەکات[٤٠].

لە مجاهد وەرگیراوە کەوا دەڵێت: پیاو بە کاروکردەوە چاکەکانی کوڕەکەی، لە گۆڕەکەیدا مژدەی پێ دەدرێت لە دوای خۆیدا[٤١].



## {لە پەسندکردنو باشزانینی تەلقین کردنی مردوو لەناو گۆڕدا}

هەروەها بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەی دەکرێت کردەوەیەکی کۆنی خەڵکە و تاکو ئێستاش لە تەلقین کردنی مردوو لەناو گۆڕەکەیدا، ئەگەر چی گوێشی لێبێت بەلاّم هیچ کەڵكو سوودی بۆی نابێتو بێ ئەنجامە، لەبارەی ئەمە پرسیار لە ئیمامی أحمدرحمه الله کرا بە باشزانینی، و ئەو ناڕەزایی لەسەر ئەو کارە دەربڕی.

لە حەدیسێکی لاوازدا ڕیوایەت دەکرێت کەوا الطبراني لە (المعجم)ەکەی باسی دەکات لە حەدیسێکی أبی أمامە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: (إذا مَاتَ أحَدكُم فَسَويتم عَليهِ التُراب فليقم أحَدكم عَلى رَأْس قَبْرِه، ثُمَّ يَقُول: يَا فلان إبْن فلانَة فإنَّه يَسمَع وَلا يجيب، ثُمَّ لِيَقل: يَا فلان إبن فلانة الثَانِيَة، فَإنَّه يَستوي قاعِداً، ثُمَّ ليقل: يَا فلان إبن فلانة يقول: أرشَدنا رَحِمكَ الله وَلكنَّكُم وَلا تَسْمَعُون، فَيَقول: اذكُر مَا خَرَجت عَلَيهِ مِن الدُنيا شَهادَة أنْ لا إلهَ إلاّ الله وَأنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله، وَأنَّكَ رضيت بالله رَبَّاً، وَبالإسلام ديناً، وَبمُحَمد نَبياً، وَبالقرآنِ إمَامَاً، فَإنَّ مُنكَراً وَنَكيراً يتأخَذ كُل واحِد مِنهَا وَيَقُول: انْطَلِق بِنا، مَا يَقعدنا عِندَ هذا وَقَد لقِن حجته؟

(٤٠) شرح الصدور: ١٣٩.

(٤١) أحوال القبور: ١٩٨.

وَيَكُـون الله وَرسـوله حجيجـه دونهمـا).فقـال رجـل: يـا رسـولالله، فـان لم يعـرف أمه؟قال:((ينسبهُ إلى أمّه حواء))[٤٢].

واته: (ئەگەر يەكێك لە ئێوە مرد كاتێ خۆڵتان بەسەريداكرد با يەكێكتان لەسـەر گۆڕەكەی بوەستێت، پاشان بڵێت: ئەی فلانی كوڕی فلانە ئافرەت، جا ئەو لە پێـوە دەوەستێت، پاشان دیسان بڵێتەوە: ئـەی فلانـی كـوڕی فلانـە ئـافرەت مردووەكـە دەڵێێت: ڕێنماییمان بكە ڕەحمەتی خودات لێبێت بەڵام ئێوە گوێتان لێ نابێـت، بـا بڵێت: بەبیر خۆت بێنەوەبەوەی كە لە دونیادا دەرچوویت (شَـهادَةَ أنْ لا إلـهَ إلاّ الله وَأنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله) وە تۆ ڕازی بوویت بەو خودایـە كـە پـەروەردگارت بێـت، بـە ئیسلامیش ئاینو ڕێبازت بێت، و بە محمد پێغەمبەرت بێت، و قورئـانیش پـەیامو پێشەوات بێت، جا مونكیرو نەكیر كەوا دوو فریـشتەی پرسـیاركەرن یـەك لـەدوای یەكدا دێن جا دەڵێن: بۆمان هەستەوە، كێ یە كەوا لەلای ئەو داماندەنیشێنێ كـە تەلقین دراوە؟ ئەوكاتە خوداو پێغەمبەرەكەی دەبێتـە پـشتو پـەنای ئـەو بێجگـە لەوان) ئینجـا پیاوێـك ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئەگـەر دایكـی نەناسـرا؟ فەرمووی: (ئەوكاتە دەگەڕێندرێتەوە بۆ دایكی حەوا).

جا ئەگەر ئەو حەدیسە نەش سەلمێنرا، ئەوا دەبێت لەو كـارە بـەردەوام بێـت لـە گشت گێژەلووكەو كۆسپو تەگەرەیەك بەبێ ئینكاری كردنێكی تەواو لەو كارەدا.

هەروەها أبو داود بە ئیسنادێكی (خراپ نیە) ڕیوایەتی كردووە كـەوا پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) ئامـادەی تـەرمی پیاوێـك بـوو، كاتێـك ناشـتیان فەرمووی: (سَلّوا لأخِيكُم التثبِيت فَإنَّهُ الآن يُسأل)[٤٣]. واتە: (سەلام لـە براكـەتان بكەنو دڵو دەروونی جێگیر بكـەن چـونكە ئـەو ئێـستا پرسـیاری لـێ دەكرێـت).

---

[٤٢] - مجمع الزوائد: ٢/٣٢٤.

(٤٣) سنن أبي داود: (٣٢٢١).

پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە کەوا ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت، و ئەگەر پرسیاریشی لێ بکرێت ئەوا گوێی لە تەلقینەکە دەبێت.

هەروەها لەپێغەمبەرﷺ وەرگیراوە کەوا دەفەرمووێت: (أنَّ الميّت يسْمَع قرع نَعالهم إذا وَلّوا منصَرفِين). واتە: (مردوو گوێی لە دەنگی نەعلەکانیانە کاتێک ئەوێ بەجێ دەهێڵن).

عبدالحق لە هەندێك پیاوچاکان باس دەکاتو دەڵێت: برایەکم مرد، لە خەومدا بینیمو ووتم: ئەی براکەم، حاڵت چۆن بوو کاتێك لە گۆڕەکەت داندرایت؟ ووتی: کۆمەڵەیەك ئاگریان بۆ هێنام جا ئەگەر دوعا خوازێك دوعای بۆ نەکردبام بەهیلاك دەچووم[٤٤].

هەروەها شبیب کوڕی شیبە دەڵێت: دایکم لە کاتی سەرەمەرگدا وەسیەتی کردم، ووتی: ئەی کوڕەکەم، ئەگەر منتان ناشت ئەوا لەلای گۆڕەکەم بوەستە، بڵێ: ئەی دایکی شبیب، بڵێ لا إلـهَ إلاّ الله، جا کاتێ ناشتمان لەلای گۆڕەکەی وەستامو ووتم: ئەی دایکی شبیب بڵێ: لا إله إلاّ الله، پاشان ڕۆیشتم، کاتێك شەو داهات لە خەومدا بینیم ووتی: ئەی کوڕەکەم، خەریك بوو بەهیلاك بچم ئەگەر تۆ بە لا إله إلاّ الله فریام نەکەوتبایت، ئەی کوڕەکەم بەڕاستی تۆ وەسیەتەکەی منت بەجێ گەیاند[٤٥].

إبن أبی الدّنیا باسدەکات، لە تماضر کچی سهل خێزانی أیوب کوڕی عیینە دەڵێت: سفیان کوڕی عیینەم لە خەودا بینی، ووتی: خودای گەورە پاداشتی چاکەی أیوبی برام بداتەوە، بەڕاستی زۆر سەردانم دەکات کەوا ئەمڕۆش لەلام بوو، جا أیوب ووتی: بەڵێ ئەمڕۆ چوومە گۆڕستان چوومە لای گۆڕەکەی[٤٦].

(٤٤) أحوال القبور: ٤٩.

(٤٥) المنامات: ٣٠.

(٤٦) أحوال القبور: ٢٠٤.

له عماد کوڕی سلمة دەگێڕدرێتەوە، له ثابت، ئەویش له شهر کوڕی حوشب کـەوا الصعب کوڕی جثامةو عوف کوڕی مالك برا بوون، صعب به عـەوفی ووت: براکـەم هەر یەکێکمان پێش ئەویتر مرد با ئەوی دیکه بێته لای‌و چـاودێری بێـت، ووتـی: ئایا ئەمه دەبێت؟ ووتی: بەڵێ، جا صعب مرد، عەوف له خـەودا بـینی وەك ئـەو وابوو بچێته لای، ووتی: ووتم: ئەی براکەم، ووتی: بەڵێ، ووتم: چیتان لێکرا؟ ووتـی پاش نارەحەتی‌و گرفتێکی زۆر لێمان خۆشبوو، ووتـی: جـا پارچـەیەکی ڕەشـم لـە گەردنی دیت، ووتم: ئەی بـرا ئـەوە چیـە؟ ووتـی: دە دینـارم لـە فلانـە جوولەکـە وەرگرتبوو، وا له گیرفانمدایه بڕۆ بیدەرێ، بزانە براکـەم هـەر شـتێك ڕووی دابێـت لـەناو بنەماڵەکـەم پـاش مـردنم ئـیللا هەواڵەکـەی بـەمن گەیـشتووە هـەتاکو پشیلەیەکمان هەبوو لەو ڕۆژانە مردووە، بزانە کچێکم هەیە پاش شەش ڕۆژی دیکە دەمرێت بڕۆ ئامۆژگاری چاکەی بکە.

جا کاتێك ئەمانـە هاتـەدی ووتم: ئەمـە تـەنها فێرکارێـك هەیـە، چـوومە لای خێزانەکەی، ووتیان: بەخێر بێیت عەوف ئاوا بەم شێوە وازتان لە براکەتان هێنـاوە؟ بۆچی نزیکمان نەکەوتوویتیەوە لەوەتەی صعب مـردووە ووتـی: بیـانووم هێنایـەوە وەکو خەڵکی، جا سەیری هەگبەکەیم کردوو هێنامە خوارەوە ئەوەی تیای بوو دەرم هێنا، جا پێچراوە یاخود توورەگەیـەکم بـینی کـەوا دینارەکـانی تێـدابوو، ئینجـا بەدوای جوولەکەکەدا گەڕام، پێم ووت: ئایا تۆ هیچ شتێکت لەسەر صعب هەیـە؟ جوولەکەکە ووتی: خوا ڕەحم بە صعب بکات ئەو لـە هاوڕێکـانی پێغەمبـەرﷺ بوو ئەمە بۆ ئەوە، ووتم: پێم بڵێ، ووتی: بەڵێ، دە دینارم پێی دابوو، جـا پارەکـەم گەڕاندەوە بۆ ئەو، ووتی: سوێند بەخوا ئەمەش لە پیاو ماقووڵی‌و پیاوچاکی ئـەوە، ووتی: ووتم: ئەوە یەکێکیان.

ووتی: جا ووتم: ئایا هیچ ڕووداوێك هەیـە لـەناو ئێـوە لـەپاش مردنـی صـعب ڕوویدابێت؟ ووتیان: بەڵێ، ئەمە لەناو ئێمە ڕوویداوە، وە ئەمەش ڕوویداوە، ووتی:

ووتم: باسی بکەن، ووتیان: بەڵێ پشیلەیەك لەو ڕۆژانە مرد، جا ووتم: ئەمە دووەمیان.

ووتم: کوا کچی براکەم؟ ووتیان: یاریدەکات، جا چوومە لای و دەستم بەسەری داهێنا، کەوا ئەو تای لێبوو حاڵی زۆر شپرزە بوو، ئینجا ووتم: ئامۆژگاریم کرد بە کاری چاکە، جا پاش شەش ڕۆژکچەکە وەفاتی کرد[٤٧].

ئەمەش لە زیرەکی و تێگەیشتنی عەوفە﷬، کە ئەو لە سەحابەکان بوو لە کاتێکدا وەسیەتی الصعب کوڕی جثامەتی جێ بەجێ کرد لەپاش مردنی، جا ڕاستی و دروستی قسەکەی ئەوی زانی سەبارەت بەو دە دینارەی کە صعب پێی گووت کەوا لە گیرفانی دایە، پاشان پرسیاری لە جوولەکەکە کرد، ئەمەش هاوشێوە بوو لەگەڵ ئەو خەونەی کە بینی بووی، ئینجا عەوف دروستی کارەکەی یەکلایی کردەوە، جا پارەکەی دا بە جوولەکەکە، ئەمەش تێگەیشتنێکە کە شایانی تێگەیشتووترین خەڵکە، و زاناترینیان، ئەمانە سەحابەکانی پێغەمبەرن ﷺ، ڕەنگە زۆربەی ئەوانەی لەپاش ئەواندا دێن ئینکاری ئەوە دەکەن و دەڵێن: چۆن دروستە بۆ عەوف کەوا ئەو پارانە بگەڕێنێتەوە بۆ جوولەکەیەك کە لە خەودا بینیوویەتی لە کاتێکدا صعب ئەو پارانەی بە هەتیوەکانی و ماڵ و منداڵەکانی خۆی بەجێ هێشتووە؟ وە هاوشێوەی ئەم تێگەیشتن و شارەزایی یە کەوا خودای گەورە تایبەتی کردووە بۆ ئەوان جگە لە خەڵك چیرۆکی ثابت کوڕی قەیس کوڕی شماس، کەوا عومەر کوڕی عبدالبر و هەندێکی تر باس دەکات، أبو عمر دەڵێت: عبدالوارث کوڕی سفیان بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە قاسم کوڕی أصبغ، ئەویش لە أبو الزنباع روح بن الفرج، ئەویش لە سعید کوڕی عفیر و عبدالعزیز کوڕی یحیی المدنی، ئەوانیش لە مالك کوڕی ئەنەس، ئەویش لە ثابت کوڕی قەیس کوڕی شماس: کەوا پێغەمبەر ﷺ

---

(٤٧) شرح الصدور: ٣٥٢.

پێی فـەرمووە: (يَـا ثَابْـت، أمـا تَرضـى أنْ تَعـيش حَمِـيداً وَتَقتـل شَـهِيداً وَتَـدخُل الجَنَّة؟).قال مالك: فَقتلَ ثابت بن قيس يوم تاقيامة شهيداً واتە: (ئەی ثابـت، ئايـا ڕازی نابيت ژيانێكی سـەربەرزو سوپاسـگوزار بـژيتو بەشـەهيدی بمريـتو بـچيتە بەهەشت؟) مالك ووتی: جا ثابـت كوڕی قەيس لە (يوم اليمامـة) ئـەو ڕۆژەی خـوا ويستی لەسەر بوو شەهيد كرا.

أبو عمر دەڵێت: وا هيشام كوڕی عمـار ڕيوايـەتی كـردووە، ئـەويش لـە صـدقة كوڕی خالد، دەڵێت عبدالرحمن كوڕی يزيد كـوڕی جـابر بۆمـانی گێڕايـەوە ووتـی: عطاء الخراسانی بۆمی گێڕايەودو ووتی: كچی ثابت كوڕی قەيس كـوڕی شمـاس بـۆ منی گێڕايەوە، ووتی: كاتێك ئەم ئايەتە دابەزی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّـذِينَ آمَنُـوا لَـا تَرْفَعُـوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ﴾ {الحجرات: ٢}

واتــە: (ئــەی ئــەو كەســانەی باوەڕتــان هێنــاوە، دەنگتــان بەســەر دەنگــی پێغەمبەرﷺ بەرز مەكەنەوە لەكاتی گفتو گـۆدا)، بـاوكی هاتـەوە ماڵەكـەی خۆی، جا دەرگای لەسەر خۆی قەپات كرد، لەوكاتەدا پێغەمبەرﷺ پێـی زانـی، بەدوايدا ناردیو لەم بارەيەوە پرسياری لێكرد، ووتی: مـن پيـاوێكم دەنگـم بـەرزو گەورەيە دەترسم كارو كردەوەكانم بە فيڕۆ بـڕوات، جـا پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: (لَسْت فِيهِم بَل تعيِش بِخَير وَتَمُوت بِخَير). واتە: (تـۆ لـەوان نيـت بـەڵكو بـەخێرو چاكە دەژيتو بە خێرو چاكەش دەمريت).

هەروەها كچی ثابت كوڕی قەيس كوڕی شماس دەڵێت: پاشان خودای گەورە ئـەم ئايەتەی دابەزانـد: ﴿إِنَّ اللَّـهَ لَـا يُحِبُّ كُـلَّ مُخْتَـالٍ فَخُـورٍ﴾ {لقمـان: ١٨} واتـە: (بەڕاستی خوا ئەو كەسانەی خۆش ناوێت كە خۆ هەڵكێشو فەخر فرۆشو فيزاوين) جا دەرگای لەسەر خۆی پێوەدا، جا دەستی بە گريان كرد، خۆی لە پێغەمبەرﷺ وون كرد، ئينجا پێغەمبەرﷺ بەدوايـدا نـاردیو هـەواڵی پرسـی، ووتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا، من جوانيم خۆش دەوێت، و حەز دەكـەم خـۆم لـەناو قەومەكـەم

وونکەم، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لَسْتَ مِنهُم بَل تعيش حَميداً، وَتقتل شَهيداً، وَتدخل الجَنَّة) [٤٨]. واتە: (تۆ لەوان نیت بەڵکو بە ژیانێکی گەورەو سوپاسگوزار دەژیت، و بە شەهیدی دەمریت، ودەچیتە بەهەشت).

هەروەها کچی ثابت دەڵێت: جا کاتێك (یوم الیمامە) بوو باوکم لەگەڵ خالدی کوڕی وەلید دەرچوو بۆ موسەیلەمە، کاتێك پێی گەیشتن و بۆیان دەرکەوت ثابت و سالم کە خاوەنی أبو حذیفة بوون ووتیان: ئەمە چییە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ شەڕمان دەکرد. پاشان هەریەکەیان چاڵێکی لێدا، ئینجا خۆیان جێگیر کرد بەشەڕ هاتن تاوەکو کوژران، ئەو ڕۆژە لەلای ثابت قەڵغانێکی بەنرخ هەبوو، پیاوێك لە موسڵمانان نووست لە خەویدا ثابت دێتە لای، پێی ووت: ڕێنماییت دەکەم بە وەسیەتێك، نەکەیت بڵێیت ئەوە خەونە، لەبیری نەکەیت، کاتێك من کوژرام پیاوێك لە موسڵمانان بەلامدا تێپەڕی، قەڵغانەکەی منی برد، ماڵەکەی لە دووری خەڵکە، لەلای ماڵەکەی ئەسپێکی لێیە بە گوریسێکی گرژ بەستراوەتەوە لەوێ قەڵغانەکە داپۆشراوە، و لەسەر داپۆشراوەکەش زینێك هەیە، بڕۆ لای خالد با ئەو بەدوای قەڵغانەکەمدا بگەڕێ و بیباتەوە، و کاتێك چوویە مەدینە بڕۆ لای خەلیفەیەکی پێغەمبەرﷺ، بە مانای: أبو بكر الصديق، پیاوەکە هاتە لای خالدو پێی ڕاگەیاند، جا بەدوای قەڵغانەکەدا گەڕاو هێنایەوە، جا ئەبو بەکر باسی لە خەونەکەی کردوو وەسیەتەکەی بە دروست داناو ووتی: هیچ کەسێك ناناسم وەسیەتەکەی لەپاش مردنیدا بڕیاری لەسەر بدرێت جگە لە ثابت کوڕی قەیس رضي الله عنه [٤٩]. ئەوەی ئەبو عومەر باسی کرد کۆتایی هات.

جا خالدو ئەبو بەکری صدیق و ئەو سەحابەیەی لەگەڵیدا بوو ڕێکەوتن لەسەر کارکردن بەو خەونە، وە جێبەجێ کردنی وەسیەتەکەی و سەندنەوەی قەڵغانەکە لە

---

(٤٨) الاستعاب: ١/ ١٨٣.

(٤٩) مجمع الزوائد: (٩/ ٣٢٠)، وە شرح الصدور.

دەستی ئەو کەسەی داگیری کردبوو، ئەمەش ڕەسەنترین‌و پوختترین تێگەیشتنە لە ئاین.

ئەگەر بهاتایە أبو حنيفەو أحمدو مالك ڕازیبان بە قسەی داواکراو لە هەردوو هاوسەرەکە ئەوا بەبێ ئەویتر چاك نەدەبوو ببێتە خێرو سەدەقە بۆ خێزانەکەی، ئەمەش باشترینانە، وە بێگومان خودای گەورە یاسای بۆ سنووری ئافرەت داناوە بە باوەڕهێنانی ژن‌و مێرد بەوەی لە نێوانیاندایە، ئەمەش ئاشکراترین بەڵگەیە لەسەر ڕاسگۆیی پیاوەکە.

خودای پاك‌و بێگەرد یاسای داناوە بۆ ڕازی بوونی هەردوو داواکراو لەسەر وازهێنانی مردووەکانیان ئەگەر لە سەفەردا مرد، و وەسیەتکرا بە دوو پیاوی ناموسڵمان وەك شایەت، جا میراتگرەکە بەسەر خیانەتی هەردوو وەسیەتکراوەکەدا چوو بەوەی کە ئەوا سوێند بە درۆ بە خودا دەخۆن‌و مافی ئەوان بۆ خۆیان دەگەڕێننەوە، دەبێت دوو کەسی دیکە لە خزمی نزیکی مردووەکە بێت لە جیاتی ئەوان ئامادە بکرێن کە شایەتی ئەوان لە شایەتی دوو پیاوەکەی تر ڕاست‌و دروستتر بێت، و ئەمەش خودای گەورە لە کۆتایی سوورەتی (المائدة) دایبەزاندووە، لە کۆتایی قورئانیشە کە دابەزیووە، ئەمەش سەحابەکان پەیڕەویان کردووە لە پاشان کاریان پێکردووە.

لەسەر ئەمەش کارکردنی سەرۆکێکی دادپەروەر لە دەرهێنان‌و وەرگرتنەوەی شتە دزراوەکان لە پیاوی دزو جەردە هەتا زۆر کەس هەیە ئینکاری ئەو شتە دەکات‌و پاڵپشتیان دەکات ئەگەر شتەکەیان دزی بێت.

خودای گەورە قسەی کردووە لەبارەی ئەو شایەدەی کە شایەتی داوە لە نێوان یوسفی ڕاستگۆو خێزانی عەزیزی میسر کەوا حوکمی ڕاستگۆیی یوسف‌و درۆی ژنەکەی دا لەگەڵ ئەوەش خزمی ئەوان بوون، و خودای گەورە لەم بارەیەوە ناڕەزایی

دەرنەبڕی، بەڵکو خوای گەورە قسەکانی بە بەڵگە هێناوەتەوە[٥٠]. پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە: لە پێغەمبەری خودا سلیمان کوڕی داود: کەوا حوکمی نێوان دوو ئافرەتی کرد کە هەردووکیان بانگەوازی ئەوەیان دەکرد کە ئەو منداڵە بچووکە لە مێردەکەیەتیو هی ئەوە کاتێك ووتی: (أئتُوني بالسّكِين أشَقُّ الوَلَد بَينَكما، فَقَالَتْ الكُبرى نَعم رَضيتُ بِذلِكَ لِلتسلي بِفقد إبن صَاحِبَتِها، وَقالَتْ الأُخرى: لا تَفْعَل هُوَ إبنها فَقَضى بِهِ لَها)[٥١]. واتە: (چەقۆیەکم بۆ بێنن تاوەکو منداڵەکە بکەم بە دوو پارچە لە نێوانتاندا، جا ئافرەتە گەورەکە ووتی: بەڵێ من ڕازیم بەمە بۆ دڵخۆشکردن بە لەدەستدانی کوڕی خاوەنەکەی، و ئافرەتە بچووکەکە ووتی: ئەم کارە نەکەی چونکە ئەمە کوڕی ئەوە، جا کوڕەکەی گەڕاندەوە بۆ ئافرەتە گەورەکە). ئەمە شەفەقەتو ڕەحمەتو بەزەیی یە کە دڵی ئافرەتەکە پێی هەستا کە بۆ یەکێکی تر لێداوە، وە بە زیندوویی دەمێنێتەوە، هەر ئەمەش چاوەڕوان دەکرێت.

ئەمەش باشترینو دادپەروەرترین حوکمو یاسایە، وە شەریعەتی ئیسلامیش بڕیار لەسەر ئەم جۆرە نموونەیە دەداتو شایەتی لە ڕاستیو دروستی دەدات.

مەبەستیش لە وەڵامدانەوەی ئەوانەی پرسیار دەکەن، و ئەگەر مردوو ئەو زانیاریانەی بە درێژیو بە کورتی زانی، جا زانیاریشی بە سەردانی زیندووانو سەلام کردن لێی و دوعاو پاڕانەوە لە بۆی لە پێشترو شیاو ترە.



---

(٥٠) سەیری ئایەتەکانی(٢٦,٢٧,٢٨) لەسورەتی(یوسف) بکە.

(٥١) موسلیم ڕیوایەتی کردووە(١٧٢٠).وە(مسند أحمد) ٢/٣٤٠.

## ئایا ڕۆحی مردووەکان بە یەکتر دەگەن
## وە سەردانی یەکتر دەکەن و یەکتر دەدوێنن یاخود نا؟

هەروەها ئەمەش مەسەلەیەکی پیرۆزو چارەنووسێکی گەورەیە، وەلامەکەشی لە ڕاستیدا ڕۆحەکان دوو بەشن: ڕۆحەکانی ئەشکەنجەو ئازار دەرەکان و ڕۆحەکانی بەخشندەو بەختەوەرەکان، جا ڕۆحە ئازار دەرەکان سەرقاڵو خەریکن بە خۆیان بەوەی لە ئازارو ئەشکەنجە دانو ناپرژێنە سەر هاموشۆکردنی یەکترو بە یەکتر گەیشتن، بەلام ڕۆحە شادمانو بەخشندەکان کە بەندکراو نین ئەمانە دەگەن بەیەكو یەکتر دەدوێننو سەردانی یەکتریش دەکەن هەروەك لە دونیا دەیانکرد، بەلام ئەمانە لە ئەهلی دونیا نین، و هەر ڕۆحێك لەگەڵ ئەو هاورێیەی دەبێت کە کاروکردەوەی وەك ئەو بووە، ڕۆحی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاورێی هەرە بەرزە کە خودای گەورەیە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا﴾{النساء: ٦٩}. واتە: (ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بکات، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بن (لە بەهەشتی بەریندا) کە خوا نازو نیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵو هاورێو هاودەمێکی چاكو بێ وێنەن). ئەم ژیانو کاروبارە جێگیرە لە دونیا، و لەجیهانی بەرزەخدا، لە جیهانی جەزاو پاداشت دانەوەدا، مرۆڤیش لەگەڵ ئەو کەسەیەکە لەو سێ ژیانو جیهانەدا خۆشی دەوێت.

هەروەها جەریر ڕیوایەت دەکات: لە منصور، ئەویش لە أبی الصنحی، ئەویش لە مسروق دەلێت: سەحابەکانی پێغەمبەرﷺ دەلێن: ئەی پێغەمبەری خودا لەوانەیە ئەگەر لە دونیا لێت جیابینەوە و ئەگەر مردیو بەرز بوویەوە بۆ سەروی

ئێمه جارێکی دیکه نەت بینینەوە، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا﴾{النساء: ٦٩}[٤٢].

الشعبي دەڵێت: پیاوێك لە ئەنسارەکان بە گریان هاتە لای پێغەمبەرﷺ جا فەرمووی: (ما يبكيك يا فلان؟). واتە: (ئەی فلان بۆچی دەگری؟) پیاوەکە ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەو خودایەی کە هیچ خودایەکی دیکە نیە جگە لە ئەو تۆم لە خۆشم خۆشتر دەوێی، وە من لەگەڵ ماڵو منداڵەکەم باسی تۆمان دەکردو یادمان دەکردیت بۆیە هاتوومە خزمەتت تا وەکو بت بینم، جا مردنی تۆو خۆمم بیرکەوتەوە، زانیوومە کە من لەگەڵت کۆ نابمەوە تەنها لە دونیادا نەبێت، وە تۆ لەگەڵ پێغەمبەراندا بەرز دەبیتەوە، و زانیوومە کاتێك دەچمە بەهەشت مەنزڵگایەکەم لە مەنزڵگای تۆ نزمترە، جا پێغەمبەری خوداﷺ هیچ وەڵامی نەداوە، ئەو کاتە خودای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقًا﴾{النساء: ٦٩} تاوەکو دەفەرمووێت: ﴿وَكَفَى بِاللّهِ عَلِيماً﴾ (النساء: ٧٠).

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ* ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً* فَادْخُلِي فِي عِبَادِي* وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ {الفجر: ٢٧-٣٠}. واتە: (ئەی خاوەنی دڵو دەروونی پڕ لە ئارامی، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیتو ئەویش لە تۆ ڕازیە، دە بچۆرە ریزی بەندە چاکە نازدارو بەرێزەکانمەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە) بە مانای: بچۆ بۆ لای بەندە چاکەکان و لەگەڵیاندابە، ئەمەش لەکاتی مردندا بە ڕۆح دەوترێت.

---

(٤٢) سەیری: تەفسیری قرطبي(٥/ ٢٧٢) بکە.

له چیرۆكی شەورِۆی پێغەمبەرﷺ لە حەدیسێكدا عەبدوڵلای كوڕی مسعود دەڵێت: كاتێك شەورەو بە پێغەمبەرﷺ كرا بە إبراهیمو موساو عیسا گەیشتعَلَيهِمُ السَّلَام، باسی ڕۆژی دواییان كرد، لە إبراهیم دەستیان پێكرد پرسیاریان لەو بارەیەوە لێكرد بەلاّم لەبارەی ڕۆژی دوایی هیچ زانیاری نەبوو، پاشان پرسیاریان لە موسا كرد ئەویش هیچ زانیاری لەسەری نەبوو، تاوەكو پرسیارەكەیان بردە لای عیساعَلَيهِ السَّلَام.

جا عیسا فەرمووی: خودای گەورە پەیمانی داومەتێ بە دەنگێكی نزمو لەسەرخۆ، جا باسی دەرچوونی دەجالی كرد. فەرمووی: دادەبەزمو دەیكوژم، لەوكاتە خەڵكی دەگەڕێنەوە وولاّتی خۆیان یەئجوجو مەئجوج پێشوازیان لێ دەكەن، ئەوانە لە هەموو بەرزاییو كونو كەلەبەرێكەوە دادەبەزن، بەلای هیچ ئاوێكدا تێپەڕنابن ئیللا دەیخۆنەوە، و بە لای هیچ شتێكدا تێناپەڕن ئیللا تێكی دەدەنو خراپی دەكەن، ئینجا خەڵكەكە هانا بۆ لای من دێننو منیش داوای یارمەتی لە خودای گەورە دەكەم جا دەیانفەوتێنێت، و لەبەر بۆنی پیسی ئەوان زەوی پڕ دەبێت، دیسان هاتو هاوار بۆ لای من دەهێنن جا لە خودا دەپاڕێمەوە، لەوكاتەدا خودای گەورە لە ئاسماندا بارانێك دەنێرێتو ئاوەكە لاشەكانیان هەڵدەگرێتو دەیانبات، فڕێیان دەداتە ناو دەریا، پاشان چیاكان دەتەقنەوە، زەویش وەك پێستەی خۆشكراو ڕادەخرێتو فراوان دەبێت، جا خودای گەورە پەیمانی ئەوەی پێداومو هەردەبێت، جا ڕۆژی دوایی لەلای خەڵك وەك سكپڕێكی تەواوكەر لە ئانو ساتدایە كەس نازانێت كەی لە ناكاو بۆیان دێتو لە دایك دەبێت ئایا بە شەو یان بە ڕۆژ دەبێت. الحاكم وە البيهقي باسیان كردووە[٥٣].

---

(٥٣) سەیری: المستدرك (٢/ ٣٨٤) بكە.

- **ئەمەش دەقێكە لە یەكتر دوواندنو گفتوگۆ كردنی ڕۆحەكان**

خودای پاكو بێگەرد هەواڵی داوە لەبارەی شەهیدەكان كەوا ئەوان زیندوونو لەلایەن خودای گەورەوە ڕزقو ڕۆزییان پێدەدرێت، و ئەوان مژدە دەدەنە ئەو كەسانەی كە هێشتا پێیان نەگەیشتوون لەدواوەی ئەواندان، ئەوانە مژدە دەدەن بە بەخشندەو چاكەیەك لەلایەن خودای گەورەوە بۆ ئەوان دانراوە، و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەیەكتر گەیشتنیان لە سێ ڕووەوە، یەكەمیان: ئەوان لەلایەن خودای گەورەوە ڕزقو ڕۆزیان پێدەدرێت، ئەگەر زیندووش بن دەبێت بەیەكتر بگەن. دووەمیان: ئەوانە بێگومان مژدە دەدەنە براكانیان بە هاتن بۆ لایانو بەیەكتر گەیشتنیان. سێ یەمیان: ووشەی مژدە بەیەكتر دەدەن لە زمانەوانیدا بەمانای ئەوانە یەك بۆ یەكتر مژدە دەنێرن وەك لەگەڵ یەكتر تێكەڵ بوون.

**هەروەها لەم بارەیەوە زۆر قسە كراوە...**

جا لەوانە: كەوا صالح كوڕی بشیر باسیكردووە، دەڵێت: لەپاش مردنی عطاء السلمي لەخەودا بینیم، پێم ووت: خوا ڕەحمت پێ بكات لە دونیادا هەردەم خەمبار بوویت، جا ووتی: سوێند بەخوا لێرەدا پاداشتەكەم بە خۆشیو شادمانیەكی نەبڕاوەیە، جا پێم ووت: تۆ لە چ پلەو پایەیەك دایت؟ ووتی: لەگەڵ ئەو كەسانەدام كە خودای گەورە نازو نیعمەتی ڕژاندووە بە سەریاندا لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاكاندا[٥٤].

وە عەبدوللای كوڕی المبارك دەڵێت: (سفيان الثوري)م لە خەودا بینی، پێم ووت: خودای گەورە چی لێكردی؟ ووتی: گەیشتم بە محمدو كۆمەڵەكەی[٥٥].

صخر كوڕی ڕاشد دەڵێت: لە پاش مردنی عبدالله كوڕی المبارك لە خەودا بینیمو پێم ووت: ئایا تۆ نەمردوویت؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئەی خودای گەورە چی لێكردی؟

---

(٥٤) المنامات ژمارە (٥٦)، وە سەیری: صفة الصفوة (٣/ ٣٣٠) بكە.

(٥٥) المنامات ژمارە (٤٥).

ووتی: خودای گەورە لێم خۆش بوو لێخۆشبوونێك کە هەموو تاوانێکی دەورە داوە. ووتم: ئەی سفیان الثوري؟ ووتی: بەخ بەخ ئەو لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خودای گەورە نازو نیعمەتی بەسەر ڕژاندوون لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاکان، ئەوانە هاوەڵو هاوڕێو هاودەمی چاكو بێ وێنەن[٥٦].

إبن أبی الدنیا لە حەدیسێکی حماد کوڕی زیت باس دەکات، لە هشام کوڕی حسان، ئەویش لە حفصەی کچی ڕاشد دەڵێت: مروان المحلمی دراوسێی من بوو، کە ئەو قازییەکی تێگەیشتوو بوو، حفصە ووتی: جا مرد لە ڕووخساریدا خەمو خەفەتێکی زۆر دیار بوو،

ووتی: جا لە خەودا بینیم، ووتم: ئەی باوکی عبداللە خودای گەورە چی لێکردی؟ ووتی: منی خستە بەهەشت، ووتم: پاشان چیتر؟ ووتی: پاشان بەرز بوومەوە بۆ لای هاوەڵە بەڕێزەکان، ووتم: پاشان چیتر؟ ووتی: پاشان بەرز بوومەوە بۆ لای هاوەڵە نزیکەکان، ووتم: لە براکانت کێت دیت؟ ووتی: الحسن وإبن سیرینو میمون کوڕی سیاهم بینی.

حماد دەڵێت: هشام کوڕی حسام ووتی: دایکی عبداللە بۆی گێڕامەوە، کە ئەو لە باشترین ئافرەتانی خەڵکی بەسرە بوو ووتی: کاتێ نووستم لە خەودا چوومە مەنزڵگایەکی خۆشو چاك، پاشان چوومە ناو ڕەزو بێستانێك، ئەوەی بە بیرم دێت ماشاء اللە جێگایەکی خۆش بوو، پیاوێکم بینی لەسەر سیسەمێکی زێڕ ڕاکشابوو وە لە دەورەیدا کەنیزەکی خزمەتکار هەبوو کە پەرداغو پیاڵەیان بە دەستەوە بوو، دایکی عبداللە ووتی: بەڕاستی من زۆر سەرم سوڕما لەو شتە چاکەی کە بینیم جا ووتیان: ئەمە مروان المحلمی پێشوازی لێکردم، جا ڕاستبووەوەو لەسەر سیسەمەکەی دانیشت، دایکی عبداللە ووتی: لە خەوەکەمدا هەڵسام هەر لەو سەعاتەدا بینیم جەنازەکەی مروان بە بەردەرگاکەمدا تێپەڕی.

(٥٦) سەرچاوەی پێشوو، ژمارە (٦٣).

لەهەندێ سوننەتی دروست بە ڕاشکاوانە باس لە بەیەکگەیشتنی ڕۆحەکانو یەکتر ناسینیان دەکات. إبن أبی الدنیا دەڵێت: محمد کوڕی عبداللە کوڕی بزیغ بۆی گێڕامەوە، کەوا فضیل کوڕی سلیمان النمیری خەبەری پێدام، ئەویش لە یحیی کوڕی عبدالرحمن کوڕی أبی لبیبە، ئەویش لە باپیریەوە ووتی: کاتێك بشیر کوڕی البراء کوڕی معمور کۆچی دوایی کرد دایکی بشیر زۆر دڵتەنگو خەمبار بوو، جا ووتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هێشتاش لە (بني سلمة) خەڵکی دەمرێتو لەناودەچێت، جا ئایا مردووەکان یەکتر دەناسن؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (نَعم وَالذي نَفسي بيَدِهِ يا أم بشير إنَّهم ليتعارفونَ كما تتعارَف الطير في رؤوس الشجرة) واتە: (بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەی دایکی بشیر ئەوان یەکتر دەناسن هەروەك چۆن باڵندە لەسەر دارو درەخت یەکتر دەناسن). جا دایکی بشیر دەڵێت: ئەی فلان، سەلامت لێ بێ، جا دەڵێ: سەلام لە تۆش بێت، ئینجا دایکی بشیر دەڵێت: سەلام بۆ بشیر بنێرە(٥٧).

إبن أبی الدنیا لە حەدیسێکی سفیاندا باس دەکات، ئەویش لە عمرو کوڕی دینار، ئەویش لە عبید کوڕی عمیر دەڵێت: ئەهلی گۆڕستان قسە دەربارەی یەکتر دەکەن، جا ئەگەر مردوویان بۆ هات دەڵێن: فلان چی کردووە؟ جا دەڵێت: صالح، فلان چی کردووە؟ ئەوی دیکە دەڵێت: صالح، فلان چی کردووە؟ دەڵێت: ئایا بۆلای ئێوە نەهاتووە؟ یاخود بە پێش ئێوە نەکەوتووە؟ دەڵێت: نەخێر، جا دەڵێت: إنَّا لله وَإنَّا إلَيهِ راجِعون، بە ڕێگایەکدا ڕۆیشتووە جگە لە ڕێگاو بەرنامەی ئێمە(٥٨).

هەروەها صالح المری دەڵێت: پێیان ڕاگەیاندووم کەوا لە کاتی مردندا ڕۆحەکان بەیەکتر دەگەن، جا ڕۆحی مردووەکان بەو ڕۆحە دەڵێت کە لە لاشەکەی دێتە دەرەوە: ئایا جێگاکەت چۆنە؟ ئایا لە چ لاشەیەکدا بوویت لە لاشەیەکی پاكو

(٥٧) المنامات: ژمارە (١٤)، وشرح الصدور: (١٣٣).

(٥٨) شرح الصدور: ١٣٥.

خاوێن یاخود لە لاشەیەکی پیس دابوویت؟ پاشان دەگریێت تاوەکو گریان بەسەریدا زاڵ دەبێت[٥٩].

هەروەها عبید کوڕی عمیر دەڵێت: کاتێك مردوویەك دەمرێت بە ڕۆحەکان دەگات هەواڵی لێ دەپرسن هەروەك چۆن خەڵکی پرسیارو هەواڵ لە سوار دەکات فلان چی لێهاتووە؟ جا ئەگەر ووتی: مردووە، و نەهاتۆتە لایان، دەڵێن: ئەو چۆتە دۆزەخ.

هەروەها سعید کوڕی المسیب دەڵێت: ئەگەر پیاوێك مرد کوڕەکەی پێشوازی لێدەکات هەروەك چۆن کەسێکی وون و نادیار پێشوازی لێدەکرێت[٦٠].

دیسان عبید کوڕی عمیر دەڵێت: ئەگەر من نائومێد بووم لە پێکگەیشتنی ئەو کەسەی لە بنەماڵەکەم مردووە ئەوا خەم و خەفەت هۆگرم دەبێت لەکاتی مردندا[٦١].

هەروەها معاویە کوڕی یحیی دەگێڕێتەوە: لە عبداللە ی کوڕی سلمە، کەوا أبا رهم السمعی بۆی گێڕاوەتەوە، ئەویش أبا أیوب الأنصاري بۆی گێڕاوەتەوە: کەوا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إنَّ نَفس المؤمن إذا قبِضت تلقَاها أهْل الرَّحمة مِن عِندَ الله كما يَلتَقِي البشير في الدّنيا، فَيَقولون: انظروا أخاكم حتى يستريح فَإنّهُ كانَ في كَرب شَديد، فَيَسأُلونهُ: ماذا فَعَلَ فلان؟ وَماذا فَعلت فلانة؟ وَهَل تَزَوجت فلانة؟ ماذا سَأَلوهُ عَنْ رجل ماتَ قَبلهُ قالَ: إنَّهُ ماتَ قَبلي، قالُوا: إنَّا لله وَإنَّا إليهِ راجِعون ذُهب به إلى أمه الهاوية فَبِئست الأم وَبِئست المربية)[٦٢].

واتە: (کاتێك ڕۆحی ئیماندار دەکێشرێت ئەوا لەلایەن پەروەردگارەوە دەگاتە ئەهلی ڕەحمەت هەروەك لە دونیادا بە یەکتر دەگەن، جا دەڵێن: سەیری براکەتان بکەن و

(٥٩) المنامات: ژمارە (٦٠).

(٦٠) سەرچاوەی پێشوو: ژمارە (١٥).

(٦١) شرح الصدور: ١٣٦.

(٦٢) سەرچاوەی پێشوو: ١٣٣، وە سەیری: مجمع الزوائد: (٢/ ٣٢٧) بکە.

ئاگاتان لێی بێت تا وەکو پشوو دەدات چونکە ئەو لە ناخۆشیەکی زۆر توند دابوو، جا پرسیاری لێ دەکەن: فلان کەس چی لێهاتووە؟ و فلانە ئافرەت چی لێهاتووە؟ ئایا فلانە کەس شووی کردووە؟ ئەگەر پرسیاری لێبکەن لەبارەی پیاوێك کە لە پێش ئەودا مردووە دەڵێت: ئەو لە پێش مندا مرد، جا دەڵێت: إنَّا لله وَإنَّا إليهِ راجِعُون کە ئەو چۆوەتە جێگایەکی ناخۆش ئەو کاتە دایکی دڵتەنگ دەبێت و بەخێوکەرەکەشی دڵتەنگ دەبێت).

هەروەها لە حەدیسێکدا یحیی کوڕی بسطام گێڕاویەتیەوە، ئەویش دەڵێت مسمع کوڕی عاصم بۆ منی گێڕاوەتەوە: پاش دوو ساڵ لە مردنی عاصم الجحدریم لەخەودا بینی، پێم ووت: ئایا تۆ نەمردوویت؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئێستا تۆ لە کوێی؟ ووتی: سوێند بە خوا لە باخچەیەکم لە باخچەکانی بەهەشت منو یەکێك لە هاوڕێکانم، هەموو شەوی هەینی کۆ دەبینەوەو لەگەڵ بکر کوڕی عبدالله المزنی گفتوگۆ دەکەینو پێك دەگەینو هەواڵی ئێوە دەپرسین، ووتم: ئایا لاشەکانتان یاخود ڕۆحەکانتان؟ ووتی: ئەی هاوار لاشەکانمان نەماوە بەڵکو ڕۆحەکان بەیەکتر دەگەن[٦٣].



## ئایا ڕۆحی زیندووەکان و ڕۆحی مردووەکان بەیەکتر دەگەن یاخود نا؟

شایەتو بەڵگەکانی ئەو مەسەلەیە زیاترە لەوەی کەوا تەنها خودای گەورە هەژماری کردووە. و هەستی ڕاستەقینە لە دادپەروەرترین شایەتی دانەکانە، جا ڕۆحی زیندووەکان بە ڕۆحی مردووەکان دەگات هەروەك ڕۆحی زیندووەکان بە یەکتر دەگەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ

(٦٣) ئەم باسە لە سەرەتای کاروباری یەکەم باسکراوە.

فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ {الزمر: ٤٢} واتە: (هەر خوایە کە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش کە نەمرد لە خەوەکەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە، جا ئەو کەسەی خوا بڕیاری مردنی دابێت ڕۆحەکەی دەگرێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئەو کەسەش کە ڕۆژی تەواو نەبووبێت دەینێرێتەوە بۆی تا کاتێکی دیاریکراو، بەڕاستی لەو دیاردانەدا چەندەها بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کە تێفکرنو بیرکەنەوە).

أبو عبدالله کوڕی مندە دەڵێت: أحمد کوڕی محمد کوڕی إبراهیم بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە عبدالله کوڕی حسین الحراني، ئەویش لە باپیری أحمد کوڕی أبي شعیب، ئەویش لە موسی کوڕی أعین، ئەویش لە مطرف، ئەویش لە جعفر کوڕی أبي المغیرة، ئەویش لە سعید کوڕی جبیر، ئەویش لە إبن عباس لەبارەی ئەم ئایەتەوە ووتی: پێم ڕاگەیاندراوە لەکاتی نووستندا ڕۆحەکانی زیندوو مردووەکان بەیەك دەگەن، لە نێوان خۆیاندا پرسیار لە یەکتر دەکەن، جا خودای گەورە ڕۆحی مردووەکان دەگرێت، و ڕۆحی زیندووەکانیش دەنێرێتەوە لاشەکانیان[٦٤].

لە تەفسیرەکەیدا إبن أبي حاتم دەڵێت: عبدالله ی کوڕی سلیمان بۆ ئێمەی گێڕایەوە، ئەویش لە الحسین، ئەویش لە عامر، ئەویش لە أسباط، ئەویش لە السدی لەبارەی ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا﴾ {الزمر: ٤٢}. واتە: (ئەو گیانەش کە نەمرد لە خەوەکەیدا)، دەڵێت: لە خەوەکەیدا دەیمرێنێت جا ڕۆحی زیندو و مردووەکان سەردانی یەکتر دەکەنو خۆیان بە یەکتر دەناسێنن، ووتی: جا ڕۆحی زیندووەکە دەگەڕێتەوە لاشەکەی لە دونیادا تا وەکو ڕۆژی تەواو

(٦٤) شرح الصدور: ٣٥١.

دەبێت، وە ڕۆحی مردووەکەش دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی جا خوای گەورە بەندی دەکات نایەڵێت بگەڕێتەوە[٦٥].

ئەمەش یەکێکە لەو فەرموودەیەی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، یەکەمیان ئەوەیە گرتنی ڕۆحەکە هەر کەسێك دەمرێت بە مردنێکی ئاسایی، و ناردنەوەی ڕۆحەکەش بۆ ئەو کەسەی دەمرێت بە مردنێکی خەوتوو، مانا لەسەر ئەو فەرموودەیەش: کەوا ڕۆحی مردووەکە دەمرێت جا خودای گەورە دەیگرێتو نایگەڕێنێتەوە بۆ لاشەکەی پێش ڕۆژی قیامەت، بەڵام ڕۆحی خەوتوو دەمرێت پاشان دەنێردرێتەوە بۆ لاشەکەی تا ماوەیەکی دیکە، ئینجا بە مردنێکی تر دەمرێت.

فەرموودەی دووەم لە ئایەتەکەدا: گرتنو ناردنەوەی ڕۆحەکە لە ئایەتەکە هەردووکیان دەمرێت بە مردنێکی خەوتوو، جا ئەو کەسەی کاتو ڕۆژەکەی تەواو کردبێت ئەوا ڕۆحەکەی دەگیرێتو ئەوکاتە ناگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی، بەڵام ئەو کەسەی کاتو ڕۆژەکەی تەواو نەکردبێت ئەوا ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی تا وەکو تەواوی دەکات، و شێخی ئیسلام ئەم فەرموودەیەی هەڵبژاردووە، دەڵێت: قورئانو سوننە بەڵگەیە بەسەریدا، دەڵێت: خودای پاكو بێگەرد باسی گرتنی ئەو ڕۆحەی کردووە، کەوا بە مردنێکی خەوتوو دەمرێت، بەڵام ئەو ڕۆحەی بە مردنێکی ئاسایی دەمرێت وەسفی ئەم جۆرەی نەکردووە بە گرتنو ناردنەوەی ڕۆحەکە، بەڵکو ئەوە بەشی سێ یەمە.

ئەوەی پەسند دەکرێت ئەوا فەرموودەی یەکەمە، چونکە خودای گەورە هەواڵی داوە بە دوو مردن: مردنی گەورە ئەویش مردنی ئاساییەو مردنی بچووك ئەمە مردنی خەوتنە، ڕۆحەکانیش دابەش دەکرێن بۆ دوو بەش: بەشێکی مردن بەسەریدا هاتو کۆتایی پێهات ئەوا ڕۆحەکەی لەلای خۆی دەگرێت، ئەوەش کەوا بە مردنێکی ئاسایی دەمرێت، و بەشێکیشی هێشتا ئەجەلەکەی ماوە بۆیە ڕۆحەکەی

(٦٥) شرح الصدور: ٣٥١.

دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی بۆ تەواوکردنی ئەجەلو وادەی خۆی، بۆیە خودای پاكو بێگەرد حوکمی گرتنو گەڕاندنەوەی بۆ هەردوو مردنەکە داناوە کە یەکەمین جار باسکرا: جا ئەوە گرتنو بەند کردنە، ئەمەش ڕەوانەکراوە یاخود گەڕاندنەوەیە، و هەواڵی داوە ئەوەی کە نەمرد ئەمەیان مردووە لە خەوتنی دا، بێگومان ئەگەر مردنی خەو دابەش بکرابا بۆ دوو بەش مەرگی مردنی ئاسایی و مردنی خەو ئەوا خودای گەورە نەیدەفەرموو: ﴿وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا﴾ {الزمر: ٤٢}. چونکە هەرکەسێك گیانی دەرچێت دەمرێت، بۆیە خوای گەورە بێ گومان هەواڵی داوە ئەو نەمردووە، جا چۆن پاش ئەمە دەفەرمووێت: ﴿فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ﴾ {الزمر: ٤٢}. واتە: (جا ئەو کەسەی خوا بڕیاری مردنی دابێت ڕۆحەکەی دەگرێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی).

بۆ ئەو کەسەی پشتگیری ئەم بۆچوونە دەکات پێویستە بڵێت: کە ئەم فەرموودەیە: ﴿فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ﴾ {الزمر: ٤٢}. پاشان ئەوەی دەیمرێنێت بە خەوێکی مردووانە بێگومان ئەمە خودایە یەکەمجار دەیمرێنێت بە خەوێکی مردووانە، پاش ئەمە مردن بەسەریدا زاڵ دەبێت، وە بۆ لێکۆڵینەوەش ئایەتەکە بە دوو جۆر لێکدەدرێتەوە، چونکە خودای گەورە باسی دوو مردن دەکات: مردنی گیان دەرچوون مردنی خەوتن، و باسی گرتنی مردنی گیان دەرچوون دەکاتو ناردنو گەڕاندنەوەی ئەوی دیکەشیان، زانراویشە کەوا خودای گەورە ڕۆحی هەموو کەسێك دەگرێت ئەگەر مردنی ئاسایی بێت لە خەودا یاخود لە هەستانەوەدا، ناردنو گەڕاندنەوەی ڕۆح بۆ ئەو کەسەی نەمردووە، جا دەفەرمووێت: (اللّهُ يَتَوَفَّى الأَنْفُسَ حِينَ مَوتِها). واتە: (هەر خوایە کە گیانەکان دەکێشێت لە کاتی مردنیاندا). هەر خۆی کاردەکات بەوەی هەر کەسێك مرد لە هۆشیاریو هەستانەوەدا هەر کەسێکیش مرد لە خەوەکەیدا.

بێگومان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەیەکگەیشتنی ڕۆحی زیندوو مردووەکان کەوا زیندوو مردووەکە لە خەوەکەیدا دەبینێت، زانیاری‌و هەواڵ دەداتە زیندووەکە کەوا هیچی لێ نازانێت، هەواڵی لەناکاوو بەرێکەوتی بۆ دەهێنێت، هەروەك لە ڕابردوو وله داهاتووشدا هەواڵ دەدات، ڕەنگە خەبەر بدات بە پارەو پولێك کە لە جێگایەکدا شاردوویەتیەوە جگە لەو کەس پێی نەزانێت، لەوانەشە خەبەر بدات بە قەرزێك لەسەری، شایەدی‌و بەڵگەش لەمانە باسکراوە.

هەروەها ڕاگەیەندراوە لەمەدا کەوا مردووەکە هەواڵی کارێك دەدات هیچ کەسێك لەم جیهانەدا پێی نەزانێت، ئەمەش ڕاگەیاندراوە کە هەواڵ دەدات بەوەی کە تۆ دێیت بۆ لای ئێمە لەم کاتەو لەو کاتەدا و ئەمەش ڕوویداوە، لەوانەیە هەواڵی هەندێك کاروبار بۆ زیندووەکە بنێرێت جگە لەو کەس نایزانێت، چیرۆکی الصعب کوڕی جثامةو ووتەکەی عوف کوڕی مالك کەوا چی پێ ووت باسمان کرد، وە باسی چیرۆکی ثابت کوڕی قیس کوڕی شماسمان کرد دەربارەی هەواڵ پێدانی بەوەی قەڵغانەکەی بینیووە هەروەها ئەو قەرزەی لەسەریەتی.

چیرۆکی صدقە کوڕی سلیمان الجعفری، هەواڵی کوڕەکەی کە لە پاش ئەو چ کارێکی کرد، وە چیرۆکی شبیب کوڕی شیبە، و قسەی دایکی لەبارەی ئەو پاش مردنی کە ووتی: خودا پاداشتی چاکەت بە خێر بداتەوە کاتێك ئەم تەلقینەی دا لا إلهَ إلا الله، و چیرۆکی الفضل کوڕی الموفق لەگەڵ کوڕەکەی، کەوا چۆن هەواڵی پێدا لەسەر زانیاری سەردانی کردنی.

هەروەها سعید کوڕی المسیب دەڵێت: عبدالله ی کوڕی سلام‌و سلمان الفارسی پێك گەیشتن یەکێکیان بەویتری ووت: ئەگەر تۆ پێش من مردی وەرە لام‌و هەواڵم بدەرێ چیت کرد کاتێك گەیشتیت بە خودای خۆت، و ئەگەر منیش پێش تۆ مردم دێمە لات‌و هەواڵت دەدەمێ، ئەویتر ووتی: ئایا مردووەکان‌و زیندووەکان بە یەکتر دەگەن؟ ووتی: بەڵێ، ڕۆحەکانیان لە بەهەشتدا بۆ هەر کوێیەك دەیەوێت دەڕوات،

ووتی: جا فلان مرد له خەودا پێی گەیشت، ئینجا ووتی: پشت بـه خـوا ببەسـتەو مژدەت دەدەمێ من هەرگیز نەمبینیووە هیچ شـتێك وەك پـشت بەسـتن بـه خـوا باشتر بێت(٦٦).

هەروەها العباس کوڕی عبدالمطلب دەڵێت: زۆر حەزم دەکرد له خەودا عمر ببینم نەمدەبینی تەنها جارێك له نزیك شوێنێك بینیم، جا بینیم ئـارەقی لـه نێوچـاوانی خۆی دەسڕیەوە و دەیووت: ئەوە ئێستا کاتی بەتاڵی‌و حەوانەوەمە خەریك بوو ماڵم کاول دەبوو ئەگەر نەگەیشتبام به خودای بەسۆزو بەخشندە(٦٧).

کاتێك مردن زۆری بۆ شریع کوڕی عابد الشمالي هێنا، عضیف کوڕی الحارث چووە لای، ووتی: ئەی أبا الحجاج، ئەگەر توانیت پاش مـردن بێیتـه لامـان و هـەواڵمان بـدەیتێ کـەوا چـیت بینیـووە، ووتـی: ئەمـه پـەیڤێکی پەسـندە لـه لای خـاوەن تێگەیشتوانی ئاین، ووتی: زەمانێك تێپەڕی‌و نەیبینی، پاشان لەخەویدا بینی، پێی ووت: ئایا تۆ نەمردووی؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: حاڵت چۆنە؟ ووتی: خوای گـەورەمان تاوانەکانی لەسەر ئێمە هەڵگرت و هـیچ کەسـێك لـه ئێمـه لـەناو نەچـوو تـەنها (الأحراض). ووتم: الأحراض چیە؟ ووتی: ئەو کەسانەن به پەنجەکانیان ئیشارەت بـۆ شت دەکەن(٦٨).

هەروەها عبدالله کوڕی عمر کوڕی عبدالعزیز دەڵێت: لەپاش مردنـی بـاوکم لـه خەودا بینیم هەروەك له باخچەیەك دابێت، سێوی بۆمن هەڵدەدا، جا یەکەمەکەیان کوڕ بوو، ووتم: چ کارێك له هەموویان باشترە؟ ووتی: تۆبـەو ئیـستیغفارکردن ئـەی کوڕەکەم(٦٩).

(٦٦) المنامات: ژمارە (٢١)، وە شرح الصدور: ٣٠٨.

(٦٧) المنامات: ژمارە (٢٢)، وە شرح الصدور: ٣٠٨.

(٦٨) شرح الصدور: ٣٤٩.

(٦٩) سەرچاوەی پێشوو: ٣٧٢.

هەروەها مسلمەی کوڕی عبدالملك لە خەودا لەپاش مردندا عمر کوڕی عبدالعزیزی بینی، پێی ووت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، خۆزگە دەمزانی لەپاش مردنتدا حاڵت چۆنە؟ ووتی: ئەی مسلمە تا ئەمەیە، کاتەکەم بەسەر چوو سوێند بەخوا هەرگیز پشووم نەداوە تەنها ئێستا نەبێت، ووتی: ووتم: ئەی پێشەوای موسڵمانان ئێستا لە کوێیت؟ ووتی: لەگەڵ ئەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن لە (بەهەشتی عدن)م[٧٠].

صالح البرّاد دەڵێت: زرارە کوڕی أوفیم بینی لەپاش مردنیدا، ووتم: خوا ڕەحمت پێبکات چیان پێووتی و چیت ووت؟ پشتی لە من کرد، ووتم: خوای گەورە چی لێکردی؟ ووتی: سەبارەت بە بەخشندەیی و چاکەی ئەو ڕێزی لێنام و چاکەی لەگەڵدا کردم. ووتم: ئەی أبو العلاء کوڕی یزید برای مطرف لە کوێیە؟ ووتی: ئەو لە پلە بەرزەکانە، ووتم: چ کاروکردەوەیەك لەلای ئێوە باشە؟ ووتی: پشت بەستن بە خوداو بێ ئومێد نەبوون[٧١].

هەروەها مالك کوڕی دینار ووتی: مسلم کوڕی یسارم بینی لەپاش مردنیدا، سەلامم لێکرد کەچی ئەو وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوە، پێم ووت: چی قەدەغەت دەکات کەوا وەڵامی سەلام نەدەیتەوە؟ ووتی: من مردووم جا چۆن دەتوانم وەڵامی سەلامەکەت بدەمەوە؟ جا پێم ووت: لە پاش مردن بەچی گەیشتیت؟ ووتی: سوێند بە خوا بە سامناکی و بە لەرزینی توندی ئێسکەکان گەیشتم ووتی: پێم ووت: ئەی لەدوای ئەو چی بوو؟ ووتی: چی لە خودای گەورە دەبینی و ڕەچاوی دەکەیت؟ چاکەکانی لە ئێمە وەرگرت و لە تاوانەکانمان خۆش بوو، جا ئەوانەی لە دوای ئێمەن ئەوانیش دێنە لای ئێمە، ووتی: پاشان مالك هاواری کردو قیژاندی و بەلادا کەوت و

---

(٧٠) المنامات: ژمارە (٢٧).

(٧١) سەرچاوەی پێشوو: ژمارە (٢٨).

له هۆش خۆی چوو، ووتی: پاش ئەمە چەند ڕۆژێك بە نەخۆشی مایەوە، پاشان دڵی لە لێدان کەوتو مرد[(٧٢)].

سهێل برای حزم ووتی: مالیکی کوڕی دینارم بینی لە پاش مردنیدا، پـێم ووت: ئەی باوکی یحیی، خۆزگە دەمزانی بەچی پێشوازیت لە خوای گەورە کردووە؟ ووتی: بە تاوانێکی زۆر پێشوازیم لێکرد بەڵام خوای گـەورە لەبـەر بـێ گومـانیو نیـەت چاکی لەسەرمی سڕیەوە[(٧٣)].

کاتێك رجاء کوڕی حیوە مرد خێزانی عابد لە خەودا بینیو ووتی: ئـەی بـاوکی المقدام، چۆن بوون؟ ووتی: بەرەو خێر، بەڵام زۆر ترساینو ڕاچـلەکین لـە دوای ئێـوە وامانزانی قیامەت هەستا ووتی: ووتم: وە دوای ئەو؟ ووتی: جا هاوەڵانی بەهەشـت بە بارە قورسەکانیان هاتن تا وای لێهـات قەرەباڵغیـەکی زۆریـان لەبـەر دەرگاکـە دروستکرد.[(٧٤)].

هەروەها جمیل کوڕی مرَّە دەڵێت: مروق العجلی بۆ من براو هاوڕێم بوو، ڕۆژێـك پێم ووت: هەریەکێك پێش هاوڕێکەی مـرد بـا هاوڕێکـەی بێتـە لای، بـا هـەواڵی پێبدات بەوەی بەسەری هاتووە، ووتی: جا مروق مرد، خێزانەکەم لە خەویدا بـینی هاتە لای ئێمە هەروەك پێشتر دەهات، و لە دەرگایدا هەروەك پێـشتر لـە دەرگـای دەدا، خێزانەکەم ووتی: منیش هەسـتام دەرگاکـەم بـۆی کـردەوە هـەروەك پێـشتر دەمکردەوە، جا ووتم: ئەی أبا المعتمـر فـەرموو وەرە ژوورەوە بـۆ مـاڵی براکـەت، ووتی: چۆن بێمە ژوورەوە لە کاتێکدا مردنم چەشتووە، بـەڵکو هـاتووم بـۆ ئـەوەی بەجوانی پێتان بڵێم کە خودای گەورە چی لێکردم، بزانە کـەوا مـنی گێـڕا بـە لـە نزیکەکانی خۆی[(٧٥)].

---

(٧٢) المنامات: ژمارە (٣٠).

(٧٣) سەرچاوەی پێشوو: ژمارە (٣٢).

(٧٤) سەرچاوەی پێشوو: ژمارە (٣٧).

(٧٥) سەرچاوەی پێشوو: ژمارە (٣٨).

کاتێك محمد بن سيرين مرد هاوڕێکانی زۆر خەفەتبار بوون بۆی جا لە خەو بينيان لە حاڵەتێکی باش دابوو، ووتی: ئەی براکەم، من تۆم بينی زۆر دڵخۆش بووم ئەم حاڵەتە باشيەت لە چی دايە؟ ووتی: سەرووی من بە حەفتا پلە بەرز بووەوە، ووتم: بەڵکو ئێمە تۆمان بينی لەوە باشتر بوويت؟ ووتی: ئەمە بە درێژايی خەمو خەفەتەکەی بوو[٧٦].

إبن عينيه ووتی: سفيان الثوريم لە خەودا بينی، جا ووتم: وەسيەتو ڕێنمايیم بکە، ووتی: خۆت لە زانستو مەعريفەتی خەڵك کەمتر بزانە[٧٧].

هەروەها عمار کوڕی سيف دەڵێت: الحسن کوڕی صالحم لە خەودا بينی، پێم ووت: زۆر بە هيوا بووم بە گەيشتنت چيت لايە پێمان بڵێ. ووتی: مژدەت دەدەمێ هيچ شتێکم نەبينيوە چاکتربێت لە گومان چاکی خودای گەورە[٧٨].

کاتێك ضيغم کوڕی العابد مرد هەندێك لە هاوڕێکانی لە خەودا بينيان، ووتی: ئايا سەلاواتت لەسەر من نەدا؟ ووتی: کاتێك بيرم کەوتەوە تۆ بەرز بوويت، جا ووتی: ئەگەر سەلاواتت لەسەر من بدابا سوودم بۆ تۆ دەبوو[٧٩].

هەروەها کاتێك رابعة مرد ئافرەتێکی هاوڕێی لە خەويدا بينی کەوا لەسەريدا بەرگێکی درەوشاوەو تارايەك لە سوندسی لەبەرا بوو، بە جبەيەك کفن کرابوو تارايەکی ئاوريشمی پێوە بوو، جا پێی ووت: چيت کردووە کەوا بەو جبەيە کفن کراوی و ئەو تارا ئاوريشمەت بەسەرەوەيە؟ ووتی: سوێند بە خوا ئەو لەبەر منی داکەندو گۆڕی بەوەی کەوا دەيبينی لەبەرمدايە، و بەو کفنە داپۆشيم، و مۆری لەسەردا، وە بەرز کرامەوە لە بەرزاييەکان بۆ تەواوکردنی چاکەکانم تا ڕۆژی قيامەت، ووتی: پێم ووت: لەبەر ئەمەيە لە ڕۆژەکانی سەر دونيا کارت دەکرد؟ جا

---

(٧٦) المنامات: ژمارە (٤٠).

(٧٧) المنامات: ژمارە (٤٤)، وە شرح الصدور: ٢٦٨.

(٧٨) المنامات: ژمارە (٤٨).

(٧٩) المنامات: ژمارە (٥٠).

ووتی: ئەی ئەمە بەس نیە کاتێك کەرامەت‌و بەخشندەیی خوای گەورەم دەدیت بـۆ پیاوە چاکەکانی؟ ئینجا پێم ووت: ئەی عبدەی کچی أبی کلاب چی بەسـەر هـات؟ ووتی: ئەی هاوار ئەی هاوار سوێند بە خوا ئەو پێش ئێمـە کـەوت بـۆ پلـەو پایـە بەرزەکان، ووتی: ووتم: جا بەچی؟ لەگەڵ ئەوەش لەناو خەڵکیدا لـەو خـوا پەرسـتتر هەبوو؟ ووتی: ئەو زۆر بیری لە دونیا نەدەکردەوە بەوەی بـەیانی دەکاتـەوە یـاخود ئێوارە دەکاتەوە، جا ووتم: ئەی أبو مالك واتە ضیغم چی کردووە؟ ووتی: هـەرکاتێ بیەوێت سەردانی خودای گەورەو میهرەبان دەکات، ووتـی: ووتم: ئـەی بـشر کـوڕی منصور چی کردەوە؟ ووتی: بەخ بەخ خودای گەورە بەسەریدا ڕژاند بەرز بووەوە بـۆ ئەو شوێنـەی ئەو بە هیوا بوو بۆی. ووتـی: ووتم: ئامۆژگـاریم بکـە بـە کارێـك لـە خودای گەورە نزیك ببمەوە، ووتی: پێویستە زۆر یادی خودا بکەیت بێگومان لـەناو گۆڕەکەت ئاسوودە دەبیت[٨٠].

کاتێك عبدالعزیز کوڕی سلیمان العابد مـرد هەنـدێك لـە هاوڕێکـانی بینیـان پۆشاکێکی سـەوزی لەبەردا بوو، و لەسەر سەری تاجێکی مرواری هەبوو، جا ووتی: لە دووری ئێمە چۆن بوویت و تامی مردن چـۆن بـوو؟ کاروبارەکانـت چـۆن بـینی لەوێ؟ ووتی: دەربارەی مردن ئەوا پرسیار مەکە لە توندی ئێش‌و ئـازاری و خـەم‌و خەفەتی تەنها ئەو کەسەی خوای گەورە ڕەحمـی پێبکـات و ئـەو هـەموو عـەیب‌و تـاوانێکی لـە ئێمـە شـاردەوە، ئەگـەر بـە چـاکەو بـەزەیی ئـەو نەبوایـە پێـی نەدەگەیشتین[٨١].

هەروەها صالح کوڕی بشر ووتی: کاتێك عطـاء السّلمی مرد لە خەومـدا بینـیم، ووتم: ئەی باوکی محمد، ئایا تۆ لە کۆمەڵەی مردوان نیت؟ ووتی: بەڵێ، ووتم: ئـەی پاش مردن چۆن بوویت لەوێ؟ ووتی: سوێند بە خوا لەناو خێرو چاکەیەکی زۆر دام،

---

(٨٠) المنامات: ژمارە (٥١)، وە سەیری: صفة الصفوة: ٤/ ٢٩ بکە.

(٨١) المنامات: ژمارە (٥٣).

و خودای گەورە بەخشندەو لێخۆشبووە، ووتم: سوێند بە خوا تۆ لە دونیادا زۆر خەمبارو دڵتەنگ بوویت، ئینجا زەردەخەنەیەکی هاتو ووتی: سوێند بە خوا پاداشتەکەی دامەوە بە شادمانیەکی درێژو خۆشیەکی بەردەوام، ووتم: ئەی تۆ لە چ پلەو پایەیەك دایت؟ ووتی: ﴿مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـٰئِكَ رَفِيقًا﴾ {النساء: ٦٩}(٨٢). واتە: (لەگەڵ ئەو کەسانە داین لە (بەهەشتی بەریندا) کە خوا نازو نیعمەتی بەسەردا رژاندووە لە پێغەمبەرانو ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵو هاوڕێو هاودەمێکی چاكو بێ وێنەن).

هەروەها کاتێك عاصم الجدری مرد یەکێك لە خزمەکانی لە خەودا بینیان، جا ووتی: ئایا تۆ نەمردووی؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: جا تۆ لە کوێیست؟ ووتی: سوێند بەخوا من لە مێرگێکم لە مێرگەکانی بەهەشت منو یەکێك لە هاوڕێکانم، هەموو شەوانی هەینی کۆدەبینەوە و بەیانیەکەشی بۆ لای بکر کوڕی عبدالله المزنی دەچین، هەواڵی ئێوەمان دەداتێ، ووتی: ووتم: لاشەکانتان یاخود ڕۆحەکانتان؟ ووتی: ئەی هاوار لاشەکان لەناو چوون، بەڵکو ڕۆحەکان بەیەکتر دەگەن(٨٣).

مرة الهمذانی ئەوەندە سوجدەی بردبوو تاوەکو خۆڵ نێوچاوانی خوارد، جا کاتێك مرد پیاوێك لە خزمەکانی لە خەودا بینی، شوێنی سوجدەکەی هەروەك ئەستێرەیەکی درەوشاوە وابوو، جا ووتی: ئەم شوێنەوارە چیە کەوا من لە نێو چاوانی تۆ دەبینم؟ ووتی: ئەمە شوێنی سوجدەکەیە کەوا خۆڵ خواردوویەتی بە نوور داپۆشراوە، ووتی: ووتم: ئەی پلەو پایەت چیە لە دوا ڕۆژدا؟ ووتی: باشترین پلەو پایەیە، مەنزڵگایەکە کەوا کەس لێی ناگوازرێتەوەو ناشمرن(٨٤).

---

(٨٢) المنامات: ژمارە (٥٦)، وصفة الصفوة: ٣/ ٣٣٠.

(٨٣) ئەم حەدیسە پێشتر باسکراوە.

(٨٤) المنامات: ژمارە (٦٥)، وصفة الصفوة: ٣/ ٣٤.

هەروەها أبو يعقوب القاري دەڵێت: لە خەودا پیاوێکی گەنم ڕەنگی زۆر درێژم بینی و خەڵکی بەدوای دەکەوتن، ووتم: ئەمە کێ یە؟ ووتیان: ئەمە وەیسی قەرەنی یە، جا منیش بەدوای کەوتم، ووتم: خوا ڕەحمت پێبکات ڕێنماییم بکە، ڕووی خۆی لەمن گرژ کرد جا وتم: ئەی ڕێنماییکار ڕێنماییم بکە، ئینجا ڕازی بوو ڕووی خۆی دامێ، ووتی: لەکاتی خۆشەویستیدا ئارەزووی ڕەحمەتی خوا بکە، وە لە کاتی تاوانو یاخی بوونتدا ئاگاداری تۆڵەسەندنەوەی بە، هیچ کاتێك لە پاڕانەوە لێی دامەبڕە، پاشان ڕۆیشتو بەجێی هێشتم(٨٥).

هەروەها إبن السَّماك دەڵێت: مسعرم لە خەودا بینی، ووتم: چ کارو کردەوەیەك باشتر دەبینیت؟ ووتی: دانیشتن لەگەڵ ئەوانەی یادی خودا دەکەن(٨٦).

الأجلح دەڵێت: سلمەی کوڕی کهیلم لە خەودا بینی ووتم: چ کارو کردەوەیەك باشتر دەبینی؟ ووتی: هەڵسانەوە لە شەودا(٨٧).

هەروەها أبو بکر کوڕی أبی مریم دەڵێت: لەپاش مردنیدا وفاء کوڕی بشرم بینی، ووتم: ئەی وەفا چیت کرد؟ ووتی: پاش هەموو تێکۆشانو ماندووبوونێك ڕزگارم بوو، ووتم: جا چ کارو کردەوەیەکتان باشتر بینیووە؟ ووتی: گریان لە ترسی خودای عز وجل(٨٨).

اللیث کوڕی سعد: لە موسی کوڕی وردان، کەوا ئەو عبدالله ی کوڕی أبی حبیبەی بینیووە لەپاش مردنیدا، جا ووتی: چاکەو خراپەکانم پێ نیشان درا، لە چاکەکانم دا بینیم هەندێك دەنکە هەنارم لەسەر زەوی هەڵگرتەوەو خواردم، و لە خراپەکانیشم دا بینیم دوو هێڵ لە ئاوریشم لە مەندیلەکەمدا هەبوو(٨٩).

---

(٨٥) المنامات: ژمارە (٦٦).

(٨٦) المنامات: ژمارە (٦٩).

(٨٧) المنامات: ژمارە (٧٠).

(٨٨) المنامات: ژمارە (٧١).

(٨٩) المنامات: ژمارە (٧٥).

هەروەها سنيد کوڕی داود ووتی: کوڕی براکەم جویریەی کوڕی أسماء بۆی گێڕامەوە ووتی: ئێمە لە عەبادان بووین، گەنجێك لە دانیشتوانی کوفە هاتە لامان کەوا خواپەرست دیار بوو، لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا مرد، ووتم: خۆمان فێنك دەکەینەوە پاشان کەلوپەلەکانی ڕێك دەخەین، جا نووستم بینیم هەروەك لە گۆڕستاندابم، وەك گومەتێکی گەوهەر وابوو لە جوانیان دەبریقایەوە، و منیش وا تەماشای دەکەم کاتێك درزی تێکەوت، لەناویدا کەنیزەیەکی تیابوو جوانی وەکو ئەوم نەبینیووە، هاتە لای منو ووتی: سوێند بەخوا ئەی باوکی عمر، لێمانی بەند مەکە تاوەکو نیوەڕۆ، ووتی: لە ترسان بە ئاگا هاتمەوە ئینجا چووم کەلو پەلی تەرمەکەم ڕێکخست، و لەو شوێنەی گومەتەکەم بینی گۆڕێکم بۆ هەڵکەند، جا هەر لەوێم بە خاك سپارد[٩٠].

عبدالملك کوڕی یعلی الليلي ووتی: عامر کوڕی عبدقیسم لە خەودا بینی، ووتم: چ کارو کردەوەیەکت باشتر بینی؟ ووتی: هیچم ناوێت ڕووبەڕووی خودای گەورە بکەمەوە[٩١].

یزید کوڕی هارون ووتی: أبا العلاء أیوب کوڕی مسکینم لە خەودا بینی، ووتم: ئایا خودای گەورە چی لێکردی؟ ووتی: لێم خۆش بوو. ووتم: بەچی؟ ووتی: بە نوێژو ڕۆژوو، ووتم: ئایا منصوری کوڕی زازانت بینی؟ ووتی: هەیهات کۆشکی ئەومان لە دوورەوە بینی[٩٢].

یزید کوڕی نعامة ووتی: جارية بە تاعوونێکی کوشندە لەناو چوو، جا باوکی لە خەودا پێی گەیشت، پێی ووت: ئەی کچەکەم، هەواڵی ڕۆژی دواییم بدەرێ، ووتی: ئەی باوکە گیان، بەسەر کارو بارێکی مەزندا تێپەڕین دەزانین بەڵام ناتوانین کار

---

(٩٠) المنامات: ژمارە (٧٧).

(٩١) المنامات: ژمارە (٨٠).

(٩٢) المنامات: ژمارە (٨٢).

بکەین، وە ئێوە دەتوانن کار بکەن بەڵام نازانن، سوێند بە خوا، تەسبیحاتێك یان دوو تەسبیحات یاخود کرنۆشێك یان دوو کرنۆش لە لاپەڕەی کارەکانم بۆمن خۆشەویستترە لە دونیاو ئەوەی تیایەتی[٩٣].

کثیر بن مرة ووتی: لە خەوما بینیم وەك ئەوەی چووبمە ناو پلەو پایەیەکی بەرز لە بەهەشتدا و تێیدا دەسوڕامەوەو سەرم لێی سوڕدەما، و لەلایەکی مزگەوتەکە ئافرەتانم بینی، چوومە لایان سەلامم لێکردن، پاشان ووتم: ئەم پلەو پایەیەتان بەچی دەستکەوت؟ ووتیان: بە سوجدە و تەکبیر کردن[٩٤].

مزاحم مولی عمر کوڕی عبدالعزیز ووتی: لە فاطمەی کچی عبدالملك خێزانی عمر کوڕی عبدالعزیز، ووتی: شەوێك عمر کوڕی عبدالعزیز ئاگاداربووەوەو ووتی: خەوێکی زۆر سەرسامم بینی ووتی: ووتم: خۆم بە فیدات دەکەم، پێم بڵێ، جا ووتی: تاوەکو بەیانی دەکەمەوە هەواڵت پێنادەم، ووتی: کاتێك بەیانی داهات دەرچوو بۆ نوێژکردن پاشان گەڕایەوە بۆ دانیشتنەکەی، ووتی: تەنهایی ئەوم بە هەل زانی‌و چوومە لای، ووتم: ئەو خەونەم پێ بڵێ کەوا بینیت، ووتی: لە خەودا بینیم بەرز کرامەوە بۆ خاکێکی سەوزو فراوان دەتووت بەرماڵێکی سەوزە، وە کۆشکێکی سپی وەك زیوی تێدا بوو، یاخود وەك شیر وابوو، یەکێك لەو کۆشکە هاتە دەرەوە، بە بەرزترین دەنگی ووتی: کوا محمد کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب؟ کوا پێغەمبەری خوا ﷺ؟ بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێشوازی لێکرد تاوەکو چووە ناو کۆشکەکە. ووتی: پاشان یەکێکی دیکە لە کۆشکەکە هاتە دەرەوە، بانگی کرد کوا أبو بکری الصدیق؟ کوا أبی قحافة؟ جا أبو بکر پێشوازی لێکرد تاوەکو چووە ناو کۆشکەکە. پاشان یەکێکی تر هاتە دەرەوەو بانگی کرد کوا عمری کوڕی خطاب؟ جا عمر پێشوازی لێکردو تاوەکو چووە ناو کۆشکەکە. پاشان یەکێکی دیکە هاتە

(٩٣) المنامات: ژمارە (٨٦).

(٩٤) المنامات: ژمارە (٩١).

دەرەوەو بانگی کرد کوا عثمان کوڕی عفان؟ جا پێشوازی لێکرد تاوەکو چووە ناو کۆشکەکە. پاشان یەکێکی دیکە هاتە دەرەوەو بانگی کرد کوا علی کوڕی أبی طالب؟ جا پێشوازی لێکرد تاوەکو چووە ناو کۆشکەکە. پاشان یەکێکی دیکە هاتە دەرەوەو بانگی کرد کوا عمر کوڕی عبدالعزیز؟ ووتی: عمر ووتی: جا هەستام تاوەکو چوومە ناو کۆشکەکە. ووتی: بە پاڵەپەستۆ چوومە لای پێغەمبەری خواﷺ، و خەڵکێکیش لە دەوروبەری ئەودا بوو، لە دڵی خۆمدا ووتم: لە کوێ دانیشم؟ ئینجا لە تەنیشت عمر کوڕی خطاب دانیشتم، سەیرم کرد أبوبکر لە دەستە ڕاستی پێغەمبەرﷺ دانیشتووە و لەنێوان أبوبکر پیاوێك دانیشتووە، ووتم: ئەو پیاوە کێ یە لە نێوان پێغەمبەری خوداوﷺ أبوبکر دانیشتووە؟ ووتیان ئەمە عیسی کوڕی مەریەمە گوێم لە بانگکەرێك بوو بانگی کرد، لە نێوان منو نێوان ئەودا پەردەیەکی نوور هەبوو ووتی: ئەی عمر کوڕی عبدالعزیز دەست بگرە بەوەی تۆ لەسەریو جێگیرو سەقامگیربە بەوەی تۆ لەسەری، پاشان وەك ئەوەی مۆڵەت درابم بۆ هاتنە دەرەوە، لەو کۆشکە هاتمە دەرەوە، ئاوڕم لە دواوە دایەوە من عثمان کوڕی عفانم بینی دەیووت: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەوا سەری خستم، و علی کوڕی أبی طالبم بینی لە دەرەوەی کۆشکەکە بوو دەیووت: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەوا لە گوناهم خۆش بوو[٩٤].

سعید کوڕی أبو عروبە ووتی: عمری کوڕی عبدالعزیزگێڕایەوە: پێغەمبەرم بینیﷺ، أبوبکرو عمر لەلای دانیشتبوون، سەلامم کرد، و دانیشتم، لەوکاتەی دانیشتبووم علیو معاویە هاتنە ژوورەکەو دەرگاکە لەسەریان پێوەدرا، وا منیش سەیر دەکەم، ئەو خێراتر لە من چووە دەرەوەو ووتی: سوێند بەخوای کەعبە

(٩٤) المنامات: ژمارە (١٢٣).

کارەکەی بە ئەنجام گەیاند، و معاویەش خێراتر لە من هاتە دەرەوە ووتی: سوێند بەخوای کەعبە لێم خۆش بوو[٩٦].

هەروەها حماد کوڕی هاشم دەڵێت: پیاوێك هاتە لای عمری کوڕی عبدالعزیز ووتی: پێغەمبەری خوامﷺ لە خەودا بینی، أبوبکریش لە دەستە ڕاستی، و عمریش لە دەستە چەپی بوو، وە دوو پیاو ناکۆکیان لە نێواندا هەبوو لێی نزیك بوونەوە، تۆش لە نێوان دەستەکانی دانیشتبوویت، جا پێی فەرموویت: ئەی عمر ئەگەر ئیشت کرد، وەك ئەو دووانە کار بکە، وەك ئەبوبکرو عمر، جا عمر سوێندی دا بە خوا ئایا ئەو خەونەت دیووە؟ پیاوەکەش سوێندی خوارد، عمریش دەستی بە گریان کرد.

عبدالرحمن کوڕی غنم ووتی: سێ ڕۆژ دوای مردنی معاذ کوڕی جبلم بینی لەسەر ئەسپێکی ڕەش‌و سپی، لە دواوەی ئەو هەندێك پیاوی سپی کە پۆشاکی سەوزیان لەبەردابوو ئەوانیش سواری ئەسپی ڕەش‌و سپی بوون، کەوا ئەو لە پێشیاندا بوو، دەیووت: ﴿يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ* بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ﴾ {یس: ٢٦-٢٧} واتە: (خۆزگە قەومەکەم بیانزانیبایە سەرئەنجامی ئیمان چۆنەو کەوتوومەتە ناو چ نازونیعمەتێکەوە* بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگارم لێم خۆشبووەو خستمیە ڕیزی ڕیز لێگیراوانەوە). پاشان ئاوڕی لە دەستی ڕاستی‌و چەپی دایەوە، ووتی: ئەی کوڕی واحە ئەی کوڕی مظعون: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ {الزمر: ٧٤}. واتە: (سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە بەڵێنی خۆی بۆمان بردە سەرو کردینی بە خاوەنی سەرزەمینی بەهەشت‌و لەهەر شوێنێك‌و لەهەر جێیەکدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر، ئای چەندە پاداشتی تێکۆشەران‌و خەباتکاران چاك‌و پاك‌و بەنرخە). پاشان تەوقەی لەگەڵمدا کردو سەلامی لێکردم.

(٩٦) المنامات: ژمارە (١٢٤).

هەروەها قبيعەی كوڕی عقبة ووتی: لەپاش مردنیدا سفیان الثوریم لە خەودا بینی، ووتی: ئایا خودای گەورە چی لێكردی؟ ئینجا ووتی:

نَظَرْتُ إلى ربِّي عياناً فقال لي *** هَنيئاً رضايَ عنك يابن سعيد
فَقَد كنتَ قَوّاماً إذا اللّيلُ قد دجا *** بعبرةِ مَحزونٍ وقَلب عميد
فَدونكَ فاختَرْ أيَّ قصرٍ تريدهُ *** وزرني فإني منك غير بعيد

سفیان كوڕی عُيَيَنة ووتی: لەپاش مردنیدا سفیان الثوریم لـە خـەودا بـینی لـە بەهەشتدا لەسەر دارخورمایەك بۆ سەر دارێك دەفڕی، و لەسەر دارێكەوە بـۆ سـەر دارخورمایەك، كەوا دەیووت: ﴿لِمِثْلِ هَـذَا فَلْيَعْمَـلْ الْعَـامِلُونَ﴾ {الـصافات: ٦١} واتە: (دەبا ئا بۆ ئەم بەهەشتە، بـۆ ئـەم كامەرانیـە، بـۆ ئـەم نـازو نیعمەتـە بـێ سنوورە، ئەوانەی كە كارو كردەوەو كۆشش دەكەن، با بۆ ئەم دەستكەوتانە بیكەن) جا پێیان ووت: بەچی چوویە ناو بەهەشت؟ ووتی: بە تۆبـەكردنو خواپەرسـتی، بـە تۆبەكردنو خواپەرستی، پێیان ووت: ئـەی چیـان لـە كـوڕی عاصـم كـرد؟ ووتـی: نەمانبینی تەنها وەك ئەستێرەیەك نەبێت(٩٧).

شعبەی كوڕی الحجاج و مسعر كوڕی كرام دوو هاوڕێی یـەكتر بـوون، أبـو أحمـد الترمذي ووتی: لەپاش مردنیان لە خەوما بینیم ووتم: باوكی بسطام، خـوای گـەورە چی لێكردی؟ ووتی: خوای گەورە پشتیوانم بـوو وە سـەری خـستم بـەهۆی ئـەوەی هەموو كات دەمووت:

حباني إلهي في الجنان بقبّةٍ *** لها ألف بابٍ من لُجَينٍ وَجوهراً
وَقالَ لي الرحمن: يا شعبة الذي *** تبحّر في جمع العلوم فَأَكثراً
تنّعم بقربي إنني عنك ذو رضا *** وَعن عبدي القوام في الليل مسعراً
كفى مسعراً عزّاً بأن سيزورني *** وَأكشف عن وجهي الكريم لينظراً
وَهذا فعلي لي بالذين تنسّكوا *** وَلَم يألفوا في سالف الدهر منكراً

---

(٩٧) المنامات: ژمارە (٢٧٥).

أحمد كوڕی محمد اللبدی ووتی: أحمد كوڕی حنبلم لـه خـەودا بـینی، ووتم: ئـەی باوكی عبدالله، خودای گەورە چی لێكردی؟ ووتی: لێم خۆشبوو، پاشان ووتی: ئـەی أحمد: تۆ شەست قامچیت لێدام؟ ووتی: بەڵێ بەخودا، ووتی: ئەمە ڕووی مـن بـوو لێم گرژ دەكردی جا سەیریم دەكرد،

أبو بكر أحمد كوڕی محمد كوڕی الحجاج ووتی: پیاوێك لە بنەماڵەی طرسوس بۆی گێڕامەوەو ووتی: داوام كرد لە خودای گـەورە ئـەهلی گۆڕسـتان لـە خـەودا ببیـنم تاوەكو پرسیاریان لێبكەم دەربارەی أحمـد كـوڕی حنبـل كـەوا خـوای گـەورە چـی لێكردووە؟ پاش دە ساڵ لە خـەودا بینـیم وەكو ئـەوەی ئـەهلی گۆڕسـتان لەسـەر گۆڕەكانیان وەستابن، ئەوان دەست پێشخەریان كرد لـە قـسە كـردن، جـا ووتیـان: ئەمە چییە ئەوەندە لـە خـودای گـەورە داوا دەكـەیت ئێمـە لـە خـەودا ببینیـت، پرسیارمان لێ بكەیت دەربارەی پیاوێك كەوا هێشتا دانەبەزیوە لەو كاتەی لە ئێوە جیا بۆتەوە فریشتە ڕازاندوویەتەوەو ئارایشتی كردووە لەژێر درەخـتی طـوبی، أبـو محمد عبدالحق ووتی: ئەم قسەی ئەهلی گۆڕستان هەواڵێكە لە بـارەی مـەزنی پلـەو پایـەی أحمـدی كـوڕی حنبـل و بـەرزی جێگاكـەی و گـەورەیی مەنزڵگاكـەی، و نەیانتوانیووە بە تەواوی وەسفی حاڵی ئەو بكەن، دەربارەی ئـەوەی كـە ئـەو لـە چ حاڵەتێكدایە تەنها بەو مانایە نەبێت.

أبو جعفر السقاء كە هاوڕێی بشر كوڕی الحارث بوو ووتی: بشر الحافی وە معروف الكرخیم بینی كە ئەوان دەهاتن، جا ووتم: ئێوە لە كـوێن؟ ووتیـان: لـە بەهەشـتی فیردەوسین، سەردانی موسای (كليم الله) مان كرد.

عاصم الجزری ووتی: لە خەودا بینیم بە بشر كوڕی الحـارث گەیشتم، ووتم: تۆ لـە كوێیت ئەی باوكی نصر؟ ووتی: لە شوێنە هەرە بەرزەكانم، ووتم: ئەی أحمدی كـوڕی حنبل چی لێ هاتووە؟ ووتی: كاتژمێریك بەجێم هێشت لەگەڵ عبـدالوهاب الـوراق كەوا لە نێوان دەستەكانو بەزەیی خودای میهرەبان دەیانخواردو دەیانخواردەوە، پـێم

ووت: ئەی تۆ؟ ووتی: من زۆر ئارەزووم لـە خواردنەکـە نـەبوو، تـەنها حـەزم کـرد سەیری بکەم.

أبو جعفر السقاء ووتی: لەپاش مردنیدا بشر کوڕی الحارثم لە خەودا بینی، ووتم: ئەی باوکی نصر، خودای گەورە چی لێکردی؟ ووتی: بەزەیی بەمندا هاتەوەو ڕەحمی پێکردم، و پێی ووتم: ئەی بشر، ئەگەر لە دونیا یەك سوجدەت بۆ من ببردبا لەسـەر پشکۆیەك ئاگر و سوپاسگوزاریت ئەنجام نەدابا ئەوا بەندایەتی تۆم نەدەخـستە نـاو دڵو دەروونتەوە، و نیـوەی بەهەشتی بۆ ئاشکرا کردم جا بـۆ هـەر شـوێنێك بمـەوێ دەچم. و بەڵێنی پێدام لەو کەسانە خۆشبێت ئەوانەی بە دوای تەرمەکەم کەوتن، جا ووتم: ئەی أبو نصر التمار چی لێهات؟ ووتی: ئەو لەسـەرووی خەڵکەوەیـە بـەهۆی ئەو سەبرو ئارامیەی تووشی ببوو لە کارەساتو هەژاریەکەی.

عبدالحق دەڵێت: خۆزگـەی بـەو ووتەیـەی دەخواسـت: نیـوەی بەهەشـت نیـوەی نیعمەتەکەیەتی، چـونکە نیعمەتەکـەی دوو نیوەیـە، نیـوەی گیـانی یـە و نیـوەی جەستەیی یە جا یەکەم جار بە گیان لەززەت دەکەن، ئەگەر گیانەکان وویستیان بـۆ جەسـتەکەش بـچێت ئەوکاتـە نیعمـەتو لـەززەتی جەسـتەیی زیـاد دەکرێـت بـۆ گیانەکە، وە هەندێکی تر دەڵێن: نیعمەتو لەززەتی بەهەشت پلەو پایەیەکە لەسەر کارو زانست، و شانسی مرۆڤ لە کاردا باشترو دڵسۆزترە لە شانسـەکەی لە زانستدا، خودای گەورەش زاناترە.

یەکێك لە پیاوچاکان دەڵێن: أبا بکر الشبلیم لە خـەودا بـینی، وەك ئـەوە بێـت دانیشتبێت لە کـۆڕی الرصـافة لـەو شـوێنەی کـەوا لێـی دادەنیـشێت، جـا هـات پێشوازیم لێکرد کەوا جلو بەرگێکی چـاکی لەبـەردابوو، هەسـتام چـوومە لای، و سەلامم لێی کرد، و لەلای دانیشتم، پێم ووت: کێ نزیکترین هاوڕێتە بۆ تۆ؟ ووتی: ئەوانەی شێوە زارو گفتو گۆیان تەنها بۆ یادکردنەوەی خودای گەورەو میهرەبانـە،

و ئەوانەی ڕاوەستاوو چەسپاون بە مافی خـودا، و ئەوانـەی پەلـەو دەستپێـشخەری دەکەن لە ڕازی بوونی خودای مەزنو دلۆڤان.

أبو عبدالرحمن الساحلي ووتی: لەپاش مردنیدا میسرەی کوڕی سلیمم لە خـەودا بینی، پێم ووت: دووریت درێژەی کێشا، ووتی: سەفەرەکە دوورو درێژە، پـێم ووت: ئایا تۆ چیت پێشکەشی ئەو کرد؟ ووتی: نەرمو نیانی، چونکە ئێمە هـەموو کـات فەتوامان دەکرد بە نەرمو نیانی، جا ووتم: ئایا چ فەرمانێکم پێ دەکەیت؟ ووتـی : بەدوای پیاوە گەورەکان بکـەوە، و هاوڕێیـەتی پیاوچـاکان بکـە ئەمانـە لـە ئـاگر دەتپارێزن، و لە خودای گەورەش نزیکت دەخاتەوە.

أبو جعفر الضرير دەڵێت: لەپاش مردنیدا زاذانم لە خەودا بینی، پـێم ووت: خـودای گەورە چی لێ کردی؟ دەستی پێکردو ووتی:

لَو رَأيتَ الحسانَ في الخلدِ حَولي *** وَأكاويب مَعَها للشراب

يترَنَّمنَ بالكتاب جميعاً *** يتمشَّين مُسبلات الثياب(٩٨).

هەندێ لە هاوڕێیانی إبن جريج دەڵێت: لە خەوما بینیم هاتـە ئـەو گۆڕسـتانەی کە لە مەککەدایە، بینـیم لەسـەر هـەموویان شـتێك وەك چـادرو خیـوەت وایـە، گۆڕێکم بینی خیوەتو چادرێكو پەردەیەکی بەسەرەوە بوو، ئینجـا بـۆ لای چـووم تاوەکو چوومە ژوورەوە، سەلامم لێی کرد، کەوا ئەو مسلم کوڕی خالد الزنجي بوو، سەلامم لێی کردو پێم ووت: ئـەی بـاوکی خالـد، هـۆی چـیە ئـەم گۆڕانـە چـادرو خیوەتیان بەسەرەوەیە، وگۆڕەکەی تۆ چادرو خێوەتو پەردەشی بەسـەرەوەیە؟ ئـەو ووتـی: مـن زۆر بـەڕۆژوو دەبـووم، ووتم: ئـەی گـۆڕی إبـن جـريج لـە کـوێ یـە، شوێنەکەشی لە کوێ یە؟ بێگومان پێشتر لـەلای دادەنیـشتم، و مـن حـەز دەکـەم سەلامی لێ بکەم، جا بەدەستی ئیـشارەتی داو ووتـی: هـەیهات و پەنجـەی شـادە

(٩٨) المنامات: ژمارە (١٤٦).

نوێژی سوڕاندەوە، گۆڕی إبن جریح لە کوێ یە؟ ئەو بەرز کرایەوە بۆ شوێنە هەرە بەرزەکان.

حماد کوڕی سلمە لە خەودا یەکێك لە هاوڕێیانی بینی، پێی ووت: خودای گەورە چی لێکردی؟ ووتی: پێی ووتم: لە دونیادا زۆر ماندوو بوونو ڕەنجت کێشا، جا ئەمڕۆ زۆر پشوو حەسانەوەت دەدەینێ ماندووت دەحەسێتەوە.

ئەمە باسێکی زۆر دوورو درێژە، ئەگەر ڕێگات بەخۆت نەدا بە باوەڕ پێکردنی و ووتت: ئەمە خەونە، جا ئەمە بێ تاوان نابێتو هیوادارم هاوڕێیەکی یاخود خزمێکی یان یەکێکی دیکە ببینێت، هەواڵی پێبدات کە بەو فەرمانە نازانێت تەنها خاوەنی خەونەکە نەبێت، یاخود پێی بڵێت بە پارەو پوولێك کەوا شاردوویەتیەوە یان ئاگاداری بکاتەوە لە ڕووداوێك کەوا ڕوودەدات، یان شەڕو ناخۆشیەکی بە کارێك هەیە وەك دەڵێن ڕوودەدات، یاخود پێی بڵێت کە ئەو یان هەندێك لە بنەماڵەکەی دەمرێتو ڕوودەدات کەوا هەواڵیشیان پێداوە، یاخود هەواڵی بدەرێ بە هەرزانی یان بە گرانیو بێ بارانی یان بە دوژمن یاخود بە کارەساتو هەواڵی دڵتەزێن یاخود نەخۆشی یاخود بە مەبەستو ئامانجێك بۆی کە ئەمانەش ڕوویانداوەو هەواڵیشیان پێداوە، وە ڕاستیەکەی لەمەدا هەژمار ناکرێت تەنها خوای گەورە نەبێت، و خەڵکیش هەمووی تێیدا بەشدارن، و ئێمەو خەڵکانی دیکەش ئەم کارە سەر سوڕهێنەرانەیان بینیووە.

ئەمەش هەڵدەوەشێتەوەو بەتاڵ دەبێتەوە هەرکەسێك بڵێت: ئەمانە هەمووی زانستو بیروڕان لە دەروندا لە خاوەنەکەی بەدیار دەکەوێت لە کاتی پچڕانی خودی خۆی لە سەرقاڵیو ماندوو بوونی جەستەیی لە خەودا، ئەمەش بابەتێکی ناڕەواو نەگونجاوە، چونکە دەروون هیچ کاتێك زانیاری لەسەر ئەمە نییە کەوا مردوو هەواڵی دەداتێ، و هەر بە بیریشی دا ناچێت، وە هیچ نیشانەیەکی لەسەردا بەدیار ناکەوێت، ئێمەش ئینکاری ئەم کارە ناکەین کەوا ڕوودەدات.

خەونیش لەسە سێ جۆر دەوەستێت: خەون لەلایەن خواوە، و خەون لەلایەن شەیتانەوە، و خەونیش لەگەڵ ئاخاوتنی دەروونداا(٩٩).

و خەونی ڕاستیش چەند بەشێکە، لەوانە ئیلهامو سرووشێکە خودای پاكو بێگەرد دەیگەیەنێتە دڵی بەندەی خۆی، و ئەمەش گفتو گۆیەکە خودای عز وجل قسەی بە بەندەکەی دەکات لە خەودا، هەروەك عبادەی کوڕی الصامت و خەڵکی دیکەش وایان ووتووە. لەوانە نموونەیەکە بۆی کە خاوەن خەونەکە دەبێتە بریکاری وە لەوانە بەیەکگەیشتنی ڕۆحی نووستوو بە ڕۆحەکانی مردوو لە بنەماڵەو خزمو هاوڕێکانی کەوا پێشتر باسمان کرد. وە لەوانە بەرز کردنەوەی ڕۆحەکەی بۆ لای خودای پاكو بێگەردو قسە کردن بۆی. وە لەوانە چوونە ژوورەوەی ڕۆحەکەی بۆ بەهەشتو پیشاندانو سەیرکردنی...، جا بەیەکگەیشتنی ڕۆحی زیندوو مردووەکان جۆرێکە لە جۆرەکانی خەونی ڕاستو دروست کەوا لەلای خەڵك بوونی هەیە کە لە ڕەگەزی هەست پێکراوانە.

ئەمەش بابەتێکە خەڵکی تێیدا شلەژاوو شێواوە تێیدا ئەوەی دەڵێت: کەوا زانستەکان هەموو نادیارو شاراوەیە لە دەروونـدا، بەڵکو سەرقاڵ بوونیەتی بە جیهانی هەست کردن کەوا قەدەغەی دەکات لە خوێندنەوەو پێداچوونەوەی، جا ئەگەر تەرخانی کرد بە خەو ئەوا بە گوێرەی ئامادە بوونی خۆی دەیبینێ، بەڵام ئەگەر خۆی تەرخان کرد بە مردن بە تەواوەتی ئەو زانستو زانیاریەکەی لەوێ تەواو دەکات. و ئەمەش ڕەواو ناڕەوای تێدایەو هەموو بەرپەرچ نادرێتەوە، و هەمووی وەرناگیرێت،

هەر کەسێك دەڵێت: ئەو خەونانە زانستێکە خودای گەورە هەر لە سەرەتاوە بەبێ هیچ هۆکارێك نووساندوویەتی لە دەروونـدا، وە ئەم ئاخاوتنە هۆکارەکانو

(٩٩) سەیری: مسلم (٢٢٦٣) بکە.

یاسا بەهێزەکان بە ناپەسند دەزانێت، ئەم ئاخاوتنەش پێـچەوانەیە لەگـەل شـەرع‌و عەقل‌و ڕەوشـتە زکماکەکان.

ئەوەی دەڵێت: خەون تەنها نموونەیەکە خودای گەورە بە نموونـە دەیهێنێتـەوە بـۆ بەندەکان بەگوێرەی ئامادەبوونی بـە هـۆگری‌و گوێڕایـەڵی لەسـەر دەسـتی خـاوەن خەونەکان، جارێك دەبێتە نموونە هێنانەوە، جارێکیش ئەوەی خـود بینیویـەتی لـە خەودا هاوشێوەیە لەگەڵ شێوەی زانستەکە ناسراوە.

ئەمەش نزیکترینە لەو دوو ئاخاوتنەی پێشوو، بەڵام خەون گەلەر نیە لەسـەریدا، بەڵکو ئەمە هۆکارێکی دیکەی هەیە کەوا لە بەیەکگەیـشتنی ڕۆحـەکان و هـەواڵ پێدانی هەندێك بۆ هەندێکی دیکە پێشتر باسکرا، و لەبەیەکگەیـشتنی خاوەنەکـە کەوا دڵ‌و تێگەیشتندایە، وە لەبارەی دیتنی ڕۆحەکە بۆ شتەکان سـڕینەوەیە بـەبێ هۆکار.

هەروەها أبو عبدالله ی کـوڕی منـدة الحافظ لـە پـەرتووکی (النفیس والـروح) باسیکردووە، لە حەدیسی محمد کـوڕی حمیـد دەڵێـت: عبـدالرحمن کـوڕی مغـراء الدوسی بۆ ئێمەی گێڕایەوە، ئەویش لە الأزهر کوڕی عبدالله الأزدي، لە محمد کوڕی عجلان، ئەویش لە سالم کوڕی عبدالله، ئەویش لە باوکیـەوە ووتـی: عمـری کـوڕی خطاب بە علی کوڕی أبی طالب گەیشت‌و پێی ووت: ئەی باوکی الحـسن، لەوانەیـە شەهید بکرێی‌و لێمان وون بیت، و لەوانەشە من شەهید بکرێم لێتـان وون بم، سـێ شت هەیە پرسیارت لێدەکەم لەتۆ هەیە ئایا زانیاریت لێیانەوە هەیە؟ علـی کـوڕی أبی طالب ووتی: ئەمانە چین؟ ئینجا ووتی: پیاوێك پیاوێکی خۆش دەوێت کە هیچ خێرو چاکەیەکی لێ نەبینیووە، و پیاوێك ڕقی لە پیاوێك دەبێتەوە کە هـیچ شـەڕو بەلایەکی لێ نەبینیووە، جا علی ووتی: بەڵێ، گوێم لە پێغەمبەری خـوا بـووﷺ دەیفەرموو: (إنَّ الأرواحَ جنُود مُجندة تلتقـي في الهَـواء فَتَـشأم، فمـا تَعـارف مِنهـا أئتلَف، وَما تَناكر مِنها اختَلف). واتـە: (ڕۆحـەکان وەك سـەرباز وان لـە ئاسمانـدا

دەگەن بە یەکترو یەکتر بۆن دەکەن، جا ئەوەی ئیماندار بێتو یەکتر بناسێت هۆگری دەبێت، وە ئەوەی رِقی لێ بێتەوە لێی لادەدات).

جا عمرؓ ووتی: ئەوە یەك، عمرؓ ووتی: وە پیاوێك ووتاریك دەگێڕێتـەوە ئەگەر لەبیری چووەوە، لەناو ئێمەدا هەیە ئەوەی باسی کردووە لـەبیری چـووەتەوە، ووتی: بەڵێ، گوێم لە پێغەمبەری خوا بووﷺ دەیفەرموو: (مَـا في القُلـوب قَلـب إلاّ وَلَهُ سَحابَة كَسَحابَة القَمَرِ بَينا القَمر مضِيء إذ تَجللته سَحابة فَـأظلَم إذا تَجلَـت فَأضاءَ وَبينا القَلب يَتَحَدث إذ تَجللته سَحَابَة فَنَسيَ إذ تَجلَت عَنـهُ فَيـذكر). واتـە: (هیچ دڵێك نییە ئیللا هەوری هەیە وەك هەوری مانگ، دەبینیت مـانگ رووناکـە هەرکاتێك هەورەکە مانگی داپۆشی ئەوا تاریك دەبێـت ئەگـەر لێـی لادا روونـاك دەبێتەوە، دڵیش وایە ئەگەر هەور دایپۆشێت یادی خوات لـەبیر دەچـێتەوە ئەگـەر لێی لادات یادی خوات بیر دێتەوە).

عمرؓ ووتی: ئەوە دوو، ووتی: پیاوێك خەونێك دەبـینێ، هەیـە بـاوەڕی پـێ دەکرێت، و هەشیانە باوەڕی پێناکرێـت؟ جـا علـیؓ ووتـی: بـەڵێ، گـوێم لـە پێغەمبەری خوا بووﷺ دەیفەرموو: (مَا مِنْ عَبـد يَنـام يَمتَلـيء نَومَـاً إلاّ عَـرَجَ بروحِهِ إلى العَرش، فَالّذي لا يَسْتَيقظ دُون العَرش فَتِلكَ الرُّؤيا الّـتي تَـصَدق، والّـذي يَستَيقظ دُون العَرش فَهي الّتي تكذب). واتە: (هەر بەندەیەك لە خـەوێکی قووڵـدا بنووێت ئەگەر رۆحەکـەی گەیـشتە عـەرشو لـەم خـەوەدا خەبـەری نـەبۆوە بزانـە خەونەکە ڕاستە، بەڵام ئەوەی خەبـەری دەبێتـەوە پـێش ئـەوەی رۆحەکـەی بگاتـە عەرش بزانە خەونەکەی درۆیە)

جا عـمرؓ ووتی: ئەوە ئەو سێ شتەیە کە من داوام دەکرد، سوپاسو سـتایش بۆ ئەو خودایەی کەوا ڕاستیەکانم دەست کەوت لەپێش مردندا[١٠٠].

---

(١٠٠) مجمع الزوائد: ١/ ١٦٢.

بقيەی کوڕی الولید[١٠١] ووتی: صفوان کوڕی عمرو بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە سلیم کوڕی عامر الحصرمی ووتی: عمر کـوڕی الخطـاب ووتـی: سـەرم سـوڕما بـۆ خەونی پیاوێك کەوا شتێکی بینیووە کە ئەو شتەی نەهاتووە بە بیریا، وەك ئـەوەی بە دەستیشی گرتبی، و شتێکی بینیووە کەوا ئەو شت نەبووە، جا علی کوڕی أبـی طالـب ووتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، خودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿اللَّـهُ يَتَـوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَـا فَيُمْسِـكُ الَّتِـي قَـضَى عَلَيْهَـا الْمَـوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُـسَمًّى﴾ {الزمـر: ٤٢}. واتـە: (هـەر خوایـە گیانـەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش کە نەمرد لە خەوەکەیـدا بـۆی دەنێرێتەوە، جا ئەو کەسەی کە خوا بڕیاری مردنی دابێـت ڕۆحەکـەی دەگرێتـەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئەو کەسەش کە ڕۆژی تەواو نەبووبێت دەینێرێتەوە بـۆی تـا کاتێکی دیاریکراو).

ڕۆحەکان بۆ ئاسمان بەرز دەکرێنەوە لە خەوەکەیدا، جا ئەوەی بینرا لە ئاسماندایـە ئەوە هەق‌و باوەڕدارە، ئەگەر گەڕێندرانەوە بـۆ لاشـەکانیان ئـەوا شـەیتانەکان لـە ئاسماندا تووشی دەبێت، و بە درۆی دەخاتەوە، ئینجا ئەوەی بینرا لەم شێوەیە ئەمە ناڕەوایە، ووتی: عمر سەری سوڕما لەو قسەیەی علی(کرم‌الله‌وجهه). إبـن منـدە دەڵێت: ئەو هەواڵە بەناوبانگە لەلایەن صفوان کوڕی عمرو و کەسانی دیکـە، أبـی الدرداء ریوایەتی کردووە.

الطبراني باسدەکات‌و دەگێڕێتەوە: لە حەدیسێکی علی کـوڕی ابـی طلحـة کـەوا عبدالله کوڕی عباس بە عمر کوڕی الخطابی(رضي الله عنه) ووت: ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران، هەندێ شت هەیە پرسیارت لێدەکەم، ووتی: ئەوەی ووێستت پرسـیار بکـە، ووتـی: ئەی ئەمیری ئیمانداران پیاو لە چی شتی بە بیر دێتەوە، وە لەچی لە بیری دەکـات،

(١٠١) میزان الأعتدال: ١/ ٣٣١.

و لەچی باوەڕ بە خەون دەكات، لەچی بـە درۆی دەخاتـەوە؟ عمـر پێـی ووت: كـە لەسەر دڵدا زوڵمێكی توند هەیە وەك هەور وایە مانگ داپۆشێت، جا ئەگـەر دڵـی داپۆشێت ئەوا ئادەمیزاد شتی لەبیر دەچێتەوە، بەڵام ئەگەر دڵی سافو لووس بێت ئەوا ئەوەی لەبیری چووە بەبیری دێتەوە، بەڵام خەون لەچی باوەڕ دەكرێتو لەچی بە درۆ دەخرێتەوە؟ خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَـا وَالَّتِـي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَـا﴾(الزمر:٤٢) واتە: (هەر خوایە گیانـەكان دەكێـشێت لـەكاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش كە نەمرد لە خەوەكەیدا بۆی دەنێردرێتـەوە). جـا ئەو ڕۆحەی بەرز كرایەوە بۆ لای فریـشتەكانی ئاسمـان ئـەوا ئـەو خەونەیـە كـەوا باوەڕی پێدەكرێت، و ئەو ڕۆحەی كە نەچـووە لای فریـشتەكانی ئاسمـان ئـەوا ئـەو خەونەیە كە بە درۆ دەخرێتەوە[١٠٢].

إبن لهيعة ڕیوایەتی كردووە، لە إبن عثمان كوڕی نعيم الرعينى، ئەویش لە أبـی عثمان الأصبحي، ئـەویش لـە أبـی الـدرداء، ووتـی: ئەگـەر مـرۆڤ خـەوت ئـەوا ڕۆحەكەی بەرز دەكرێتەوە تاوەكو دەچێتە لای عەرش، جا ئەگەر پاكو خاوێن بێـت ئەوا مۆڵەتی دەدرێتـێ كڕنۆش ببات، و ئەگەر پیسو پۆخڵ بێت مۆڵـەتی نـادرێتێ بە كڕنۆش بردن[١٠٣].

جعفر كوڕی عون ڕیوایەتی كردووە، لە إبراهيم الهجری، ئەویش لە أبی الأحوص، لە عبدالله كوڕی مـسعود كـەوا دەڵێـت: ڕۆحـەكان وەك سـەربازی بـەزۆر گـیراون بەیەكدەگەنو دەچنە ناو یەكتر هەروەك ئەسپ لەشەڕدا دەچنە نـاو یـەكتر، ئـەوەی بیناسێت هۆگری دەبێت و ئەوەی نەیناسێتو ڕقی لێبێت لێی جیا دەبێتەوە[١٠٤].

---

(١٠٢) ميزان الأعتدال: ٣/ ١٤٣.

(١٠٣) شرح الصدور: ٣٥٦.

(١٠٤) كشف الخفاء، العجلوني: ١/ ١٢١.

وه هێشتاش خەڵكی كۆنو ئێستا ئەمە نازانن‌و نەیانبینیووە، جمیـل كـوڕی معمـر العذري دەڵێت:

أَضَلُّ نَهاري مُستَهاماً وَتَلتَقي *** مَعَ اللَيلِ روحي في المَنامِ وروحها

ووتویانە: پیاوی نووستو خەڵكی دیكە لە زیندووان دەبینێت‌و قـسەشی لەگەڵـدا دەكات، و ئەگەر چی ماوەیەكی دووریش لە نێوانیاندا هەبێت، لەگەڵ ئـەوەش ئـەم دوو كەسە هۆشیارن‌و ڕۆحەكەیان لە جەستەیان جیا نەبۆتەوە، جا چۆن ڕۆحـەكانیان پێك گەیشتن؟ دەڵێن: ئەمە یان دەبێت نموونەیەك بێت كـەوا خـەون لێكـدەرەوە بـۆ كەسی خەوتوو هێناویەتیەوە، یاخود گێڕانەوەكە خۆی لەو كەسەیە كـە خەونەكـەی بینیووە كەوا خۆی بێ بەری دەكـات لـە خەوەكەیـدا هـەروەك حبیـب كـوڕی أوس دەڵێت:

سَقياً لَطيفِك مِن زُورٍ أتاكَ بِهِ *** حَديث نَفسك عَنهُ وَهو مَشغُولُ

بێگومان ڕۆحەكان بۆ یەكتر دەگونجێن، و پەیوەندی یەكێكیان بەوی دیكە توونـدترو بەهێزتر دەبێت، وە هەریەكە لەوان هەست بـە هاوڕێیـەتی هاوەڵەكـەی دەكـات، و ئەگەر هەستی بە یەكێكی دیكە نـەكرد ئـەوا دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو هەسـتەی لـە نێوانیاندا هەیە، و خەڵكیش ئەم شتە سەرسوڕهێنەرەیان بینیووە.

مەبەستیش لەوە كەوا ڕۆحی زیندووەكان بەیەك دەگەن هـەروەك ڕۆحـی زینـدوو مردووەكان بە یەكتر دەگەن، هەندێك لە پێشینەكان دەڵێن: ڕۆحەكان لە ئاسماندا بە یەكتر دەگەن، یەكتر دەناسنەوەو گفتو گۆش لەگەڵ یـەكتر دەكـەن، جـا فریـشتەی خەون دەیگاتێ بە چاكەو خێر یاخود بە خراپەو شەڕ، دەڵێت: ئینجا خودای گـەورە فریشتەیەك دەكاتە وەكیلی خەونەكە فێری دەكات‌و ئیلهامی دەداتـێ بـە زانیـاری پێدانی هەموو نەفەسێك لە سەرچاوەی گەورەیی‌و ناوونیشان‌و بێباریەكەی لە دین‌و دونیاو سروشت‌و پەروەردەو ڕەوشتی، و هیچ شتێك لەو ناچێت، وە هـیچ هەڵـەش

ناكات، جا كۆپیەك لە زانستی پەنهانی‌و غەیبی خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دێت بۆ لای بەوەی كەوا تووشی ئەو مرۆڤە دەبێت لە خێرو چاكە یاخود شەڕو خراپە لە دین‌و دونیاكەی، و نموونەو شێوەی وای بۆ دێنێتەوە بە قەدەر هەڵس‌و كەوت‌و داب‌و نەریتەكەی بێت، جا جارێك مژدەی پێدەدات بەو چاكەی كە دەیكات یاخود پێشكەشی دەكرێت، و ئاگاداری دەكاتەوە لە گوناهێك كە كردوویەتی یاخود بۆ ئەو گرنگە، و وریای دەكاتەوە لە خراپەیەك كە ببێتە هۆكارێك بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بنێت بۆ كاری تاوان‌و كارەسات، و جگە لەمەش خەون نیعمەتێكە خودای گەورەبۆ ڕەحمەت‌و چاكەو یادكردنەوەی خوداو زانیاری پێدان دەینێرێت، و یەكێكە لەو ڕێگایانەی كە ڕۆحەكان بەیەكتر دەگەیەنێت بۆ سەردانی یەكتر كردن‌و گفتوگۆ كردن، چەند كەس لە ڕێگای ئەو خەونانەوە تەوبەیان كردووەو ڕێگای چاكەیان گرتۆتە بەرو پەشیمان بوونەتەوەو باوەڕیان هێناوە بە ڕۆژی دوایی، وە چەندەها كەس لە ڕێگای خەونەوە بوونەتە خاوەنی سەروەت‌و سامان‌و گەنجینەیان دۆزیوەتەوە كەوا شاردرابۆوە.

لە پەرتووكی (المجالسة)ی أبی بكر كوڕی مروان المالكی: لە إبن قتیبە ئەویش لە أبی حاتم، وە لە الأصمعي، ئەویش لە المعتمر كوڕی سلێمان، ئەویش لەو كەسەی بۆی گێڕاوەتەوە، ووتی: جارێك دەرچووین بۆ گەشت، ئێمە سێ كەس بووین، جا یەكێك لە ئێمە خەوت، شتێكمان بینی وەك ڕووناكی‌و چرایەك وابوو لە لووتی هاتە دەرەوەو چووە ناو ئەشكەوتێكی نزیك لێی، جا ڕووناكیەكە گەڕایەوەو چۆوە ناو لووتی، ئینجا لەخەو هەڵساو دەم‌و چاوی سڕیەوە، ووتی: خەونێكی سەیرم دیت، لەو ئەشكەوتەدا ئەوهاو ئەوهام دیت، جا چووینە ناو ئەشكەوتەكە هەندێك سامان‌و پاشماوەمان دۆزیەوە.

ئەمەش عبدالمطلبە کە لە خەودا دەستنیشانی زەمزەمی کرد وە ئەو سامانو گەنجینەیەی دۆزیەوە کەوا لەوێ بوو[١٠٥].

وە ئەمەش عمیر کوڕی وهب لەخەودا هاتنە لای‌و پێیان ووت: هەڵسە بڕۆ ئەو شوێنەو ئەو شوێنە لە ماڵەکە هەڵیکەنە پارەو پوولی باوکت دەدۆزیتەوە، کەوا باوکی پارەو پوولەکەی شاردبۆوە، کە وەسیەتی پێ نەکردبوو، جا عمیر لەخەودا هەڵساو شوێنەکەی هەڵکەند بەو شێوەی ئەمریان پێکردبوو، دەهەزار درهەم‌و ئاڵتوونێکی زۆری دۆزیەوە، ئینجا بۆ سەرخستنی دینەکەی‌و باشکردنی گوزەرانی خۆی‌و بنەماڵەکەی پارەیەکی زۆری سەرف کرد، و٠ ئەمەش ئیسلامی بوونی ئەوی بەدوادا هات، یەکێك لە کچە بچووکەکانی پێیووت: باوکە گیان، خودای ئێمە باشتر لە هوبەل‌و عوزا ئێمەی بە دینەکەی خۆی خۆش ویستووە، ئەگەر ئەو نەبایە ئەم پارەو پوولەی بۆ بەجێ نەدەهێشتی، کەچی ڕۆژانێکی کەمیش ئەوت پەرستووە.

علی کوڕی أبی طالب القیروانی العابر دەڵێت: ئەو بەسەرهاتەی عمیرو دەرهێنانی پارەو پوولەکەی لە خەودا بە سەیرترین شت دادەنرێت لەلای ئێمە، لەو سەردەمەی ئێمەداو لە شارەکەی خۆمان لە أبی محمد عبدالله البغانشیمان بینی کەوا پیاوێکی چاك‌و بەناوبانگ بوو بە خەونی مردووەکان و پرسیارکردنیان لە شتە بزرو پەنهانەکان، جا ئەمەی دەگواستەوە بۆ ماڵەوەیان و خزم‌و ناسیاویان تاوەکو ناوی دەرکردو خەڵکێکی زۆر لە دەورەی کۆبووەوە، پیاوێك هاتە لای‌و شکایەتی لای کرد کە یەکێکی نزیکی ئەو مردووە بێ ئەوەی وەسیەتی لەلای بکات‌و پارەو پوولێکی زۆری هەبوو شوێنەکەی پێنازانێت، بۆ ئەوەی ڕێگایەکی چاکی پێ نیشان بدات، لەخودای گەورە پاڕایەوە لەو شەوەدا ئەو مردووەی وەسفی کردبوو لە

---

(١٠٥) السیرةالنبویة،إبن هشام:(١/١٥٠).

خەوەکەیدا بینی، ئینجا پرسیاری ئەو پارەو پوولەی لێکرد، ئینجا خەبەری دا بە پیاوەکە.

لە کارە دەگمەنەکانی کە پیرەژنێکی چاكو ئیماندار مرد ئافرەتێك نەبوو لەلای کە ئەو حەوت دینارەی هەیەتی پێی بسپێرێت، جا یەکێك هاتە لای هاورێکەی کەوا ئەو دەیویست پارەکەی لەلا دابنێت، بە خێرایی چووە لای پیرەژنەکە، هەواڵی ناوی مردووەکەی راگەیاند بە کەس‌وکاری، پاشان بەیانی ئافرەتەکە گەرایەوە لای کەس‌وکاری، پێی ووت: فلانە پیرەژن دەڵێت: لە بنمیچی ماڵەکەم حەوت تەختە بژمێرە پارەکانم لەوێ شاردۆتەوە لەناو پەرۆیەکی خوریم داناوە، ئینجا ئەم کارەی کرد، ئینجا پارەکەی دۆزیەوە کەوا وەك ئەوەی وەسفی کردبوو.

دەڵێت: پیاوێك بۆی گێرامەوە کەوا گومان نابەم بە درۆکردنی ووتی: ئافرەتێك منی بە کرێ گرت بۆ ئەوەی ماڵەکەی لێ تێك بدەم، و سەرلەنوێ نۆژەنی بکەمە بە پارەیەکی دیاریکراو، جا کاتێك کەل‌وپەلەکەم وەرگرت بۆ تێکدانی خانووەکە، ووتم: ئەمە بۆچی تێکی دەدەی؟ ئافرەتەکە ووتی: سوێند بەخوا هیچ پێویستیم بە تێکدانی ئەم خانووە نیە، بەلاَم کە باوکم مرد، ئەو زۆر دەوڵەمەندو خاوەنی سەروەت‌و سامانێکی زۆر بوو بەلاَم هیچی وامان نەدۆزیەوە لە پارەو پوولەکەی، پارەکەی لە شوێنێکی ئەم خانووە شاردۆتەوە بۆیە تێکی دەدەم بەڵکو پارەکە دەدۆزمەوە، ئینجا پیاوەکە وەك ئاگادار کردنەوەیەك بە ئافرەتەکەی ووت: شتێکت پێ بڵێم لەمە ئاسانتر بێت بۆ تۆ، ووتی: ئەم شتە چی یە؟ ووتی: فلان کەس، برۆ لایو پرسیاری لێبکەو چیرۆکی خۆتی بۆ بگێرەوە بەڵکو ئەم باوکت لە خەو دەبینی‌و شوێنی شاردنەوەی پارەکەت پێ نیشان دەدات بەبێ ماندووبوون‌و بەبێ نرخ، جا ئافرەتەکە چووە لای پاشان هاتەوە لای ئێمە، پێی ووت: کەوا ناوی خۆی‌و ناوی باوکی لای خۆی نوسیووە، بەیانی زوو چوومە لای کارەکە، جا ئافرەتەکە لای پیاوەکە هاتەودو ووتی: پیاوەکە پێی ووتم: باوکتم لە خەودا بینی، ئەو دەیووت:

پارەکە لە شوێنێکی چەماوەدایە لای خانووەکە، ووتی: ئینجا شوێنی دیوارە چەماوەکەمان هەڵکەند تاوەکو دەلاقەیەك بە دیارکەوت و بینیم پارەکە لەوێدایە، ووتی: بەڕاستی سەرمان سوڕما، جا ئافرەتەکە پارەکەی بە کەم زانی کە دۆزیەوە، دەیووت: پارەو سامانی باوکم لەوە زیاتر بوو، بەڵام من دەگەڕێمەوە لای پیاوەکە، جا ڕۆیشتەوە لای پێی ڕاگەیاند، پاشان پرسیاری لێکرد دووبارە بکاتەوە، جا کاتێك بەیانیەکەی چووە لای ووتی: کەوا ئەو بە ئافرەتەکەی ووتوە: کەوا باوکت پێت دەڵێت: لە کۆگای زەیتەکە حەوزێکی چوارگۆشە هەیە ژێرەوەی هەڵبکەنە، ووتی: کۆگاکەم کردووە لە گۆشەیەکدا حەوزێکی چوارگۆشە هەبوو، هێنامانە خوارەوەو ژێرەوەمان هەڵکەند، گۆزەیەکی گەورەمان دۆزیەوە، دام بە ئافرەتە پاشان تەماعی گرتی و سوور بوو لەسەر ئەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوە لای پیاوەکە، ئەم کارەی کرد، لەلای پیاوەکە گەڕایەوە خەمۆکی و دڵتەنگی بە ڕوویەوە دیار بوو ئافرەتەکە ووتی: پیاوەکە بە منی ووت: بەقەدەر توانای خۆت پارەکەت وەرگرت، بەڵام ئەوەی ماوەتەوە شەیتانێك لە جنۆکە لەسەری دانیشتووەو پاسەوانی لێدەکات تا ئەو کاتەی قەدەرەکە تەواو دەبێت.

وە حیکایەت و چیرۆك لەو بابەتەدا زۆرە.

یەکێك بۆی گێڕامەوە لەبارەی شێخی ئیسلام إبن تیمیە کەوا لەپاش مردنیدا لە خەودا بینیوویەتی، پرسیاری لێکردووە لە مەسەلەی هەندێك شتی فەرزو واجب کەوا کێشەی بۆ دروستکردبوو جا وەڵامی پرسیارەکانی بەڕاستی دایەوە.

***



## ئایا ڕۆح دەمرێت
## یاخود مردن تەنها بۆ لاشەکەیە؟

بێگومان خەڵك لەمەدا جیاوازی هەیە، کۆمەڵێك دەڵێن: ڕۆح دەمرێت، وە تامی مردن دەچێژێت، چونکە ئەویش نەفسە، وە هەموو کەسێك دەبێت تامی مردن بچێژێت.

دەڵێن: بەڵگەکان ئاشکراو نیشانەن لەسەر ئەوەی کەس نامێنێت تەنها خودای تاكو تەنیا نەبێت، خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ* وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ {الرحمن: ٢٦-٢٧} واتە: (هەموو ئەو کەسانەی لەسەر ڕووی زەویـن، هەر هەمووی فەوتاوو تیاچووەو دەبێت بمرن* تەنها زاتی پەروەردگاری خاوەن بڵندیو ڕێزداری تۆیە کە دەمێنێتەوە). وە هەروەها خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ {القصص: ٨٨}. واتە: (هەرچی شت هەیە تیا چووەو لەناو چووە جگە لەو زاتە). دەڵێن: ئەگەر فریشتەکان بمرن، ئەوا نەفسی مرۆڤ لە پێشترە بۆ ئەوەی بمرێت، دەڵێن خودای گەورە لەبارەی ئەهلی ئاگرەوە دەفەرموویت ئەوان دەڵێن: ﴿رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ {غافر: ١١}. واتە: (پەروەدگارا تۆ دەسەڵاتت بێ سنوورە دووجار ئێمەت مراندووەو دووجار ئێمەت زیندوو کردۆتەوە). جا مردنی یەکەم ئەوا شایەدەو بینراوە، ئەوە بۆ لاشەکەیە، و ئەوەی تر بۆ ڕۆحەکەیە.

هەندێکی دیکە دەڵێن: ڕۆحەکان نامرن، ئەمە دروستکراوە بۆ مانەوە، بەڵکو تەنها لاشەکان دەمرێت، دەڵێن: بێگومان بەڵگە هەیە لەسەر ئەم ووتانە ئەمەش بەڵگەیە لە نازو نیعمەتی ڕۆحەکانو ئازاردانی ڕۆحەکان پاش ئەوەی جیا دەبنەوە لە لاشەکانیانو دەگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە، جا ئەگەر ڕۆحەکان مردن ئەوا

نیعمەتو ئازاریان لەسەر دەپچڕێت، جا خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ* فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُواْ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ﴾ {آل عمران: ١٦٩-١٧٠}. واته: (هەرگیز وا مەزانن‌و وا دامەنێن ئەوانەی لە پێناوی خوادا شەهید بوون‌و کوژران، مردوون، نەخێر وانیە، بەڵکو ئەوانە زیندوون، لەلای پەروەردگاریان لە رزق‌و رۆزی بەهرەوەرن* زۆر دڵخۆش‌و شادمانن بەو بەخشش‌و زیادە فەزڵەی کە خوا پێی بەخشیوون، مژدەش دەدەن بەوانەی هێشتا بەوان نەگەیشتوون‌و ((شەهید نەبوون))). وە ئەمەش لەگەڵ پچڕانە کاتێك رۆحەکان لەلاشەکانیان جیا دەبنەوە بێ گومان تامی مردن دەچێژێت.

راستیەکەی دەوترێت: مردنی گیانەکان بریتی یە لە جیابوونەوەیان لە لاشەکانیان، دەرچوونە لێی، جا ئەگەر ئەوەی دەڵێت رۆحەکە دەمرێت ئەوا تامی مردنی چێشتووە، ئەوەی دەڵێت رۆحەکان دەمێننەوە بەلام تەنها لاشەکان لەناو دەچێت کەواتە بەو بۆچوون‌و رەچاوکردنە رۆحەکە نامرێت، بەڵکو ئەو دەمێنێتەوە پاش دروست بوونی لەنازو نیعمەت یاخود لە عەزاب‌و ئێش‌و ئازار تاوەکو ئەوکاتەی خودای گەورە بیەوێت، وەهەروەها بەخێرایی بریار دەدات کە خودای گەورە رۆحەکان دەنێرێتەوە بۆ لاشەکانیان، وە أحمد کوری الحسين الكندي ئەو جیاوازیەی رێکخستووە لەو پارچە هۆنراوەیەدا:

تنازَع الناس حَتى لا اتفاق لهم *** إلاّ على شَجَبٍ والخُلفُ في الشجبِ[١٠٦].
فَقيلَ: تَخَلُصُ نَفسُ المرءِ سالمة *** وَقيلَ: تَشرَكُ جسم المرء في العَطَبِ

جا ئەگەر ووترا: لەکاتی فووکردن بە کەرەنادا ئایا رۆحەکان بە زیندوویی دەمێننەوە هەروەك ئێستا، یاخود دەمرێت پاشان زیندوو دەبێتەوە؟

---

(١٠٦) الشجب: لەناوچوون، الخُلف: جیاوازی.

ووتویانه: خودای گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الآرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ﴾ {الزمر: ٦٨}. واته: (لەورۆژه فوو دەکریّت بە کەڕەنادا هەرکەس لە ئاسمانەکانو زەویدا مابیّت خێرا دەمریّت، مەگەر کەسێك خوا وویستی لەسەر مردنی نەبیّت). بێگومان خودای گەورە لە ئاسمانەکانو لە زەویدا هەندێك کەسی لەو مردنە دوور خستۆتەوە.

جا هەندێك دەڵێن: ئەوانە شەهیدەکانن، ئەمە ووتەی أبی هریره، وإبن عباس، وسعید کوڕی جبیرە.

وە دەڵێن: ئەوانە جبرائیلو میکائیلو إسرافیلو عزرائیل (ملك الموت)ە. وە ئەمەش ووتەی مقاتلو هەندێك کەسی دیکەیە.

دەڵێن: ئەوانە ئەو کەسانەن کە لە بەهەشتدان لە (حور العین) حۆریەکانو هەندێکی تر، ئەوانەی لە ئاگردان لە ئەهلی دۆزەخو دەرگەوانەکەی دۆزەخ، أبو إسحاق کوڕی شاقلا ئەمەی وتووە.

ئیمام أحمد دەریخستووە لەسەر ئەوەی کەوا (حور العین والولدان) حۆریەکان و منداڵانی ناو بەهەشت نامرن لەکاتی فووکردن لە کەرەنادا. خوای گەورە هەواڵی داوە کەوا ئەهلی بەهەشت ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلَّا الْمَوْتَةَ الْأُولَى﴾ {الدخان: ٥٦}. واته: (لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە کە هەرگیز تاڵی مردن ناچێژن تیایدا جگە لەو مردنەی یەکەمجار).

ئەمەش دەقێکە لەسەر ئەمانە کەوا نامرن جگە لە مردنی یەکەمجار نەبیّت، جا ئەگەر جاری دووەم مردن ئەوا دەبێتە دوو مردن، بەڵام ووتەی ئەهلی دۆزەخ: ﴿رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ {غافر: ١١}. واته: (پەروەردگارا تۆ دەسەڵاتت بێ سنوورە دوو جار ئێمەت مراندووەو دوو جار ئێمەت زیندوو کردۆتەوە) جا تەفسیرکردنی ئەو ئایەتە کەوا لە سوورەتی (البقرة) دایە وەك خودای گەورە دەفەرموویّت: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾

{البقرة: ٢٨}. واتە: (چۆن بێ بڕوا دەبن بە خوا لەکاتێکدا ئێـوە بـێ گیـان بـوون خوا دروستی کردوونو گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێتو دوایـی زینـدووتان دەکاتەوە). جـا ئەوانـە مردبـوون وە ئەوانـە کـەمێ ئـاوی ڕوون بـوون لـە پـشتی باوکیانو لـە منداڵـدانی دایکیـان، لـەدوای ئەمـەدا زینـدووی کردنـەوە، پاشـان دەیانمرێنێت، پاشان زیندوویان دەکاتەوە لە ڕۆژی زیندوو بوونەوەدا. ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنێت کەوا ڕۆحەکانیان پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت نامرن، جا ئەگـەر وابێـت ئەوا دەبێتە سێ مردن، لەکاتی فووکردن بە کـەڕەنادا ڕۆحـەکان دەمـرن، جـا لـەو حەدیسە سەحیحەدا: (أنَّ النَّاس يصعقون يَوم القِيامَـة فَـأكُون أول مَـنْ يفيـق، فـإذا موسى آخذ بقائمة العرش، فَلا أدري أفاق قَبلي أم جوزي بصعقة يوم الطـور)[١٠٧]. واتە: (بێگومان خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا دەمـرن جـا مـن یەکـەمین کەسـم کـە زیندوو دەبمەوە، بینیم موسی دەستی بە پێچکەی عەرشەوە گرتبـوو، نـازانم پـێش من زیندوو دەبێتەوە یاخود لە دوای من لە مردنی ڕۆژی دوایی).

جا ئەو مردنە لە هەڵوێستو نیشانەکانی ڕۆژی قیامەتە ئەگـەر خـودای گـەورە هاتو وویستی لەسەر بوو بۆ بڕینەوەو تەواوکردنی و زەوی بە نووری خۆی ڕوونـاك دەکاتەوە، لەو کاتـەدا هـەموو بوونـەوەرو دروسـتکراوان دەمـرن. خـودای گـەورە دەفەرموویت: ﴿فَذَرْهُمْ حَتَّى يُلَـاقُوا يَـوْمَهُمُ الَّـذِي فِيـهِ يُـصْعَقُونَ﴾ {الطـور: ٤٥}. واتە: (وازیان لێ بهێنە هەتا بەو ڕۆژە دەگەن کە تیایدا دەچنو لاڵو پاڵ دەکـەون). ئەگەر چی ئەو لاڵو پاڵ کەوتنەش مردن بێت ئەوا مردنێکی دیکەیە، و کۆمـەڵێك لە پیاوچاکان بۆ ئەمە ئاگاداریان کردۆتەوە، جـا أبـو عبـدالله القرطبـی ڕەحمـەتی خوای لێ بێت لەم بارەیەوە دەڵێت: لەم حەدیسە دەرکەوتووە کەوا ئـەوە مردنێکـی لەهۆش خۆ چوونە نەك ئـەو مردنـەی ڕوودەدات لـەکاتی فـووکردن بـە کـەڕەنادا، دەڵێت: شێخ أحمد کوڕی عمرو ووتی: حەدیسی پێغەمبەرﷺ دەریخستووە نیشانە

(١٠٧) مسلم: (٢٣٧٣).

دەکات لەسەر ئەوەی کەوا ئەو مردنە ماوەی دووری نەفخەی دووەمە کەوا نەفخەی زیندوو بوونەوەیە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: لەوانەیە موسی لەو پێغەمبەرانە بێت کەوا نەمرێت، ئەمەش نارەوایەو ناگونجێت، القاضي عیاض دەڵێت: لەوانەیە مەبەست لەو مردنە داچڵەکینو تۆقاندنی کاتی زیندوو بوونەوە بێت لەو کاتەی ئاسمانەکانو زەوی لێك دەترازێن. وە أبو العباس القرطبي بەرپەرچی دەداتەوەو دەڵێت: لەو حەدیسە سەحیحەدا وا لێك دەدرێتەوە کاتێك پێغەمبەرﷺ لە گۆڕەکەی دێتە دەرەوە موسای پێ دەگات کەوا لیستی عەرشی هەڵگرتووە. ئەمەش لەوانەیە لەکاتی نەفخی ڕاچڵەکینو داخورپان بێت.

أبو عبدالله دەڵێت: شێخ أحمد کوڕی عمرو ووتی: ئەوەی ئەو کێشەو گرفتە ناهێڵێت مردن ئەوە نیە بە پاكو بێگەردی نەبێت، بەڵکو ئەوە گواستنەوەیە لە بارێك بۆ بارێکی دیکە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەهیدەکان لەپاش کوژرانیان یان مردنیان زیندوونو لەلایەن خودای گەورەوە رزقو ڕۆزییان بۆ فەراهەم کراوەو دڵخۆشو مژدە دەریشن، وە ئەمەش خەسڵەتی زیندووەکانە لە دونیادا، جا ئەگەر بۆ شەهیدەکان ئاوا بێت ئەوا پێغەمبەرەکان هەقترو لە پێشترن بۆ ئەم کارە، وە لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەرﷺ ڕاستی فەرمووە کە زەوی جەستەی پێغەمبەران ناخوات وە هەروەها پێغەمبەرﷺ لە شەوڕەوەکەیدا لە بيت المقدس لەگەڵ پێغەمبەران کۆبووەوە، لە ئاسمانیشدا بەتایبەتی لەگەڵ موسی، پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە کەوا هیچ موسڵمانێك نیە سەلام لە مردوو بکات ئیللا خودای گەورە ڕۆحەکەی بۆ دەنێرێتەوە تاوەکو وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە، جگە لەمە ئەوەی بڕیاری لەسەر دەدرێت ئەوەیە کە مردنی پێغەمبەران گەڕانەوەیە کەوا لە ئێمە دوور خراونەتەوەو لێمان شاراوەن بەجۆرێك ئێمە نازانینو هەستیان پێ ناکەین بەوەی ئایا ئەوان بە زیندوویی ماونەتەوە، ئەمەش وەك حاڵەتی فریشتەکان، کەوا ئەوان زیندوونو بوونیان هەیە بەڵام ئێمە نایانبینین، ئەگەر بڕیار درا بەوەی ئەوان

زیندوون، جا ئەگەر فوو بە کەڕەنادا کرابە نەفخەی مردن ئەوا ئەوەی لە ئاسمانەکاندایەو، ئەوەی لە زەویش دایە دەمرێت مەگەر ئەوەی خوا بیەوێت نەمرێت، بەلاّم (صعق) مردنو لە هۆش خۆ چوونی پێغەمبەران دەریخستووەئەوا لە هۆش خۆ چوونە، جا ئەگەر فوو کرا بە کەڕەنادا بە نەفخی زیندوو بوونەوە ئەوەی مردووە زیندوو دەبێتەوە، وە ئەوەیش کە لە هۆش خۆی چووە هەڵدەستێتەوە، هەروەها پێغەمبەرﷺ لە حەدیسێکی سەحیحدا هاتووە: (فَأكون أول مَن يفيق). واتە: (من یەکەم کەس دەبم کە هەڵدەستمەوە). وە پێغەمبەرمانﷺ یەکەمین کەسە کە لە گۆڕەکەی دێتە دەرەوە جگە لە موسی نەبێت، ئەوەش ڕاڕایی هەیە لەسەر ئەوەی ئایا ئەو پێش پێغەمبەر لە هۆش خۆ چوونەکەی زیندوو بۆتەوە، یاخود لەسەر ئەو حاڵەتە ماوەتەوە کەوا پێش نەفخەی (صعق) لە هۆش خۆ چوون بە خەبەر بووە، چونکە ئەوە هەژمار دەکرێت بە مردنی ڕۆژی دوایی، و ئەمەش چاکەیەکی گەورەیە بۆ موسی، ئەمەش هەرگیز پێویست ناکات بە چاکەیەك باشترو چاکتری بکەیت لەسەر پێغەمبەرمانﷺ، چونکە شتێکی نیمچەیی واجبو پێویست نابێت لە کارێك بە تێکڕایی(١٠٨).

أبو عبدالله القرطبی دەڵێت: ئەگەر حەدیسەکە لەسەر مردنی بوونەودر بێت لە ڕۆژی قیامەت ئەوا هیچ کێشەو گرفتی نامێنێت، بەلاّم ئەگەر لە هۆش خۆ چوونی مردن بێت لەکاتی فووکردن بە کەڕەنادا، ئەمەش دەبێت یادی ڕۆژی قیامەت بکرێتەوەو مەبەست لێی لێکدانەوەیە، جا ماناکەی: ئەگەر فوو کرا بە کەڕەنادا لە نەفخەی زیندوو بوونەوە پێغەمبەرﷺ دەڵێت من یەکەمین کەسم لەوانەی سەری خۆی بەرز دەکاتەوە، جا دیتم موسی دەستی گرتووە بە پێچکەیەك لە پێچکەکانی عەرش، جا نازانم پێش من هەڵساوەتەوە یاخود لەدوای من لە مردنی ڕۆژی دایبدا.

---

(١٠٨) التذكرة: ١٦٨.

(إبن القيّم) دەڵێت: پشتگیری کردنو ڕاڤە کردنی حەدیسەکە لەسەر ئەمە بەڕاست نازانرێت، چونکە پێغەمبەرﷺ دوو دڵو ڕارا بووە، ئایا موسی لە پێش ئەو هەڵساوەتەوە، یاخود لە دوای ئەودا، جا ماناکەی: نازانم لە هۆش خۆی چووە، یاخود لە هۆش خۆی نەچووە، وە لە حەدیسەکەدا دەفەرموێت: (فَأكون أول مَن يفيق) وە ئەمەش هێما دەکات لەسەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ لە هۆش خۆی دەچێت، ئەم دوو دڵیو ڕاراییەش دەستدەکەوێت لەبارەی موسی ئایا لە هۆش خۆی چووەو پێش ئەو هەڵدەستێتەوە لەکاتی لە هۆش خۆ چوونەکەی، یاخود لە هۆش خۆی ناچێت، جا ئەگەر مەبەستی یەکەم بێت بە لەهۆش خۆ چونی یەکەم ئەمەش لە هۆش خۆ چوونی مردنە ئەگەر وابێت ئەوا مردنی پێغەمبەرﷺ سەلمێندراوە، وە ڕاڕایش هەیە ئایا موسی مردووە یاخود نەمردووە؟ ئەمەش ناڕەواو نەگونجاوە لە هەموو ڕووەکانەوە، جا ئەمەش زانراوە کە ئەمە (صعق)ی ڕاچڵەکینو لە هۆش خۆ چوونە نەوەك (صعق)ەی مردن، لەو کاتەدا ئایەتەکە هێما ناکات لەسەر ئەوەی لە کاتی نەفخەی یەکەم هەموو ڕۆحەکان دەمرێت، بەڵێ هێما دەکات لەسەر مردن بوونەوەرو دروستکراوەکان لەکاتی نەفخەی یەکەم، هەرکەسێك پێشتر تامی مردنی نەکردبێت لەوکاتەدا تامی مردن دەکات، بەڵام ئەوەی تامی مردنی کردووە یاخود ئەوەی مردنی لەسەر واجب نەکراوە ئەوا ئایەتەکە هێما ناکات لەسەر ئەوەی بۆ جاری دووەم دەمرێتەوە، خودای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە.

جا ئەگەر وتیان: چۆن کار بەو حەدیسە دەکەن: (إنّ النَّاس يصعقون يَوم القيامَة فَأكون أول مَنْ تنشق عَنْـهُ الأرض، فَأجد موسى باطِشاً بِقائِمَة العَرشِ؟). واتە: (بێگومان خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا دەمرن جا من یەکەمین کەسم لە زەوی دێمە دەرەوە، لەوکاتەدا موسی دەبینم بە توندی دەستی گرتووە بە پێچکەی عەرش). دەڵێین: گومانی تیا نیە کەوا ئەم وتەیە ئاوا هاتووە، کێشەو گرفتی تێدا سەری

هەڵداوە، بەڵام لەسەر ئەوانەی ئەم حەدیسانەی ڕیوایەت کردووە، لە دوو حەدیسدا بە دوو شێوەزار هاتووە، وە دوو حەدیسەکەش ئەمانەن:

یەکەمیان: (أن النَّاسَ يَصعقونَ يَم القيامَة فَأكون أول مَنْ يَفيق)

وە دووەمیان: (أنا أَول مَنْ تنشق عنه الأرض يَوم القيامة)

واتە: (ئەمن یەکەم کەسم کەوا زەوی لەسەرم شەق دەبێت، واتە یەکەم کەسم ڕۆژی دوایی زیندوو دەبمەوە).

جا لەالترمذی و کەسانی دیکەدا لەحەدیسێکی سعید الخدری وەرگیراوە و دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (انا سيد ولد آدم يوم القيامة ولافخر، وبيدي لواء الحمد ولافخر وما من نبي يومئذ آدم فمن سواه إلاّ تحت لوائي، وأنا أول من تنشق عنه الأرض ولافخر).قال الترمزي: هذا حديث حسن صحيح.

واتە: من گەورەی نەوەی ئادەمم لەرۆژی دوایی بەبێ شانازی، وە لەژێر ئاڵای سوپاسی منن بەبێ شانازی وەهەموو پێغەمبەرەکان لەژێر ئاڵای منن وەمن یەکەم کەسم کە زەویم لەسەر شەق دەبێت بەبێ شانازی).

جا ئەگەر وتیان: چی دەکەین لەبارەی ئەو حەدیسە: (فلا أدري أفاق قبلي أم كان ممن استثنى الله عز وجل؟) واتە: جا نازام لەپێش من هەڵساوەتەوە یاخود یەکێکە لەو کەسانەی خودای عز وجل جیایی کردۆتەوە).

ئەوانەی خودای گەورە جیای کردوونەتەوە ئەوانە جیاکراوە لەنەفخەی ڕاچڵەکینو لەهۆش خۆچوون نەك لەراچڵەکینو لەهۆش خۆچوونی ڕۆژی دوایی هەروەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ﴾ (الزمر: ٦٨) واتە:( لەورۆژەدا فوو دەکرێت بەکەرەنادا هەرکەس لەئاسمان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت، مەگەر کەسێك خوا ویستی لەسەر مردنی نەبێت).

لێرەدا جیاکردنەوە رووی ئەدا لەمردنی بوونەوەرەکان لەرۆژی قیامەتدا؟ وە ئەوانەی ریوایەت دەکەن لەسەر ئەم حەدیسە سەحیحە کە رێك نەکەوتوون کەوا دەفەرموویێت: (فلا أدري أفاق قبلي أم جوزي بصعقة الطور) واتە: (جانازانم (موسى) ﷺ لەپێش من هەڵساوەتەوە یاخود لەدوای من لەمردنی رۆژی دواییدا).

هەندێك لەوانەی ریوایەت دەکەن وا گومان دەبەن کەوا ئەو مردنە بریتییە لەو فووکردنەی مردندا وە (موسا)ش لەناو ئەوکەسانەیە کەلێی جیاکراوەتەوە، ئەمەش هەرگیز رێك ناکەوێك لەسەر ئەو بیروباوەڕە نوێیەدا، چونکە هەڵسانەوە لەوکاتەدا بریتییە لە هەڵسانەوەی زیندووبوونەوە، جا چۆن دەفەرموویێت: (لا أدري أبعث قلبي أم جوزي بصعقة الطور).

ئەمەش بەجیاوازی ئەو مردنەیە کەهەموو بوونەوەرەکان دەمرێت لەرۆژی دواییدا لەوکاتەی خوای گەورە کارەکەی لەنێوان بەندەکان تەواوبکات و نووری خۆی پێشانی ئەوان دەدات ، جا هەموو لەهۆش خۆیان دەچن، بەڵام موسى ﷺ ئەگەر لەگەڵ ئەوان لەهۆش خۆی نەچێت بێگومان ئەوا هەژمار دەکرێت بەو لەهۆش خۆچوونەی کەوا خودای گەورە لەورۆژەی نووری خۆی نیشانی چیاکەداو جا لەتاوان و لەهەژمەتان پارچەپارچە بوو، جا خودای گەورە ئەو لەهۆش خۆچوونەی موسای تەعویز کردۆتەوە بەو لەهۆش خۆچوونەی بوونەوەرەکان، لەوکاتەی نووری خۆی پێشانی بەندەکان دەدات لەرۆژی قیامەتدا.

***

## کاتێك ڕۆحەکان پاش جیابوونەوەی لاشەکانیان، ئەگەر خۆیان خەریك کرد بەهەر شتێك هەندێك پەسەندتر دەکات تاوەکو خۆیان بەیەکتر بناسێنن و بەیەکتر بگەن، وە ئایا کێشە درووست دەکات ئەگەر خۆی تەرخانکرد بەهاوشێوەی لاشەکەی کەوا تێیدا بووە و ئایا داوای وێنەکەی دەکات؟ یاخود ئایا حاڵی چۆن دەبێت؟

ئەوە کێشەیەکە هێشتا و بەردەوام قسەی لەبارەیەوە دەکرێت وهەرکەسێکیش لەسەر ئەمەی نووسی سەرکەوتوو نابێت جا ئەگەر بەسوود بێت یاخود بێ سوود بێت، بەتایبەتی لەسەر یاساو بیرو باوەڕێك ئەوکەسەی دەڵێت ئەمە تەنها شتێکە لەسەر خوانی گفت و گۆ بەکێشەو هەڵپەسێردراوی ماوەتەوە، و نەك لەناو جیهانی دونیادا و نە لەدواییدا، و هیچ هاوشێوەو تواناو قەدەرو کەسێك نییە.

جا ئەو پرسیارە لەسەر نەریت و بیروباوەڕی ئەواندا ئەوا هیچ وەڵامێك بۆ ئەوان نییە، هەروەها ئەوەی دەڵێت: ئەمە بریتییە لە نیشانەیەك لەنیشانەکانی جەستە، لەیەکێکی دیکە جیای دەکاتەوەو پەسەندتری دەکات، ئەمە مەرجدارە بەلاشەوە هەڵسێت، جا جیاکردنەوەو پەسەندکردن لەپاش مردندا بۆی نیە، بەڵکو هیچ بوونێکی نییەو لەسەر بیروباوەڕی ئەوان، بەڵکو لەناو دەچێت و نامێنێت بە لەناوچوونی لاشەکە هەروەك هەموو خەسڵەت و سیفەتی زیندو لەناو دەچێت و نامێنێت، وە ناکرێت وەڵام لەسەر ئەو مەسەلەیە هەبێت تەنها لەسەر یاساو بیروباوەڕی ئەهلی سوننە کەوا بەڵگەی قورئان و سوننەت و نیشانەکان و هۆکارەکان لەسەر دەهێنێتەوە.

خوای گەورە وەسفی ڕۆحی کردووە بەهاتن و دەرچوون و گیان کێشان و مردن و و گەڕانەوە وە بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان کردنەوەو داخستنی دەرگاکان بۆ ڕۆحەکان.

جا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلآئِكَةُ بَاسِطُواْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُواْ أَنفُسَكُمُ﴾ (الانعام: ٩٣).

واتە:( خۆ ئەگەر ئەو ستەمكارانە ببینی چۆن لەنێش و ئازاری سەرەمەرگدا گیریان خواردووە فریشتەكانیش دەستیان لێدەكەنەوەو لێیان دەدەن (پێیان دەڵێن): گیانتان بدەن بەدەستەوە، دەی رۆحتان دەركەن).

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ * ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً * فَادْخُلِي فِي عِبَادِي * وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ (الفجر: ٢٧-٣٠).

واتە:( ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت كەتۆ لەو رازیت و ئەویش لەتۆ رازییە، دەبچۆرە ریزی بەندە چاكە نازدارو بەرێزەكانمەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە رازاوەكەمەوە).

ئەمەش لەوكاتەدا پێی دەوترێت كە رۆح لەلاشەدا جیادەكرێتەوە..

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا * فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ (الشمس: ٧-٨) واتە:( سوێند بەدەروون و ئەوزاتەی كە بەرێك و پێكی بەدیهێناوە، جا توانای خراپەو چاكەو خوانەناسی و خواناسی تێدا دابین كردووە).

جا خوای گەورە رایگەیاندووە كەوا ئەو دەروونی درووست كردووە هەوەك رایگەیاندووە كەوا لاشەی دروست كردووە..

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ (الأنفطار: ٧) واتە:( ئەو پەروەردگارە تۆی درووست كردووە بە رێك و پێكترین شێوە، بەجوانترین شێواز).

ئەمەش پاك و بێگەردی خودایە دەروونی ئادەمیزادی درووست كردووە، هەروەك لاشەكەشی درووست كردووە، بەڵكو لاشەكەی درووست كردووە، وەك قاڵبێك بۆ دەروونەكەی، جا یەكسانی لاشە بەردەوامییە بۆ یەكسانی دەروون، وە لاشە

ئامادەو درووستكراوە بۆ دەروون وەك قاڵب هەروەك دەروون ئامادەو درووستكراوە بۆ لاشە.

تا لێرەدا دەزانرێت كەوا لەلاشەكەیدا شێوەیەك وەردەگرێت كەلە كەسێكی دیكە پێی جیا دەكرێتەوە، جا دەروون و لاشە هەردووكیان كاریگەرییان بۆسەر یەكتری هەیە، لاشەی پاك و خاوێن وە پیس و خراپ لەدەروونی پاك و خاوێن و پیس و خراپدا دەست دەكەوێت، وە دەروونی پاك و خاوێن و پیس و خراپ لەلاشەی پاك و خاوێن و پیس و خراپدا دەست دەكەوێت.

جا توندو بەهێزترین شت كەوا پەیوەندی و گونجاوی كاریگەری و كار لێك كردنی لەسەر ئەوەی تردا هەبێت ئەوا ڕۆح و لاشەیە، بۆیە لەكاتی جیابوونەوەی ڕۆح لەلاشەدا پێی دەوترێ: ئەی دەروونی پاك وەرە دەرەوە كەوا لەلاشەیەكی پاكدا بوویت، ئەی دەروونی پیس وەرە دەرەوە كەوا لەلاشەیەكی پیس دابوویت.

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ (الزمر: ٤٢).

واتە: (هەر خودایە كە گیانەكان دەكێشێت لەكاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش كە نەمرد لەخەوەكەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە، جا ئەوكەسەی كەخوا بڕیاری مردنی دابێت ڕۆحەكەی دەگرێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی ئەوكەسەش كە ڕۆژی تەواو نەبوویێت دەینێرێتەوە بۆی تا كاتێكی دیاریكراو).

جا خودای گەورە وەسفی كردووە بەمردن وە گرتن و ناردنەوە، هەروەك وەسفی كردووە بەچوونە ناوەوەو دەرچوون و گەڕاندنەوەو یەكسانی كردن و ڕێكخستن.

وە پێغەمبەر(ﷺ) ڕایگەیاندووە: (أن بصر الميت يتبع نفسه إذا قبضت) [١٠٩].

واتە: (ئەگەر ڕۆح دەرچوو چاوی مردو بەدوایدا دەڕوانێت).

---

(١٠٩) مجمع الزائد: ٢/٣٣٠

هەروەها رایگەیاندووە: (أن الملك يقبضها فتأخذها الملائكة من يده فيوجدلها كأطيب نفخة مسك وجدت على وجه الأرض، أو كأنتن ريح جيفة وجدت على وجه الأرض) [110].

واته:( گیانێکیش گیانی دەکێشێت جا فریشتەکان دەیخەنە ناو کفنە بۆن خۆشەکە کەوا بۆنی زۆر خۆشترە لەبۆنخۆشترین میسك لەسەر رووی زەوی، یاخود بۆنخۆشترە لەناو ئەو بۆنانەی کە لەسەر زەویدا هەیە).

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە: (أنها تصعد الى السماء ويصلي عليها كل ملك لله بين السماء والأرض وأنها تفتح لها أبواب السماء فتصعد من سماء إلى سماء حتى ينتهي بها الى السماء التي فيها الله عز وجل، فيتوقف بين يديه، ويأمر بكتابة أسمه في ديوان أهل عليين أو ديوان أهل سجين، ثم ترد الى الأرض، وأن روح الكافر تطرح طرحاً، وأنها تدخل مع البدن في قبرها للسؤال).

واته:( ئەو رۆحە بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان جا هەموو فریشتەکانی خودا لەنێوان زەوی و ئاسماندا نوێژی لەسەر دەکەن ودەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە و ئاسمان بەئاسمان بەرزی دەکەنەوە هەتاکو دەیگەیەننە ئەو ئاسمانەی خوای گەورەی لێیە، جا لەنێوان بەزەیی ئەودا دەوەستێت، و فەرمان دەکات ناوی بنووسن لەکتێبی ئەهلی بەرزەکان یاخود لەکتێبی ئەهلی زنجیرکراوان، پاشان دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەرزەوی، جا رۆحی کافر دەردەکرێت و دەچێتەوە ناو لاشەکە لەناو گۆڕەکەیدا بۆ پرسیارکردن).

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) رایگەیاندووە: (بأن نسمة المؤمن وهي روحه طائر يعلق في شجرة الجنة حتى يردها الله الى جسدها) [111].

---

(110) مسند أحمد: ٤/٢٨٧، و سنن أبي داود (٣٢١٢).

(111) الموطأ: ١/٢٤٠

واته:( بێگومـان ڕۆحـی ئیمانـدار وەك ڕۆحـی باڵندەیـەك وایـە لـە دارو درەختـی بەهەشت دەخوات تاوەکو خودای گەورە دەینێرێتـەوە بۆ لاشەکەی).

هەروەها ڕایگەیاندووە: (أن أرواح الشهداء في حواصل طير خضر تـرد أنهـار الجنـة وتأكل من ثمارها).

واته:( بێگومان ڕۆحی شەهیدەکان لەناو سـکی باڵنـدەی سـەوزدان لـەڕووبارەکانی بەهەشـت دەخواتـەوەو لەبەروبوومەکانیـشی دەخـوات، ڕووبارەکـانی بەهەشـت گوزەردەکات و لە بەروبوومەکەشی دەخوات)

هەروەها دەفەرمووێت: (ان الروح تنعم وتعذب في البرزخ الى يوم القيامة) [112].

واتـه:( بێگومـان ڕۆح لـەژیانی بەرزەخـدا لـەژیانی خۆشـدا دەبێـت و ئـازاریش دەکێشێت تاوەکو ڕۆژی قیامەت).

خودای گەورە لەبارەی ڕۆحەکانی نەتەوەی فیرعەون ڕایگەیاندووە کەوا ئێواران و بەیانییان تووشی ئاگر دەبن پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت، هەواڵیشی داوە لـەبارەی شەهیدەکان کەوا ئەوان زیندوون و لەلایـەن خـودای خۆیانـەوە ڕزق و ڕۆزییـان بـۆ فەراهەم کراوە، ئەمە ژیانی ڕۆحەکانیانـە، ڕزق و ڕۆزیـشییان بەردەوامـە، کەچـی لاشەکانییان نەماون و پارچە پارچە بوون.

جا پێغەمبەرﷺ ئەو ژیانەی ئـاوا ڕاڤـەکردووە: (بـأن أرواحهـم في جـوف طـير خضر لها قناديل معلقة بالعرش تسرح من الجنة حيـث شـاءت، ثـم تـأوي إلى تلـك القناديل، فأطلع اليهم ربهم إطلاعـة فقـال: هـل تـشتهون شـيئاً؟ قـالوان أي شـيء نشتهي نسرح من الجنة حيث شئنا؟ فعل بهم ذلك ثلاث مرات، فلما رأوا أنهـم لـن يتركوا من أن يسألوا قالوا: نريد أن ترد أرواحنا في أجسادنا حتـى نقتـل في سـبيلك مرة أخرى) [113].

---

([112]) شرح الصدور: ٣٠٥.

([113]) مسلم (١٨٨٧) و سنن الترمذي (٣٠١١).

واتە: (بێگومان رۆحەکانیان لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە چەند چرای لێیە هەڵواسراوە بەعەرشدا پشوو دەدەن و رادەبوێرن لەبەهەشتا هەرچۆن بیانەوێت، پاشان دەچن بۆلای چراکان، ئینجا خودای پەروەردگار خۆیانی بۆ دەردەخات بەتەواوی جا دەفەرموێت: ئایا ئارەزووی هیچ شتێك دەکەن؟ دەڵێن: ئایا هیچ شتێکی تر ماوە ئارەزووی بکەین وا ئێمە بەئارەزووی خۆمان لەبەهەشت پشوو دەدەین و دەسوورێینەوە، جا کاتێك دەبینن ئەوان وازیان لێ ناهێنن لەپرسیارکردن دەڵێن: دەمانەوێت رۆحەکانمان بگەڕێتەوە لاشەکانمان تاوەکو جارێکی دیکە لەپێناوی تۆدا دەکوژرێین و شەهید دەبین).

وە لەپێغەمبەرداﷺ هاتووە کەوا: (أن أرواح الشهداء في طير خضير تَعْلُق من ثمر الجنة)[114].

واتە:( بێگومان رۆحی شەهیدەکان لەناو باڵندەیەکی سەوزدایە لەبەروبوومی بەهەشت دەخوات).

ئیبن عباس وتی: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (لما أصيب أخوانكم بأُحد جعل الله أرواحهم في أجواف الطير خضر ترد أنهار الجنة وتأكل من ثمارها، وتأوي الى قناديل من ذهب في ظل العرش، فلما وجدوا طيب مشربهم ومأكلهم وحسن مقليهم قالوا: ياليت إخواننا يعلمون ما صنع الله لنا لئلا يزهدوا في الجهاد ولاينكلوا عن الحرب، فقال الله عز وجل: أنا أبلغهم عنكم).

واتە:( کاتێك براکانتان لەغەزای ئوحود شەهیدکران خودای گەورە رۆحەکانی ئەوانی دانا لەناو سکی باڵندەی سەوزدا دەگەڕێت بە رووبارەکانی بەهەشتداو بەبەرووبوومەکەی دەخوات، وە دەچن بۆلای ئەو چرایانەی لە زێڕ درووست کراون کەوا لەژێر سێبەری عەرشدان، جا کاتێك خواردن و خواردنەوە خۆشەکانییان و قسەو گفت و گۆ چاکانیان بینی دەڵێن: خۆزگە دەزانن کەوا خودای گەورە چی بۆ

(114) سنن الترمذي (١٦٤١).

ئێمە کردووە، ئەوکاتە زیاتر تێدەکۆشان لـەجیهاد و خـەباتکردن لـەپێناوی خـواوە هەرگیز دوور نەدەکەوتنەوە لەشەڕکردن پشتییان تێ نەدەکرد، جا خوای عـز وجـل، دەفەرمووێت: من لەجیاتی ئێوە پێیان رادەگەیەنم).

جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دابەزاند: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ (آل عمـران: ١٦٩) [١١٥]، ئیمام احمد ریوایەتی کردووە.

ئەمەش روون و ئاشکرایە لەخواردن و خواردنەوەو جوولـەو گواسـتنەوەو قـسەو گفت و گۆکردنی رۆح، ئەگەر خوا حەزبکات بەدرێژی باسی ئەو بابەتە دەکەین.

جا ئەگەر ئەمە باری رۆحەکان بێت ئەوا جیا کردنەوەی و پەسندکردنی پاش دابـڕان لەلاشەدا ئاشکراتر دەبێـت لەجیاکردنـەوەی لاشـەکان، و لێـك چـوون و هاوشـێوە لەنێوان رۆحەکان دوورترە لە لێك چوونی لاشـەکان، چـونکە لاشـەکان زیـاتر لێـك دەچن، بەڵام رۆحەکان لێك چوونیان کەمترە.

لەمەدا روون دەبێتەوە کە ئێمە جەستەی پێغەمبـەران و سـەحابەو پیاوچـاکانمان نەبینیوە، و ئەوانەش زۆر پەسەندترو جیاکراوەترن لەناو زانـستی ئێمـەدا، ئەمـەش ناگەڕێتەوە کەوا جیاکردنـەوەو پەسـەندتر تـەنها بـۆ لاشـەکان بێـت کـەوا بۆمـان باسکراوە، لەسیفەتی لاشەکانیان تایبەت نییـە لەیەکێکیانـەوە بـۆ یـەکێکی تـر، بەڵکو جیاکردنەوەو پەسەندی لەلای ئێمەدا بەوەی فێربووین زانیومانە بەسـیفات و چۆنییەتی رۆحەکانیانە، وە جیاکەرەوەو پەسەندی رۆح لەرۆحێکی دیکە بەسیفات و تایبەتمەندییـەکانیان گـەورەترە لەجیاکردنـەوەی لاشـەیەك لەلاشـەیەکی دیکـە بەتایبەتمەندییەکانی.

---

(١١٥) مسند أحمد: ١/٢٦٦، و سنن أبي داود (٢٥٢٠).

ئايا نابینینت کەوا لاشەی ئیماندارو کافرێك زۆر پێك دەچن و هاوشێوەن کەچی رۆحەکانییان گەورەتر دیارە لەجیاکەرەوەو پەسەندی، تۆ دەبینیت دوو برا لەرووخسارو دروستکردندا زۆر پێك دەچن کەچی رۆحەکانییان زۆر لێك جیاوازن.
کاتێك شێوەیەکی جوان و رووخسارێکی چاك و پێکهاتەیەکی رووخۆشی و رەوشت بەرزی دەبینیت ئیلا دەبینیت رۆحێکی گونجاو و هاوشێوەی بۆی هەڵبەسێردراوە.
جا ئەگەر رۆحەکان بەرزکرانەوە ئەوا فریشتەکانیش هەندێك لەهەندێکییان جیاکراوەو پەسەندترن بەبێ لاشە هەڵیاندەگرێت، هەروەها جنۆکەکانیش، جیاکەرەوەو پەسەندتری رۆحی ئادەمیزاد لەپێشترو یەکەمینە.

❊❊❊

## ئایا رۆح لەکاتی پرسیارکردن دەگەڕێتەوە بۆلای مردووەکە لەگۆڕەکەیدا یاخود نا؟

بێگومان بۆنێمە بەسە کەوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاری لەو مەسەلەیە داوە، و فریامان کەوتووە، لەقسەو قسەلۆکی خەڵکی کەوا بەجۆرێك روونی کردۆتەوە کە رۆح دەگەڕێتەوە لای مردووەکە، البراء کوری عازب دەڵێت: ئێمە لەبەقیع الغرقد لای جەنازەیەك بووین لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) هاتەلامان دانیشت ئێمەش لەچوار دەوری دانیشتین هەروەك لەسەر سەرمان باڵندەیەك هەبێت نەئەجوولاین جا سەیری کردو فەرمووی: (أعوذ بالله من عذاب القبر) واتە: (پەنا دەگرم بەخودا لەسزاو ئازاری گۆڕ) ئەمەی سێ جار دووبارە کردەوە.
پاشان فەرمووی: (إن العبد اذا كان في إقبال الآخرة وانقطاع من الدنيا نزلت إليه ملائكة كأن وجوههم الشمس، فيجلسون منه مد الصبر، ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند رأسه فيقول: أيتها النفس الطيبة اخرجي الى مغفرة من الله ورضوان).

واته: ( ئەگەر هاتوو بەندەيەك لـەرۆژی دوايـی نزيـك بـووەوە و خەريكـە لـەدونيا دادەبڕێت ئەوكاتە فريشتە بۆی دادەبەزن كە رووخسارييان هـەروەك خـۆر وايـە جـا لەلای دادەنيشن بەدووری بينينی چاو، پاشان فريـشتەی گيـانكێش دێـت و لـەلای سەری دادەنيشێت جا پێی دەڵێت: ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پاك وەرە دەرەوە بـۆ لێبوردەيی و رەزابوون لەلايەن پەروەردگار).

دەفەرمووێت: (فيـصعدون بهـا فـلا يمـرون بهـا الا قـالوا: ماهـذا الـروح الطيـب! فيقولون: فلان بن فلان بأحسن أسمائه التي كانوا يسمونه في الدنيا حتى ينتهـوا بهـا الى السماء الدنيا، فيستفتحون له فيفتح له، فيشيعه مـن كـل سمـاء مقربوهـا الى السماء التي تليها حتى ينتهي بها الى السماء الـتي فيهـا الله تعـالى، فيقـول الله عز وجل: اكتبوا كتاب عبدي في علبين، وأعيـدوه الى الارض، فـإني منهـا خلقـتهم وفيها أعيدهم ومنها أخرجهم تارة أخرى).

واته: (جا كۆمەڵێك فريشتە بەرزی دەكەنەوە بەلايدا تێپـەڕنابن ئـيلا دەڵـێن: ئـەم رۆحە بۆن خۆشە چييە! جا دەڵێن: فلانی كوڕی فلانە بەجوانترين شێوە ناوی دەبـەن كەوا لەدونيا ناويان دەهێنا تاوەكو لەئاسمانی دونيا دەيبەنـە دەرەوەو كۆتـايی پـێ دەهێنن، ئينجا داوای بۆ دەكـەن ئاسمانـەكانی بـۆ بكرێتـەوە جـابۆی دەكرێتـەوە، لەهەموو ئاسمانەكاندا لايەنگيری دەبن و لەنزيكی دەبن بۆ ئـەو ئاسمانـەی بەدوايـدا دێت تاوەكو كۆتايی دێت و دەگاتە ئەو ئاسمانەی كـە خـودای گـەورەو ميهرەبـانی لێيە، جا خودای گەورە دەفـەرمووێت: نـاوی بەنـدەی مـن لەئاسمانـە بەندەكانـەوە بنووسنەوە، بيگەڕێننەوە بۆسەر زەوی، وەمن لەزەوی درووستم كردوون و بۆئـەوێش دەيانگەڕێنمەوە، جارێكی تريش لەوێ دەريان دەهێنمەوە).

وە فەرمووی: (فتعاد روحه في جسده، فيأتيه ملكان فيجلسانه، فيقولان لـه: مـن ربك؟ فيقول: ربي الله، فيقـولان: مـا دينـك؟ فيقـول: ديـني الاسـلام، فيقولـون لـه: ماهذا الرجل الذي بعث فيكم؟ فيقول: هو رسول الله، فيقولان له: وما علمك بهـذا؟

فيقول: قرآن كتاب الله فآمنت بـه وصـدقت، فينـادي منـادٍ مـن الـسماء أن صـدق عبدي فأفرشوه من الجنة، وافتحوا له باباً منها).

واته:( ئينجا رۆحەكەی دەگەڕێتەوە بۆ لاشەكەی، لەوكاتە دوو فريـشتە دێنـەلای و دای دەنيشێنن، پێی دەڵێن: خوای تۆ كێيە؟ دەڵێـت: خـودای مـن (الله)يـە، پێـی دەڵێن: ئايينی تۆ چييە؟ دەڵێت: ئاينی من ئيسلامە، جـا پێـی دەڵـێن: ئـەوپياوە كێيە لەناو ئێوە رەوانەكراوە؟ دەڵێت: ئەوە پێغەمبەری خودايە، پێی دەڵێن: ئايا چ زانياريت دەربارەی هەيە؟ دەڵێت: كتێبی خوا كە قورئانە خوێندوويتەوە ئيمانم پێی هێناوەو بەڕاستيشم داناوە، جا بانگەرێك لەئاسماندا بانگ دەكات كەوا بەندەی من راست دەكات جا لەبەهەشتەوە فەرشی بۆ راخەن، و لەوێ دەرگايەكی بۆ بكەنەوە).

دەفەرمووێت: (فيأتيه من ريحها وطيبها، ويفسح لـه في قـبره مـد البـصر) واتـە: (لەبەهەشتەوە بۆن و خۆشييەكی بۆدێت، و بـەدووری بينـينی چـاو گۆڕەكـەی بـۆ فراوان دەكرێت).

ئينجا فەرمووی: (ويأتيه رجل حسن الوجه حسن الثيـاب طيـب الـريح، فيقـول: أبشر بالذي يسرك، هذا يومك الذي كنت توعده فيقول له: من أنت؟ فوجهـك وجـه الذي يجيء بالخير، فيقول: أنا عملك الصالح، فيقول: رب أقم الساعة حتى أرجع إلى اهلي ومالي).

واتە: (ئينجا پياوێكی رووخسار جوان و پۆشاك خاوێن و بۆنخۆش دێتـەلای دەڵێـت: مژدەدەربە بەوەی دڵخۆشت دەكات، ئەوا ئەو رۆژەی تۆيە كەوا پەيمانی پێت دابـوو، پێی دەڵێت: تۆ كێيت؟ ئەو ڕووەی تۆ ئەو ڕوودیە كە خێری هێنـاوە، دەڵێـت: مـن كردەوە چاكەكانی تۆم، جادەڵێ: خودايە قيامـەت هەڵـسێنە تـاوەكو بەرووخۆشـی بگەڕێمەوە لای كەسوكارەكەم).

وە فەرمووی: (وإن العبد الكافر إذا كان في انقطاع من الدنيا وإقبال مـن الآخـرة نزل اليه من السماء ملائكة السود الوجه معهم المسوح، فيجلسون منه مد البـصر،

ثم يجيء ملك الموت حتى يجلس عند رأسه فيقول: أيتها النفس الخبيثة إخرجي الى سخط من الله وغضب).

واتە: (كاتێك بەندەیەكی كافر نزیكی مردن دەبێتەوە و خەریكە لەدونیا دادەبڕێت، فریشتەكان لەئاسمانەوە بۆی دادەبەزن كە رووخساریان رەشەو كفنێكی لەئاگریان پێیە، لەلای دادەنیشن هەتا چاو بڕدەكات، پاشان فریشتەی گیانكێش لەلای سەری دادەنیشێت و دەڵێت: ئەی رۆحی پیس وەرە دەرەوە بۆلای سزاو تووڕەی خوای گەورە).

جا دەفەرمووێت: (فتفرق في جسده فينتزعها كما ينتزع السفود من الصوف المبلول، فيأخذها، فإذا أخذها لم يدعوها في يد طرفة عين حتى يجعلوها في تلك المسوح، ويخرج منها كأنتن روح جيفة وجدت على الارض، فيصعدون بها، فلا يمرون بها على ملأ من الملائكة الا قالوا ماهذا الريح الخبيث؟ فيقولون: فلان بن فلان بأقبح أسمائه التي كان يسمى بها في الدنيا، حتى ينتهي الى السماء الدنيا، فيستفتح له فلا يفتح).

واتە: (جا رۆحەكە لەلاشەكەدا جیادەبێتەوە وەكو چۆن شیشێكی گۆشت برژاندن بكرێت بەناو خوریەكی تەڕی ئاڵۆزدا، جا لەدەست فریشتەی گیانكێشانی وەردەگرن، و نایەڵن چاو بتروكێنێ هەتا دەیگەیەننە ناو ئەو كفنە زبرە بۆن ناخۆشە، وەناخۆشترین بۆن كەلەسەر زەویدا هەیە، ئینجا بەرزی دەكەنەوەو بەلای هەر كۆمەڵە فریشتەیەكدا تێدەپەڕن دەڵێن ئەم رۆحە پیسە چییە؟ دەڵێن: ئەوە فلانی كوڕی فلانە بەناشرینترین ناو بانگی دەكەن كەلە دونیا پێی ناسراوە، هەتا دەگەیەنرێتە ئاسمانی دونیا، داوای كردنەوەی دەرگاكانی ئاسمانی بۆ دەكەن بەلاّم بۆی ناكرێتەوە).

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاء وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾ (الأعراف: ٤٠).

واته:( هەرگیز دەرگاکانی ئاسمانییان بۆ ناکرێتـەوەو ناچـنە بەهەشـت هـەتا وشـتر نەچێت بەکونی دەرزیدا).

جا خودای گـەورە دەفـەرموێت: نـاوی بەندەکـەم بنووسـن لـە (سـجين)دا کـە پەرتووکێکە کارو کردەوە خراپەکانی تێدا دەنووسرێت، کە لەژێر چینی زەوی هـەرە خوارەوەی زەوی دایە، ئینجا رۆحەکەی دەردەکەن..

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَـن يُـشْرِكْ بِاللَّـهِ فَكَأَنَّمَـا خَـرَّ مِـنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ (الحج: ٣١).

واته: (هەرکەسێ هاوبەش بـۆ خـودا بڕیاربـدات وەکـو کەسـێك وایـە لەئاسمانـەوە بکەوێتە خوارەوە و باڵندە شاڵاوی بۆ ببات یان بایەکی بەهێز بیباتە نـاو قـووڵترین شوێن لەخوارووی زەویدا).

(فتعاد روحه في جسده، ويأتيه ملكان فيقولان له: من ربك؟ فيقـول: هـاه هـاه لا أدري، فيقولان له: ماهذا الرجل الذي بعث فيكم؟ فيقول: هاه هاه لا أدري، فينـادي منادٍ من السماء أن كذّب عبدي فأفرشوه من النار، وأفتحوا له باباً إليـه، فيأتيـه من حرها وسمومها، ويضيق عليه قبره حتى تختلف فيه أضلاعه، ويأتيه رجـل قبـيح الوجه قبيح الثياب منتن الريح، فيقول: أبشر بالذي يسؤك، هذا يومـك الـذي كنـت توعد، فيقول: مـن أنـت؟ فوجهـك الوجـه الـذي يجـيء بالـشر، فيقـول: أنـا عملـك الخبيث، فيقول: رب لاتقم الساعة).

واته: (جا رۆحەکەی دەگەیەندرێتەوە بۆ لاشەکەی و دوو فریـشتە دێنـەلای و پێـی دەڵێن: خوات کێیە؟ دەڵێت ها ها نازانم، پێی دەڵێن: ئەو پیـاوەی لەناوتانـدا بـوو چی بوو؟ جادەڵێت: ها ها نازانم، جا بانگەرێك بانگـدەکات لەئاسمانـدا کـەوا ئـەو بەندەیەی من درۆی کرد و لەدۆزەخدا فەرشی بۆ ڕاخەن، و دەرگایەکی لەگۆڕەکـەی بۆبکەنـەوە تـاکو گـڕو هـاڵاوی دۆزەخـی بۆبـچێت، وە گۆڕەکـەی لەسـەر تەسـك دەکرێتەوە هەتا هەموو پەراسووەکانی لەپشتەوە تێك دەشکێنێت، پاشان پیـاوێکی

رووخسار ناشرین و پۆشاك ناشرین و بۆن ناخۆش دێتەلای و پێی دەڵێت: مژدەدەربە بەوەی پێت ناخۆشە، ئا ئەمە ئەورۆژەیە کە بەڵێنت پێ درابو لێی ئاگادار دەکرایتەوە، جا دەڵێت: ئەتۆ کێیت؟ کە رووخسارت لەرووخساری پیاوی شەڕانی دەچێت، پێی دەڵێت: من کارو کردەوە ناشرینەکەی تۆم، جادەڵێت: خودایە قیامەت هەڵمەستێنە).. ئیمام أحمد و أبوداود و نسائي و إبن ماجە ریوایەتییان کردووە.

ئەبو محمد کوڕی حزم لەکتێبی (الملل والنحل) دەڵێت: بەلاّم ئەوەی واگومان دەبات کەوا مردو لە گۆڕەکەیدا زیندو دەبێتەوە لەرۆژی قیامەتدا ئەمە هەڵەیە، وە ئەوئایەتانەی کەوا باسمانکرد ئەمەیان قەدەغە دەکات، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ (غافر: ١١).

واتە: (کافرەکان لەوەلاّمدا دەڵێن پەروەردگار تۆ دەسەلاّتت بێ سنوورە دووجار ئێمەت مراندووە و دووجار ئێمەت زیندوو کردۆتەوە)

وە هەروەها دەفەرمووێت: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ (البقرە: ٢٨).

واتە:( چۆن بێ بڕوا دەبن بەخوا لەکاتێکدا ئێوە بێ گیان خوا درووستی کردوون و گیانی بەبەردا کردن، پاشان دەتانمرێنێت و دوایی زیندووتان دەکاتەوە).

ئەگەر مردوو لەگۆڕەکەیدا زیندو بێتەوە ئەوا خودای گەورە دەبو سێ جار بمانمرێنێت و سێ جار زیندوومان بکاتەوە، ئەمەش نارەواو پێچەوانەی قورئانە مەگەر ئەوەی خودای گەورە زیندووی کردبێتەوە نیشانەیەکە بۆ پێغەمبەرێك لەپێغەمبەران، وە ئەوانەی لەماڵەکانیان دەرچوون، کەوا ئەوانە بەهەزارەها کەس بوون بەمردن ئاگادارکرانەوە، جاخودای گەورە پێی فەرموون: بمرن هەموویان مردن، پاشان زیندوویان کردنەوە.

لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الآنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ (الزمر: ٤٢).

واتە: (هەرخوایە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش کە نەمرد لەخەوەکەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە، جا ئەوکەسەی کە خوا بڕیاری مردنی دابێت ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی، ئەوکەسەش کەرۆژی تەواو نەبووبێت دەنێرێتەوە بۆی تا کاتێکی دیاریکراو ).

بەدەقی قورئان ئەو ڕۆحانە کەوا باسمان کرد ناگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی مەگەر بۆ کاتێکی دیاریکراو ئەویش ڕۆژی قیامەتە، هەروەها پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە کە لەشەو ڕۆیەکەی بەئاسماندا ڕۆحەکانی بینیوە ئەو ڕۆحانەی لەدەستەراستی ئادەم بێت ئەهلی بەختەوەرن، ئەوانەی لە دەستە چەپدا بوو ئەوا ئەهلی ناخۆشی و ئازاربوون.

پێغەمبەرﷺ لەجەنگی بەدر قسەی لەگەڵ مردووەکان دەکرد و ئەوانیش گوێیان لەقسەی پێغەمبەر دەبوو پێش ئەوەی گۆڕیان بۆ لێبدەن، جا کە سەحابەکان وتیان: ئەمانە مردوون و وشك بوونەتەوە بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بزانن ئەمانە گوێیان لێیە بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە.

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾ (فاطر: ٢٢).

واتە: (بەڵام ئەی پێغەمبەر تۆ ناتوانیت پەیامەکەت بگەیەنیت بەوکەسانەی لەناو گۆڕدان) جا بیستنی ئەوکەسانەی لەناو گۆڕدان بەدوور دەخاتەوە بێ گومان ئەویش لاشەکانن.

پاشان لەرێگای إبن عیینەوە باسدەکات، ئەویش لە منصور کوڕی صفیە، ئەویش لە صفیەی کچی شیبە، وتی: ئیبنو عمر چووە مزگەوت و چاوی بە ئیبنو الزبیر کەوت لەوێ دانراوە، جا پێیان وت: ئەمە ئەسمای کچی ئەبوبکری الصدیقە،

ئیبنو عمر رووی خۆی بۆلای وەرگێڕا و ئارامی کردەوە و پێی وت: ئەم لاشانە هیچ شتێکی ئەوتۆ نییە، بەڵکو رۆحەکان لەلایەن خوداوەیە، جا دایکی وتی: چ شتێك قەدەغەم دەکات کەوا سەری یحیى کوڕی زەکەریا پێشکەش بکەم بۆ ستەمکارێك لە ستەمکارانی بەنی ئیسرائیل[116].

وتم: ئەوەی محمد باسی کردووە هەق و ناهەقی تێدایە، کەوا وتەکەی: گومان بردنی بەوەیە گوایە مردوو لەگۆڕەکەیدا زیندوو دەبێتەوە ئەمە هەڵەیە، جا ئەمە یەکدەنگی تێدایە کەوا ئەوژیانە لەدونیادا پەیمانی پێدراوە کە رۆح و جەستە پێکەوە هەڵسن بەرێکخستن و راپەڕاندنی کاروبارەکان، وە لەگەڵیدا پێویستی بەخواردن و خواردنەوەو جل و بەرگ هەیە.

جا ئەگەر ویستی وابو بۆ ژیانێکی دیکە ئەوا جیایە لەو ژیانەی ئێستا، بەڵکو رۆح دەگەڕێتەوە بۆ لای، ئەو گەڕانەوەیەش وەك ئەو گەڕانەوەیە نییە کە لەدونیادا بوو بۆئەوەی پرسیاری لێبکرێت و تاقی بکرێتەوە لەگۆڕەکەیدا، ئەمەش رەوایە، وە نەفی کردن و دوورخستنەوەشی هەڵەیە، دەقە راست و راشکاوەکانیش بەڵگەن لەسەری، هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویێت: (فتعاد روحه في جسده) واتە: (بێگومان رۆحەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی)، باسی لاوازی حەدیسەکەش وەڵام دەدەینەوە إن شاءالله.

بەڵام ساخکردنەوەو دەرخستنی ئەو فەرموودە پیرۆزە: ﴿رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾ واتە:( کافرەکان لەوەڵامدا دەڵێن پەروەردکار تۆ دەسەڵاتت بێ سنوورە دووجار ئێمەت مراندووەو دووجار ئێمەت زیندوو کردۆتەوە).

ئینجا ئەمە سەلماندنی گەڕاندنەوەی رۆح بۆ لاشەکە دوور ناخاتەوە، هەروەك چۆن بەنی ئیسرائیل کوژران و خودای گەورەش پاش کوشتنی زیندووی کردنەوە پاشان مراندنی.

(116) سەیری: الفصل في الملل: ٤/٦٧ بکە

نهێنی ئەمەش: گەڕاندنـەوەی رۆح بـۆ لاشـە پێـنج جـۆرە وە پەیوەنـدی جیـاوازی بەیاساکانەوە هەیە.

یەکەم: پەیوەندی بە کۆرپەلە هەیە لەناو سکی دایك.

دووەم: پەیوەندی هەیە بە پاش دەرچوونی بۆسەر رووی زەوی.

سێیەم: پەیوەندی هەیە بەحاڵەتی خەوتن جا لەرووییەکەوە پەیوەستە پێیـەوە، وە لەرووییەکی دیکەوە لێك جیابوونەوەیە.

چـوارەم: پەیوەنـدی هەیـە بـەژیانی بەرزەخـەوە کـەوا لـەنێوان مـردن و زیندووبوونەوەدایە، وئەگەر رۆح لەلاشەکە جیابووەوە و کۆتایی پێهـات، لـەوەڵامی ئەمـەدا پێـشتر باسمـان کـرد سـەبارەت بـەو حەدیـسانەی کـەوا بەڵگـەن لەسـەر وەڵامدانەوەی مردو لەکاتی سەلام کردن لێیان ئەم وەڵام دانەوەیەش گەڕانەوەیەکی تایبەتیە لەژیانی لاشە واجب نابێت پێش رۆژی قیامەت.

پێنجەم: پەیوەنـدی هەیـە بـە زیندووبونـەوەی لاشـەکان، ئەمـەش تـەواوترین جۆرەکانە کەوا پەیوەندی هەیە بەلاشە.

بەڵام ئەم فەرموودەیە خودای گەورە کەوا دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ ( الزمر: ٤٢).

واتە:( هەرخوایە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هـەروەك ئەوگیانـەش کـە نەمرد لەخەوەکەیدا هەرخوا بـۆی دەنێرێتـەوە، جـا ئەوکەسـەش کـە خـوا بڕیـاری مردنی دابێت رۆحەکەی دەگرێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی، ئەوکەسەش کـەرۆژی تەواو نەبووبێت دەینێرێتەوە بۆی تا کاتێکی دیاریکراو).

جا گـرتنی رۆحەکـە لەلایـەن پـەروەردگارەوە خـودا بڕیـاری مردنـی لەسـەرداوە گەڕانەوەی بۆ لاشەی مردووەکـە بـەدوور ناخاتـەوە لەکاتێکـدا کـەوەڵام دەداتـەوە ئەمەش مانای ئەوەنییە کە ئەو ژیانە بێت کەلە دونیادا بەڵێنی پێدراوە.

کەسی خەوتووش ئەگەر رۆحەکەی لەلاشەکەیدابێت ئەوا خۆی زیندوە، وە ژیانەکەشی جیاوازە لەگەڵ کەسێکی بەئاگا، چونکە خەوتن برای مردنە[117]، هەرئاواش ئەگەر رۆحەکەی گەڕایەوە لاشەکەی ئەوا مردووەکە لەحاڵەتێکی مامناوەندی دایە لەنێوان ژیان و مردن کەوا رۆحەکەی ناگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی وەکو حاڵەتی نووستنی مام ناوەندی لەنێوان ژیان و مردندا، جا ئەم جۆرە تێگەیشتنە زۆر گیروگرفتت لەسەلا لادەبات.

بەڵام هەواڵدانی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی دیتنی پێغەمبەران لەشەوڕەوەکەیدا، کەوا هەندێك لەوانەی حەدیس لێکدەدەنەوە پێداگری دەکەن لەسەر ئەوەی کەوا پێغەمبەر بینیویەتی تارمایی و رۆحەکانیان بوە، دەفەرموویێت: ئەوانە زیندوون لەلایەن خوداوە، وە حەزرەتی ئیبراهیمی بینی پشتی بە کۆلەگەکانی کەعبەی پیرۆزدابو، و حەزرەتی موسای بینی لەگۆڕەکەیدا هەڵسابو نوێژی دەکرد کاتێك باسی پێغەمبەرانی دەکرد کەبینیان ئەوا باسی تارماییەکەی دەکرد جا موسای بینی گەنم رەنگێکی لاوازی درێژ بوو هەروەك بەپیاوانی هۆزی (شنۆۃ) چوویێت، وە حەزرەتی عیسای بینی پرچی دڵۆپە ئاوی لێ دەتکا هەروەك تازە لەگەرماو هاتبێتە دەرەوە، حەزرەتی ئیبراهیمیشی بینی بەخۆی چواند.

هەندێك ناکۆکن لەسەر ئەمەوە دەڵێن: ئەو دیتنە تەنها بۆ رۆحەکانیانە بەبێ لاشەکانیان، و جەستەکانیان لەزەویدا بەجێ ماون، بەڵکو زیندوو دەکرێتەوە ئەو تا رۆژەی جەستەکان زیندوو دەکرێنەوە، پێش ئەمە زیندوو نابێتەوە، ئەگەر هاتو پێش ئەمەجەستەکان زیندو بکرێتەوە ئەوا پێش رۆژی قیامەت زەوی شەق دەبوو، ئەوا تامی مردنی دەچێشت لەکاتی فووکردن بەکەڕەنادا، ئەمەش مردنی سێیەمە. ئەمەش هەرگیزاو هەرگیز ناڕەوایە، ئەگەر هاتبا لاشەکان لەگۆڕەکان زیندو ببنەوە ئەوا خودای گەورە رۆحەکەی بۆ ناگەڕێنێتەوە، بەڵکو لەبەهەشتدا دەبێت، وە

---

(117) سەیری: مجمع الزوائد:(١٠/٤١٥) بکە.

لەپێغەمبەر(ﷺ) وەرگیراوە کـە دەفـەرمووێت: خـوای گـەورە بەهەشـتی حـەڕام کردووە لەسەر پێغەمبەران هەتاکو پێغەمبەرمان کرد دەچێتە ناوی، و هەرئـەویش یەکەمین کەسـە دەرگای بەهەشت دەکاتەوە، وە ئەویش یەکەمین کەسـە کـەوا زەوی بۆی درزی بردووە، بۆ هیچ کەسێك پێش ئەو درزی نەبردووە.

بەپێویـست زانـراوە کـەوا جەسـتەی پێغەمبـەر(ﷺ) نـەرم و شـل و پـاراوە سەحابەیەك لێی پرسی چۆن دروودو دوعای ئێمە بۆتۆ نیشاندەدات لەکاتێکدا لەناو ئێمە نامێنیت و لەناو دەچیت؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (إن الله حرم على الارض ان تأكل أجساد الانبياء)[118]. واتە:( بێگومان خودای گـەورە لەسـەرزەوی حەڕام کردووە جەستەی پێغەمبەران بخوات).

ئەگەر جەستەکەی لەمەزارەکەی دانەبێت لەوانەیە وەڵام بدرایەوە.

لەوەوە پشت ڕاست کراوەتەوە: کەوا خودای گـەورە فریـشتەی کردۆتـەوە کلیلـی گۆڕەکەی کە پێی ڕابگەیەنن لەباری سەلامەتی ئوممەتەکەی.

وە لەلایـەن ئـەوەوە وەرگـیراوە: کـەوا لـەنێوان أبـی بکـر و عمـر هاتـە دەرەوە و فەرمووی: (هكذا نبعث) [119]. واتە: (ئاوا زیندوو دەکرێینەوە).

لەگەڵ ئەمەشدا ڕۆحی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) لەلایەن پەروەردگاری بەرزەوەیـە لەبەرزترین (علیین) لەگەڵ ڕۆحی پێغەمبەرەکاندایە.

لەلایەن ئەوەوە پشت ڕاست کراوەتەوە: کەوا پێغەمبەر(ﷺ) لەشـەو ڕەوەکەیـدا حەزرەتی موسای بینی لەگۆڕەکەیدا وەستابوو نوێژی دەکـرد، و لـەئاسمانی شەشـەم یان حەوتەمیش بینی ڕۆحەکە لـەوێ بـو، و لەگۆڕەکەیـدا پەیوەنـدی بەلاشـەکەیدا هەیە، سەرپەرشتی دەکات و پێیەوە لکاوە، بەجۆرێك لە گۆڕەکەیـدا نوێـژدەکات و وەڵامی سەلام دەداتەوە کەچی لەلای خودایە.

---

(۱۱۸) سنن ابي داود(۱۰٤۷)، ومسند أحمد:٤/٨.

(۱۱۹) سنن الترمزي(۳٦٦۹).

ئەم دوو فەرمانەش لەیەکتر دوور ناخرێتەوە، کەچی فەرمان و ماوەی ڕۆحەکان وەکو فەرمان و ماوەی لاشەکان نییە، تۆ دەبینیت دوو ڕۆحی هاوشێوەو گونجاو لەگەڵ یەکتر زۆر دراوسێ و نزیکی یەکتر دەبنەوە کەچی ماوەی نێوانییان دووری ماوەی دوو ڕۆژهەڵاتە، و هەروەها دەبینیت دوو ڕۆحی نەگونجاو و تووڕە لەگەڵ یەکتر ماوەی نێوان زۆر دوورە کەچی لاشەکانییان دراوسێی یەکترن و پێکەوە نووساون.

دابەزینی ڕۆح و بەرزکردنەوەو دووری و نزیکی پەیوەندی بەلاشەوە نییە، چونکە ڕۆحەکە بەرزدەبێتەوە بۆسەرووی ئاسمانەکان، پاشان دادەبەزێت بۆسەر زەوی، لەنێوان بەزەیی و سۆزی خودا دایە کەچی مردووەکە کەلەناو گۆڕەکەیەتی، کەچی ماوەیەکی زۆریش لاشە نەبەرز دەبێتەوە و نە داشدەبەزێت، وە هەروەها بەرزبوونەوەو گەڕانەوەی ڕۆح بۆ لاشە لەکاتی نووستن و هەڵسانەوە هەندێکییان وەك خۆر وایە کەوا ئەو لەئاسمانەوەیە کەچی ڕۆناکییەکەی لەسەرزەوییە.

ڕۆحیش هەرخۆی بەرزدەبێتەوەو دادەبەزێت، بەڵام گفت و گۆی سەحابەکان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەشەڕو کوشتاری بەدر چۆن قسە لەگەڵ نەتەوەیەك دەکەیت لەکاتێکدا ئەوانە مردوون و لاشەیان بۆنی کردووە کەچی پێغەمبەر هەواڵی پێدان کە ئەوانە گوێیان لەقسەو گفت و گۆکانە، ئەمەش گەڕانەوەی ڕۆح بۆ لاشەکانییان بەدوور ناخاتەوە لەوکاتەدا بۆئەوەی گوێ لە گفت و گۆیەکان بگرن و لەهەمان کاتدا لاشەکانییان بۆنی کردووە، جا قسە کردنیش بۆ ڕۆحەکان پەیوەستە بەو لاشانەی کەوا لەناوچوون.

بەڵام سەبارەت بەو فەرموودەیە پیرۆزە: ﴿وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ﴾ (فاطر: ٢٢) واتە: (بەڵام تۆ ئەی پێغەمبەر ناتوانیت پەیامەکەت بگەیەنیت بەوکەسانەی کەلەناو گۆڕدان).

ئەم ئایەتە بەڵگە دەدات لەسەر ئەوەی کەوا مەبەست لێی: ئەوکافرەی دڵی مردووە توانات نییە لەسەر گوێ گرتنی ئەو ئەو گوێگرتنە سوودی بۆی هەبێت، وە ئەوانەی لەناو گۆڕیشدان ناتوانیت لەسەر گوێگرتنییان و سوودیان پێ بگەیەنیت، خودای پاك و بێگەرد بەرپەرچی ئەوەی نەداوەتەوە کە ئێستا لەوکاتەدا ئەوانەی لەناو گۆڕدان گوێیان لە هیچ نییە، چۆن، کەچی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی داوە کەوا ئەوانە گوێیان لەدەنگی نەعلەکانە کەلەسەر گۆڕستان پاش ناشتنیان دەگەڕێنەوە[١٢٠].

خەبەری داوە کەوا کوژراوەکانی بەدر لەقسەو گفت و گۆکانیەتی، وە خەبەری داوە هەرکەسێك سەلام لەسەر براکەی بکات وەڵامی سەلامەکە دەداتەوە.

ئەم ئایەتە هاوشێوەی ئەم فەرموودە پیرۆزەیە: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاء إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ﴾ (النمل: ٨٠).

واتە: (بێگومان تۆ ناتوانیت ئەم بانگەوازە بخەیتە ناودڵی دڵ مردو و کەڕو لاڵەکانەوە، بەتایبەت کاتێك ڕوو وەردەگێڕن و پشت هەڵدەکەن).

دەڵێن: گوێ گرتنی کەڕو لاڵەکان لەگەڵ گوێ گرتنی مردووەکان نەفی دەکات و دووریان دەخاتەوە لەم کارەو مەبەست لێی: نەگونجان و نەشیاوی هەریەکەیان بۆ گوێگرتن و دڵی ئەوانە لەکاتێکدا مردوویەکی کەڕو نابیسەر بوون بۆ گوێگرتنییان قەدەغە دەکات، بەپلەو پایەی گوێگرتنی مردو و نابیسەران، ئەمەش ڕەوایە، بەڵام گوێگرتنی ڕۆحەکان پاش مردن نەفی ناکات و لەم کارەی دوورناخاتەوە بەومانایەی تۆ ناتوانیت بانگەواز بخەیتە ناودڵی مردوان و نابیسەران ئەگەر خودای گەورە ویستی لەسەر نەبێت.

الحافظ أبو عبدالله کوڕی مندە لەکتێبی (الروح والنفس)دا دەڵێت: محمد کوڕی یعقوب کوڕی یوسف خەبەری پێداین، کە محمد کوڕی إسحاق بۆی گێڕاینەوە، أبو

---

(١٢٠) سنن أبي داود: (٧).

النـضر الهاشم كوڕی القاسم پێی ڕاگەیاندین، ئەویش لە عیسی بن المسیب، لە عدی کوڕی ثابت، لە البراء کوڕی عازب وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووین لەگـەڵ جەنازەیەکدا کە پیاوێکی ئەنساری مردبوو، جا کاتێك لەگۆڕەکە بووینەوە و نێژرا، دانیشتین بەبێ جووڵە هەروەك بەردێك لەسەر شانمانەوە بێـت، و لەسـەرمان باڵنـدە بسووڕێتەوە، تۆزێك بێ دەنگ بوو جا کاتێك سـەری بـەرزکردەوەو فـەرمووی: (إن المؤمن إذا کان في قُبلٍ من الآخرة ودُبر من الدنیا وحضره ملـك الموت، نزلـت علیـه ملائکة معهم کفن من الجنة، وحنوط من الجنة، فجلـسوا منـه مـد البـصر، وجـاء ملك الموت فجلس عند رأسه، ثم قال وأخرجي أیتها الـنفس المطمئنـة، إخرجـي الى رحمة الله ورضوانه، فتنسل نفسه کما تقطر القطرة من السقاء).

واتە: (بەندەی ئیماندار کاتێ ڕووی کردۆتە دوارۆژو دابڕاوە لـە دونیـا و فریـشتەی گیانکێش دێتەلای و فریشتە لەئاسمانەوە دادەبەزنـە سـەری و کفـنی بەهەشـتییان پێیە، وە بۆنی میسك کەلەناو ئاوریشمێکدایە، جا دێن لەلای دادەنیـشن تـا چـاو بڕ دەکات، فریشتەی گیـانکێش لـەلای سـەری دادەنیـشێت، پاشـان دەڵێـت: وەرە دەرەوە ئەی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی، وەرە دەرەوە بۆلای پـەروەردگاری بـەزەیی و ڕەزابوون لێت، ڕۆحەکەشی دێتە دەرەوە هەروەك دڵۆپە ئاو لەدەمی مەتارە بێتـە دەرەوە).

فإذا خرجت نفسه صلی علیه کل من بین السماء والارض إلا الثقلین، ثـم یـصعد به الی السماء فتفتح له السماء، ویشیعه مقربوها الی الـسماء الثانیـة، والثالثـة، والرابعة، والخامسة، والسادسة، والسابعة، إلى العرش مقربو کل سماء.

واتە: (جا کاتێـك ڕۆحـی دەرچـوو هەرچـی لـەنێوان ئاسمانـان و زەویدایـە دوعـای بۆدەکەن، پاشان بەرز دەکرێتـەوە بـۆ ئاسمـان، ئاسمـانی بـۆ دەکرێتـەوە، وە دوایـی هەڵیدەگرن بۆ ئاسمانی دووەم و سێیەم و چـوارەم و پێنجـەم و شەشـەم و حەوتـەم، تاکو ئەو ئاسمانەی عەرشی لێیە).

فإذا انتهى الى العرش كتب كتابه في عليين، ويقول الرب عز وجل، ردوا عبدي إلى مضجعه، فإني وعدتهم أني منها خلقتهم وفيها أعيدهم ومنها أخرجهم تارة أخرى، فيرد الى مضجعه، فيأتيه منكر ونكير يثيران الارض بأنيابهما ويفحصان الارض بأشعارهما، فيجلسانه، ثم يقال له: ياهذا من ربك؟ فيقول: ربي الله، فيقولان: صدقت، ثم يقال له: مادينك؟ فيقول: ديني الاسلام، فيقولان: صدقت، ثم يقال له: من نبيك؟ فيقول: محمد رسول الله، فيقولان: صدقت.

واته: (جاكاتێك گەیشتە عەرش ناوی لە هەرە بەرزەكان دەنووسرێت، و خودای گەورە میهرەبان دەفەرمووێت: بەندەكەم بگەڕێننەوە بۆ گۆڕەكەی، چونكە من پەیمانم پێیان داوە كەوا من لەزەوی دروستم كردوون و بۆئەوێش دەیانگەڕێنمەوە، هەروەها لەوێش جارێكی دیكە دەیان هێنمە دەرەوە، جا دیگەڕێننەوە بۆناو گۆڕەكەی، ئینجا دوو فریشتە (منكر و نكیر) دێن بۆلای دایدەنیشێنن، پاشان پێی دەڵێن: خوای تۆ كێیە؟ دەڵێت: خودام (الله)یە، پێی دەڵێن: راستت وت، پاشان پێی دەڵێن: ئاین و رێبازت چییە؟ دەڵێت: ئاین و رێبازم ئیسلامە، دەڵێن: راستت وت، پاشان پێی دەڵێن: پێغەمبەرت كێیە؟ دەڵێت: محمد رسول الله، جا پێی دەڵێن: راستت وت).

ثم يفسح له في قبره مد بصره، ويأتيه رجل حسن الوجه طيب الريح حسن الثياب فيقول: جزاك الله خيراً، فوالله علمت إن كنت لسريعاً في طاعة الله، بطيئاً عن معصييته، فيقول: وانت جزاك الله خيراً، فمن أنت؟ فيقول: أنا عملك الصالح، ثم يفتح له باب الى الجنة، فينظر الى مقعده ومنزله منها حتى تقوم الساعة.

واته: (پاشان تا چاوی بردەكات گۆڕەكەی بۆ فراوان دەبێت، و پیاوێكی رووخسار شیرین و بۆن خۆش و پۆشاك خاوێن دێتە لای دەڵێت: خوا پاداشتی چاكەت بداتەوە، سوێند بەخوا نەمدەزانی تۆ ئەوەندە خێرابوویت لەخواپەرستی و سست و خاو بوویت لەتاوان، جا دەڵێت: تۆش خودا پاداشتی چاكەت بداتەوە، تۆ كێیت؟

دەڵێت: من کـارو کـردەوە چـاکەکانی تـۆم، پاشـان لەگۆڕەکەیـدا دەرگایـەکی بـۆ دەکرێتەوە، شوێن و پلـەو پایـەی خـۆی لەبەهەشـتدا دەبینێـت تـاوەکو قیامـەت هەڵدەستێت).

وإن الكافر كان في دبر من الدنيا وقُبل من الآخرة وحضره الموت نزلت عليـه مـن السماء ملائكة معهم كفن من النار وحنوط من النار.

واتە: (کاتێك کافر خەریکە لەدونیا دادەبڕێ و لەمردن نزیك دەبێتـەوە لەئاسمانـەوە فریشتە بۆی دادەبەزن و کفنێکی لەئاگریان پێیە).

فەرمووی: ((فيجلسون منه مد بصره، وجاء مَلَكُ الموت فيجلس عند رأسـه، ثـم يقول أخرجي أيتها النفس الخبيثة، أخرجي الى غضب الله وسخطه، فتفـرق روحـه في جسده كراهية أن تخرج لما تـرى وتعـاين، فيستخرجها كما يـستخرج السَفود مـن الـصوف المبلـول، فـإذا خرجـت نفـسه لعنـه كـل شـيء بـين الـسماء والارض إلا الثقليين)).

واتە: (جا فریشتەکان تا چاو بڕەکات لـەلای دادەنیـشن، وە فریـشتەی گیـانکێش دێت لەلای سەری دادەنیـشێت، پاشـان دەڵێـت: وەرە دەرەوە ئـەی دڵ و دەروونـی پیس، وەرە دەرەوە بـۆ تـوڕەیی و سـزای خـوای گـەورە، جـا رۆحەکـە بەناخۆشـی لەلاشەکەی دێتە دەرەوە، وا دێتە دەرەوە چـۆن شیـشێکی گۆشـت برژانـدن لـەناو خوریەکی تەڕ رابکێشیت ئەوەی لەنێوان ئاسمان زەویدایە نەفرەتی لێدەکەن).

ثم يـصعد الى الـسماء، فتغلق دونـه، فيقـول الـرّب عـز وجـل: ردوا عبـدي الى مضجعه، فإني وعدتهم أنـي منهـا خلقتهم وفيهـا أعيـدهم ومنهـا أخـرجهم تـارة أخـرى، فـترد روحـه الى مـضجعه، فيأتيـه منكـر ونكـير بـثيران الارض بأنيابهمـا، ويفـصحان الارض بأشـعارهما، أصـواتهما كالرعـد القاصـف، وأبـصارهما كـالبرق الخاطف، فيجلسانه، ثم يقولان: ياهذا من ربك؟ فيقول: لا أدري، فينادي من جانـب القبر لا أدري، فيضربانه بمرزبَّة من حديد ولو أجتمع عليها من بين الخـافقين لم تقـل،

ويضيق عليه قبره حتى تختلف أضلاعه، ويأتيه رجل قبيح الوجه قبيح الثياب نتن الريح، فيقول: جزاك الله شراً، فوالله ماعلمت إن كنت لبطيناً عن طاعة الله، سريعاً في معصيته، فيقول: ومن أنت؟ فيقول: أنا عملك الخبيث، ثم يفتح له الباب الى النار، فينظر الى مقعده فيها حتى تقوم الساعة.

واته: (پاشان بەرزدەكرێتەوە بۆ ئاسمان، جا دەرگاكانی لەسەر دادەخرێت، خودای عز وجل دەفەرمووێت: بەندەكەم بگەڕێننەوە بۆناو گۆڕەكەی، چونكە من بەڵێنم داوە من ئەوانم لەخۆڵ درووست كردووە، دەیانگەڕێنمەوە بۆئەوێ، هەر لەوێش جارێكی دیكە دەریان دەهێنمە دەرەوە، جا رۆحەكەی دەگەڕێننەوە بۆ ناو گۆڕەكەی، جا دوو فریشتەی (منكر و نكير) دێنەلای دەنگیان وەك گرمەی هەور شكێنەرە، و چاوەكانیشیان وەك بروسكەیەكی بەپرتاوە، جا دایدەنیشێنن پاشان پێی دەڵێن: چی دەزانی دەربارەی خوداكەت؟ دەڵێت: نازانم، بانگكەرێك لەتەنیشت گۆڕەكەی بانگ دەكات: نازانیت جا چەكوشێكی ئاسن لێی دەدەن، ئەگەر هەموو نێوانی رۆژهەلات و رۆژئاوا لێی كۆببنەوە هیچ ناڵێت، وە گۆڕەكەی لەسەری تەسك دەبێتەوە و هەموو پەراسووەكانی لەدواوە تێك دەشكێت، لەوكاتەدا پیاوێكی ناشیرینی بەرگ و پۆشاك ناشیرین و بۆن ناخۆش دێتەلای، پێی دەڵێت: خودا پاداشتت بەشەڕ بداتەوە، سوێند بەخوا نەمدەزانی تۆ ئەوەندە لەسەرخۆ بووی لەخواپەرستی و ملكەچ كردن بۆ خودا!، خێراو بەپەلەبوویت لەتاوانكردن، پێی دەڵێت: تۆ كێیت؟ دەڵێت: من كارو كردەوە خراپەكانی تۆم، جا لەگۆڕەكەی دەرگایەكی لەئاگری بۆ دەكرێتەوە و سەیری جێگای خۆی دەكات لەدۆزەخدا تاوەكو قیامەت هەڵدەستێت..) ئیمام أحمد[121]،و محمود بن غيلان ریوایەتییان كردووە.

لێرەدا دەردەكەوێت كەوا رۆحەكان دەگەڕێندرێتەوە بۆ گۆڕەكانییان، و دوو فریشتەش دایاندەنیشێنێت و گفت و گۆی لەگەڵدا دەكەن.

---

(١٢١) مسند أحمد: ٤/٢٨٧.

پاشان إبن منده لەرێگای محمد کوڕی سلمە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە حفیض الجزري، ئەویش لە مجاهد، ئەویش لە البراء کوڕی عازب وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ جەنازەی پیاوێکی ئەنساری بووین، گۆڕەکەمان تەواوکرد هێشتا بەخاك نەسپاردرابوو، جەنازەکەی داناو پێغەمبەر(ﷺ) دانیشت.

جا فەرمووی: (إن المؤمن إذا اختضر أتاه ملك الموت في أحسن صورة وأطيبه ريحاً، فجلس عنده لقبض روحه، وأتاه ملكان بحنوط من الجنة وكفن من الجنة وكانا منه على بعيد، فأستخرج ملك الموت روحه من جسده رشحاً فإذا صارت الى ملك الموت ابتدرها الملكان فأخذاها منه، فحنطاها بحنوط من الجنة، وكفناها بكفن من الجنة، ثم عرجا به الى الجنة، فتفتح له ابواب السماء، وتستبشر الملائكة بها، ويقولون: لمن هذه الروح الطيبة التي فتحت لها أبواب السماء، ويسمى بأحسن الاسماء بها في الدنيا فيقال: هذه روح فلان.

فإذا صعد بها الى السماء شيعها مقربوا كل سماء حتى توضح بين يدي الله عند العرش، فيخرج عملها من عليين، فيقول الله عز وجل للمقربين: اشهدوا أني قد غفرتُ لصاحب هذا العمل، ويختم كتابه، فيرد من عليين: فيقول الله عز وجل: ردوا روح عبدي الى الارض فإني وعدتهم أني أردهم فيها).

واتە: (کاتێك بڕوادارێك خەریکە گیانی دەربچێت فریشتەی گیانکێش دێتە لای لەجوانترین شێوەو بۆنخۆشترین بۆن، لەلای دادەنیشێت تاوەکو ڕۆحی بکێشێت، و دوو فریشتە دێنەلای بۆنخۆشترین بۆنی بەهەشتییان پێیە و کفنێکیش لەبەهەشت، ئەمانە لەدووری ئەو دەوەستن جا فریشتەی گیانکێش ڕۆحی لەجەستەی دێنێتە دەرەوە بەبێ ئێش و ئازار و فریشتەکان دەست پێشخەری دەکەن بۆ هەڵگرتنی ڕۆحەکەی، جا بەبۆنی بەهەشت مۆمیای دەکەن و بەکفنی بەهەشت کفنی دەکەن، پاشان بەرزی دەکەنەوە بۆ بەهەشت، ئینجا دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە، فریشتەکان مژدەی پێدەدەن و دەڵێن: ئەو ڕۆحە کە پاکە هی کێیە کەوا دەرگاکانی

بەهەشتی بۆ کراوەتەوە، وە بەجوانترین ناو کەناسراوە لەسەر دونیا بانگی دەکەن، جا دەڵێن: ئەمە ڕۆحی فلانە.

کاتێك بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان هەموو ئاسمانەکانی پێدەکەن تاوەکو لەنێوان دەستی بەزەیی خودای پەروەردگار دادەنرێت لەلای عەرش، جا لە (علیین) هەرە بەرزەکان کاروکردەوەی دێتە دەرەوە، جا خودای میهرەبان بەفریشتە نزیکەکان دەفەرموێت: ئێوە شایەد بن من لەخاوەنی ئەو کارو کردەوە چاکە خۆش بووم و کتێبەکەشی مۆری لێدەدرێت، جا دەگەڕێتەوە بۆ (علیین) ئینجا خودای گەورە دەفەرموێت: ڕۆحی بەندەکەم بگەڕێننەوە سەر زەوی، چونکە من بەڵێنم پێیان داوە ئەوان دەگەڕێنمەوە بۆ ئەوێ).

پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ (طه: ٥٥).

واتە:( ئێمە ئێوەمان هەر لەزەوی درووست کردووە، دەتانگەڕێنینەوە ناوی، پاشان جارێکی تر دووبارە لەو زەویە دەرتان دەهێنینەوە).

کاتێك ئیماندارێك لەناو گۆڕەکەی دانرا لەلای پێیەکانی دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە لەبەهەشتدا، پێی دەڵێن:سەیرکە ئەو شوێنەی خودای گەورە بۆتۆی ئامادە کردووە بەرامبەر ئەو چاکەیەی کە کردوتە، وە لەلای سەری دەرگای بۆ دەکرێتەوە رووەو ئاگر، پێی دەڵێن: سەیرکە لەو شوێنە بەئازارەی خودای گەورە لەسەر تۆی لابردووە، پاشان پێی دەڵێن: بەشادمانی بخەوە، جا هیچ شتێك لەلای ئەو خۆشتر نییە لەهەڵسانی قیامەت.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (اذا وضع المؤمن في لحده تقول له الارض: إن كنت لحبيباً إلي وأنت على ظهري فكيف إذا مرت اليوم في بطني، سأريك ما أصنع بك، فيفسح له مافي قبره مد بصره).

واتـه: (کاتێـك ئیمانـدارێك لـەناو گۆڕەکـەی دادەنرێـت زەوی پێـی دەڵێـت: تـۆ خۆشەویست بوویت بۆمن کاتێك لەسەر پشتم بوویت جا ئێستا چۆنە کەلەناو هەناو منداییت، پێشانت دەدەم چیت بۆ دەکەم، جا بۆی فراوان دەبێـت لـەناو گۆڕەکەیـدا تا چاو بڕدەکات).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (اذا الكافر في قبره أتـاه منكـر ونكـير فيجلسانه فيقولان له: من ربك؟ فيقول: لا أدري، فيقولان لـه: لا دريـت، فيـضربانه ضربة فيصير رماداً، ثم يعاد فيجلس، فيقال له: ماقولك في هذا الرجل؟ فيقـول: أي رجل؟ فيقولان: محمد(ﷺ) فيقول: قال الناس أنه رسول الله(ﷺ) فيضربانه ضـربة فيصير رماداً)[١٢٢].

واته: (کاتێك کافرێك لەناو گۆڕەکەی دانرا دوو فریشتە منکـر و نکـیر دێنـەلای و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: خوات کێیە؟ دەڵێت: نازانم، پێی دەڵـێن نازانیـت، جـا وای لـێ دەدەن دەبێتـە خۆڵـەمێش، پاشـان دەگەڕێتـەوە سـەر شـێوەی جـاران و دادەنیشێت پێی دەڵێن: قسەت چییە دەربارەی ئەوپیاوە؟ دەڵێت: کامە پیاو؟ پێـی دەڵێن: محمد(ﷺ) جا دەڵێت: خەڵکی دەیانوت ئەو پێغەمبەری خودایە(ﷺ) جا لێدانێکی وا لێی دەدەن دەبێتە خۆڵەمێش).

ئەم حەدیسە جێگیرو بەناوبانگە بـەفراوانی پـشتڕاست کراوەتـەوە، نـەمانزانیوە یەکێك لەپێشەوایان تانە لەوحەدیسە بـدەن، بەڵکولـەکتێبی خۆیانـدا ریوایـەتیان کردووە، بە قەبوڵیان داناوە، کردوویانـە بەیاسـایەك و بەنـدێك لەبەنـدەکانی ئـایین لەسزاو ئازاری گۆڕ وە نیعمەت و خۆشییەکانی گۆڕ، وە مەسەلەی (منکر و نکـیر) و کێـشانی رۆحـەکان، و بەرزکردنـەوەی بـۆ نێـوان دەسـتەکانی بـەزەیی خـودای میهرەبان، پاشان گەڕاندنەوەی بۆناو گۆڕ، ئەمەش أبی محمد گێڕاویەتییەوە، لە أبي

---

(١٢٢) شرح الصدور: ١٦٥.

البراء ریوایەتی کردووە، جگە لە زاذان نەبێت، وە عدی کوڕی ثابت و مجاهد کوڕی جبیر و محمد کوڕی عقبە ریوایەتییان کردووە.

ئەگەر بچینەوە سەر حەدیسەکەی البراء کەوا گشت ئەو حەدیسانەی ریوایەتی کردووە (صحیح) و راست و راشکاون لەوبارەیەوە، وەك حەدیسی إبن أبي ذئب، لە محمد کوڕی عمرو کوڕی عطاء، ئەویش لە سعید کوڕی یسار، ئەویش لە أبی هریرة: کەوا پێغەمەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إن الميت تحضره الملائكة، فإذا كان الرجل الصالح،قال أخرجي أيتها النفس الطيبة كانت في الجسدة الطيب، أخرجي حميدة، وأبشري بروح وريحان ورب غير غضبان) دەفەرموێت: (فيقول ذلك حتى تخرج).

واتە: (بێگومان مردو فریشتە دێتەلای، جا ئەگەر پیاوێکی چاك بێت، دەڵێن: وەرە دەرەوە ئەی رۆحی پاك کەوا لەجەستەی پاکدابوویت، وەر دەرەوە بەختەروەبە، مژدە بێت بەسۆزو بەزەیی خودای گەورە و بەرەیحانەی بەهەشت وە خوایەك کە توورە نییە لێت) وە دەفەرموێت: (ئەم قسەیە دەڵێنەوە تاوەکو رۆحەکە دێتە دەرەوە).

(ثم يعرج بها الى السماء فيستفتح لها فيقال: من هذا؟ فيقولون: فلان، فيقولون: مرحباً بالنفس الطبية كانت في الجسد الطيب، أدخلي حميدة، وأبشري بروح وريحان ورب غير غضبان، فيقال لها ذلك حتى ينتهي بها الى السماء التي فيها الله عز وجل، وإذا كان الرجل السوء قال: أخرجي أيتها النفس الخبيثة كانت في الجسد الخبيث، أخرجي ذميمة وأبشري بحميم وغساق وأخر من شكله أزواج فيقولون ذلك حتى تخرخ).

واتە:( پاشان رۆحەکە بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان، دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوو دەڵێن: ئەوە کێیە؟ دەڵێن: ئەوە فلانە، جا دەڵێن: بەخێربێت بۆ رۆحێکی پاك کەوا لەجەستەیەکی پاکدا بوویت، وەرە ژوورەوە بەختەوەری، وە مژدە بدە بەرۆحێك وە ریحانی بەهەشت کە خودایەك توورە نییە لێت، ئەمەی پێ دەوترێ تاوەکو دەیبەنە

ئەو ئاسمانەی خودای میهرەبانی لێیە، ئەگەر پیاوەکە خراپ بێت دەڵێت: وەرە دەرەوە ئەی رۆحی پیس کەوا لەلاشەی پیس دابوویت، وەرە دەرەوە بێزاریت و مژدەت لێ بێ بەسزای ئاوی کوڵاو و تاریکایی پیسی دۆزەخ، ئەمانەی پێ دەوترێت تاکو دێتە دەرەوە).

(ثم يعرج الى السماء، فيستفتح لها، فيقال: من هذا؟ فيقولون: فلان، فيقولون: لامرحباً بالنفس الخبيثة كانت في الجسد الخبيث، إرجعي ذميمة، فإنها لن تفتح لك أبواب السماء، فترسل بين السماء والارض، فتصير الى القبر، فيجلس الرجل الصالح في قبره غير فزع ولا معوق، ثم يقال: فما كنت تقول في الاسلام ما هذا الرجل؟ فيقول: محمد رسول الله(ﷺ) جاءنا بالبينات من قبل الله فآمنا وصدقنا).

واتە: (پاشان دەیبەن بۆ ئاسمان، جا دەرگاکانی بۆ دەکرێتەوە، دەڵێن: ئەوە کێیە؟ دەڵێن: ئەمە فلانە، جا دەڵێن: ئەی رۆحی پیس کەوا لەلاشەی پیس دابوویت بەخێر نەیەیت، بەبێزراوی بگەڕێوە، برۆ هەرگیز دەرگاکانی ئاسمانت بۆ ناکرێتەوە، جا رۆحەکەی دەنێرنەوە نێوان ئاسمان و زەوی، وە دەیگەڕێننەوە بۆناو گۆڕ، بەڵام پیاوی چاك لەناو گۆڕەکەی دادەنیشێت بەبێ ترس و بەبێ کێشە و گرفت، پاشان دەڵێن: چی دەربارەی ئیسلام دەزانیت و ئەم پیاوە کێیە؟ جا دەڵێت: محمد رسول الله(ﷺ) لەلایەن خودای گەورەوە قورئان و رێنمایی بۆ ئێمە هێناوە ئێمەش باوەڕمان پێی هێناوەو بەراستمان داناوە).

الحافظ أبو نعیم دەڵێت: ئەم حەدیسە باوەڕپێکراوە لەسەر گواستنەوە و راستیەتی هەردوو ئیمام محمد کوڕی اسماعیل البخاری و مسلم کوڕی الحجاج علی ابن ابی ذئب، بڕیاریان لەسەر داوە، وە محمد کوڕی عمرو کوڕی عطاء و سعید کوڕی یسار ئەوانە لە فەرموودەکانی هەردوو پێشەواکانن.

أبو عبدالله بن منده ناڕەزایی دەربڕیوە: لەسەر گەڕانەوەی رۆح بۆ لاشە بەوەی کە وتوویەتی: محمد کوڕی الحسین کوڕی الحسن بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە محمد

کوڕی یزید النیسابوری، ئەویش لە حماد کوڕی قیراط، ئەویش لە محمد کوڕی الفضل، ئەویش لە یزید کوڕی عبدالرحمن الصائغ البلخی، ئەویش لە الضحاك کوڕی مزاحم، ئەویش لە ابن عباس کەوا دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنێوان ئێمەدا دانیشت و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلآئِكَةُ بَاسِطُواْ أَيْدِيهِمْ﴾ (الأنعام: ٩٣).

واتە: خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینی چۆن لەئێش و ئازاری سەرەمەرگدا (گیریان خواردووە) فریشتەکانیش دەستییان لیّ دەکەنەوەو لێیان دەدەن.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (والذي نفس محمد بيده مامن نفسٍ تفارق الدنيا حتى ترى مقعدها من الجنة والنار) .

واتە:( سوێند بەوکەسەی گیانی محمدی بەدەستە هیچ ڕۆحێك لەدونیا جیا نابێتەوە تاوەکو جێگای خۆی دەبینێت لەبەهەشت و دۆزەخ).

پاشان دەفەرموێت: (فإذا كان عنده ذلك صف له سماطان من الملائكة ينتظمان مابين الخافقين كأن وجوههم الشمس، فينظر اليهم ماترى غيرهم وإن كنتم ترون أنهم ينظرون اليكم مع كل منهم اكفان وحنوط، فإن مؤمناً بشروه بالجنة، وقالوا: اخرجي أيتها النفس الطيبة الى رضوان الله وجنته، فقد أعد الله لك من الكرامة ماهو خير من الدنيا ومافيها، فلا يزالون يبشرونه ويحفون به، فهم ألطف وأرأف من الوالدة بولدها، ثم يسلون روحه من تحت كل ظفر ومفصل، ويموت الاول فالاول، ويهون عليه، وكنتم ترونه شديداً حتى تبلغ ذقنه).

واتە: (ئینجا لەو کاتەدا فریشتە بەدوو ڕیز بەڕێك و پێکی بۆی ڕادەوەستن ڕووخسارییان وەك خۆر وایە ، جا سەیری ئەوان دەکات لەو بڕوازێت کەس نایانبینێت، ئەگەر بیانبینن ئەوان سەیری ئێوە دەکەن یەکێکیان کفنێکیان پێیە، ئەگەر مردووەکە ئیماندار بێت ئەوا مژدەی بەهەشتی پێدەدەن، پێی دەڵێن: وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پاك بۆلای ڕەزابوونی خوداو بەهەشتەکەی، خودای گەورە ڕێزو

کەرامەتێکی وای بۆت ئامادەکردووە لەدونیاو ئەوەی تیایەتی، وە بەردەوام مژدەی پێ دەدەن و گرنگی پێدەدەن، جا ئەو فریشتانە لەو دایکەی ئەو منداڵەی لێ بووە بۆی نەرمترو بەزەییترە، پاشان ڕۆحی دەکێشن لەژێر هەر نینۆك و جومگەیەك، و یەك بەیەك دەمرێت، لەسەری هێمن و هێور دەبێت، ئێوە بەتووندو بەئازاری دەبینن تاکو مردنەکە دەگاتە چەناگەی).

دەفەرمووێت: (فلهي أشد كراهية للخروج من الجسد من الولد حين تخرج من الرحم، فيبتدرها كل ملك أبهم يقبضها، فيتولى قبضها ملك الموت).

واتە:( بێگومان دەرچوونی ڕۆح لەجەستە توندترو بەرق و کینەترە لەو منداڵەی کاتێك لە ڕەحمی دایکی دێتە دەرەوە، هەموو فریشتەکان پەلەدەکەن کامەیان ڕۆحی بکێشێت، ئینجا فریشتەی گیانکێش ڕۆحی دەکێشێت).

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾ (السجدة: ١١).

واتە: (جا پێیان بڵێ فریشتەی گیان کێشان کە کاری گیان کێشانتانی پێ سپێردراوە، لەوەودوا بۆلای پەروەردگارتان دەبرێتەوە).

ئینجا بەکفنی سپییە پێی دەگەن و پاشان لەباوەشی دەگرن، پێویسترو باشتر لەو ئافرەتەی منداڵەکەی لێ بووە، وە بە بۆنخۆشترین لە میسك بۆنی بەسەردا دەڕێژن و مژدەی پێ دەدەن، دەڵێن: بەخێر بێیت بۆنەو ڕۆحە پاکەو دڵ و دەروونە پاکە، خواوەندا سەلاوات لەسەر ڕۆحێك وە لەسەر ئەو جەستەی کەوا لێی هاتە دەرەوە).

دەفەرمووێت: (فيصعدون بها، ولله عز وجل خلق في الهواء لايعلم عدتهم ألا هو، فيفوح لهم منها ريح أطيب من المسك فيصلون عليها ويتباشرون، ويفتح لهم أبواب السماء، فيصلي عليها كل ملك في كل سماء تمر بهم حتى ينتهي بها بين يدي ملك الجبار، فيقول الجبار جل جلاله، مرحباً بالنفس الطيبة وبجسد خرجت منه، وإذا قال الربّ عز وجل للشيء مرحباً رحب له كل شيء، ويذهب عنه كل ضيق).

واتە: (جا بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان، وە فریشتەی خودا لەئاسماندا هەن ئەوەندە زۆرن ژمارەیان کەس نازانێت تەنها ئەو نەبێت، وە بۆنێکی بەسەردا دەڕێژن خۆشتربێت لەبۆنی مسك و سەلاواتی لەسەر لێدەدەن و مژدەی پێ دەدەن، و دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا تێدەپەڕێت لەئاسمانەکاندا سەلاواتی لەسەر لێدەدەن تاوەکو دەگاتە ئەو ئاسمانەی کەلە نێوان دەستی بەزەیی خودای گەورەو دەسەلاتدار هەیە، جا خودای بەهێزو توانا دەفەرموویت: پێشوازی لێ بێت لەرۆحێکی پاكو جەستەیەکی پاك کە رۆحەکەی لێ دەرچووە، کاتێك خودای میهرەبان بەشتێك بفەرموویت بەخێربێت هەمووشتێك لەپێشوازیدا دەبێت و هەموو دڵتەنگی و نەهامەتییەکی لەسەر لادەچێت).

ثوم يقول لهذه النفس الطيبة:أدخلوها الجنة وأروها مقعدها من الجنة،وأعرضوا عليها ما أعددت لها من الكرامة والفيم،ثمَّاذهبوا بها إلى الارض،فإني قضيت أني منها خلقتهم وفيها أُعيدهم،ومنها أخرجهم تادةً أُخرى.

(پاشان بەو رۆحە پاکە دەفەرموویت: بیبەنە بەهەشت و شوێنەکەی لەبەهەشت پێ نیشان بدەن، هەموو ئەو نیعمەت و ڕێزەی بۆم ئامادە کردووە بۆی ئاشکرا بکەن، پاشان بیبەنەوە سەرزەوی، چونکە من لەزەوی درووستم کردووە وە دەیگەڕێنمەوە بۆ ئەو شوێنەوە هەر لەوێشەوە جارێکی تر دەیهێنمەوە دەرەوە).

(فَو الذي نفس محمد بيده لهي أشد كراهية للخروج منها حين كانت تخرج من الجسد، وتقول: أين تذهبون بي الى ذلك الجسد الذي كنت فيه؟ قال: فيقولون: إنا مأمورون بهذا، فلابد لك منه، فيهبطون به على قدر فراغهم من غسله وأكفانه، فيدخلون ذلك الروح بين جسده وأكفانه).

واتە:( سوێند بەو کەسەی گیانی محمدی بەدەستە بەڕاستی بەشێوەیەکی زۆر توندو بە رق و کینەیە کاتێك رۆح لەلاشە دێتە دەرەوە، وە دەڵێت: بۆکوێ دەمبەنە لای ئەو لاشەیەی کەوا تیابووم؟ دەفەرموویت: جا دەڵێن: ئێمە نوێنەرو سپێردراوین بەم

کاره، دەبێ بۆتی ئەنجام بدەین، ئینجا بۆی دادەبەزن بەپێی کـار ڕاپەڕانـدنییان لـە شووشتن و کفن کردنی، جا ئەو ڕۆحە دەخەنە نێوان لاشە و کفنەکەی).

شێخی ئیسلام دەڵێت: حەدیسە ڕاستە متواتیرەکـان بەڵگـەن لەسـەر گەڕانـەوەی ڕۆح بۆ لاشە لەکاتی پرسیارکردن، وە پرسیارکردن لەلاشە بەبێ ڕۆح وتەی بەشـێکە لە خەڵك، زۆربەش ئینکاری ئەم شـتە دەکـەن، هەنـدێکیش پێـشوازی لێدەکـەن و قەبووڵی دەکەن، جا دەڵێت: پرسیار کردن بۆ لاشـەیە بـەبێ ڕۆح، وە ئەمـەش إبـن مُرة وە إبن حازم وتوویانە، و قسەی هەردووکیشییان هەڵەیە.

ئەمەش قسەی پرسیارکارانە: ئایـا سـزای گـۆڕ لەسـەر دڵ و دەروون و لاشـەیە؟ یاخود لەسەر دڵ و دەروونە بەبێ لاشە! یاخود لەسەر لاشـەیە بـەبێ دڵ و دەروون؟ وەیان دڵ و دەروون بەشداری لاشە دەکات لەخۆشی و نیعمەت و سزا و ئازار یـاخود نا؟.

ئەم پرسیارە لەشێخی ئیسلام کرا دەربارەی ئەو مەسەلەیە، ئێمەش وەڵامەکـەی ئەومان لەبیر ماوە جا وتی: بەڵکو سزا و ئازارو نیعمەت و خۆشی لەسـەر لاشـە و دەروونە بەکۆدەنگی ئەهلی سوننە و جەماعەت، ڕۆح لەنیعمەتدا دەبێـت و سـزا و ئازاریش بەتەنیا جگە لەلاشە، و نیعمەت و ئازار و سزاش دەبینێت بەلاشـەکەوە و لاشەش پەیوەندی بەرۆحەوە هەیە، جا نیعمەت و سزا لەسەریان دەبێت لەو حاڵەتـە پێکەوە هەروەك کەوا ڕۆح تەنیایە لەلاشە.

ئایا دەبێت سزاو خۆشی بۆلاشە بێت بەبێ ڕۆح؟ ئەمانە دوو وتەی بەناوبانگن بۆ ئەهلی حەدیس و سوننەو خاوەن قسەکە، لەو مەسەلەیەدا وشـەی دەگمـەن هەیـە ئەمەش لەقسەکانی ئەهلی سوننە و حەدیسدا نییە.

بەڵام دەڵێن: ئەم شتە لەبەرزەخدا نابێـت، بـەڵکو لـەکاتی هەڵـسانەوە لـەگۆڕدا دەبێت، بەڵام ئەمانـە سـزادانی لاشـە بەتـەنها لـەگۆڕدا ڕەت دەکەنـەوە، دەڵـێن:

رۆحەكان لەبەرزەخدا لەخۆشيدان ياخود لەسزادان، بەڵام ئەمانە دەربارەى سزاى گۆڕ سێ قسە هەيە:

**يەكەم**: تەنها لەسەر رۆحە.

**دووەم**: سزاكە لەسەر رۆحە و لەسەر لاشەكەش دەبێت بەهۆكارى رۆحەكە.

**سێيەم**: سزاكە تەنها لەسەر لاشەيە ئەمەش قسەى دووەميش دێتە پاڵ ئەمانە.

جا ئەگەر قسەى ئەو سێ كەسە دەگمەنانەت زانى جا قسەى دووەمى دەگمەنەكان كەوا دەڵێت: رۆح بەتەنها لەنيعمەت و سزادا نابێت بەڵكو رۆح خۆى ژيانە، ئەمەش بە لەئەهلى گوفتارەكانە لە (المعتزلة)[123] (الاشعرية)[124]كان وەك قاضي أبي بكر و خەڵكانى ديكە، ئەمە رەت دەكەنەوە كەوا رۆح لەپاش جيابوونەوەى لەجەستە دەمێنێتەوە، ئەمەش وتەيەكى نارەوايە پێچەوانەى هاوڕێكەيەتى ئەويش أبو المعالي الجويني و خەڵكانى ديكەن.

بەڵكو بەكتێب و سونەت و هاودەنگى پێشەوايان سەلمێنراوە كەوا رۆح دواى جيابونەوەى لەلاشە دەمێنێتەوە، ئەو لەخۆشيدا دەبێت ياخود لەسزاو ئازاردا دەبێت، فەيلەسووفە ئيلاهييەكان بڕيار لەسەر ئەمە دەدەن بەڵام گەڕانەوەى لاشەكان رەت دەكەنەوە، هەندێكييان بڕيار لەسەر گەڕانەوەى لاشەكان دەدەن بەڵام گەڕانەوەى رۆحەكان و لەخۆشي بوون و سزادانييان بە لاشە رەتدەكەنەوە، هەردو ئاخاوتنەكە هەڵەو گومڕاييە.

ئاخاوتنى كۆمەڵە سێيەمە دەگمەنەكە كە دەڵێت: لەژيانى بەرزەخدا خۆشي و سزاى تێدا نييە، بەڵكو ئەمە نابێت تاوەكو هەڵسانى قيامەتى گەورە، و موعتەزيلەكان و ئەوانەى وەكو ئەوانن وەك دەڵێن ئينكارى سزاى گۆڕو نيعمەتەكانى دەكەن بەپێى ئەوەى كەوا رۆح لەپاش جيابوونەوەى لەلاشە

---

([123]) المعتزلة: ئەمانە كۆمەڵێكن لە (أهل الكلام) نكۆڵى لەتەزار قەدەر دەكەن، وەك بواصل بن عطاء و هاوەڵەكانى.

([124]) الأشعرية: ئەمانەش كۆمەڵێكن لە (أهل الكلام) وەك أبي الحسن الأشعري و هاوەڵەكانى.

نامێنێتەوە، وە لاشەش لەناو گۆڕدا خۆشی و سزا نابینێت، جا هەموو ئەو کۆمەڵانە سەبارەت بەژیانی بەرزەخدا لەگومڕاییدان، بەڵام ئەوانە باشترن لە فەیلەسووف و بیرمەندەکان، بەوەی ئەوان بڕیار لەسەر قیامەتی گەورە دەدەن.

***

## ( مردوو لەخۆشی و ئاسوودەییدایە یاخود لەئازارو ئەشکەنجەییدا )؟

جا کاتێك ئەوهەموو ناخاوتنە نارەوایانەت زانی، بزانە کەوا مەزهەبی پێشەوا پێشینەکان و پیاوچاکان دەربارەی مردو ئەگەر مرد لەخۆشی یاخود سزادا دەبێت، ئەمەش بۆ رۆح و لاشەکە ئەنجام دەدرێت، رۆحیش پاش جیابوونەوەی لەلاشە لەخۆشیدایە یاخود لەسزادایە، وەهەندێ جار بەلاشەکەش دەگات و پێکەوە لەخۆشیدا دەبن یاخود سزا دەکێشن پاشان لەرۆژی قیامەتی گەورە رۆحەکان دەگەڕێندرێنەوە بۆ لاشەکان، وە لەگۆڕەکانییان هەڵدەستنەوە بۆلای خودای گەورەو میهرەبان، گەڕانەوەی لاشەکانیش کۆدەنگی هەیە لەنێوان موسڵمانەکان و جولەکەو گاورەکاندا.

***

## ( لەحەدیسەکاندا باسی سزای ناوگۆڕ هەیە )

ئەوەی باسمان کرد دەیسەلمێنین و بڕیاری لەسەر دەدەین، بەڵام ئەو حەدیسانەی باس لە سزای ناوگۆڕو مەسەلەی هەردوو فریشتەی (منکرو نکیر) دەکەن، ئەمانە زۆر و متەواتیرەن کەوا لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە هەروەك لەهەردوو سەحیحەکەشدا هاتووە، لە ئیبنو عەباس کەوا پێغەمبەر(ﷺ) بەلای دوو گۆڕدا

تێپــەڕی و فــەرمووی: (أنهـا لَيُعـذبان ومـا يعـذبان في كـبير أمـا احـدهما فكـان لايستبريء من البول، وأما الآخر فكان يمشي بالنميمة).

واتە: (ئەو دووانە سزا دەدرێن، سزا دانەکەشیان لەسەر شتێکی زۆر گـەورە نییـە یەکێکیان خۆی پاك ڕانەدەگرت لەکاتی میزکردن، بـەڵام ئـەوەی دیکـە دووزمـانی دەکرد لەناو خەڵکدا).

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) داوای کرد گەڵایکی تەڕی دارخورما بێـنن، جـا کـردی بەدوو بەش، فەرمووی: (لعله يخفف عنهما مالم ييبسا)[125].

واتە: (بەڵکو سزاکەیان لەسەر سوك ببێ تاوەکو دوو گەڵاکە وشك دەبنەوە).

لـە سـەحیحێکی موسـلمدا: لەزەیـدی کـوڕی ثابـت دەگێڕێتـەوە وتـی: لەگـەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لەبیستانێکی نەوەی النجار بوون کەئەو لەسەر ئەسپەکەی بـوو، جا گوێی لەدەنگێکی گەورەبوو بەلایاندا تێپەڕی، لەوێ چوار یان پێنج یـان شـەش کەس بەخاك سپێردرابوون و گۆڕەکەیان لەوێ بـوو، پێغەومبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (من يعرف أصحاب هذهِ القبور) واتە: (کێ خاوەنی ئەو گۆڕانە دەناسێت؟)

پیاوێك وتی: من، فەرمووی: (فمتى مات هؤلاء؟) وتی: (ئەمانە کـەی مـردوون؟) وتی: لەکاتی هاوبەش دانان بۆ خوداو بێباوەڕیدا مردوون.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (إن هذه الأمة تبتلي في قبورها، فلولا أن لا تدافنوا لـدعوت الله ان يـسمعكم مـن عـذاب القـبر الـذي أسمـع منـه) واتـە:( ئەمانـە لەگۆڕەکەیاندا تووشی تاقی کردنەوە دەبن، جا ئەگەر ئێوە ئەوانتان نەناشـتبا داوام لەخودای گەورە دەکرد کە گوێتان لەسزاو ئازاری گۆڕ بوایە کەوا ئێـستا مـن گـوێم لێیە).

پاشان ڕووی کـردە ئێمـە و فـەرمووی: (تعـوذوا بـالله مـن عـذاب النـار) واتـە: (پەنابگرن بەخودای گەورە لەسزای ئاگر) وتییـان: پـەنا دەگـرین بـەخودای گـەورە

---

(125) مسلم: (٢٩٢).

لەسزای ئاگر، فەرمووی: (تعوذوا بالله من عذاب القبر) واتە:( پەنا بگرن بـەخودای گەورە لەسزای گۆڕ) وتییان: پەنا دەگرین بەخودا لەسزای گۆڕ، فـەرمووی: (تعـوذوا بالله من الفتن ماظهر منها وما بطن) واتە: (پەنابگرن بـەخودای گـەورە لەفیتنـەو ئاشووبەکان لەوەی دیـارو ئاشـکرایە وە لـەوەی نادیـارو پەنهانـە)، وتییـان: پـەنا دەگرین بەخودای گەورە لەفیتنەو ئاشووب لەوەی دیارو ئاشکرایە ولـەوەی نادیـارو پەنهانە.

جا فەرمووی: (تعوذوا بالله من فتنة الدجال) [١٢٦]، واتـە:( پـەنابگرن بـەخودای گەورە لەفیتنەی دەجال)، وتییان: پەنا دەگرین بەخودای گەورە لەفیتنەی دەجال.

لەسەحیحی موسلمدا: لە ئەبی هورەیرەوە، کـەوا پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرمووێت: (إذا أحدكم من التشهد الأخير فليعوذ بالله من أربع، من عذاب جهنم، ومن عذاب القبر، ومن عذاب فتنة المحيا والممات، ومن فتنة المسيح الدجال) [١٢٧].

واتە: (ئەگەر یەکێکتان لەشەهادە هێنانی کۆتـایی تـەواو بـوو بـا پـەنا بـەخودای گەورەو میهرەبان بگرێت بەچوارشت، لەسـزای دۆزەخ، و لەسـزای گـۆڕ، و لەسـزای فیتنەی ژیانی زیندوبوونەوە و مردن، وە لەسزای مەسیحی دەجال).

هـەروەها لـە سـەحیحی موسـلمدا لـە ئیبنـو عـەباس دەگێڕێتـەوە، کـەوا پێغەمبـەر(ﷺ) فێـری ئـەو دوعایـەی دەکـردین وەك چـۆن فێـری سـوورەتێکی دەکردین لەقورئاندا: (اللهم أني اعوذ بك من عذاب جهنم، وأعوذ بـك مـن عـذاب القبر، وأعوذ بك من فتنة المحيـا والممـات، وأعـوذ بـك مـن فيتنـة المسيح الدجال) [١٢٨].

---

(١٢٦) مسلم: (٢٨٦٧).

(١٢٧) سەرچاوەی پێشوو: (٥٨٨).

(١٢٨) سەرچاوەی پێشوو: (٥٩٠).

واتە: (خودایە من پەنا دەگرم بەتۆ لەسزای دۆزەخ، و پەنا دەگرم بەتۆ لەسزای گۆڕ، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەفیتنەی زیندوبوونەوەو مردن، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەفیتنەی مەسیحی دەجال).

لەهەردوو سەحیحەکەدا لە أبی أیوب دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵ دەرچوو و ڕۆژیش لەئاوابووندا بو، جا گوێی لەدەنگێك بوو ئینجا فەرمووی: (یهود تعذب في قبرها) [129].

واتە: (جولەکە لەگۆڕەکەی خۆی سزاو ئازار دەچێژێت).

وە لەدوو سەحیحەکەدا لە عائیشەوە(ﷺ) وتی: پیرەژنێك لەپیرەژنە جولەکەکانی مەدینە هاتەلای من، وتی: خاوەنی گۆڕەکان لەگۆڕەکانیاندا سزادەدرێن، وتی: منیش بەدرۆم خستنەوە نەمویست بڕوای پێبکەم، وتی: پیرەژنەکە ڕۆیشت،و پێغەمبەر(ﷺ) هاتەلای من وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، پیرەژنێك لەپیرەژنەکانی جولەکەکانی مەدینە هاتەلای من و سور بوو لەسەر ئەوەی خاوەن گۆڕەکان لەگۆڕەکانیاندا سزادەدرێن، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (صدقت، إنهم يعذبون عذاباً تسمعه البهائم كلها) [130].

واتە: (ڕاست دەکات، ئەوان سزایەکی وا سزا دەدرێن هەموو گیانلەبەرێك گوێی لێیەتی).

جا عائیشە وتی: پێغەمبەرم نەبینیوە ئیللا لەپاش نوێژکردندا خۆی پەنادەگرێت بەخودای گەورە لەسزای گۆڕ.

وەلە سەحیحی ئیبن حباندا لە أم مبشر وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هاتەلای من و فەرمووی: (تعوذوا بالله من عذاب القبر) واتە:( پەنابگرن بەخودای گەورە لەسزای گۆڕ)، جا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەگۆڕدا سزا هەیە؟ فەرمووی: (انهم

---

([129]) سەرچاوەی پێشو: (٢٨٦٩).

([130]) سەرچاوەی پێشو: (٥٨٦).

ليعذبون في قبورهم تسمعه البهـائم)[١٣١]، واته:( ئەوان لەگۆڕەكانياندا سزادەدرێن و گیانلەبەران گوێیان لێیە).

عبدالحق الاشبيلی وتی: أبو الحكم كوڕی برخان كەوا يەكێكە لەخاوەنی زانست و كارە چاكەكان دەڵێت لەنزيك شاری ئیشبيليە مردوويەكيان ناشت، كاتێك تـەواوبو لە بەخاكسپاردنی لە لێواری گۆڕستانەكە دانیشت و قسەيان دەكرد، لەنزيك ئـەوان ئاژەڵێك دەلەوەڕا، جا ئاژەڵەكـە بـەخێرايی بـۆلای گۆڕەكـە ڕۆيـشت، گوێـيەكانی بەرزكردەوە وەك ئەوەی گوێی لـە شـتێك بێـت، پاشـان رايكـردو هـەڵات، پاشـان گەڕايەوە لای گۆڕەكەو گوێيەكانی بەرزكردەوە وەك ئـەوەی گـوێی لەشـتێك بێـت، پاشان هەڵات، جار لەدوای جار ئەمەی دووبارە دەكردەوە.

ئەو گویێ لێ بوونـە راسـتە و لەسـەر دەنگـی سـزادراوان روودەدات، هنـاد بـن اليسری لە كتێبی الزهد دەڵێت: وكيع بۆمانی گێڕايەوە، ئەويش لـە الاعمـش، لـە شقيق، ئـەويش عائيـشە(رضي الله عنها) وە لـەدايك و بـاوكی وتـی: پيرەژنێكـی جولەكـە هاتـەلای مـن، باسـی سـزادانی گـۆڕی كـرد منـيش بـەدرۆم خـستەوە، جـا پيێغەمبەر(ﷺ) هاتەلای من و ئەمەم بۆگێڕايەوە، فەرمووی: (والذي نفسي بيده إنهم ليعذبون في قبورهم حتى تسمع البهائم أصواتهم)[١٣٢].

واتە: (سوێند بەوكەسەی كـە گيـانی مـنی بەدەسـتە ئـەوان لەگۆڕەكانيانـدا سـزا دەدەرێن تاوەكو ئاژەڵ گوێی لەدەنگەكانيانە).

جـا وتم: حەديـسەكان لـەكاروباری قـەبر زۆرن كـەوا لەهـەردوو سـەحيحەكەو سوننەتەكاندا هاتووە لە البراء كوڕی عازب دەگێڕێتـەوە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرمووی: (المسلم إذا سئل في قبره فيشهد أن لا إلـه الا الله وأن محمداً رسـول الله

---

(١٣١) سەحيحی إبن حبان: (٣١١٤) و مسند أحمد: ٦/٣٦٢.
(١٣٢) مسند أحمد: ٦/٢٠٥.

فذلك قوله تعالى﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ (ابراهيم: ٢٧)[١٣٣].

واته: (موسڵمانێك ئەگەر لەگۆڕەكەیدا پرسیاری لێكرا، شایەدی دا بەوەی كەوا هیچ پەرستراوێك و خودایەك نییە جگە لەزانی (الله) نەبێت و (محمد)یش نێردراوی خودایە، ئەوا ئەم فەرموودەیەی خودای لەسەر جێگیر دەبێت: (خودای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەكات لەسەر گوفتاری بەجێ و درووستیان دەكات لەژیانی دەونیادا، لەسەرەمەرگ و قیامەتیشدا).

لەو حەدیسەدا رایدەگەیەنێت بە گەڕانەوەی رۆح بۆ لاشەكەو بەتێك شكاندنی پەراسوەكانی ئەمەش ئەوە ئاشكرا دەكات كەوا سزا لەسەر لاشەو رۆحەكەیە پێكەوە.

أبو هريره لە نموونەی حەدیەكەی البراء ریوایەت دەكات سەبارەت بەكێشانی رۆح و مەسەلەی خۆشگوزەرانی و سزادانی، حەدیسەكەشی لە (مسند صحيحى) أبى حاتم دا هاتووە: كەوا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (إن الميت إذا وضع في قبره، إنه يسمع خفق نعالهم حين يولون عنه، فإن كان مؤمناً كانت الصلاة عند رأسه، والصيام عن يمينه، والزكاة عن شماله، وكان فعل الخيرات من الصدقة والصلة والمعروف والأحسان عند رجليه، فيؤتي من قبل رأسه، فتقول الصلاة: ماقبلي مدخل، ثم يؤتي من يمينه فيقول الصيام: ماقبلي مدخل، ثم يؤتي من يساره فتقول الزكاة: ماقبلي مدخل، ثم يؤتي من قبل رجليه فيقول: فعل الخيرات من الصدقة والصلة والمعروف والأحسان، ماقبلي مدخل، فيقال له: إجلس فيجلس قد مثلت له الشمس وقد دنت للغروب، فيقال له: هذا الرجل الذي كان فيكم ماتقول فيه، وماذا تشهد به عليه؟ فيقول: دعوني حتى أصلي، فيقولون: إنك ستصلي، أخبرنا عما نسألك عنه، أرأيت هذا الرجل الذي كان فيكم ماتقول فيه وماتشهد

---

(١٣٣) مسلم (٢٨٨١) ومسند أحمد: ٤/٩١.

عليه؟ فيقول: محمد، اشهد أنه رسول الله جاء بالحق من عند الله، فيقال له: على ذلك حييت وعلى ذلك مت وعلى ذلك تبعث إن شاء الله ثم يفتح له باب الى الجنة، فيقال له: هذا مقعدك وما أعد الله لك فيها فيزداد غبطة وسروراً ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعاً وينور له فيه، ويعاد الجسد لما بديء عنه، وتجعل نسمته في النسم الطيب وهي طير تعلق في شجرة الجنة) قال: فذلك قول الله تعالى: ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ (ابراهيم: ٢٧).

وذكر في الكافر ضد ذلك الى أن قال: (ثم يضيق عليه في قبره الى أن تختلف فيه أضلاعه، فتلك المعيشة الضنك التي قال الله تعالى: ﴿فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ (طه: ١٢٤) [١٣٤].

واته: (مردو ئەوکاتەی لەگۆڕەکەی دادەنرێت، لەکاتێکدا ئەو گوێی لەدەنگی نەعلەکانە کەوا بەجێی دەهێڵن، جا ئەگەر مردووەکە ئیمانداربێت ئەوا نوێژ لەلای سەری دەبێت، و ڕۆژو لەلای دەستەراستی دەبێت، و زەکات لەلای دەستەچەپی دەبێت، وە کاروکردەوە چاکەکان لە سەدەقە و پەیوەندی خزمایەتی و چاکەو چاکەکاری لەلای پێیەکانی دەبێت، ئینجا فریشتە لەلای سەریەوە بۆی دێت، نوێژ پێی دەڵێت: لەلای من دەرگای هاتنە ژوورەوە نییە، پاشان لەلای راستیەوە بۆی دێت ڕۆژوو پێی دەڵێت لەلای من دەرگای هاتنە ژوورەوە نییە، پاشان لەلای چەپیەوە بۆی دێت زەکات پێی دەڵێت لەلای من دەرگای هاتنە ژوورەوە نییە، پاشان لەلای پێیەکانییەوە بۆی دێت جا کاروکردەوە خێر لە سەدەقەوە پەیوەندی خزمایەتی و چاکەو چاکەکاری پێی دەڵێت لەلای من دەرگای هاتنەژوورەوە نییە، ئینجا فریشتەکان پێی دەڵێن: دانیشە ئەویش دادەنیشێت، جا پێی دەڵێن: ئەوپیاوەی کە نێردراوە بۆ ناوتان چی دەڵێیت دەربارەی، وە چ شایەدیەك دەدەی لەسەری؟ ئەویش دەڵێت لێم گەڕێن با نوێژ بکەم، ئەوانیش پێی دەڵێن تۆ لەمەودوا

(١٣٤) مسند أحمد: ٣٤٧، و صحيح إبن حبان: ٣٧٩/١.

نوێژ دەکەیت بەڵام وەڵامان بدەرەوە سەبارەت بەوانەی پرسیارت لێ دەکەین، ئایا ئەوپیاوەت بینیوە کەلە ناوتاندا بوو وەچی دەربارەی دەڵێیت، وە چ شاهێدییەك دەدەی لەسەری؟ جا دەڵێت: ئەو (محمد)ــە و شاهیدی دەدەم کە ئەو نێردراوی خودایە، لەلایەن خودای گەورەو میهرەبانەوە بەهەق بۆمان هاتووە، پێی دەڵێن: تۆ لەسەر ئەم کارو کردەوانە ژیایت لەسەر ئەمەش مردووی ولەسەر ئەمانەش گەر خوا حەز بکات زیندوو دەبیتەوە، پاشان لەگۆڕەکەیدا دەرگایەکی لەبەهەشت بۆ دەکرێتەوە، پێی دەڵێن: ئەمە جێگای تۆیە کەوا خودای گەورە بۆتی ئامادەکردووە جا خۆشی و شادمانی بۆ مردووەکە زیاتر دەبێت، پاشان گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت حەفتا گەز بەحەفتا گەز و بۆشی روونـاك دەکرێتەوە، و لاشەکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆ ئەو خاکەی یەکەمین جار لێی درووست کراوە، وە رۆحەکەی دەخرێتە ناو رۆحی پاك ئەویش باڵندەیەکە چلاوچل دەکات بەسەر درەختەکانی بەهەشتەوە..

وتی: جا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ (ابراهيم: ٢٧) واتە: (خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەداردەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستییان دەکات لەژیانی دونیادا، لەسەرمەرگ و قیامەتیشدا).

وە لەبارەی کافریش پێچەوانەوە دژی ئەمە باسی کردووە تاوەکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پاشان گۆڕەکەی لەسەر تەسك دەبێتەوە تاوەکو پەراسووەکانی لەدواوە تێك دەشکێنێت، ئا ئەمەیە ئەوژیانە تەنگ و ناخۆشەی کە خودای گەورە لەبارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ (طه: ١٢٤) واتە: بێگومان بۆئەو جۆرە کەسانەی ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت و لەرۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین).

له صەحیحی ابن ابی حاتمدا: لە أبی هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: (إذ قبر أحدكم أو الانسان أتاه ملكان أسودان أزرقان العين يقال لأحدهما: النكر وللآخر النكير، فيقولان له: ماكنت تقول في هذا الرجل محمد(ﷺ)؟ فهو قائل ماكان يقول، فإن كان مؤمناً قال: عبدالله ورسوله، أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً عبده ورسوله، فيقولان له إن كنا نعلم أنك تقول ذلك ثم يفسح له في قبره سبعون ذراعاً في سبعين ذراعاً، وينور له فيه، ويقال له: نم، فيقول: أرجع الى اهلي ومالي فأخبرهم فيقولان: نم كنومة العروس الذي لا يوقظه إلا أحب اهله اليه، حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك، وإن كان منافقاً قال: لا أدري، كنت أسمع الناس يقولون شيئاً، فكنت أقوله فيقولان له: كنا نعلم أنك تقول ذلك، ثم يقال للأرض: التئمي عليه فتلتئم عليه، حتى تختلف فيها أضلاعه، فلا يزال معذباً حتى يبعثه الله من مضجعه ذلك) [١٣٥].

واته:( کاتێك یەکێکتان یان ئادەمیزادێك دەخرێتە ناو گۆڕەوە دوو فریشتەی ڕەشی چاوشین دێن بۆ لای یەکێکیان ناوی (منکر) ئەوی تر ناوی (نکیر) ئەویش پێیان دەڵێت: چی لەبارەی ئەوپیاوە دەڵێیت کەناوی (محمد)ـە؟ جا ئەگەر ئیمانداربێت ئەوا دەڵێت: شاهێدی دەدەم کەوا ئەو بەندەو نێردراوی خودایە، (أشهد أن لا إله الا الله وأن محمداً عبده ورسوله) جا پێی دەڵێن: ئێمە دەمانزانی تۆ وادەڵێیت، پاشان گۆڕەکەی بۆ فراوان دەبێت حەفتا گەز بەحەفتا گەز، بۆی ڕووناك دەبێتەوە، و پێی دەڵێن: بخەوە، جا دەڵێت: دەگەڕێمەوە ناو خزم و کەس و کارەکەم و خەبەریان دەدەمێ، پێی دەڵێن: بخەوە وەك خەوی زاوا کەوا کەس خەبەری ناکاتەوە تەنها خۆشەویسترین کەسی نەبێت، تاوەکو خودای گەورە لەگۆڕەکەیدا زیندووی دەکاتەوە، جا ئەگەر مردووەکە مونافیق و دووڕوو بێت دەڵێت: نازانم، گوێم لێبوو خەڵکی شتێکیان لەبارەیەوە دەووت، منیش ئەوەی دەڵێم، جا دوو فریشتەکە پێی

(١٣٥) سنن الترمذي: (١٠٧١) وشرح الصدور: ١٨٦.

دەڵێن: ئێمە دەمانزانی تۆ وادەڵێیت، پاشان بەزەوی دەڵێن: بیگوشە و لەسەری تەنگ ببە جا زەوی دەیگوشێت و لەسەری تەنگ دەبێت، تاوەکو پەراسووەکانی لەدواوە تێك دەشکێنێت، ئەم سزایە دووبارە دەبێتەوە لەسەری تاوەکو خودای گەورە لەگۆڕەکەیدا زیندووی دەکاتەوە).. وە ئەمەش ڕووندەکاتەوە کەوا لاشە سزا و ئازار دەکێشێت.

لە ابی هورەیرەوە: کەوا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إذا أحتضر المؤمن أتت الملائكة بحريرة بيضاء فيقولون: أخرجي أيتها الروح الطيبة راضية مرضياً منك الى روح وريحان ورب غير غضبان، فتخرج كأطيب من ريح المسك حتى أنه ليناوله بعضهم بعضاً حتى يأتو به باب السماء، فيقولون: ما أطيب هذه الريح التي جاءتكم من الأرض، فيأتون به أرواح المؤمنين فلهم أشد فرحاً به من أحدكم بغائبه يقدم عليه، فيسألونه ماذا فعل فلان؟ قال: فيقولون: دعوه يستريح فإنه كان في غم الدنيا، فإذا قال: أتاكم فيقولون: إنه ذهب به الى أمه الهاوية، وإن الكافر إذا أحتضر أتته ملائكة العذاب بسمح، فيقولون: أخرجي مسخوطاً عليك الى عذاب الله، فتخرج كأنتن ريح جيفة حتى يأتوا به باب الارض فيقولون فما انتن هذه الروح حتى ياتوا به أرواح الكافر) [١٣٦].

واتە: (کاتێك ئیماندارێك خەریکە دەمرێت فریشتەکان بەئاوریشمی سپیەوە دێن بۆلای و پێی دەڵێن: وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پاك ڕازیکراوبەو خواش لێت ڕازییە بۆ ڕۆحێك و بەو ڕەیحانەی لەبەهەشتدایە وە خوایەك کە تووڕە نییە لێت، جا ڕۆحەکە دێتە دەرەوە لەبۆنی میسك بۆن خۆشترە تاوەکو فریشتەکان دەستاودەستی پێدەکەن و دەیبەنە دەرگای بەهەشت، جا دەڵێت: ئەم بۆنە خۆشە چییە کەلەزەوی هێناوتانە، ئینجا ڕۆحی ئیمانداران دێنەلای و کەوا زۆر دڵخۆشن بەیەکێك کەونبووە لایان و دەچنەلای، پرسیاری لێ دەکەن: فلان کەس چی کردووە؟ وتی:

---

(١٣٦) مسند أحمد: ٣٦٤/٢، و سنن النسائي: ٨/٤.

پێی دەڵێن: لێی گەڕێن با پشوو بدات چونکە ئەو لەغەمی دونیادا رزگاری بووە، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە ئەو براوە بۆ جێگەی خۆی لای ئەهلی دۆزەخ، ئەگەر کافرێکیش خەریکە دەمرێت ئەوا فریشتەی سزا دێتە لای کە زۆر رووگرژو توندوتیژن پێی دەڵێن: وەرە دەرەوە بۆ رق و تووڕەیی و سزای خودا، جا رۆحەکە دێتە دەرەوە بەبۆنێکی زۆر ناخۆش تاوەکو دەیبەنەوە سەرزەوی جا پێی دەڵێن: ئەو رۆحە ببەن بۆلای رۆحی کافرەکان).

النسائی لە (سنن)ەکەیدا لەحەدیسێکی عبدالله ی کوڕی عمرﷺ ریوایەتی کردووە، کەوا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هذا الذي تحرك له العرش وفتحت له ابواب السماء وشهد له سبعون الفاً من الملائكة لقد ضّم ضمة ثمَّ خرج منه) قال النسائي يعني سعد بن معاذ[١٣٧].

واتە: (ئائەمە ئەو کەسەیە کە خودای گەورە عەرشی بۆ هێنایە لەرزەو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرایەوە و حەفتا هەزار فریشتە لەگەڵ جەنازەکەیدا ئامادەبوون پاشان گۆڕەوشار دراو لەدواییدا رزگاری بوو).. النسائی دەڵێت واتاکەی سەعدی کوڕی معاذە.

وە لە حەزرەتی عائیشەوە ریوایەت کراوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (للقبر ضغطة لو نجا منها أحد لنجا منها سعد بن معاذ)[١٣٨].

واتە: (بێگومان گۆڕ پاڵەپەستۆو گوشینێکی هەیە گەر کەسێك لەو گوشینە رزگاری بوایە ئەوا سەعدی کوڕی موعاز دەبوو رزگاری بێت).

وتی: عبدە بۆ ئێمەی گێڕایەوە، لە عبدالله کوڕی عمر، ئەویش لە نافع دەڵێت: پێی راگەیاندووم کە جەنازەی سەعدی کوڕی موعازی بینیووە حەفتا هەزار فریشتە

---

(١٣٧) سنن النسائي: ٤/١٠٠.

(١٣٨) مسند أحمد: ٦/٥٥.

ئامادەی بوو هەرگیز دانەبەزیوونــە ســەرزەوی، وە پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) پێــی راگەیاندم و فەرمووی: (لقد ضم صاحبكم في القبر ضمة)[139].

واتە: (هەرئێستا هاوەڵەکەتان لەگۆڕەکەیدا گۆڕەوشار درا).

شعیب بۆمانی گێڕایەوە، لە ئیبن دینار، ئەویش لە ابراهیم الغنوی، ئــەویش لــە پیاوێك وتی: لــەلای عائیــشە بــووم رضي الله عنها جــەنازەی منــداڵێکی بــچووك تێپــەڕی، عائیشە گریا، پێم وت، ئەی دایکی ئیمانداران بۆچی دەگری؟ وتی: بۆ ئەم منداڵــە گریام و بەزەییم پێدا هاتەوە لەگۆڕەو شار کردنی گۆڕەکەی[140].

❊❊❊

## (سزای گۆڕ هەق و ڕەوایە لەلای ئەهلی سوننە)

ئەمەش وەك ســوننەتێکی ســەحیح و راســت پێویــست دەبــێ، لــەنێوان ئــەهلی سوننەدا یەکدەنگیەك هەیە و هەموویان کۆکن لەم بارەیەوە، المــروزی دەڵێــت: أبــو عبداللە وتی: سزای گۆڕ هەقە ئینکاری و نکۆڵی لێ ناکات تەنها ئەوانەی گــومڕان و خەڵکی گومڕا دەکەن.

حەنبەل وتی: بە ابی عبداللە م ووت لەبارەی سزای گۆڕ وتی: حەدیــسی ســەحیح هەیــەو باوەڕمــان پێیــەتی، و بڕیاریــشی لەســەر دەدەیــن، ئــەوەی لەلایــەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە، ئەوا پاڵپشتییەکی باشە و دانی پیا دەنێین، جا ئەگەر ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە و ئێمە ڕەتمــان کــردەوەو دانمــان پیــا نــەنا نــەوا فەرمانێکی خوای گەورەمان ڕەت کردۆتەوە، خــودای گــەورە دەفــەرمووێت: ﴿وَمَـا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ﴾ (الحشر: ٧).

---

(١٣٩) طبقات ابن سعد: ٣/٣٤٠.

(١٤٠) شرح الصدور: ١٥٩.

واتە: (جا ئەوەی پێغەمبەر پێی بەخشیون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن).

پێم وت: ئایا سزای گۆڕ هەقە؟ وتی: بەڵێ هەق و ڕەوایە، سزا و ئازار دەدرێین لەگۆڕەکاندا، وتی: گوێم لە أبا عبدالله بوو دەیووت: باوەڕمان هەیە بەسزای گۆڕ و بەهەردوو فریشتەی (منکرو نکیر) وە بەندەش لەگۆڕەکەیدا پرسیاری لێ دەکرێت جا لەگۆڕدا ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ (ابراهيم: ٢٧).

واتە: (خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و درووستیان دەکات لەژیانی دونیادا، لەسەرەمەرگ و قیامەتیشدا).

أحمد القاسم وتی: ئەی أبا عبدالله ئایا بە منكر و نكير دان پیا دەنێی هەروەك لەسزای گۆڕ ریوایەت کراوە؟ وتی: پاك و بێگەردی بۆ خودای میهرەبان بەڵێ بەوشێوەیە بڕیاری لەسەر دەدەین و ئاواش دەڵێین، وتم: هەربەو شێوەزارە دەڵێیت: منكر و نكير یاخود دەڵێیت هەردوو فریشتەکە؟ وتی: منكر و نكير، وتم: ئەوان دەڵێن: لەحەدیسدا منكر و نكير نییە، وتی: ئەو ئاوایە بەمانای: ئەوان هەردووکیان (منكر و نكير)ن.

بەڵام بیرو بۆچوون و ئاخاوتنەکانی ئەهلی بیدعە، گومڕاکان جا أبو الهزيل والمرسيبي دەڵێن: هەرکەسێك لەرێگای ئیمان چووە دەرەوە، ئەوا لەنێوان هەردوو (نفخە) فووەکە سزا دەدرێت، وە مەسەلەی ناوگۆڕ لەوانەیە بکەوێتە ئەوکاتە.

الجبائي و کوڕەکەی وە البخلي سزای ناوگۆڕ دەسەلمێنن، بەڵام لەسەر ئیمانداران ڕەتدەکەنەوە، بەڵام لەسەر ئەوانەی تا هەتایین وەك کافرەکان و گومڕاکان بڕیاری لەسەر دەدەن.

زۆر لە موعتەزیلەکان دەڵێن: نابێت فریشتەکانی خودا بە منکر و نکیر ناوببرێت، چونکە منکر بەمانای ئەوکەسە دێت لەکاتی پرسیارکردن شت دووبارە دەکاتەوەو زمانی دەگیرێ، وە نکیر بەمانای فریشتەی توندو تیژ و رەق و تووڕەن.

الصالحی و صالح دەڵێن: سزای گۆڕ لەسەر کەسی ئیماندار لەسەر لاشەیە بەبێ گەڕاندنەوەی رۆحەکەی بۆ لاشەکە، ومردووش دەکرێ ئازار بکێشێ و هەست بکات و بزانێت بەبێ رۆح، ئەمەش بۆچوونی کۆمەڵێکن لە الکرامیە[141].

هەندێك لە موعتەزیلەکان دەڵێن: خودای پاك و بێگەرد مردووەکان لەناو گۆڕەکانیاندا سزا دەدات، و ئێش و ئازار بەسەریاندا روودەدات بەڵام ئەوانە هەست پێناکەن، جا ئەو کاتەی زیندوو بوونەوە هەست بەو ئێش و ئازارە دەکەن، دەڵێن: نموونەی سزادانی مردووان وەك نموونەی سەرخۆشان و بێهۆشانە کاتێك لێیان دەدرێت هەست بە ئێش و ئازارەکە ناکەن، جا ئەوکاتەی ئەقڵەکەیان گەڕایەوە سەریان هەست بەئێش و ئازاری لێدانەکە دەکەن.

هەندێك لەوانەش یەکسەر سزای ناوگۆڕ رەت دەکەنەوەو دانی پێدا نانێن وەك ضرار کوڕی عمرو یحیی کوڕی کامل، ئەمەش بۆچوونی المریسیيە، وە ئەم ناخاوتنانەش ناخاوتنی شەرمەزاران و گۆمڕاوانە.



## (سزای گۆڕ ئەوکەسەی شایانیەتی دەستی دەکەوێت)

ئەوەی دەبێت بزانرێت کەوا سزای ناوگۆڕ سزای بەرزەخە، جا هەرکەسێ مرد و شایەنی سزابێت ئەوا پشکی ئەو سزایەی بەردەکەوێت، هەتا ئەگەر دڕندەش لاشەی خواردبێت یاخود سووتابێت هەتا ئەگەر بووبێتە خۆڵەمێش، و هەتا ئەگەر لەگەڵ هەوادا پەرت و بڵاو بێتەوە، یاخود رەق بووبێت، یاخود لەدەریادا نقووم کرابێت

[141] الکرامیة: هاوەڵانی محمد کوڕی کەرامن لە (٢٥٥)ك لەدایك بووە، ئەمەش لەکۆمەڵانی داهێنانی بیدعەن لەنیسلام.

ئەوا رۆح و لاشـەکەی دەگاتـەوە یـەك سـزاکە دەیانگـاتیّ هـەروەك لـەگۆڕەکانیان دابێت.

لەسەحیحێکی بوخاریـدا: لـە سمـرەی کـوڕی جنـدب گێڕایـەوە و وتـی: کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) نوێـژی تـەواو دەکـرد رووی خـۆی بـۆلای ئێمـە وەردەگێـڕاو دەیفەرموو: (مـن رأى مـنکم الليلـة رؤيـا؟) واتـە: کـیّ لـەئێوە ئەمـشەو خـەونی بینیـوە؟ وتـی: ئەگـەر کەسـێك خـەونی بدیتایـە دەیگێڕایـەوە، جـا دەیفـەرموو: (ماشاءالله) رۆژێك پرسیاری لێمان کرد فـەرمووی: (هـل رأي أحـد مـنکم رؤيـا؟) واتە:( ئایا کەس لەئێوە خەونی بینیوە؟) وتمان: نەخێر..

فەرمووی: بەڵام من ئەمشەو بینیم دوو پیاو هاتن بۆلام و دەستیان گرتم، منیان برد بۆخاکی پیرۆز، بینیم پیاوێـك دانیـشتبوو، و پیـاوێکیش وەسـتابوو ئاسـنێکی قولابی بەدەستەوەبوو دەیکرد بە لاشەویلاکیدا و هەڵیدەقڵێشاند پاشـان دەیخـستە سەر ئەلای تری بەهەمان شێوە چی لەو لایەی کردبوو ئەولایەشی والیّ دەکـرد، تـا لایەکەی والیّ دەکرد لاکەی تر چاك دەبۆوەو بەردەوام ئەولاو ئەولای هەڵدەقڵێشاند، وتم ئەمە چییە؟ وتییان: برۆ..

جا رۆیشتین تـاکو گەیـشتینە پیاوێـك پـاڵ کـەوتبوو و پیـاوێکیش بەسـەریەوە وەستابوو تاشە بەردێکی بەدەستەوە بوو دەیکێشا بەکەللەی سەریدا و بەردەکە بەر دەبۆوەو دەڕۆیشت لەبەر سەختی پیاکێشانەکەدا، سەری دوو پارچە دەکرد و خوێنی لیّ دەردەچـوو پیاوەکـە دەچـوو بەردەکـەی دەهێنایـەوە و سـەری وەك خـۆی لـیّ دەهاتەوە، دیسانەوە بەردەکەی دەکێـشا بەسـەری خۆیـدا و بـەردەوام ئـەو کـارەی دووبارە دەکردەوە، وتم: ئەمە چییە؟ وتییان: برۆ..

جا رۆیشتین گەیـشتینە شـوێنێك وەك تـەنوور وابـوو سـەرەوەی تەسـك بـوو و خوارەوەی فراوان بوو لەژێرەوە ئاگریان پێوە دەنا، بینیم پیاوان و ئافرەتـانی رووتـی تێدابوو، لە ژێرەوە ئاگریان پێوە دەنا و کاتێك لێیان نزیك دەبۆوە بـەرز دەبوونـەوە

خەریك بوو لەتەنوورەکە بێنە دەرەوە کاتێك ئاگرەکە دامرکایەوە دەگەڕانــەوە، جـا وتم: ئەمە چییە؟ وتییان برۆ..

جا ڕۆیشتین تا گەیشتینە ڕووبارێـك لـەخوێن پیاوێـك لەناوەڕاسـتی ڕووبارەکـە وەستابوو و پیاوێکیش لەقەراغی ڕووبارەکە کۆمەڵێك بەردی لەبەر دەستیابوو، جـا ئەوپیاوەی لەناەڕاستی ڕووبارەکە بـوو بـۆلای پیاوەکـە دەهـات و دەیویـست بێتـە دەرەوە پیاوەکەش بەردێکی گەورەی دەخستە ناودەمی، جا پیاوەکـە نقـووم دەبـوو بۆناو ئاوەکە هەروەك پێشوو، هەرکاتێ دەیویست بێتـە دەرەوە پیاوەکـە بـەردێکی دەخستە ناودەمی و دەیگەڕاندەوە شوێنی خۆی، جا وتم: ئەمە چییە؟ وتییان: برۆ..

جا فەرمووی ڕۆیشتین تا گەیشتینە بـاخێکی سـەوز کـەوا دارو درەخـتی گـەورەی تێدابوو، لەبن دارە گەورەکە پیاوێکی پیرو کۆمـەڵێك منـداڵی تێـدا بـو، پیاوێـك لەنزیك دارەکە ئاگرێکی بەدەستەوەبو دایدەگیرساند، پاشـان منیـان بـەرزکردەوە و بردمیانە ناو خانوویەکەوە شوێنی وا خۆشـم هـەرگیز نـەبینیبو، کـە چـەندمناڵ و پیرێکی تێدابو، پاشان منیان بەرزکردەوەو بردمیانە خانوویـەکی دیکـە کـەوا لـەو خۆشتر و جوانتر بو، وتم: ئێوە منتان زۆر گەڕان و سووڕان پێم بڵێن ئەوانەی بینینم، وتیــان: بــەڵێ ئــەوەی قــوولاپی لەشــەویلگەی دەچــەقێنراو هەڵیەقلیـشاند ئــەوە کابرایەکی درۆزن بو پڕوپاگەندەی درۆی بڵاو دەکردەوە، وە ئەو درۆیە لـەوەوە بـڵاو دەبۆوە تا دەگەیـشتە شـوێنایی دوور، جـا بـەو شـێوەیەی لـێ دەکرێـت تـا ڕۆژی قیامەت.

ئەو پیاوەی تاشە بەردەکەی لە کەللە سەری دەدا ئەوە پیاوێك بو خـوای گـەورە قورئانی فێردەکرد جا بەشەو دەخەوت، کـەرۆژ دەبـۆوە هیـچی لـێ نـەدەزانی، و بەرۆژ کاری پێنەدەکرد، ئەوکارە دەکات تا ڕۆژی قیامەت.

وە ئەوەی بینیت لەناو تەنوورەکە ئەوانـە پیـاوان و ئافرەتـانی زیناکـاربوون، وە ئەوەی بینینت لەڕووبارەکەدا ئەمانە ڕیباخۆر بوون.

وه ئەو پیاوه پیرەی لـەژێر دارەکـەبو ئـەوه ئیـبراهیم بـوﷺ ئـەو منداڵانـەش منداڵی خەڵك بوون، و ئەکەسەی ئاگری بڵێسەدەدا ئەوه دەرگەوانەکانی دۆزەخ بـو، وه یەکەم ماڵ کە چوویتە ناوی ئەو جێگای باوەڕدارانە بەگشتی، ماڵەکـەی دیکـە کەبینیت جێگای شەهیدەکانە، منیش جوبرائیلم، وه ئەوەش میکائیلە.. جـا وتـی سەرت بەرزکەوه منیش سەرم بەرز کـردەوه کۆشـکێکی گـەورەم بـینی وەك پەڵـە هەورێکی سپی، وتییان: ئا ئەوه جێگای تۆیـە، وتم: لێمگـەڕێن بـا بـچمە نـاوی، وتییان: هەندێك لەتەمەنت ماوه هێشتا تەواوت کردووه، جا هەرکاتێك تەوات کرد دێیە ناو جێگای خۆت[١٤٢].

ئەمەش دەقێکە لەسـزای بەرزەخـدا جـا خـەونی پێغەمبـەران و ژیـانی زینـدو هاوشێوەن لەهەمان کارو فەرماندا.

الطحاوی باسدەکات و دەڵێت: إبن مسعود گێڕایـەوه لەپێغەمبـەر(ﷺ) کـەوا فەرموویەتی: (أمر بعبد من عبد الله أن يضرب في قبره مائة جلدة، فلم يـزل يـسأل الله ويدعوه حتى صارت واحدة، فأمتلأ قبره عليه نارا، فلما ارتفع عنه أفاق، فقـال: علام جلدتموني؟ قالوا: إنك صـليت صـلاة بغـير طهـور، ومـررت علـى مظلـوم فلـم تنصره) [١٤٣].

واتە: (فەرماندرا یەکێك لەبەندەکانی خوا سەد جەلدەی لێبدرێت لەگۆڕەکەیدا، ئەو مردووه لەخودا دەپاڕایەوه تا بۆی کرا بەیەك جەلدە، کـەلێی درا، گۆڕەکـەی بـووه یەك پارچە ئاگر بەسەریدا، کاتێ هۆشی هاتەوه خۆی، وتی: بـۆ جەلـدەتان لێـدام؟ وتیان: چونکە تۆ نوێژێکت کرد بەبێ دەست نوێژ، و بەلای مرۆڤێکی ستەم لێکـراو ڕەت بوویت و سەرت نەخست).

---

(١٤٢) مسلم (٢٢٧٥) ومسند أحمد: ١٤/٥.

(١٤٣) شرح الصدور: ٢٢٨.

البيهقى لەحەديسێكى الربيع بن أنس باسى دەكات و دەگێڕێتەوە، لە أبى العاليە، ئەويش لە ئەبو هورەيرە، لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) سەبارەت بەو ئايەتە: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً﴾ (الاسراء: ١) واتە: (پاكى و بێگەردى و ستايش بۆ ئەو زاتەى كە شەورەوى كرد لەبەشێكى كەمى شەودا بەبەندەى خۆى محمد).

كەوا فەرمووى: ئەسپێكيان بۆى هێنا سوارى سەرپشتييان كرد، هەر هەنگاوێكى بەئەندازەيى بينينى چاو بو، وە حەزرەتى جوبريليشى لەگەڵدا بو گەيشتنە لاى قەومێك بەرۆژێك دەيانچاند، وە بەرۆژێك دەيان دووريەوە، هەرچەندى دەيان دووريەوە وەك خۆى لىٚ دەهاتەوە، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووى: (يا جبريل من هؤلاء؟) واتە:( ئەى جوبريل ئەوانە كێن؟) وتى: ئەمانە خەباتكارن لەپێناوى خوادا، خواى گەورە بەحەوت سەد چاكە بۆيان زياد دەكات ﴿وَمَا أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ (سبأ : ٣٩) واتە: (ئێوەش هەرشتێك دەبەخشن ئەو زاتە جێى پڕ دەكاتەوە، چونكە ئەو خوايە چاكترين رزق و رۆزى بەخشە).

پاشان بەلاى قەومێكدا تێپەڕين سەرى خۆيان لەتاشە بەردەكان دەداو شەقيان دەكرد و هەركاتىٚ خۆيان بەرزدەكردەوە وەكو خۆى لىٚ دەهاتەوە، فەرمووى: (يا جبريل من هؤلاء؟) واتە:( ئەى جوبريل ئەوانە كێن؟) وتى ئەوانە ئەوكەسانەن سەريان گرانە لەنوێژكردن.

پاشان بەلاى قەومێكدا تێپەڕين لەپێشەوەيان داخ دەكران، و لەدواوەيان داخ دەكران، هاواريان دەكرد وەك چۆن ئاژەڵ هاواردەكات لەسەر درەختى دڕكاوى و درەختى زەقوم كە تاڵترين درەختە لەدۆزەخ دەژيان و لەسەر ئەو بەردە گەرمانەى كەبەئاگرى دۆزەخ داخراون وەستابوون، فەرمووى: (يا جبريل من هؤلاء؟) واتە: (ئەى جوبريل ئەوانە كێن؟) وتى: ئەوانە ئەوكەسانەن لەپارەو پوولى خۆيان سەدەقەو بەخشش نادەن، بەڵام خودا زوڵميان لىٚ ناكات، خوداى گەورە ستەم لەبەندەى خۆى ناكات.

پاشان بەلای قەومێکدا تێپەڕین لەنێوان دەستەکانیاندا هەندێك گۆشتی پاك و هەندێك گۆشتی پیس هەبوو، جا لەگۆشتە پیسەکەیان دەخواردو وازیان لە گۆشتە پاکەکە دەهێنا، جا فەمووی: (یا جبریل من هؤلاء؟) واتە: (ئەی جوبریل ئەوانە کێن؟) وتی: ئەوانە ئافرەتی حەلاڵیان هەیە کەچی دەچن بەلای ئافرەتانی پیس و تابەیانی لایان دەمێننەوە.

پاشان بەلای قەومێکدا تێپەڕین لێویان بەمەقاشی ئاسن پارچەپارچە دەکرا، گۆشتیان لێدەکرایەوە هەرچەند جارەی گازی لێدەگرت وەك و خۆی لێدەهاتەوە، فەرمووی: (یا جبریل ما هذا؟) واتە:( ئەی جوبریل ئەمە چییە؟) وتی: ئەوانە وتاربێژانی فیتنەو ئاشووب گێڕن.

پاشان چووە سەر کوونێکی بچووك رووناکییەکی گەورەی لێ دەهاتە دەرەوە، جا رووناکییەکە دەیویست بچێتەوە ناو کونەکە وەك چۆن لێی هاتبووە دەرەوە بەس ناتوانێت، فەرمووی: (یا جبریل ما هذا؟) واتە: (ئەی جوبریل ئەمە چییە؟) وتی: ئەوە پیاوێکە قسەیەك دەکات و لێی پەشیمان دەبێتەوە، جا دەیەوێت بیگێڕێتەوە بەڵام ناتوانێت(١٤٤).

وە لە (سنن)ی أبی داود لەحەدیسێکی ئەنەس کوڕی مالیکدا دەگێڕێتەوە: کەوا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لما عرج بي مررت بقوم لهم أظفار من نحاس يخمشون وجوههم وصدورهم، فقلت: يا جبريل من هؤلاء؟ قال: الذي يأكلون لحوم الناس ويقعون في أعراضهم)(١٤٥).

واتە: (کاتێ بەرزکرامەوە بۆ ئاسمان بەلای کەسانێکدا تێپەڕیم نینۆکەکانیان لە مس درووستکرابو دەموچاو و سنگیان پێ دەڕنیەوە، جا وتم: ئەی جبریل ئەوانە

(١٤٤) مجمع الزائد: ١/٧٢.

(١٤٥) سنن أبي داود: (٤٨٧٨).

كێن؟ وتی: ئەوانە ئەوکەسانەن گۆشتی برایانی خۆیان دەخۆن لەپاشملە بەخراپە باسیان دەکەن).

أبو داود الطيالسي، لە (مسند)ەکەیدا دەڵێت: شعبە بۆمانی گێڕایەوە، لە الاعیش، ئەویش لە مجاهد، ئەویش لە ئیبنو عەباس: کەوا پێغەمبەر(ﷺ) هاتە سەر دوو گۆڕ، فەرمووی: (إنهما ليعذبان في غير كبير، أما أحدهما فكان يأكل لحوم الناس، وأما الآخر فكان صاحب نميمة).

واتە: (ئەو دووانە ئێستا سزا دەدرێن لەسەر شتێکی زۆر گەورەش نا، یەکێکیان گۆشتی خەڵکی دەخوارد و ئەوی تریان دووزمانی دەکرد لەنێو خەڵکدا).

پاشان داوای دوو گەڵای تەڕی دارخورمای کردو کردی بەدوو بەش، جا بەشێکی گەڵاکەی خستەسەر گۆڕێك و بەشەکەی دیکەی خستە سەر گۆڕەکەی دیکە، و فەرمووی: (عسى أن يخفف عنهما ما دامتا راطبين) واتە: (بەڵکو سزا لەسەریان کەم بێتەوە، مادام هەردوو گەڵاکە تەڕن).

خەڵك لەوەدا ناکۆکن ئایا خاوەنی ئەودوو گۆڕە کافر بوون یاخود ئیمانداربوون؟ دەڵێن: هەردووکیان کافر بوون وەك فەرموودەکەی: (إنهما يعذبان في كبير) واتە: ئەوانە لەسەر شتی گەورە سزا دەدرێن.. واتە: بەزیادەخستە سەری کوفرو هاوبەش پەیداکردن بۆ خودای گەورە، دەڵێن: ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا سزاکە لەسەریان زیاد نابێت بەڵکو سووك دەبێت، هەروەها سووك بوونی ماوەی سزاکەش هەتاکو گەڵای دارخورماکان بەتەڕی دەمێنێتەوە.

هەروەها ئەگەر هەردووکیان ئیمانداربوونایە پێغەمبەر(ﷺ) شەفاعەتی بۆ دەکردن، وە پێغەمبەر(ﷺ) دوعای دەکرد بەشەفاعەتی خۆی کە سزاکەیان لەسەر هەڵبگیرێت، و هەروەها لەهەندێك رێگاکانی حەدیسەکە دەڵێت: (أنها كانا كافران) واتە: ئەودووانە هەردووکیان کافربوون، وە ئەو سزایەش لەسەر سزای هەردووکیان زیاد دەکرێت بەهۆی تاوان و کوفری هەردووکیان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی

کەوا کافر بەهۆی کوفرو تاوانەکانییان سـزا دەدرێـن، ئەمـەش بیروبۆچـوونی (أبـی الحکم کوڕی برخان)ـە.

دەڵـێن: هـەردووکیان موسـڵمان بونـە لەبەرئـەوەی پێغەمبـەر(ﷺ) هـۆی سزاکەیان باس ناکـات، هـەروەك لەفەرموودەکـەی: (ومـا يعـذبان في كـبير) واتـە: لەسەر شتێکی زۆر گەورە نا ئەوانە سزا دەدرێن، دیارە کوفرو هاوبەشی پەیداکردن لەتاوانە گەورەکانە..

پێویستیش ناکات پێغەمبەر(ﷺ) شەفاعەت بـۆ هـەموو موسـڵمانێك بکـات کەوا لەگۆڕەکەیدا لەسەر تاوانێك لەتاوانەکان سزا دەدرێـت، و خەبـەری داوە کـەوا یەکێك لەسەر دزینی عەبایەك لەبەرەکانی شەڕدا کـە دزی بـووی لەگـەڵ ئەوەشـدا لەوغەزایـەدا شـەهیدبوو کەچـی لەگۆڕەکەیـدا ئـاگر بـەرز بـووەوە، و ئەوکەسـە موسڵمانێکی موجاهیدیش بو، خودای گەورەش لەهەموکـەس زانـاترە، ئەمـەش بیروبۆچوونی (أبي عبدالله القرطبي)ە.

❊❊❊

## ئەمەش وتەی پرسیارکارانە: وەڵاممان چییە بۆ بێ باوەڕان و گومڕاوان و ئەوانەی نکۆڵی دەکەن بۆ سزای گۆڕ و فراوانی و تەنگ و ناخۆشی ژیان تێیدا، وە بوونی دۆڵێك لەدۆڵەکانی ئاگر یاخود باخێك لەباخەکانی بەهەشت، وە ئایا مردو لەناوی دادەنیشێت یاخود دانانیشێت؟

دەڵێن: کاتێك گۆڕ هەڵدەدەینەوە هیچ فریشتەیەك لەناویدا نـابینین کـوێرو کـەڕ لەمردو بدەن بەچەکوشی ئاسن، و هیچ مارو ئەژدیهاو دووپشك و ئاگرمان نەبینیوە لەناو گۆڕدا هەڵبچن، وە هیچ حاڵەتێك لەو حاڵەتانەمان نەبینیوە ئەوەی بینیومانە وەکو خۆیەتی و نەگۆڕاوە، ئەگەرچی لەسەر چاوەکانیشی جیوەو لەسەر سینگیـشی رووەکی خەردەل دابنێین، ئەوا حاڵەتەکەمان وەکو خۆی بینیوە، جـا چـۆن تـا چـاو

بڕدەکات گۆڕەکەی بۆ فراوان دەبێت، یاخود گۆڕەکەی لەسەر تەسك دەبێت کەچی ئێمە گۆڕەکانمان وەکو خۆی بینیوە، وە ڕووبەری گۆڕکەشمان وەکو خۆی بینیوە نەزیادی کردووەو نە کەمی کردووە، و چۆن ئەو گۆڕە تەنگەی بۆ فراوان دەبێت، و فریشتە و ئەو وێنەیەی کەوا هۆگر و هاوڕێی دەبێت یاخود دەیترسێنێ؟ و براکانییان لەئەهلی بیدعەو گومرایی دەڵێت: هەموو قسەو ئاخاوتنێك پێچەوانەی کارێکی گونجاو و هەستکردنە و قسەکەرەکەش بەهەڵەدا دەبات.

دەڵێین: بێگومان ئێمە هەموو کەسێکی مردو لەسەر تەختەدا دەبینین بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ نەپرسیاری لێ دەکرێت و نەوەڵامیش دەداتەوە نە دەجووڵێ و نەلەسەر لاشەکەی ئاگر هەڵدەگیرسێت، ئەگەر یەکێك ئاژەڵێکی دڕندە گۆشتی بخوات یاخود باڵندەکان لەلاشەیان خواردبێت یاخود لاشەکەی پارچەپارچە بووبێت لەبەردەمی دڕندەکان و باڵندەکان و نەهەنگەکان و شەپۆلەکانی با، ئایا چۆن ئەوهەموو پارچانە پرسیاری لێدەکرێت سەرەڕای ئەوەی هەموو جیابوونەتەوە؟ چۆن مەسەلەی دووفریشتەکە بیردەکەیتەوە بۆئەوکەسەی ئەمە وەسف و تایبەتمەندی ئەوبێت، وەچۆن گۆڕ لەسەر ئەم کەسە دەبێتەوە باخێك لەباخەکانی بەهەشت یاخود دۆڵێك لەدۆڵەکانی جەهەننەم، وە چۆن گۆڕ لەسەریدا تەسك دەبێتەوە تاوەکو پەراسووەکانی تێك بشکێنێت؟.

***

**(هەواڵ گەیاندنی پێغەمبەران ژیرو تێگەیشتووان شایەدی بۆدەدەن)**

فەرمانی یەکەم: دەبێ بزانرێت کەوا پێغەمبەرانعَلَيْهِمُ السَّلَامُ ئەم هەواڵانەیان نەگەیاندووە، بۆئەوەی ژیرو داناکان خۆیانی پێ بڕازێننەوە و لەخۆیان بگۆڕن، بەڵکو هەواڵ گەیاندنەکە بۆ دووبەشە:

یەکەم: بۆئەوەی پیاوانی ژیرو عاقڵ و تێگەیشتوو و داهێنەر شاهێدبن و ئاگاداربن پێی.

دووەم: ئەوەی کەسی ژیرو عاقڵ درکی پێناکات و نایزانێت وەك شتە پەنهان و شاراوەکانە کەوا هەواڵی پێ دەدەن لەبارەی ژیانی بەرزەخ و رۆژی دوایی، و باسی چاکەو سزا، وە نابێت هەواڵەکەشیان ئەستەم بێت، هەموو هەواڵێکیش گوماندەکرێت کەوا عەقڵ بیڕازێنێتەوە جا لەو دوو فەرمانە بەدەری ناکات: یان دەبێت هەواڵەکە درۆبێت لەسەریان، یاخود دەبێت عەقڵ و بیرکردنەوەکە پووچەڵ بێت.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سبأ: ٦).

واتە: (ئەوانەی زانست و زانیارییان پێدراوە چاك دەزانن ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت رەوانەکراوە هەرئەوە حەق و راستە، هیدایەت و رێنموویی بەخشە بۆ رێبازی پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات و شایستەی سوپاس و ستایشە).

وە دەفەرمووێت: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى﴾ (الرعد: ١٩).

واتە: (جا ئایا ئەوکەسەی کە دڵنیایە و دەزانێت بێگومان ئەم قورئانەی کەلەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە حەق و راستەقینەیە، وەکو ئەوکەسە وایە کەکوێرە لەئاستیدا؟).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَفْرَحُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ الأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُ﴾ ( الرعد: ٣٦).

واتە: (دەستەیەك لەوانەی کەکتێبی ئاسمانییان پێ بەخشیون دڵخۆش و شادمان دەبن و بەو قورئانەی کەبۆتۆ دابەزێنراوە، هەندێ گرۆو دەستەی تریش هەیە ئینکاری هەندێکی دەکات).

هیچ دەروونێکیش بەمەحاڵ دڵخۆش نابێت، خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَـا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِـفَاء لِّمَـا فِـي الـصُّدُورِ وَهُـدًى وَرَحْمَـةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ * قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ﴾ (يونس: ٥٧-٥٨).

واتە: (ئەی خەڵکینە، بەڕاسـتی ئێـوە ئامۆژگاریـەکی گـەورەو گرنگتـان لەلایـەن پەروەردگارتانەوە بۆهاتووە کـە قورئانـە شـیفاو چارەسەریـشە بـۆ نەخۆشـی دڵ و دەروونەکان و ڕێ نیشاندەرو ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران، ئەی محمد بەئیمانداران بڵـێ با دڵشادو شادمان بن بەفەزڵ و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی کە قورئان و بەرنامـەی خوایە، کەوابوو باهەر بەوە دڵخۆش بن).

مەحاڵیش چارەسـەر نییـە، نـە ڕێ نیـشاندان و نـە ڕەحمەتیـشی تێـدا دەسـت ناکەوێت، پێی دڵخۆشیش نابێت، جا ئەمـەش فەرمانێکـە بۆهەرکەسـێك لەدڵیـدا خێرو چاکەی تێدا سەقامگیر نەبێت، پێیـەکانی لەسـەر ئیـسلام جـێگیرو وەسـتاو نەبێت، وە چاکترین بارودۆخیشی سەرسامی و گومان و شپرزەیی دەبێت.

*** 

## (لە پێویستی تێگەیشتنی مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ).

فەرمانی دووەم: دەبێت لەمەبەست و نیازی پێغەمبەر(ﷺ) تێبگـەیت، بـەبێ زیادەڕۆیی و بەبێ کەمتەرخـەمیش، وە فـەرموودەو وتـەکانی شـتی نەخرێتەسـەر کـەناگونجێت، و کـەم و کورپـشی تـێ ناکـەوێت لـە مەبەسـتەکەی و لـەئامانج و نیازەکەی لەبارەی ڕێ نیشاندان و بەرنامە و راگەیاندنەکەی.

ئەمەش بەهۆی پشتگوێ خستنەوە درووست بو وازهێنان لێی لەگومڕاییـەوە وە وازهێنان لێی لەراستییەوە کە نازانێت جگە لەخوای گەورە نـەبێت، بـەڵکو خـراپ تێگەیشتن لەبارەی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی کـەوا ئەسـڵ و بنـەڕەتی هـەموو بیدعە و گومڕاییە کەوا لەناو ئیسلام سەری هەڵداوە، بەڵکو ئەو بناغـەی هـەموو

هەڵەیەلە بنچینەو لقەکاندایە، نەخاسمە ئەگەر نیاز خراپـی تێـدا زیادبکرێـت، جـا لەهەندێك شتدا خراپ تێگەیشتن هەیە لەشوێنکەوتووەکاندا لەگەڵ نیازچاکی ئەوان و نیـازخراپی ئەوانـەی لـەدوای ئەوانـدادێن، ئەمـەش دەبێتـە بـەڵاو کارەسـات و ناخۆشی بۆ دین و ئەهلەکەی، وە خوای گەورەی پەناگەو یامەتیدەرە.

ئایا قەدەریەو مورجئەو خوارج و موعتەزیلە و جەهەمیە و رافیزەکان و تـەواوی لایەنەکان کەوتوونەتە ناو ئەهلی بیدعە، یاخود تـەنها خـراپ تێگەیـشتنییانە لـە خودا و پێغەمبەرەکەی تـاوەکو وای لێهـاتووە دیـن کەوتۆتـە بەردەسـتی زۆربـەی خەڵکان کـە وتـەو وەڵامدانـەوەی ئـەو تێگەیـشتنانەیە؟ وەك ئـەوەی سـەحابەکان تێگەیشتوون.



## (ژیان و مەنزڵگاکان سێ بەشن)

فەرمانی سێیەم: خودای گەورەو میهرەبان مـەنزڵگا و ژیانـەکانی کردۆتـە سـێ بەش: ژیانی دونیا و ژیانی بەرزەخ (لەنێوان مردن و زیندوبوونەوە دایـە) وە ژیـانی کۆتایی یان ژیانی رۆژی دوایی، بۆ هەموو ژیانێکیش چەند حوکم و یاسایەك هەیـە کە بەو تایبەتە، ئەو ئادەمیزادەی کە لەلاشەو دڵ و دەروون پێکهـاتووە و حـوکم و یاساکانی دونیا لەسەر جەستەو رۆحەکان دانراوە، بۆیە یاسـاکانی شـەرع بـەرێك و پێکی بەرجەستە کراوە لەسەر دەرکەوتنی جوولەی زوویان و ئەندامـەکان و کاتێـك دڵ و دەروون دەشارڕێتەوە ئەمە پێچەوانیەتی.

ژیانی بەرزەخ لەسـەر رۆح و لاشـەکان دانـراوە، جـا کاتێـك رۆحـی لاشـەکانی لەیاساکانی دونیا بەدوایدا بێت جا بەئێش و ئازاری لاشـە رۆحـیش ئـێش و ئـازار دەکێشێت، و حەوانەوەو پشووی لاشە رۆحـیش پـشوو دەدات و چـێژ وەردەگرێـت،

هەر رۆحیشە هۆکاری دەستپێکردنی نیعمەت و سزایە، لاشە بەدوای رۆحدا دەچێت لەوەرگرتنی چێژەکانی نیعەمت و خۆشی و سزاو ئازاردا، رۆحەکانیش لەوکاتەدا بەخۆشی و سزادا دەست پێدەکات، لێرەدا لاشەکان دیارو ئاشکران و رۆحەکانیش پەنهان و شاراوەن، لاشەکانیش بۆ رۆحەکان وەك گۆڕ وایە، و لەبەرزەخدا رۆحەکان دیارو ئاشکرا دەبن و لاشەکانیش دەبێتە پەنهان و شاراوە لەگۆڕەکەیدا، یاساکانی بەرزەخیش بەسەر رۆحەکاندا تێدەپەڕێت، جا نیعمەت و سزا بۆ لاشەکەی دەڕوات، وەك چۆن لەدونیادا یاساکان بەسەر لاشەدا جێبەجێ دەکرێت و نیعەمەت و سزاش بۆ رۆحەکەی دەڕوات.

بێگومان خودای پاك و بێگەرد بە لوتف و بەزەیی و رێ نیشاندەری خۆی ئەم حاڵەتەمان لەکاتی خەوتن لەدونیادا نیشان دەدات، جا ئەگەر نیعمەت ببەخشێ یاخود سزا بنێرێت ئەوا لەبنەڕەتدا بەسەر رۆحەکەدا تێدەپەڕێت و لاشەش بەدوایدا دێت، ئەمەش کاریگەرییەکی بەهێزی دەبێت لەسەر لاشەدا، جا کەسی خەوتوو لەخەوەکەیدا دەبینێت لێیدەدرێت، جا شوێنەواری لێدانەکە لەلاشەیدا دەبێت، وە دەبینێت لەخەوەکەیدا دەخوات یان دەخواتەوە، کاتێك لەخەو هەڵدەستێت دەبینێت شوێنەواری خواردن و خواردنەوەکە لەدەمیدا دیارەو برسیەتی و تینوویەتی لێی لادەچێت.

لەهەمووی سەیرتر یەکێکی خەوتوو دەبینێت لەخەوەکەیدا هەڵدەستێت و تەکان دەدات و شەق دەهاوێت هەروەك بەئاگابێت وایە کەچی خەوتووەو هەستیش بەم شتانە ناکات، ئەمەش کاتێك یاسا بەسەر رۆحەکە تێدەپەڕێت لەدەوروەیدا یارمەتیدەر دەبێت بۆ لاشەکە، ئەگەر چوو بەلای بەئاگا دێتەوەو هەست دەکات، جا لەوکاتەدا رۆحەکە نیعمەت و ئازارەکە دەبینێت و بەرێگای شوێنکەوتن وپەیوەندیەوە دەگاتە لاشەکەی، جا ئەمەش لەبەرزەخدا روودەدات، بەڵکو گەورەترو مەزنترە.

جـا کـەی هـەقی ئـەم بابەتـە دەدەیـت کـەوا بـۆت ئاشـکرا بـوو بـەوەی کـە پێغەمبەر(ﷺ) رایگەیاندووە لەسزا و نیعمەتی گۆڕو تەسـك بوونـەوەی و فـراوان بوونی و ببێتە دۆڵێك لەدۆڵەکانی ئاگر یـاخود باغێـك لەباغـەکانی بەهەشـت کـە هاوشێوەیە و یەك دەگرێتەوە لەگەڵ عەقڵ و مەنتیق.

بێگومان ئەمە هەق و راسـتە و هـیچ گومـانی تێدانییـە، و هەرکەسـێك لەمـەدا کێشەو گرفتی لەسەر درووستکرد ئەوا خراپ تێگەیشتنیەتی و کەمی زانیارییـەتی لەسەری، وەك دەڵێن:

وكم من عائبٍ قولاً صَحيحاً *** وَآفتهُ من آلفَهْمِ السَّقيمِ!



**( حیکمەت کردنی رۆژی دوایی فەرمانێکی شاراوەیە )**

فەرمانی چوارەم: لەراستیدا خودای گەورەو میهرەبان فـەرمانی رۆژی دوایـی و ئـەوەی پەیوەنـدی بـەوەوە هەیـە کردوویەتیـە کـارێکی پـەنهان و شـاراوە، و قەدەغـەکردنی و شـاردنەوە لەهەسـت پێکـردن و پێـزانینی پـێ سـپێردراوان لـەو ژیانەدا، ئەمەش لەتەواوی حیکمەتی ئەو زاتەیە، بۆئەوەی ئیمانداران شتی غـەیب و شاراوە لەشتەکانی دیکە جیابکەنەوە، جا یەکەم جاریش فریشتە لەلای ئەوکەسـە دادەنیشێ کە خەریکە دەمرێت، و هەندێك جاریش دەیانبینن، ولەلای ئەو گفـت و گۆ لەگەڵ یەکتر دەکەن، و کفـن و ئاوریـشمیان پێیـە یـان لەبەرهەشـتدایە یـاخود لەدۆزەخدایە، و باوەڕ لەسەر پاڕانەوەو دوعای ئامـادەبووان دەکـەن بـەخێرو چـاکە یاخود بەشەڕو خراپە.

بێگومان سەلام دەکەن لەسەر ئەوکەسەی خەریکە گیان لەدەست دەدات، جارێك بە وشە وەڵامی ئەوان دەداتەوە، وە جارێکیش بەهێما و ئیشارەت وە جارێکیش بەدڵ بەجۆرێك ناتوانێت نە قسەبکات و نەبجوولێت.

لەراستیدا لەهەندێك نەخۆشی سەرەمەرگ بیستراوە و دەڵێت: بەخێربێن و خۆشهاتن بۆ ئەو روخسارانە، و لەهەندێك نەخۆشیش بیستراوە کەدەڵێن: کەوا گوێیان لێبووە کە دەیوت سەلامی خوات لێبێت ئا لێرەدانیشە، و سەلامی خواش لەتۆ بێت، ئالێرە دادەنیشم.

سلمەی کوڕی عبدالملك وتی: کاتێك عومەری کوڕی عبدالعزیز خەریکی گیانەڵا بو ئێمە لە گومەزەکەی لای دانیشتبووین بەپەنجە هێمای بۆئێمە کرد کەبچینە دەرەوە ئێمەش چووینە دەرەوەو لەدەرەوەی گومەزەکە دانیشتین، تەنها خزمەتکارەکەی لای مایەوە، جا گوێمان لێبو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الأَرْضِ وَلَا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (القصص: ٨٣).

واتە( جا باخەڵکی دێنیابن کە ئەو ماڵی قیامەتەو ئەو بەهەشتی بەرینەمان ئامادەکردووە بۆ ئەو کەسانەی کە نەلووت بەرزیو گەورەییان دەوێت لە زەویدا نە فەسادو گوناهو خراپە، سەرەنجام و سەرفرازیش هەر بۆ پارێزکاران و خواناسەکانە).

عومەر وتی: ئێوەنە ئادەمیزادن و نەجنۆکە، پاشان خزمەتکارەکە هاتە دەردەوە، هێمای بۆ ئێمە کرد کەوا بچینە ژوورەوە، کاتێك چووینە ژوورەوە ئەو گیانی دەرچوبو.

فضالەی کوڕی دینار وتی: لەلای محمد کوڕی واسع ئامادەبووم خەریك بوو گیانی دەردەچوو: جا هەڵیکردو وتی: بەخێرهاتن و سەلام لەفریشتەی خودام بێت، ولاحول

ولا قوة الا بالله، بۆنێکی زۆر خۆش دەکەم هەرگیز بۆنی واخۆشم نەکردووە، پاشان چاوی کردەوە، گیانی دەرچوو[١٤٦].

نموونەو باسکردن لەم بابەتانەدا زۆرن و لەژمارە نایەن..

ڕاگەیەندراوە و بۆمانیش روونکراوەتەوە ئەمەش هەموو فەرموودەی خودای گەروەومیهرەبانە کە دەفەرموویێت: ﴿فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ * وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ * وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَّا تُبْصِرُونَ﴾ (الواقعة: ٨٣-٨٥).

واتە: (باشە ئێوە بۆ بیرناکەنەوە ڕۆژێك دێت کە ڕۆحتان دەگاتە گەرووتان، ئێوەش بەدەوری ئەوکەسەدا بێ دەسەلاتانە تەماشا دەکەن و سەرنج دەدەن، لەکاتێکدا کەئێمە لەئێوە نزیکترین لێی، بەلام ئێوە نامانبینن).

واتە: فریشتەو پێغەمبەرانمان لێی نزیکترە.. بەلام ئێوە نایانبینن، جا ئەمەش یەکەم کارو فەرمانە کەشتێکی دیارو ناشکرانییە بۆئێمە، و ئەمەش لەو ژیانەدایە.

پاشان فریشتە دەست بە ڕۆحەکەدا دەهێنێت و ڕۆحەکە دەکێشێت و قسەشی لەگەڵدا دەکات، بەلام ئامادەبووان نەدەیبینن و نە گوێشیان لێیە، پاشان دەڕوات، جا نوورێك وەك تیشکی خۆر لێی دەردەچێت و بۆنێك خۆشتر لەبۆنی میسك، کەچی ئامادەبووان نایبینن و بۆنیشی ناکەن.

پاشان فریشتەکان بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە، کەچی ئامادەبووان نایانبینن.

پاشان ڕۆحەکە دێت و سەیری لاشەکە دەدات کاتێك دەیشۆن و کفنی دەکەن و هەلی دەگرن، و دەلێت: پەلە بکەن، یاخود دەلێت ئێوە بۆ کوێم دەبەن، بەلام خەلکەکە گوێی لەمە نییە، جا کاتێك لەناو گۆڕەکەی دادەنرێت و خۆلی بەسەردا دەکەن، خۆل بەسەر داکردنەکە ڕێگا لە فریشتەکان ناگرێت لەگەیشتن بۆلای، بەلکو کاتێك بەردەکەی بۆ دادەنێن و ئامادەبوونی ئەم هەموو جەستە زۆرە ڕێگا لەبڕینی

(١٤٦) شرح الصدور: ١٢٠.

رۆحەکان ناگرێت بۆچوونە ناوی، بەڵکو جنۆکەش ناتوانێت قەدەغەی بکات، بەڵکو خودای گەورە ئەم هەموو خۆڵ و بەردانەی بۆ فریشتەکان گۆڕی و وەك هێلانەی باڵندەیەك لەئاسماندا و فراوانبوونی گۆڕ و بەتایبەتیش فراوانبوونی گۆڕ بۆ رۆحەکەو لاشەش بەدوایدا دێت، جا لاشەکە لەگۆڕێکدا دەبێت کەلە باڵێك تەسکترە، بێگومان تا چاو بڕەکات بۆی فراوان دەبێت و بەدوای رۆحەکە دەکەوێت، بەلام گوشینی گۆڕ هەتاکو هەندێ لەئەندامانی مردووەکە تێك دەشکێنێت لەکاتێکدا نەهەست و نەعەقڵ و نە سروشت ناتوانێت بەرپەرچی بداتەوە.



## (ئاگری دونیا لەئاگری رۆژی دوایی جیاوازە)

فەرمانی پێنجەم: لەڕاستیدا ئەو ئاگرەی کەوا لەناو گۆڕدا هەیە وەکو ئەو ئاگرەی دونیا و ڕەنگ سەوزیەی نییە کەوا لەدونیا دەیبینیت، بەڵکو ئەمە لەئاگری رۆژی دواییە و تووندترو بەهێزترە لە ئاگری دونیا، بەلام خەڵکی سەردونیا هەستی پێناکات، جا خودای پاك و بێگەرد لێی دەپارێزێت لەو خۆڵ و بەردەی کەوا لەسەریەتی و لەژێریەتی تاکو وای لێدێت گەرمتر بێت لەپشکۆکانی دونیا.

ئەگەر یەکێك لەخەڵکی سەرزەوی دەستی لەو خۆڵ و بەردەیدا کەلەناو گۆڕەکەدایە هەستی پێناکات، بەڵکو لەمەش سەیرتر کاتێك دووپیاو لەتەنیشت یەکەوە دەنێژرێن، ئەمەیان گۆڕەکەی دۆڵێکە لەدۆڵەکانی ئاگر کەچی گەرماییەکەی ناگاتە دراوسێکەی، و ئەویتر گۆڕەکەی باخێك بێت لەباخەکانی بەهەشت رۆحەکەی نیعمەت و خۆشیەکەی ناگاتە دراوسێکەی.

توانای خودای گەورە لەمە فراوانترو سەیرتریشە، بێگومان خودای میهرەبان لە نیشانەکانی توانی خۆی بەئێمەی پیشانداوە لەو مەنزڵگایەداکەلەمە زۆر سەرسوڕهێنترە، بەلام ئەو دڵ و دەروونانەی کە پڕن و داگیرکراون بەدرۆ کەوا

بەزانست و زانیاری گەمارۆ نەدراون و نازانن تەنها ئەوانەی خودای گـەورە سـەریان دەخات و راگیراویان دەکات.

جا بۆ کافر لەناو گۆڕدا دوو تەختە رادەخرێت لەئاگر ئینجا گۆڕەکـەی لەسـەری دەسووتێ و سوور دەبێتەوە هەروەك تەنوور هەڵدەگیرسێت و سوور دەبێتەوە، ئەگەر خودای گەورە ویستی لەسەربێت ئەوا لەئاگر رزگاری دەکات، بۆیە ئەگەر بەنـدەکان ئەمەیان بۆ دەرکەوت هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی تەکلیف کـردن و باوەڕهێنـان بەغەیب و شتە شاراووەکان.

هەروەك لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی ئەوکەسـانەی خەڵکی دەنێژن دەفەرمووێت: (لولا ان لاتدفنوا لدعوت الله أن يسمعكم من عـذاب القبر ما أسمع) [١٤٧].

واتە: (ئەگەر لەترسی ئەوە نەبێت لەمەودوا نەوێرن مردو بنێژن، ئەوا داوام لەخوای گەورە دەکرد ئەو سزای ناوگۆڕەکەی ئێستا من گوێم لێیـەتی ئێـوەش گوێتـان لـێ بوایە).

کاتێـك ئـەو حیکمەتـە شـاراوە بـوو تـەنها گیانلەبـەران هەسـتی پێدەکـەن، پێغەمبـەر(ﷺ) گـوێی لەمـەبووەو هەسـتی پێکـردووە، هـەروەك ئەسـپەکەی پێغەمبەر(ﷺ) درکی پێکردو سڵەمیەوە جـا کاتێـك بـەلای گۆڕەکـەدا تێپـەڕی هەستی کرد یەکێك لەناو گۆڕەکەیدا سزا دەدرێت.

دەڵێت أبو عبدالله کوڕی الرزيز الحراني بۆمنی گێڕایەوە وتی: لـەپاش عەسـرێك لەماڵەکەی چووە دەرەوە بۆناو بێستان کەماڵی لەئامەد بو، وتی: لەوکاتـەی پـێش ئەوەی رۆژ هەڵبێت چوومە ناوەڕاستی گۆرستانێك، یەکێك لـەگۆڕەکان پـشکۆیەك ئاگر بو وەك پارچە شووشە دەبریسکایەوە، مردووەکـەش لەناوەڕاسـتیدابو، ئینجـا دەستم بەچاوەکانم داهێنا وتم: ئایا من خـەوتووم یـاخود بـەئاگام؟ پاشـان چـوومە

---

(١٤٧) مسلم: (٢٨٦٧) و مسند أحمد: ١٠٣/٣.

ماڵەوە سەرسام ببووم، خواردنییان بۆهێنام نەمتوانی بیخۆم، پاشان چوومە ناوشار، پرسیارم لەخاوەنی ئەو گۆڕە کرد بۆم دەرکەوت کە ئەو باج و سەرانەی دەیەکی خەڵك دەسەند و هەرئەو رۆژەش وەفاتی کردبو[148].

جا دیتنی ئەوئاگرە لەناوگۆڕدا وەك دیتنی فریشتەو جنۆکەکانە کەهەندێ جار روودەدات بۆ ئەوکەسەی خودای گەورە ویستی لەسەربێت پێشانی دەدات.

إبن أبي الدنيا لە (كتاب القبور)دا لە الشعبي دەگێڕێتەوە: کەوا باسی پیاوێك دەکات و بۆ پێغەمبەر(ﷺ) قسەدەکات، بە بەدردا تێپەڕیم و پیاوێکم بینی لەزەوی هاتە دەرەوە جا پیاوێك بەکوتەك لێی دەدا تا لەزەوی ون دەبو، پاشان دەهاتە دەرەوەو ئەم کارەی دووبارە دەکردەوە، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ذلك أبو جهل بن هشام يُعذب الى يوم القيامة)[149].

واتە:( ئەمە ئەبو جەهلی کوڕی هیشامە بەم جۆرە سزا دەدرێت تاوەکو رۆژی دوایی).

لە حەدیسێکی حماد کوڕی سلمە باسکراوە: لە عەمرو کوڕی دینار، ئەویش لە سالم کوڕی عبداللە، ئەویش لەباوکیەوە دەڵێت: لەنێوان مەککە و مەدینەدا دەڕۆیشتم لەسەر پشتی وشتر بووم زەمزەمیەکی ئاوم پێبوو، بەلای گۆڕستانێکدا تێپەڕیم، پیاوێکم بینی لەدەرەوەی گۆڕەکەیدا ئاگری لێ هەڵدەگیرسا، و لەگەردنیدا زنجیرێك هەبوو رایدەکێشا، وتی: ئەی عبداللە، ئاوی بدەرێ، ئەی عبداللە ئاوم بدەرێ، سوێند بەخوا نازانم بەناوی خۆم منی ناساند یاخود وەك ئەوەی خەڵکی بانگم دەکەن وتی: جا یەکێکی دیکە هاتە دەرەوە، وتی: ئەی عبداللە، ئاوی مەدەرێ، پاشان زنجیرەکەی راکێشا و گەڕاندیەوە ناو گۆڕەکەی[150].

---

(148) شرح الصدور: ٢٤٥.

(149) شرح الصدور: ٢٢٦.

(150) شرح الصدور: ٢٢٦.

لە حەدیسێکی سفیان باسکراوە: داود کوڕی شابوور بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە أبی قزعە وتی: بەلای هەندێك ئاودا تێپەڕین کەوا لەنێوان ئێمە و بەسرەدا هەبوو، گوێمان لەزەڕەی کەرێك بو، ئینجا پێمان وت: ئەم زەڕەیە چی بو؟ وتیان: ئەمە پیاوێکی کەللە ڕەق بو کاتێك دایکی قسەی لەگەڵیدا کرد بۆ شتێك پێی دەگووت: بزەڕە، جا کاتێك مرد ئەم زەڕەیە هەموو شەوێك لەگۆڕەکەی دەبیسترێ.

هەروەها لە عەمرو کوڕی دینار باسکراوە و دەڵێت: پیاوێك هەبوو لەخەڵکی مەدینە، خوشکێکی هەبوو لە دەرووبەری مەدینە، کاتێك خوشکەکەی مرد و بەخاکیان سپارد، کابراکە کەگەڕایەوە شتێکی لەبیر چوو لەناو گۆڕەکەی بەجێما، چوو داوای یارمەتی لەیەکێك لەبراکانی کرد و وتی: گۆڕەکەم بۆ پشکنین، شتێکم لەناو گۆڕەکەی بەجێ هێشتووە، جا بە پیاوەکەی وت، هەرچۆنێك بێت خوشکمە و دەبێت گۆڕەکەت بۆ هەڵبدەمەوە، کاتێك بینی گۆڕەکەی ئاگری لێ هەڵدەستێت، ئینجا گۆڕەکەی پڕکردەوەو گەڕایەوە، گەڕایەوە لای دایکی وتی: حاڵی خوشکەکەم چۆن بوو؟ دایکی وتی: پرسیاری چی لێ دەکەی بەهیلاك چو؟ وتی: پێم بڵێ؟ دایکی وتی: ئەو نوێژی تاخیر دەکرد نوێژی نەدەکرد تا گومانم دەکرد دنیا ڕووناك بووەتەوە، دەچوو گوێی بە دەرگای دراوسێکمان دەنووساند و قسە و باسەکانی بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە[١٥١].

إبن أبی الدنیا دەگێڕێتەوە: پیاوێك پرسیاری لە أبا إسحاق کرد لەبارەی کفن دز ئایا تەوبەی لێ وەردەگیرێت؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر نیەتەکەی باش بێت، جا پیاوێك پێی وت: من گۆڕم هەڵدەداوە قەومێکم بینی ڕوویان وەرگێڕابو لەقیبلە، لەلای الفزاری هیچ شتێکی دەست نەکەوت ئینجا ناردی بۆلای الأوزاعي ئەم شتەی پێ بڵێت، جا الاوزاعي پێی وت: خوا تەوبەکەی وەردەگرێت ئەگەر نیەتەکەی تەندرووست بێت و لەدڵەوە باوەڕی هێنابێت، بەڵام بە گوێرەی وتەکەی کەوا هەندێك

---

(١٥١) شرح الصدور: ٢٤٤.

قەومی بینیوە روویان وەرگێڕاوە لەقیبلە، ئەوانــە قــەومێك بــوون لەســەر ســوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەمردوون[١٤٢].

إبن ابی الدنیا دەڵێت: عبدالمؤمن كوڕی عبدالله كــوڕی عیــسا القیــسی بــۆمنی گێڕایەوە وتی: بــەو گۆڕهەڵكەنــەی تەوبــەی كــردووە: چ شــتێكت بــینی لەهــەموو سەرسوڕهێنتر بو؟

وتــی: گــۆڕی پیــاوێكم هەڵدایــەوە وتــی: هــەموو لاشــەی بــەبزمار كوترابــو، وە بزمارێكی گەورەش لە كەللەی سەری درابو، یەكێكی دیكەش لەپێیەكانی

وتی: لە گۆڕهەڵكەنێكی دیكە پرسیار كرا: هۆكاری تەوبەكردنت چــی بــو؟ وتــی: بەگشتی ئەو گۆڕەی هەڵم دایەوە دەمبینی رووی لەقیبلە وەرگێردراوە.

وتی: أبو عبدالله محمد كوڕی مــساب الــسلامی كەیــەكێك لەباشــترین بەنــدەكانی خودایە بۆمنی گێڕایــەوە: كــەوا لەراســتگۆیانیش بــو وتــی: پیاوێــك هاتــە بــازاڕی ئاسنگەران لەبەغداد بزماری بچووك و بزماری دووسەری دەفرۆشت، جا ئاسنگەرەكە كەلێی وەرگرت، ئاگری لەسەر دانا بەڵام نەرم نەبو تــاوەكو بەلێــدان لەبزمارەكانیــدا بەڵام بێ سوود بو، جا فرۆشیارەكە بەدوایدا گەڕا تاوەكو پیاوەكەی دۆزیــەوە، ئینجــا پێی وت: ئەو بزمارانەت لەكوێ بــو؟ وتــی: دۆزیــەوە، كڕیارەكــە وازی لــێ نــەهێنا تاوەكو پێی وت كەوا گۆڕێكی كراوەی بینی و ئیسك و پروسكی مردوویەكی تێــدابوو بەو بزمارانە داكوترابو، وتی: زۆر هەوڵمدا تاوەكو دەریان بهێنم بەڵام نەمتوانی، جــا بەردێكی گەورەم هێنا و ئێسكەكانیم شكاند وتی: ئەو بزمارانەم لەناویاندا دەهێنــا، پێم وت: شێوەكەی چۆن بو؟ وتی: بزمارەكان بچووك و دووسەر بوون[١٤٣].

---

([١٤٢]) شرح الصدور: ٢٢٨.

([١٤٣]) شرح الصدور: ٢٤٥.

ابن ابی الدنیا وتی: باوکم بۆی گێڕامەوە ئەویش لە ابی الجریش، ئـەویش لـە دایکـی وتی: کاتێك أبو جعفر خەندەقی کوفەی هەڵکەند لـەدەوری مردووەکـانی خەڵکەکـە گەنجێکیان بینی شوێنەواری گەستنی لەسەر دەستی دیاربو[154].

لە سماك کوڕی حرب باسکراوە، دەڵێت: أبو الـدردا بـەنێو گۆڕسـتانێکدا تێپـەڕی، وتی: لەرووخسـارو دەرەوەتدا چەند بێدەنگیت و لەناوەوەشدا خەڵکی خـراپ و فێڵبـاز هەن؟

سابت البیانی دەڵێت: لەکاتێکدا بەناو گۆڕستاندا دەڕۆیشتم، دەنگێـك لـە دواوەم را هات، ئەو دەیوت: ئەی سابت، ئەو بێ دەنگییەی گۆڕستان هەڵت نەخەڵەتێنێ ئایا نازانیت چەندین گرفتار و خەفەتباری تێدایە، جا ئاوڕم دایەوە کەسێکم نەدیت[155].

الحسن بە گۆڕستانێکدا تێپەڕی وتی: ئای ئەو هەموو خەڵکە لێرە کۆبوونەتـەوەو بێدەنگن، و چەندین کەس لەناویاندا پەست و خەمبارن!

ئیبن أبی الدنیا لەهەندێ پێشیەکاندا باسکراوە و دەڵێت: کچێکم مـردو شـۆڕمان کردەوە ناو گۆڕ، منیش چووم خشتەکان چاك بکـەم، بینـیم رووی وەرگـەڕابو لـەلای قیبلە، بەڕاستی زۆر غەمبار بووم بۆ ئەم کارە، جا لەخەودا بینیم، وتـی: باوکـەگیان کاتێك منت بینی دڵگیر بوویت، ئەو خەڵکانەی لەدەوروبەری منـدابوون هـەموویان روویان وەرگەڕاوە لەقیبلە.

وتی: وەك ئەوەی دەتەوێت بڵێیت ئەوانە لەسەر گوناهی گەورە مردوون.

هەروەها عەمرو کوڕی میمون وتی: گوێم لە عومەری کوڕی عبـدالعزیز بـو وتـی: لای ئەو کەسە بوم کە وەلیدی کوڕی عبدالملیکی شۆڕدەکردەوە ناو گۆڕەکەی، بینیم ئەژنۆکانی لەگەردنی کۆبۆتەوە، ئینجا کوڕەکەی وتی: سوێند بەخوای کەعبـە بـاوکم

---

(154) شرح الصدور: ٢٣٨.

(155) شرح الصدور: ٢٨٩.

هەروا ژیاوە، جا وتم: سوێند بەخوای کەعبە باوکت زۆر ترساوە، پاش ئەمە عومەر پەندو ئامۆژگاری لیّ وەرگرت(١٥٦).

کاتێك یزید کوڕی الملهب بووە کاربەدەستی عێراق عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وت: ئەی یزید لەخوا بترسە، من کاتێك وەلیدم شۆڕکردەوە ناو گۆڕەکەی، هەروەك لەکفنەکەی خۆی رابکات وابو.

یەزیدی کوڕی هارون وتی: هشام کوڕی حسان گێڕایەوە لە واصل مولی أبی عیینە، ئەویش لە عمر کوڕی زهدم، ئەویش لە عبدالحمید کوڕی محمود وتی: لەلای ئیبنو عەباس دانیستبووم، هەندیّ کەس هاتنەلای وتییان: ئێمە بەمشتومڕو گفتوگۆ چووینە دەرەوەو برادەرێك لەگەڵماندا بو تا گەیشتینە لای (الصفاح) پیاوەکە مرد، کەلوپەلمان بۆ ئامادەکرد پاشان دەرچووین گۆڕێکمان بۆ هەڵکەندو ناشتمان، کاتێك ئەوێمان بۆ چۆڵ کرد بینیمان گۆڕەکەی پڕبووە لە ماری گەورە، جا گۆڕێکی دیکەمان بۆ هەڵکەند، ئەویش پڕبولەماری گەورە، گۆڕێکی دیکەمان بۆ هەڵکەند ئەویش هەروا بو.

ئیبنو عەباس وتی: ئەمە دزی لەگەڵ کەلوپەلەکانی دەکرد و شتی گران دەکرد، جا گەڕان ئاوەکو شوێنێك بدۆزنەوە پیاوەکەی لیّ بشارنەوە، سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر زەوی هەموو هەڵکۆڵن ئەو مارە گەورانەی تێدا دەدۆزرایەوە، ئینجا چووین لەشوێنێك شاردمانەوە، جا کاتێك گەڕاینەوە بەو کەلوپەلەی لای بەجێمابو کەلەلای ئێمە دانرابو، بەخێزانەکەیان وت: پیاوەکەت چ کارێکی دەکرد؟ وتی: ئەو خواردنی دەفرۆشت هەموو رۆژێك هەندێکی لەو خواردنە دەهێنایەوە بۆ گوزەرانــدنی ماڵ و منداڵی، پاشان هەندێك خواردنی وەك و ئەوخواردنە لەخواردنەکەی دەکرد(١٥٧).

(١٥٦) شرح الصدور: ٢٣٩.

(١٥٧) شرح الصدور: ٢٣٩.

ئیبن ابی الدنیا وتی: محمد کوڕی الحسین بۆمنی گێڕایەوەو وتی: أبو ئیسحاق بۆی گێڕامەوە وتی: داوایان لێکردم مردوویەك هەیە کە بیشۆم، کاتێك جلەکانیم لەسەر دەم و چاوی لابرد مارێکم بینی خۆی لەگەردنی ئالآندبوو، باسی ئەستووری مارەکەی دەکرد، وتی: هاتمە دەرەوەو نەمشووشت، ئینجا باسیان کرد کەئەمە جنێوی بەسەحابە دەدا [١٥٨].

هەروەها ئیبن ئەبی الدنیا باس دەکات لە سعید کوڕی خالد کوڕی یزید الانصاری، ئەویش لەپیاوێك کە خەڵکی بەسرەیە گۆڕی هەڵدەکەند، وتی: رۆژێك گۆڕێکم هەڵکەند و سەری خۆی نزیك لەو دانا، لەخەومدا دوو ئافرەت هاتنە لام، یەکێکیان وتی: ئەی عبدالله سوێندت دەدەین بەخودا ئەگەر ئەو ئافرەتە لە دراوسێیەتمان لاببەیت، لەترسان بە ئاگا هاتم، بینیم تەرمی ئافرەتێك وا دێت، وتم: گۆڕەکە لەدواوەتانە، من ئەوانم رەوانەی ئەوگۆڕە کرد، جا کاتێك شەوداهات دوو ئافرەت هاتنە خەونەکەم یەکێکیان وتی: خودا پاداشتی خێرت بداتەوە کەوا شەڕێکی درێژت لەسەر ئێمە لابرد، وتم: ئەی بۆ هاوڕێکەت وەك تۆ قسە لەگەڵ من ناکات؟ وتی: ئەو ئافرەتە بەبێ وەسیەت مردووە، هەقی ئەوکەسەش کە بەبێ وەسیەت دەمرێت قسەناکات تاکو رۆژی دوایی.

جا ئەو هەواڵ و راگەیاندنانە و زیاد لەوەش و زۆر زیاتریش کەوا لەکتێبێکدا جێگای نابێتەوە بەوەی خودای گەورە پێشانی هەندێك لە بەندەکانی خۆی دەدات لەسزای گۆڕ و نیعمەت و خۆشیەکەی بەبینین و سەیرکردن.

بەڵام خەو بینین ئەگەرچی باسمان کردو ژمارەیەك دەرەنجامی لێ کەوتەوە، و هەرکەسێك دەیەوێت هەڵوەستەیەك بکات لەسەری بابچێت کتێبی ئیبن ئەبی الدنیا (کتاب المنامات) وە کتێبی قیراون (کتاب التبیان) بخوێنێتەوە، وە زۆر کتێبی تریش

---

[١٥٨] شرح الصدور: ٢٣٨.

کەباسی لەوبابەتە دەکات، و لەلای گومڕاکاران و زیندیقەکان هیچ شتێك نییە تـەنها درۆو درۆخستنەوە نەبێت بەوەی کەوا لە زانستەکەیاندا شارەزانین.



## ( توانایی خودا لەسەر داهێنانی ڕووداوی سەرسوڕهێن )

فەرمانی شەشەم: بێگومان خودای گەورەو میهرەبـان لـەو ژیـان و مەنزڵگایـەدا شتی لەوە سەیرتر و سەرسامکەرتر درووست دەکات، ئەمە جوبریلە کاتێـك دابـەزی بۆسەر پێغەمبەر(ﷺ) خۆی هێنا شـێوەی پیاوێـك، بـە ئاخـاوتن قـسەی لەگـەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) کـردو ئـەویش گـوێی لێبـو، وە ئەوکەسـەی لەتەنیـشت پێغەمبەرەوە(ﷺ) دانیشتووە گوێی لیّ نەبوو و نـەی بینیـوە، هـەروەها هەنـدێك لەپێغەمبەرانیش هەندێ جار پێغەمبەر(ﷺ) وەحی بۆ دەهات وەك دەنگی زەنـگ، کەچی لەئامادەبووان کەس گوێی لیّ نەدەبو، ئەو جنۆکانە لـەنێوان خۆیـان و ئێمـەدا بەدەنگی بەرز قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن کەچی ئێمە گوێمـان لێیـان نییـە، بێگومـان فریـشتە بەقامـچی لـەکافرەکان دەدەن و لەگـەردنییان دەدەن و هاواریـان لـێ هەڵدەستێنن، ئەو موسڵمانانەی لەگەڵیاندان نە گوێیان لەدەنگیانەو نـە دەیـانبینن، خودای پاك و بێگەرد لەزۆر شتدا نەوەی ئـادەمی لـێ قەدەغـە کـردووە بـەوەی کـە لەسەر زەویدا ڕوودەدات، ئەو شتەش لەنێوانیاندایە و حەزرەتی جـوبریلیش قورئـانی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەخوێندەوەو وانەی قورئـانی پـێ دەوتـەوە کەچـی ئامـادەبوان گوێیان لیّ نەدەبو.

ئایا چۆن سپڵەیی بەامبـەر ئـەم کـارە دەکرێـت کـە خـودای گـەورە دەیزانێـت و بەتوانای خـۆی بڕیـاری لەسـەر دەدات و هەنـدێك ڕوودا و ڕوودەدات لـەپێش چـاوی

درووستکراوی خۆی قەدەغەی دەکات، حیکمەت و بەزەیی خودایە بۆئەوان، چونکە ئەوانە توانای ئەوەیان نییە ببینن و گوێیان لێبێت، وە بەندەش بینین و بیستنی زۆر لەوە لاوازترە کە سزای گۆڕی بۆ ئاشکرا بێت و ببینێت.

پاشان ئایا بەندە توانای هەیە لەسەر لابردنی جیوە و خەردەل لەچاو و سینگی مردو پاشان بەخێرایی بۆی بگەڕێنێتەوە، جا چۆن ئەم دەسەڵاتەی لێ قەدەغە دەکرێت؟ وە چۆن توانای لەسەر نییە ئەوکەسەی توانای لەسەر هەموو شتێکدا هەیە و بێ سنوورە؟ ئایا کارو ژیانی ناو بەرزەخ پێوانەیە لەگەڵ ئەوەی لەدونیادا دەیبینیت ئەمە تەنها نەزانین و گومڕاییە، و بەدرۆخستنەوەی راستگۆترین راستگۆکانە و مل نەدان و بەئەستەم دانان بۆ کارو توانای خودای گەورەو میهرەبان و ئەمەش مەبەست و نیازی نەزان و گومڕاکانە.

ئەگەر یەکێك لەئێمە توانای هەبوو گۆڕ دەباڵ و سەد باڵ فراوان بکات و زیاتر درێژو پاك و بەرینی بکات، و فراوانی بکات لەسەر خەڵکی و هەر چۆنێکی بوێت وابکات، جا چۆن مل نادات بۆ خودای گەورەو میهرەبان کەوا ئەم گۆڕە هەرچۆنێکی بوێت ئاوا فراوانی بکات، وە قەدەغەی بکات لەبەرچاوی نەوەی ئادەمیزاد، جا نەوەی ئادەمیزاد بەتەسکی و تەنگی دەیبینێت، کەچی ئەو فراوانترین شتە و بۆنخۆشترین بۆنی لێدێت، و گەلێك رووناك و پڕشنگدارە کەچی ئەوان نایبینن.

نهێنی ئەو مەسەلەیش لەفراوانبوون و تەسکی و رووناکی ناوگۆڕ، ئاو و ئاگرەکەی، ئەمە لەڕاستیدا لەڕەگەزی رۆژی دوایی نییە لەو جیهانەدا، خودای گەورە بەڵکو تەنها لەوێ و لەوێ پێشانی نەوەی ئادەمی دەدات بەڵام ئەمە کارو فەرمانی رۆژی دوایی نییە، لەراستیدا کاتێك سەرپۆشەکەی لەسەر لادەبات بۆئەوەی دڵ و دەروونی تێیدا سەقامگیر بێت ئیمان بەهێزتر بێت ببێتە هۆکاری بەختەوەربوونیان، جا ئەگەر پەردەکە لەسەریان لابردرا ئەوا بینینەکە ئاشکرا دەبێت، جا ئەگەر مردوویەك لەنێو خەڵك دابێت ئەوا دوو فریشتەکە قەدەغە ناکرێت لەهاتن بۆلایان و

پرسـیارلێکردنی بـەبێ ئـەوەی ئامـادەبووان هەسـتی پـێ بکـەن، و مردووەکـەش وەڵامییان دەداتەوە بێ ئەوەی کەس گوێیان لێبێـت، و کاتێـك لێـی دەدەن کەسـێك نییە لـەئامادەبووان لێدانەکـە ببینێـت، هـەروەك کەسـێك لەتەنیـشت هاوڕێکـەی دەخەوێت جا لەخەوەکەیدا سزا دەدرێت و لێی دەدرێت و ئازار دەچێژێت، بـێ ئـەوەی ئەوکەسـەی بەئاگایـە لەتەنیـشتی ئاگـاداری ئەمـە بێـت لەکاتێکـدا کەلـە خـەو هەڵدەستێت شوێنەواری لێدانەکە بەجەستەیەوە دیارە.



## ( توانینی گەڕاندنەوەی رۆح )

فەرمانی حەوتەم: هیچ قەدەغـەکراوێك نییـە لـەوەی رۆحـەکان بگەڕێندرێنـەوە بۆکەسی لەسێدارەدراو وە نقوومی ئـاوبو وە سـووتێندراو، کەچـی ئێمـەش هەسـتی پێناکەین چونکە ئەم گەڕاندنەوەش جۆرێکی دیکەیە لەنەزانراوەکان، جا ئەم لـەهۆش خۆ چوونە و بێدەنگییـە و سەرسـامییە زینـدوون و رۆحەکانیـشییان لەگەڵیاندایـە، کەچی ئێمە هەست بەژیانییان ناکەین، و ئەگەر لاشەکانی پارچەپارچە بوویێـت ئـەوا هیچ قەدەغەکارێك نییە لەسەر ئەوکەسەی توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە کـەوا لەو رۆحە بکات پەیوەندی بەهەموو پارچەکانی لەش بکات سەرەڕای دووری و نزیکی نێوانییان، ئەو پارچـانەش هەسـت بـەجۆرێك لـەئێش و ئـازار دەکـەن و هەسـتیش بەخۆشی و شادمانی دەکەن، ئەگەر خودای گەورە هەست بەبێ گیانەکان بدات و درك بە پاڕانەوە بکـەن بـۆ خـودای میهرەبـان و بـەردی گـەورە لەترسـی خـودای گـەورە لەشاخەکان دەکەوێتە خوارەوە، وە چیاو دارو درەخت و ئاو و رووەکەکان کڕنـوش بـۆ خودای گەورە دەبەن و لێی دەپاڕێنەوەو حەمدو ستایشی دەکەن.

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾(الاسراء: ٤٤).

واتە: (هیچ شتێك نییە لەم بوونەوەرەدا کە تەسبیحات و ستایش و سوپاسی ئەو زاتە نەکات، بەڵام ئێوە لەتەسبیحات و ستایشی ئەوشتانە تێ ناگەن).

ئەگەر چی تەسبیحاتە کە تەنها بەڵگە بێت لەسەر درووستکارەکە نەیدەفەرموو: ﴿وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ واتە: بەڵام ئێوە لەتەسبیحات و ستایشی ئەوشتانە تێناگەن.

جا هەموو ئاقڵمەندێك تێدەگات تێگەیشتنی بەڵگەکەی لەسەر درووستکارەکەیە، خودای گەورەو میهرەبان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ﴾ (ص: ١٨).

واتە: (بەڕاستی ئێمەش کەژو کێوەکانمان بۆ رام هێنابو، ئەوانیش یادو تەسبیحاتی خوایان دەکردو پێکەوە دەیانوتەوە لەدەمەو ئێواران و بەرە بەیانەکاندا).

وە بەڵگەش لەسەر درووستکار تایبەت نییە بەوکاتەدا، هەروەها خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ﴾(سبأ: ١٠).

واتە: (ئەی کێوەکان تەسبیحات و سروودی ستایشی لەگەڵدا بڵێنەوە).

وە خودای میهرەبان دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ﴾ (الحج: ١٨).

واتە: (ئایا نەتبینیوە و نەتبیستووە کەبەڕاستی هەرکەس و هەرچی هەیە لەئاسمانەکان و زەویدا کڕنوش بۆ خودا دەبەن، هەروەها خۆرو مانگ و ئەستێرەو چیاکان و درەخت و مالأت و زۆرێك لە خەڵکی).

بەڵگەش لەسەر درووستکراویش تایبەت نییە بەزۆری خەڵك، خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالطَّيْرُ صَافَّاتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ﴾ (النور: ٤١).

واتە: (ئایا نەتبینیوە کەبەڕاستی هەرچی و هەرکەسی لەئاسمانەکان و زەیدا هەیە، تەسبیحات و ستایشی خوا دەکەن، هەروەها باڵندەکانیش لەکاتێکدا پۆل پۆل بەئاسماندا دەفڕن هەرهەموویان ستایش و پەرستش و تەسبیحاتی خۆیان زانیوە).

جا ئەو پەرستش و تەسبیحاتە راستییەکەو هەر خودای گەورە دەیزانێت لەکاتێکدا نەزانە درۆزنەکان دەیشارنەوەو دانی پیا نانێن.

خودای گەورە رایگەیاندووە هەندێك لە تاشە بەردە گەورەکان لەشوێنی خۆیان لادەچن و لەترسی خودا دەکەونە خوارەوە[159]، لەراستیدا هەواڵی داوە کە زەوی و ئاسمانەکان هەردووکیان بۆی مۆڵەت دراون، واتە: گوێیان لەقسەکەی ئەوە، ئەوقسەیان لەگەڵدا دەکات و گوێیان لەقسەکەی ئەوەو بەباشیش وەڵامی دەدەنەوە، جا هەردووکیان پێی دەڵێن: ﴿ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾(فصلت: ١١).

واتە:( جا بەئاسمان و زەوی فەرموو فەرمانبەردارو ملکەچ بن، بەخۆشی خۆتان یان بەزۆر بتانخەمەژێر دەسەڵاتی خۆمە؟! هەردوولا خێرا وتییان ملکەچی تۆین و چۆن دەفەرموویێت وادەکەین).

لەراستیدا سەحابەکان گوێیان لە تەسبیحاتی ئەو خواردنەبو کە دەیانخوارد [160]، وە گوێیان لە ناڵەو نرکەی قەدی ئەو دارە وشکەبوو، کەلە مزگەوتەکە دابوو[161]، جا ئەگەر ئەو جەستەیە هەست و شعووری هەبێت، ئەوا ئەو جەستەیەی کە ژیان و رۆحی تێدایە لەمە لەپێشترە، وە خودای پاك و بێگەرد لەو مەنزڵگایەدا پێشانی

---

(١٥٩) سەیری ئایەتی (٧٤) بکە لەسوورەتی (البقرة).

(١٦٠) مسند أحمد: ١/٤٦٠.

(١٦١) سنن الترمذي: (٥٠٥).

بەندەکانی خۆی داوە بەگەڕاندنەوەی ژیانێکی تەواو بۆ لاشەیەك کەوا رۆحەکەی لێـی جیابووتەوەو قسەشی کردووەو رۆیشتووەو خواردنیـشی خـواردووەو هاوسەرگیریـشی کردووەو منداڵیشی پەیا کردووە ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحْيَاهُمْ﴾ (البقرة: ٢٤٣).

واتە: (ئایا نەتبیستووە و نەتڕوانیوەتە ئەوانەی لەترسی مردن لـەماڵ و شـوێنەواریان دەرچوون، لەکاتێکدا کە هـەزارەها کەسـیش بـوون، ترسـان لـە بەرەنگاربوونـەوەی دوژمن، خواش فەرمووی پێیان بمرن! دوای ئەوەی مردن پاشان زیندووی کردنەوە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّى يُحْيِـي هَـَذِهِ اللّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ (البقرة: ٢٥٩).

واتە: (یاخود وەك ئەوکەسەی تێپەڕی بەلای شارۆچکەیەکدا کەهـەموو خانووەکـانی بەسەر سەقفەکانیدا تەپی بوون، لەبەر خۆیەوە وتی ئاخۆ خوای گەورە چـۆن خـەڵکی ئەم شارۆچکەیە لەدوای مردنیان زیندوو دەکاتەوە؟! ئەو کەسە عوزەیر پێغەمبەر بوو ، یەکسەر خوای گەورە سەد ساڵ مراندی و پاشان زیندووی کـردەوە و پێـی فـەرموو چەند مایتەوە؟ عوزەیر وتی رۆژێك یان کەمتر لەرۆژێك ماومەتەوە).

هەروەك کوژراوانی نەوەی ئیسرائیل، یان ئەوانەی وتیان بەموسی: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً﴾ (البقرة: ٥٥).

واتە: (ئەی موسا هەرگیز باوەڕت پێ ناهێنین تاوەکو بەئاشکرا و بەچاوی خۆمان خوا نەبینین).

جا خوا ئەوانی مراند و پـاش مردنیـان زینـدووی کردنـەوە، هـەروەك (أصحاب الکهف) و چیرۆکی ئیبراهیم و چوار باڵندەکە، کە خـودای گـەورە ژیـانێکی تـەواوی گەڕاندەوە بۆئەو جەستانە پاش ئەوەی بەمردن سارد بوونەوە، جا چۆن رێگری دەکرێت لەو توانا لەبن نەهاتووەی کەوا ژیان پاش مردنی بگەڕێنێتەوە، وە ئایا مـل نـەدان و

ئینکـاریکردنی ئەوانــە تــەنها بــەدرۆ خــستنەوەو یــاخیبوون و ســپڵەیی نییــە؟ سەرکەوتنیش لەلایەن خواوەیە.

❊❊❊

## ( لەڕاستیدا سزای گۆڕ ناونیشانێکە بۆ سزای بەرزەخ )

فەرمانی هەشتەم: دەکرێت بزانرێت کەوا سزای گۆڕو خۆشییەکەی ناوێکە بۆ سزای بەرزەخ و خۆشییەکەی، ئەوەی کە لەنێوان دونیــاو ڕۆژی دواییدایــە، خــودای گــەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ ( المؤمنون: ١٠٠).
واتە:( بەڵکو دەبێت لەژیانی بەرزەخدا لــەنێوان مــردن و زیندوبوونــەوەدا تــا کاتێــك زیندو دەکرێنەوە چاوەڕی بێت).

ئەم بەرزەخەش خاوەنەکەی شانازی پێوەدەکات لەسەر ژیانی دونیاو ڕۆژی دوایــی، وە ناونراوە بەسزای گۆڕو نیعمەتەکەی یــان ئــەوەتا باخێکــە لەباخــەکانی بەهەشــت یاخود دۆڵێکە لەدۆڵەکانی ئاگر بەهۆی زۆرینــەی بوونــەوەر، جــا کەســی هەڵواســراو یاخود سووتێنراو و نقووم بو لەئاوداو ئەوانەی دڕندە و باڵنــدە خواردوویانــە هــەموو ئەوانــە کردەوەکانییــان پــشکی ســزای گــۆڕ یــاخود نیعمەتەکــەی بەردەکــەوێت لەبەرزەخدا.

هەندێك لە پێشینەکان وا گومان دەبەن ئەگەر یەکێك لاشەکەی بسووتێ بــەئاگر و ببێتە خۆڵەمێش و تۆزەکەی بکرێتە ناو دەریا و بەهەوادا بڵاوببێتــەوە ئــەوا ڕزگــاری دەبێت لەسزای گۆڕدا، بەڵام خــودای گــەورە فــەرمان بــە دەریاکــان دەکــات ئــەوەی تیایەتی کۆی بکاتەوە، وە فەرمان بە وشکانی دەکات ئەوەی تیایەتی کۆی بکاتــەوە، پاشان دەفەرمووێت: هەڵسەوە ئــەوەی جــێگیر کــراوە لــەنێوان دەســتەکانی بــەزەیی خودای میهرەبان، جا پرسیاری لێدەکرێت: چــیت بــەکۆڵتا داداوە لــەوەی کردووتــە؟

دەڵێت: ئەی خودایە تۆ لەهەموو کەس زاناتری تەنها ترسان و ملکەچی لەتۆ، رەحمەتی خوا دوورە پەرێزنابێت لەوەی رەحمان پێبکات، لەوکاتەدا سزای گۆڕ و نیعمەتەکەی بەسەر ناچێت بۆئەو بەش و پارچانەی کەلەو حاڵەتەدا وای لێهاتووە هەتاکو ئەگەر مردووەکە بەسەری درەختەکانەوە هەڵواسرابێت لەبەر بای شەماڵ ئەوا لاشەی پشکی دەکەوێت لەسزاو ئازاری بەرزەخ، و ئەگەرچی پیاوی چاکەکار بخرێتە ناو تەنوورێك لەئاگر ئەوا لاشەکەی و رۆحەکەی تووشی نیعمەت و خۆشگوزەرانی دەبێت لەژیانی بەرزەخدا، جا خودای گەورە ئەو ئاگرەی بۆ مردووەکە سارد و سەلامەت دەکات، بای شەماڵیش بۆ ئەوەی دیکە دەکاتە ئاگر و گڕکان.

***

## ( گەڕانەوەی مردو وە زیندوبوونەوەی یەکەم )

فەرمانی نۆیەم: لەڕاستیدا مردو دەگەڕێتەوە و جاری یەکەمیش زیندوو دەکرێتەوە، جا بۆیە خودای میهرەبان بۆنەوەی ئادەمیزاد دوو گەڕانەوەو دوو زیندوبوونەوەی داناوە لەهەردووکیاندا بەکارو کردەوە خراپەکان سزا دەدرێن و بەکاروکردەوە باشەکانیش پاداشت دەکرێن.

زیندوبوونەوەی یەکەم: جیابوونەوەی رۆح لەلاشە و چارەنووسی بۆ رۆژی لێپێچینەوەی یەکەم.

زیندوبوونەوەی دووەم: ئەو رۆژەیە خودای گەورە رۆحەکان بۆ لاشەکانیان دەگەڕێنێتەوەو لەگۆڕەکەشیدا زیندووی دەکاتەوە بۆبەهەشت یاخود بۆ ئاگر، ئەمەش حەشر و کۆکردنەوەی یەکەمە، وە ئەمەش لەحەدیسێکی سەحیحدا هاتووە: (وتۆمن

بالبعث الآخرة) [١٦٢]. واته:( لەڕاستیدا دەبێت باوەڕت هەبێت بەزیندوبوونەوەیەکی دیکە).

جا زیندوبوونەوەی یەکەم ئەوا کەس ئینکاری ناکات، و زۆربەی خەڵکی ئینکاری پاداشتی نیعمەت و سزا تێیدا دەکەن، بێگومان خودای گەورە باسی ئەو دوو قیامەتەی کردووە، ئەوانیش قیامەتی بچووك و قیامەتی گەوردن لە سوورەتی (المؤمنون) و سوورەتی (الواقعة) وە سووردتی (القيامة) و سوورەتی (المطففين) و سوورتی (الفجر) وە هەندێك سورەتی دیکەش، بێگومان ئەمەش ویستی خودای گەورەو میهرەبانە بە دادپەروەری و حیکمەتەکەی کەوا دوو ڕۆژی پاداشت داناوە پاداشتی چاکەکاران و پاداشتی خراپەکاران، بەڵام پاداشتی کۆتایی ئەمە دەبێتە زیندوبوونەوەی دووەم لەڕۆژی کۆتایی و جیهانی دووەمە وەك خودای گەورە دەفەرموێت:﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾(آل عمران: ١٨٤). واتە: (هەموو کەس دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت، تەنها لەڕۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتتان بەتەواوی پێ دەدرێت).

لەڕاستیدا دادوەریەکی ویست و گونجاوەو ناوە جوانەکانیشی واجب کراوە و پیرۆزیەکەشی تەواوەو خۆشی و خۆشگوزەرانی و نیعمەتەکەی بۆئەو لاشەو ڕۆحانەیە کە هاوکارو پشتگیری ئەو ئاینەن، وە سزاو ئازاری ئەو لاشە و ڕۆحانەیە کە دژایەتی ئەو ئاینە دەکەن، بێگومان لاشەو ڕۆحەکەی نیعمەت و خۆشی دەچێژن بۆ ئەوکەسانەی گوێ رایەڵن و بۆی گونجاوەو لاشە و ڕۆحی ئەوکەسانەی کافرن لەئێش و ئازاردان بەوەی شایەنیەتی.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (فيفتح له باب الى الجنة، فيأتيه من روحها ونعيمها) واته:( لەگۆڕەکەیدا دەرگایەکی لەبەهەشت بۆ دەکرێتەوە، جا لەوێوە نیعمەت و خۆشی بۆ ڕۆحەکەی دەێت).

---

(١٦٢) مسلم: (٩).

دەربارەی کافریشدا دەفەرموویّت: (فیفتح لـه بـاب الی النـار، فیأتیـه مـن حرهـا وسمومها) واتە:( لەگۆڕەکەیدا دەرگایەکی لەئاگر بۆ دەکرێتەوە، جا لەوێوە گـەرمی و گڕەکەی بۆدێت).

بێگومان زانراوە کەوا لاشەش لەو دەرگایەدا پـشکی خـۆی وەردەگرێـت هـەروەك رۆح پشکی خۆی وەردەگرێت، جا لەودەرگایەدا قیامەتی بۆ دێتـە ژوورەوە و شـوێنی خۆی دەبینێت.



## ئەمەش وتەی پرسیارکارێکە: حیکمەتی سزای گۆڕ لە قورئاندا باس نەکراوە لەگەڵ ئەوەی پێویستی زۆر هەیە بۆ ئەوەی بیزانیت و باوەڕی پێ بهێنیت بۆ ئەوەی لیّ ئاگادار بکرێیتەوە و لێی بترسیت؟

جا وەڵامیش لە دوو رووەوەیـە: بـە کـورتی و بـە گـشتی وە بـە درێـژی و بـە فراوانی.

ئـەوەی بـە کورتیـە ئەوەیـە خـوای گـەورە و میهرەبـان دوو وەحـی بـۆ سـەر پێغەمبەرەکەی دابەزاندووە و لەسەر بەندەی خۆی واجـبی کـردووە بـاوەڕی پێیـان بهێنێت و کاریـان پـێ بکـات، وە ئـەوانیش قورئـان و حیکمەتـە خـوای گـەورە دەفەرموویّت: ﴿وَأَنزَلَ اللّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ (النساء: ١١٣).

واتە: (خوای گەورەش قورئـان و دانـایی بـۆ دابەزانـدوویت و فێـری ئـەو شـتانەی کردوویت کە جاران نەتدەزانی).

هەروەها دەفەرموویّت: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ﴾ (الجمعة:٢) واتە: (هەر ئەو زاتەیە لە ناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبـەرێکی لـە خۆیـان رەوانـە کـردووە ئایەتـەکانی

قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و رواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات).

وە هەروەها دەفەرموێت ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ﴾ (الأحزاب: ٣٤) واتە: (هەرچی لە ماڵەکانتاندا دەخوێندرێتەوە لە قورئان و فەرموودە یادی بگرن و فەرامۆشی مەکەن وباسی بکەن بۆ خەڵکی).

کتێبیش بریتییە لە قورئان، حیکمەت و داناییش بریتییە لە سوننەت، ئەمەش بە هاودەنگی پێشینەکان، ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی خودای گەورە هەواڵی پێداوە ئەمە لە پێویستیەکانی دانپیانان و باوەڕپێکردنیەتی، کەوا خودای میهرەبان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی رایگەیاندووە، ئەمەش بنچینە و بناغەیەکی یەکدەنگییە لە نێوان موسڵمانان کەس ئینکاری ناکات تەنها ئەوانەی لە ئیسلام دا نین، وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إني أوتيت الكتاب ومثلهُ معهُ) [١٦٣].

واتە: (بێگومان من قورئانم بۆ هاتووە و هاوشێوەکەشی لەگەڵدایە).

بەڵام وەڵامی بە درێژی و فراوانی ئەوا نیعمەتی بەرزەخ و سزاکەی لە قورئاندا باسکراوە بەبێ دیارکردنی ناوەکە، جا لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلآئِكَةُ بَاسِطُواْ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُواْ أَنفُسَكُمُ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ غَيْرَ الْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ آيَاتِهِ تَسْتَكْبِرُونَ﴾ (الأنعام: ٩٣).

واتە: (خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینی چۆن لە ئێش و ئازاری سەرەمەرگدا (گیریان خواردووە)، فریشتەکانیش دەستییان لێ دەکەنەوە و لێیان دەدەن و (پێیان دەڵێن): دە دەی گیانتان بدەن بە دەستەوە، دەی رۆحتان دەرکەن، ئەمڕۆ لە تۆڵەی (خوانەناسیتاندا) سزا و ئەشکەنجەی ریسوایی و شەرمەزاری دەدرێن، چونکە

(١٦٣) سنن أبي داود (٤٦٠٤)، ومسند أحمد: ١٣١/٤

شتی ناحەقتان بەدەم خواوە هەڵدەبەست و خۆتان بـە گـەورە دەزانـی لەبەرامبـەر ئايەت و فەرمانەکانی خوادا و لوت بەرزيتان نەيدەهێشت باوەڕی پیٚ بهێنن).

ئەمەش وتەی ئەمانە لە کاتی مردندا، بێگومان فريـشتەکان رايانگەيانـدووە و راستگۆن لەو کاتەدا ئەوان سزايەکی بە ئازارييان دەدەن ئەگەرچی دواش بکەون لـە دابڕانی دونيادا و راستيشە کە بەوان دەڵێن: ئەمرۆ تۆڵەی سزاکە وەردەگرن.

لەو بارەوە خوای گەورە دەفەرموويێت: ﴿فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ * النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوّاً وَعَشِيّاً وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ (غافر: ٤٥-٤٦)

واتە: (جا خوای گەورە ئەو ئيمانداره ژێرەی پاراست لە پيلانی خراپ و دڕندانەيان، دار و دەستەی فيرعەونيش زۆر سەختيان تووش بوو، ئـاگری دۆزەخـە، بـەيانيان و ئێواران نيشانيان دەدرێت، ياخود پيايياندا دەچزێنێت، لە (جيهانی بەرزەخـدا) رۆژی قيامەيش فەرمان دەدرێت، ئادەی تـاقم و دەسـتەی فيرعـەون بخەنـە نـاو ئـێش و ئازاری زۆر ناخۆشەوە).

جا لێرەدا بە راشکاوی باسی سزای هەردوو جيهان دەکات کە جگە لە زاتی ئـەو نەبێت هيچ کەسێك بەرگە و توانای ئەو کارەی نييە.

هەر لە بارەی ئەوانەوە خوای گەورە دەفەرموويێت: ﴿فَذَرْهُمْ حَتَّى يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي فِيهِ يُصْعَقُونَ * يَوْمَ لَا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئاً وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ * وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَاباً دُونَ ذَلِكَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (الطور: ٤٥-٤٧).

واتە: (وازيان لیٚ بهێنە هەتا بەو رۆژەی دەگەن، کە تيايدا تيـا دەچـن و لاڵ و پـاڵ دەکەون، ئەو رۆژە ئيتر فـێڵ و تەڵەکـەيان بـە هـيچ جۆرێـك فريايـان ناکـەوێت و سەرکەوتوو سەرفراز نابن، بێگومان بۆ ئـەو کەسـانەی سـتەميان کـردووە سـزای تريش هەيە بێجگە لەوەی کە جارجار بۆيان پێش دێت پێش تياچـوونی يـەکجاری، بەڵام زۆربەيان نەفامن و نازانن).

ئەمەش لەوانەیە مەبەستەکەی: سزاکەیان لە دونیادا بە کوشتن و شتی لەم بابەتە بێت، وە مەبەست لێیان جیهانی بەرزەخە، ئەوەش دەرکەوتووە، چونکە زۆربەی ئەوان مردوونە و لە دونیا سزا نەدراون، وپێیان دەڵێن: ئەوەی ئاشکرایە کاتێك یەکێك لەوان مرد لە بەرزەخدا سزا دەدرێت و ئەوەی لەوان ماوەتەوە لە دونیادا بە کوشتن و شتی دیکە سزا دەدرێت، جا ئەمەش پەیمانێکە بە سزادانیان لەدونیا و لە بەرزەخدا.

دیسان دەربارەی ئەوانەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الأدْنَى دُونَ الْعَذَابِ الأكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ (السّجدة: ٢١).

واتە: (سوێند بە خوا ئێمە تاڵا و لە دونیادا دەکەین بە گەروویاندا، بێجگە لە سزای ریشەکەنکردنیان، بۆ ئەوەی هۆش و بیر بکەنەوە بیرێك بکەنەوە بگەڕێنەوە بۆ لای ئیمان).

لە بارەی ئەو ئایەتە هەندێك بیانوو دەردەبڕن لەوانە عەبدوڵڵا کوڕی عەبباس لەسەر سزادانی ناوگۆڕ، بڕوبیانووشییان لەبارەی ئەم شتەوە، چونکە ئەوە سزادانە لە دونیادا و داوایان لێ دەکرێت لە کوفر بگەڕێنەوە بۆ لای ئیمان، بەڵام لە تێگەیشتن لە قورئان و تێگەیشتن لێی بە وردی ئەوانە سزای گوڕیشیان هەیە، خودای گەورە رایگەیاندووە کە بۆ ئەوان دوو سزا هەیە سزای بچووك و سزای گەورە، خودای گەورە هەواڵی داوە کەوا هەندێك سزای بچووکییان دەدرێت بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە.

ئەمەش هاوڕێیە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) : (فيفتح لە طاقة إلى النّار فيأتيه من حرّها و سمومها). واتە: ( جا لە گۆڕەکەیدا کەوانەیەك یاخود دەرگایەکی لەلای ئاگر بۆ دەکرێتەوە، جا لەو دەرگایەدا لە گڕ و گەرمای ئاگرەکەی بۆ دێت).

نەیفەرموو: (گڕ و گەرماییەکەی) بۆ دێت بەڵکو دەفەرموویێت: (لە گڕ و گەرماییەکە) هەوای گەرمی بۆ دێت، جا ئەوەی گەیشتبێت بە جیهانی بەرزەخ و زۆربەشیان ماون، ئەوانەشی دوژمنایەتی خوا دەکەن لە دونیادا هەندێك سزادراون، زۆربەشیان لەوان ماون و سزای گەورەتر چاوەڕێیانە.

هەر لە بارەی ئەمانە: خودای گەورە و میهرەبان دەفەرموویێت: ﴿فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ * وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ* وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَّا تُبْصِرُونَ *فَلَوْلَا إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ * تَرْجِعُونَهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ * فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ * فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ * وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ أَصْحَابِ الْيَمِينِ * فَسَلَامٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ * وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ * فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ * وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ * إِنَّ هَذَا لَهُوَ حَقُّ الْيَقِينِ * فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾ (الواقعة: ٨٣-٩٦).

واتە: (باشە ئێوە بۆ بیرناکەنەوە، ڕۆژێك دێت کە ڕۆحتان دەگاتە گەروتان ئێوەش بە دەوری ئەو کەسەدا بێ دەسەڵاتانە تەماشە دەکەن و سەرنج دەدەن لە کاتێکدا لە ئێمە لە ئێوە نزیکترین لێی بەڵام ئێوە نامانبینن خۆ ئەگەر ئێوە زیندوو ناکرێنەوە و پاداشت نادرێتەوە، ئەو ڕۆحەتان دەگێڕایەوە ئەگەر ڕاست دەکەن و دەسەڵاتتان هەیە جا ئەگەر ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدایە نزیکیان و خۆشەویستانی ئێمە بێت ئەوە ئیتر خۆش و کامەرانی و ئاسوودەیی بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەت چاوەڕێیەتی خۆ ئەگەر لە دەستەی ڕاستانیش بێت ئەوە لەلایەن دەستەی ڕاستانەوە سڵاوت پێشکەش دەکرێت بەڵام ئەگەر لە دەستەی ئەوانە بێت کە گومڕان و بڕوایان بە بەرنامەی خوانیە بە ئاوی کوڵ و پێشوازی دەکرێت دەگەیەنرێتە دۆزەخ بە ڕاستی ئەوەی کە باسمان کرد حەقیقەت و ڕاستەقینەیە و دوور لە گومانە کەواتە ستایش و سوپاسگوزاری پەروەردگاری گەورە بکە).

تا لێرەدا باسی حوکم و یاساکانی رۆح دەکات لە کاتی مردندا، هەر لـە یەکـەم سورەتدا باسی حوکمەکانی رۆژی گەڕانەوە گەورە دەکات، کە رۆژیی دواییە، ئەمـە بۆیە باسکرا بۆ پێشکەوتنی مەبەست و نیازەکەیـە بـۆ پاراسـتن و ئاگادارکردنـەوە چونکە ئەمە لە هەموویان گرنگترە باسی لێوە بکرێت، وە لە کاتی مردنـدا بۆیـان کردووە بەسێ بەش، هەروەك لە رۆژی دواییدا بۆیان کردووە بەسێ بەش.

هەروەها لە بـارەی ئەوانـەوە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿يَـا أَيَّتُهَـا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ * ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً * فَـادْخُلِي فِـي عِبَـادِي * وَادْخُلِـي جَنَّتِي﴾ (الفجر: ٢٧-٣٠)

واتە: (ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت کـە تۆ لەو رازیت و ئەویش لە تۆ رازی نییە، وە بچۆرە رێـزی بەنـدە چـاکە نـازدار و بەرێزەکانمەوە، بچۆرە بە هەشتە خۆشە رازاوەکەمەوە).

لە راستیدا پێشینەکان رایان جیـاوازە کـەی ئەمـەیان پـێ دەوترێـت، بەشـێك دەڵێن: لە کاتی مردندا پێیان دەوترێت، وتەکەش ئاشکرایە لەگـەڵ ئەمانەیـە، جـا ئەمانەش وتەیەك بە دڵ و دەروون دەوترێت لەو کاتەی رۆح لەلاشەی جیاکراوەتەوە، لێـی هاتۆتـە دەرەوە، وە ئـەو فەرموودەیـەی خـوای گـەورە: ﴿فَـادْخُلِي فِـي عِبَادِي﴾(الفجر: ٢٩)

هاوشێوەی ئەو فەموودەی پێغەمبەر(ﷺ) : (اللهم الرفيق الأعلى) [١٦٤].

ئەگەر تۆ دەتەوێت بیر لە رووداوەکانی سزا نیعمەتی ناو گۆڕ بکەیتـەوە و لێـی وردببیتەوە ئەوا بگەڕێوە بۆ قورئان بە درێژی و بە پوختی باسی دەکـات وە خـوای گەورەش هاوکارو یاریدەدەرە.

* * *

[١٦٤] مسلم: (٢٤٤٤)، وتەی: الرفيق الاعلى، بە مانای بەهەشت، یاخود پێغەمبەران دێن.

## ئەمەش وتەی پرسیارکارێکە:
## ئەو هۆکارانە چین کەوا خاوەنی گۆڕەکان پێی سزا دەدرێن؟

وەڵامەکەش لە دوو رووەوەیە: بە کورتی و بە پوختی وە بە درێژی و بەفراوانی.

ئەوەی بە کورتییە ئەوانە سزا دەدەین لەسەر ئەو تاوانانەی بە نەزانی بەرامبەر خودای گەورە کردوویانە، و سەرپێچی فەرمانەکانی خوا دەکەن، جا خودای گەورە رۆحێك سزا نادات کەوا دەیناسێت و خۆشی دەوێت و فەرمانەکەی جێبەجێ کردووە و دوورکەوتۆتەوە لەوەی خودای گەورە نەهی لێ کردووە، هەروەها لاشەیش هەرگیز سزا نادرێت، کەوایە سزای گۆڕ و سزای دوا رۆژ نیشانەی تورەبوونی و رق هەڵسانی خوای لەسەر بەندەی خۆی، جا هەرکەسێ خودا لێ تورە بێت و رقی لێ هەڵسانی خوا لەسەر لە بەرزەخدا دەدرێت، جا تاوانەکەی کەم بێت یاخود زۆر بێت، باوەرپێکراوە بێت یاخود درۆزن بێت.

بەڵام وەڵامی درێژی وبەفراوانی: لە کاتێکدا پێغەمبەرﷺ هەواڵی دا لەبارەی ئەو دوو پیاوەی کەبینی لە گۆڕەکانیان سزا دەدرێت، یەکێکیان لەناو خەڵکیدا دوو زمانی دەکرد، ئەوەی دیکەیان خۆی لە پاك راگرتنی میز نەدەپاراست، کە ئەمەش وازهێنانە لە پاکراگرتن کە واجبێکە، ئەمەش هۆکاری ئەو کارەی بوو بە زمانی خۆی دووژمنداری و دژایەتی لە ناو خەڵك بڵاو دەکاتەوە ئەگەرچی پیاوێکی راستگۆش بووبێت.

لەوەدا ئاگادارکردنەوەیەکە لەسەر ئەو رووداوەی کە لەنێوانیان دا بە درۆ و بوختان شایەدی بە ناهەق دژایەتی و کاری ناڕەوا بڵاودەکاتەوە کە گەورەترین سزای لەسەرە. هەروەها خۆ نەپاراستن لە میزکردن ئاگادارکردنەوەیەکە لەسەر

ئەنجامنەدانی نوێژکردن چونکە خۆ نەپاراستن و خۆ پاك راگرتن لە میزکردن هەندێك مەرج و واجبات لادەبات و ناهێڵێت.

ئەمەش توندترین سزای لەسەرە، و لە حەدیسێکی شوعبەدا، یەکێك لە سزا دراون کەوا گوشتی خەڵکی دەخوارد ئەمەش بوختان کردنەو هەروەها نەمیمی و دووزمانیش، هەروەها لە حەدیسێکی ئیبن مەسعودﷺ دەڵێت کاتێك قامچییێکی لێ دەدرێت گۆڕەکەی یەکپارچە دەبێت بە ئاگر. ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە تەنها یەك نوێژ بەبێ دەستنوێژ کردووە و بەلای ستەم لێکراوێکدا تێپەڕیوە ستەمەکەی لەسەر لانەبردووە و سەری نەخستووە.

لە سەحیمی بوخاریدا لە حەدیسێکی سرەدا هاتووە لە بارەی سزادانی ناوگۆڕ ئەوانەی درۆزنن و درۆ دەکەن سزا دەدرێن، سزادانی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت و پاشان بەشەو دەخەوێت کەچی لە رۆژدا لەبیری دەچێتەوە کاری پێناکات، وە سزادانی ئەو پیاو و ئافرەتانەی زینا دەکەن، وسزادانی ئەو کەسانەی پارەی ریبا دەخۆن، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە جیهانی بەرزەخدا ئەمانەی بەچاوی خۆی بینی.

لە حەدیسێکی ئەبو هورەیرەﷺ دەگێڕێتەوە وا باسکراوە کەوا تێیدا ئەو نەتەوانەی بەبەرد سەریان دەشکێنرا بەهۆی ئەوەی سەریان گران دەکرد لە نوێژ کردن، و ئەوانەی لە نێوان خواردنی گیایەکی دڕکاوی وشك و خواردنی درەختی زەقومن کە لەناو سکیاندا دەکوڵێت لەبەر ئەوەی زەکات لەماڵەکانیان دەرناکەن، وە ئەوانەی گۆشتی بۆگەن و مرداروەبوو دەخۆن بەهۆی زیناکردن و داوێن پیسییان، و ئەوانەی لێوەکانیان بە مەقاشی ئاسن دەبڕن لەبەر هەستانیان بە فیتنە و ئاشوب بەهۆی وتاردان و قسە کردن لەنێو خەڵکدا.

ئەوانەی پشکۆی ئاگر دەخرێتە دەمیانەوە و لە خوارەوەیان دێتەوە ئەوانەن کە ماڵی هەتیوو بە ناهەق دەخۆن.

و ئەوانەی بە مەمکیان هەڵواسراون ئەوانەن کە زینا و داوێن پیسییان کردووە.

و ئەوانەی نینۆکیان لەمس دروستکراوە دەم و چاوو سنگیان پێ دەڕننەوە، ئەو کەسانەن کە بەدوای نامووسی خەڵك دەگەڕێن.

جا دووزمان و درۆزن و بوختانکەر و شایەدی دانی بە درۆ، بانگەوازکردن بۆ بیدعە شتی زیادکراو و قسەکردن لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) کەوا هیچ زانیاری لەسەر نییە، و سەرکێشی کردن لە قسەکانیدا، و خواردنی ریبا و خواردنی ماڵی هەتیو بە ناهەق، وە خواردنی ماڵی حەرام لە رێگای رەشوە و بەرتیل وەرگرتن و زۆری تریش ئەمانە هەموو سزای ناوگۆڕ دەدرێن لە جیهانی بەرزەخدا.

خواردنی ماڵی برا موسڵمانەکەی بە ناڕەوا یاخود ماڵی شەریك و هاوپەیمانەکەی وە خواردنەوەی ماددەی بێ هۆشکەر و داوێن پیسی و نێربازی و خیانەت و جاسوسی، وە ستەمکار و فێڵباز و تەڵەکەباز و ساختەکار وەرگرتنی پارەی سوو خۆری و ئەوەی دەیدات و نووسەرەکە و هەردوو شایەدەکە و هەموو ئەوانەی کار لەو مەسەلەیەدا دەکەن، وە کردنی کارە قەدەغەکراوەکان.

ئەوانەی موسڵمانان ئەزیەت و ئازاردەن و ئەوانەی بەدوای نامووسیان دەکەون و ئەوەی حوکم بە غەیری ئەو شتە دەکات کە خوا دەیابەزاندووە، وە فەتوا دان بە پێچەوانەی شەرعی خودای گەورە، و هاوکاری کردن لەسەر تاوان و دژایەتی کردن، و کوشتنی بەناهەق کە خودای گەورە حەرامی کردووە، وە کەسی مولحید و بێ دین لە مزگەوتەکان و کەعبە و شوێنە پیرۆزەکان، ئەوانەی کار ناکەن بە حەقیقەتی ناوە پیرۆزەکانی خوا و سیفەتە جوانەکانی، وە ئەوانەی بێ دینی دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە ئەوانەی شیوەن و واوەیلا دەکەن و ئەوانەش گوێی لێ رادەگرن، ئەوانەی ئەو گۆرانیانە دەڵێت کە خوا و پێغەمبەر(ﷺ) حەرامی کردووە و ئەوانەش گوێی لێ رادەگردن، ئەوانەی مزگەوت لەسەر گۆڕەکان دروست دەکەن و مۆم و چرای لەسەر هەڵدەکەن و دەیرازێننەوە، ئەوانەی فێڵ لە تەرازوو دەکەن بۆ

دەستکەوتنی پارەی زیاتر ئەگەر بۆ خەڵکیش بکێشن دیسان فێڵی لێ دەکەن و زۆردارەکان و خۆبەزلزانەکان و دووڕووەکان و غەیبەتکاران و ئەوانەی تەعلیق و توانج لە خەڵکی دەدەن.

ئەوانەی دەبنە دەردو و بەلا لەسەر پێشینەکان و ئەوانەی دەچنە لای فالگرەوە دەستگرەوە و جادوبازی و پرسیار لێ دەکەن و باوەڕییان پێ دەهێنن، و ئەوانەی هاریکاری زوڵم و ستەم دەکەن و دوارۆژی خۆیان بە پارەیەکی کەم دەفرۆشن، و ئەوانەی ئەگەر بە ناوی خوا ترسێندران و بە بیریان هێنایەوە چاویان ناگرێت و لە تاوان دوورناکەونەوە، ئەو کەسەی بە فەرمودەی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) داوای هیدایەتی و ڕێنموویی لێ دەکەن بەلام هیچ وەرناگرێت و نایەتە سەر ڕێگای ڕاست و سەری خۆی پێ بەرزناکاتەوە، و ئەو کەسەی قورئانی بۆ دەخوێندرێتەوە ئەوا هیچ کاریگەری لەسەر نابێت و لەوانەشە بارگرانتربێت.

ئەو کەسەی سوێند بە خوا بخوات درۆ دەکات، بەلام ئەگەر سوێند بە گەورەیی خۆی یاخود بە نزیکێکی خۆی یان بە کەسێك کەوا خۆشی دەوێت بخوات ئەوا درۆ ناکات ئەگەر چی هەڕەشەشی لێ بکرێت یاخود سزاش بدرێت.

ئەو کەسەی شانازی بە یاخی بوون و تاوانی خۆی دەکات و لەناو خەڵکیدا بلاوی دەکاتەوە، و ئەوانەی باوەڕت پێیان نیە ماڵ و نامووسی خۆت لەلای ئەمانەت بدەیت، ئەوانەی زمان پیسی دەکەن و خراپەکاری پێ دەکەن و خەڵکی خۆیان لە شەڕ و خراپەی دەپارێزن، و ئەوەی نوێژ دوا دەخات بۆ کاتێکی دیکە و پەلە لە نوێژەکە دەکات و هیچ یاد و زیکری خوای تێ ناکات، هیچ کاتێك لە ماڵەکەی زەکاتی لێ دەرناکات و خۆی پاك و خاوێن ناکاتەوە، و هیچ کاتێك گوێ ناداتە ئەوەی ئایا ئەو ماڵ و پارە و پووڵەی دەستی کەوتووە، لە حەلاڵە یاخود لە حەرام دەستی کەوتووە، پەیوەندی خزمایەتی و بەزەیی نایەتەوە بە هەژار و نەدار و بێوەژن و هەتیوو و ئاژەلاندا.

بەڵکو پاڵ بە هەتیووەوە دەنێت و هانی کەسیش نادات کە خواردن و خۆراك ببەخشێت بەهەژار و نەداران و ئەوانە خۆیان لەناو خەڵکیدا دەردەخەن و قەدەغەی هەموو چاکە و کۆمەك و هاوکارییەك دەکەن و خۆی خەریك دەکات بە عەیبی خەڵکی و ئاگای لە عەیبی خۆی نیە، خۆی خەریك دەکات بە تاوانەکانی خەڵکی و ئاگای لە تاوانی خۆی نییە، جا هەموو ئەوانە و نموونەی ئەوانە لە گۆڕەکانیاندا سزا دەدرێن بەهۆی ئەو تاوانانەیەوە بە گوێرەی زۆری و کەمی و بچووکی و گەورەیی تاوانەکانیان.

کاتێك زۆرترین خەڵك لەم حاڵەتەدان، ئەوا خاوەنی گۆڕەکانیان لە ئێش و ئازاردان، وکەسی براوە لەناویاندا کەمن، جا دەرەوەی گۆڕەکان بە خۆڵ داپۆشراوە کەچی ناوەڕۆکەکەی گشتی ئێش و ئازار و ئاخ هەڵکێشانە، دەور و پشتی گۆڕەکە خۆڵ و بەردی نەخش کراوە کەچی لەناو هەناویدا بەلآ و کارەسات و سزادانە، سوێند بە خوا ئەمانە گشتی ئامۆژگاری کراون بەوەی کەوا دونیایان دەڕازاندەوە و ئاوەدانیان دەکردەوە و پێیان دەوترا ئەو خانووە ئاوەدان بکەنەوە کە ئێوە بەپەلەن بۆی بچن کە ئەو گۆڕەیە ئێستا تێیدان و خانووەکانیشیان بۆ یەکێکی دیکە بەجێ هێشتووە، ئەمەش جیهانی وەرگرتنی کردەوەکانە، و کۆگای کردەوەکانە لەوەی چاندووتانە و ئەمەش شوێنی پەڕینەوەیە بۆ باخێك لە باخەکانی بەهەشت یاخود دۆڵێك لە دۆڵەکانی دۆزەخ.

***

## ئەو هۆكارانە چین دەبێتە هۆی رزگار بوون لە سزای گۆڕ؟

دیسان وەڵامەکەی لە دووڕووەوەیە: بە کورتی و بەدرێژی وەڵامەکەی بە کورتی: ئەو دوورکەوتنەوەیە ئەو هۆکارانەن کەوا سزای گوڕ بە سەریدا تێدەپەڕێت، و لە سوودمەنترینی ئەو پیاوەیە کاتێك دەیەوێت بخەوێت تەنها بۆ خودا یەك کاتژمێر لە خۆی بپرسێتەوە و موحاسەبەی خۆی بکات لەوەی لەو رۆژەدا زەرەرەمەندبووە یاخود سوودی پێ گەیشتووە، پاشان لەنێوان خۆی و خوای گەورە تەوبەی نەصوح نوێ بکاتەوە، جا لەسەر ئەو تەوبەیەدا بخەوێت.

ئیمانی پتەو و خۆراگر بێت ئەگەر لەخەو هەڵسا نەگەڕێتەوە سەرئەو تاوانەی کردوویەتی، و هەموو شەوێ ئەم کارە بکات، جا ئەگەر لەسەر ئەو تەوبەیە شەوەکەی مرد ئەوا لەسەر تەوبە دەمرێت.

ئەگەر لە خەویش رابوو ئەوا بۆ کاروکردەوەی چاك بۆ دوارۆژەکەی کار دەکات دڵخۆشە بەوەی کە ئەجەلەکەی دواکەوت تاوەکو پێشوازی لە خوای خۆی بکات و ئەوەی لە دەستی داوە بیگەڕێنێتەوە، بۆ بەندەش لەو خەوەدا سوودمەندترینە، نەخاسمە ئەگەر لەو کاتەدا خۆی بە یادو و زیکری خوا سزا دا و هەر لەو خەوەشدا ئەو سوننەتە بەکار دەهێنێت کە لەلایەن پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە[١٦٥] تاوەکو خەو بەسەریدا زاڵ دەبێت، جا ئەوکەسەی خوای گەورە خێری بۆ بووێت ئەوا سەرکەوتووی دەکات، ولا قوة الآ بالله.

وەڵامەکەشی بە درێژی: هەندێك لە حەدیسەکانی پێغەمبەر(ﷺ) باس دەکەین کە تێیدا لە سزای گۆڕ رزگاری دەبێت.

لەوانە: سەلمان (رەزای خوای لێ بێ) گێڕایتیەوە و موسلمیش لە سەحیحەکەیدا ریوایەتی کردووە و دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) دەیفەرموو: (رباط یوم

---

([١٦٥]) سەیری : موسلم (٢٧١٠) و (٢٧١٤) و (٢٧٢٧) بکە.

وليْلةَ خير من صِيام شهر و قِيامه، وإن ماتَ أجرى عليه عمله الذي كانَ يعملهُ وأجرى عليهِ رزقه وأمن الفتّان) [١٦٦].

واته: (هەر كەسێك بمرێت لە كاتی پاسەوانی كردنیدا لە پێناوی خوای گەورە، خوا ئەو كردەوە چاكەی بۆ درێژە پێ دەدات پاداشتی خێرترە لە بەرۆژوو بوونی مانگێك و شەونوێژەكانیشی، وە درێژە بە رزق و رۆزی پێدانی بۆ دەدرێت تا رۆژی كۆتایی و دوور دەبێت لە تاقیكردنەوەی لێ پرسینەوەی گۆڕ).

لە حەدیسێكی فەزاڵە كوڕی عوبەید گێڕاییتیەوە لە كتێبی (جامع الترمذي) ترمذي دەڵێت ئەود حەدیسێكی (حسن صحيح)ە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: (كل ميت يختم على عمَلِه إلاّ الذي مات مرابطاً في سبيل الله، فإنه ينمى له عملهُ إلى يوم القِيامة ويأمن من فتنة القبر)[١٦٧].قال الترمزي: هذا حديث حسن صحيح.

واته: (هەموو مردوویەك كۆتایی بە كردەوەكانی دێت و مۆر دەنرێت بەسەریدا تەنها ئەو كەسە نەبێت كە لە پێناوی خوای گەورەدا پاسەوانی كردووە ئەو كەسە كردەوەكەی گەشە پێدەدرێت لەگۆڕدا تا رۆژی كۆتایی پارێزراو دەبێت لە سزا و تاقیكردنەوەی گۆڕ).

لە (سنن النسائي) دا ریوایەتی كردووە: لە راشد كوڕس سەعد، ئەویش لە سەحابەكانی پێغەمبەر(ﷺ) كەوا پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئیمانداران تووشی تاقیكردنەوە دەبن لە گۆڕەكانیاندا تەنها شەهید نەبێت؟

فەرمووی: (كفى ببارقة السيوف على رأسِه الفتنة) [١٦٨].

واته: (شەوقی شمشێر بەسەریانەوە بەسە بۆ تاقیكردنەوەیان).

---

([١٦٦]) سەرچاوەی پێشوو: (١٩١٣)

(١٦٧) سنن الترمذي: (١٦٢١).

([١٦٨]) سنن النسائي: (٤/٩٩).

المقدام كوڕی معد يكرب دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویت: (للشَهيد عند الله ست خِصال: يغفِر لـه في أول دفعـة مـن دمـهِ، ويـرى مقعـدهُ مـن الجنّة، ويجار من عذاب القبر، ويأمن من الفزع الأكبر، ويُضَع على رأسهِ تاج الوقار، الياقوتةَ منه خير من الدينا وما فيها، ويزوج إثنتين وسبعين زوجة من الحور العين، ويشفع في سـبعين مـن أقاربـه)إبـن ماجـة وترمـذي ريوايـەتيان كـردووە و دەڵـێن حەديسێكی (حسن صحيح)ـە[169].

واتە: (شەهيد شەش سيفەتی لای خوای خۆی هەيـە: لەگـەڵ ڕژانـی يەكـەم دڵـۆپ خوێن لە خوێنەكەی خوای گەورە لـەگوناهی خـۆش دەبێـت، و شـوێنی خـۆی لـە بەهەشت دەبينێت، و لە سزای گۆڕ ڕزگاری دەبێت، و پارێزراو دەبێـت لـە تـرس و تۆقێنی هەرە گەورە لە ڕۆژی دواييدا و تـاجی شـكۆداری لەسـەر دەنرێـت، هـەر ياقووت و مرواريیەك تێيدا خێری لە دونيا و ئـەوەی تيايـەتی زيـاترە، و حـەفتا و دوو حۆری بەهەشتی لێ مـارە دەكرێـت، وە تكـا بـۆ حـەفتا كـەس لـە خزمـانی دەكات).

لـە ئـيبن عەبباسـەوە(رضي الله عنه) دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: پياوێـك لـە هـاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر گۆڕێكی شاردراوە دانيشت كە نەيزانی ئەمە گـۆڕە، بـەڵام ئەو گۆڕی ئادەميزادێك بوو جا سورەتی (الملك)ی خوێند تا تـەواوی كـرد، ئينجـا چووە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەسـەر گـۆڕێكی شـاردراوە دانيشتم و نەمزانی كە ئەوە گۆڕە، كەچی ئەو گۆڕی مرۆڤێك بوو سورەتی (الملـك)م لەسەر خوێند تا كۆتايی، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هي المانعة، هي المنجيـة تُنَجيهِ من عذاب القبر) ترمذي دەڵێت ئەمە حەديسێكی (حسن غريب)[170].

---

(169) سنن إبن ماجه: (2799).

(170) سنن الترمذي: (2890).

واتە: (ئەو سوورەتە ڕێگـرە لـە سـزای گـۆڕ، وە ڕزگارکەریـشە و ڕزگـاری دەبێـت لەسزای گۆڕ).

لە مەسنەدی عەبد کوڕی حەمید بۆمان ریوایەت کراوە، لە ئیبراهیمـی کـوڕی حەکیم، ئەویش لە باوکییەوە ئەویش لە عیکرەمـە، ئـەویش لـە ئـیبن و عـەبباس (ڕەزای خواییان لیّ بێت) بە پیاوێکی وت : ئایا دیاریەکت پێشکەش بکـەم، پێـی دڵخۆش بیت؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ.

وتی: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الملك: ١) بخوێنـە و لەبەری بکە فێری ماڵ و منداڵ و کوڕەکـەت و دراوسـێکەت بکـە، چـونکە ئـەو سوڕەتە ڕێگرە و ڕزگار کەرە لە سزای دۆزەخ، وە ئەگەر چـوویە نـاو گـۆڕ داوا لـە خوای خۆی دەکات لە ڕزگارت بکات لە سزای گۆڕ، جا خـوای گـەورە خاوەنەکـەی ڕزگار دەکات لە سزای گۆڕ.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموویێت: (لـوددت أنهـا في قلـب كـل إنـسان مـن أُمـتي) [١٧١].

واتە:(حۆزگە دەخوازم ئەو سوڕەتە لە دڵی هەموو ئادەمیزادێك بێت لە ئۆمەتەکـەم دا).

أبو عمر عبدالبر دەڵێت: لەپێغەمبەر(ﷺ)گێڕاویتەوە کـەوا دەفـەرموویێت: (إنّ سورة ثلاثين آية شفعت في صاحبها حتى غفَرَ له ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾(الملك:١) [١٧٢].

واتە: (سوڕەتێك هەیە سی ئایەتە تکای بۆ خاوەنەکەی کرد تا خوا لێی خۆش بـوو، سوڕەتەکەش ﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ﴾)

---

(١٧١) تفسير إبن كثير: ٤/٤٢٢

(١٧٢) سنن الترمذي: (٢٨٩١). وسنن أحمد: (٢/٢٩٩).

له سننی إبن ماجه ریوایەت کراوه له حەدیسێکی ئەبی هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) که له پێغەمبەر(ﷺ) وەرگیراوه دەفەرمووێت: (من ماتَ مبطوناً مات شهيداً ووقي فتنة القبر، وغدي وريح عليه برزق من الجنة) [173].

واته: (هەر کەسێك به سك ئێشه بمرێت به شەهید مردووه، لەفیتنەی گۆڕ پارێزراو دەبێت و له رزق و رۆزی بەهەشتدا خواردنی دەدرێتێ).

له ترمزی ریوایەت کراوه، له حەدیسێکی رەبیعە کوڕی سەیف، ئەویش له عبدالله ی کوڕی عومەر وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ما مِنْ مُسلِم يَموتَ يومَ الجُمعةَ أو ليلةِ الجُمعةَ إلاَّ وقاه الله فِتنة القبر)) [174].

واته: (هیچ موسڵمانێك نیه کەوا رۆژی هەینی یاخود شەوی هەینی بمرێت ئیلاّ خوای گەوره له فیتنه و ئاشوبی گۆڕ دەیپارێزێت) وه ترمزی دەڵێت ئەمه حەدیسێکی (حسن غريب).

حەدیسه صەحیحەکان بەرپەرچی ئەو قسانه دەداتەوه که دەڵێت پیاوی راستگۆ لەگۆڕەکەیدا پرسیاری لێ ناکرێت بەڵکو کەسی راستگۆش له گۆڕەکەیدا وەکو هەر خەڵکێکی دیکه پرسیاری لێ دەکرێت، ئەمەش عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێ) کە سەری راستگۆیانه، به پێغەمبەری(ﷺ) فەرموو: کاتێك پێی راگەیاندم له پرسیارلێکردنی مەلیکێك له گۆڕەکەیدا، وتی: ئایا منیش لەسەر ئەم حاڵەتەدام له گۆڕەکەمدا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی بەڵێ [175].

وه هاتووه لەوەی که له سزای گۆڕ رزگاری دەبێت حەدیسێکه شیفای تێدایه ابو موسی المديني ریوایەتی کردووه و دەردەکەشی دیاری کردووه له کتێبەکەی (الترغيب والترهيب) و شەرحیشی بۆ داناوه، له حەدیسێکی الفرج کوڕی فضاله

---

(173) إبن ماجة: (١٦١٥).

(174) سنن الترمذي: (١٠٧٤)، ومجمع الزوائد: (٢/٣١٩).

(175) سەیری: ميزان الإعتدال: ٤/١٦٧ بکه.

ریوایەتی کردووە کەوا هیلال أبـو جبلـە بۆمـانی گێڕاوەتـەوە لـە سـەعدی کـوڕی ئەلموسەیب، ئەویش لە عبدالرحمن کوڕی سمرە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لامان لە صفە بووین لە مەدینە، جا لەسەرمان وەستا و فەمووی:(إني رأيتُ البارحـة عجبـاً رأيت رجلاً من أُمتي أتاه ملك الموت ليقبَض روحه، فجاءهُ بره بالوالديه، فرّد ملـك الموت عنهُ.

ورأيتُ رجلاً من أُمتي قد أحتوشتهُ الـشياطين، فجـاء ذكـر الله فطـير الـشياطين عنهُ.

ورأيْتُ رجلاً من أُمتي يلهث عطشاً كلما دنـا مـن حـوض منـع وطـرد، فجـاءهُ صيام شهر رمضان فأسقاه وأرواه.

ورأيتُ رجلاً من أمتي ورأيتُ النبّيين جلوساً حلقاً حلقاً كلما دنا إلى الحلقة طـرد ومنع، فجاءه غسله من الجنابة فأخذ بيدهِ فأقعده إلى جنبى.

ورأيتُ رجلاً من أمتي من بين يديهً ظلمة، ومن خلفه ظلمـة، وعـن يمينـه ظلمـة، وعـن يـساره ظلمـة ، ومـن فوقـه ظلمـة وهـو مـتحير فيـه، فجـاءه حجـة وعمرتـهُ فأستخرجاه من الظلمة دخلاه في النور.

ورأيتُ رجلاً من أُمتي يتقي وهو النّار وشـررها فجاءتـه صـدقته فـصارت سـتراً بينه وبين النار وظلاً على رأسهِ.

ورأيتُ رجلاً من أمتي يكلم المؤمنين ولا يكلموه، فجاءتهُ صلة الرحمة، فقالت: يا مَعْشر المؤمنين إنهُ كان وصلاً بالرحمة فكلموهُ بِكلمة المؤمنون وصافحوهُ وصافحهم.

ورأيتُ رجلاً من أمتي قد أحتوشته الزبانيـة، فجـاءه أمـر بـالمعروف ونهيـهِ عـن المنكر فإستنقذهُ من أيديهم وأدخله في ملائكة الرحمة.

ورأيت رجلاً من أمتي جاثياً على ركبتيهِ، وبيْنَهُ وبين الله حجـاب فجـاءه حـسن خلقه، فأخذ بيدهِ، فأدخلهُ الله عز وجل.

ورأيتُ رجلاً من أمتي قد ذهبت صحيفة من قبل شماله، فجـاء، خوفـه مـن الله عز وجلّ.

ورأيت رجلاً من أمتي خف ميزانه فجاءه افراطه فثقلوا ميزانه ورأيتُ رجلاً مـن أمتي قائماً على شفير جهنم، فجاءه رجاء، من الله عز وجلّ، فاستنقذهُ من ذلك و مضى.

ورأيتُ رجلاً من أمتي قد هوى في النّار، فجاءه دمعتهُ التي قد بكى من خشية الله عز وجلّ فاستنقذتهُ من ذلك.

ورأيتُ رجلاً مـن أمـتي قائمـاً علـى صـراط يرعـد كمـا ترعـد الـسعفة في ريـح عاصف، فجاءه حسن ظنهِ بالله عز وجلّ فسكن روعهُ ومضى.

ورأيتُ رجلاً من أمتي يزحف على صراط يحبوا أحيانـاً ويتعلق أحيانـاً فجـاءه صلاته فأقامتهُ على قدميهِ وأنقذتهُ.

ورأيتُ رجلاً من أمتي إنتهى إلى ابواب الجنـة، فغلقـت الأبـواب دونـه، فجاءتـه شهادة أن لا إله إلاّ الله ففتحت له الأبواب، وأدخلتهُ الجنة)[١٧٦].

الحـافظ أبو موسى دەڵێت: ئەو حەدیسە (حـسن جـداً)ە، ریوایـەتی کـردووە لـە سعید کوری المسیب وە عمر کوڕی ذر وە علی کوڕی یەزید کوڕی جدعان.

واتە: (دوێنی شەو من خەونێکی سـەیرم بـینی لـە ئوممەتەکـەم دا پیـاوێکم بـینی فریشتەی گیانکێش هاتە لای بۆ ئەوەی رۆحی بکێشێت، جا چاکەی دایك و بـاوکی هاتەلای و فریشتەی گیانکێش دەستی لێ بەردا و وازی لێ هێنا.

لە ئوممەتەکەمدا پیاوێکم بینی شەیتانێکی زۆری لێ کۆببوونەوە، ئینجـا یـاد و زیکری خوا هاتە لای و شەیتانەکانی لەلا فڕین.

لـە ئوممەتەکەمـدا پیـاوێکم بـینی فریـشتەکانی سـزادان دەورەیـان دابـوو، جـا نوێژەکەی هاتە لای و لە دەستی رزگاری کردن.

---

([١٧٦]) مجمع الزوائد: ٧/١٨٠

لە ئۆممەتەکەم دا پیاوێکم بینی لە تێنوتیان هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو و هەرکاتێك دەیوویست لە حەوزەکە نزیك ببێتەوە قەدەغەیان دەکرد و دەریان دەکرد، جا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان هاتە لای و ئاوی پێدا و تێنوێتی شکاند.

لە ئۆممەتەکەم پیاوێکم بینی، وە بینیم پێغەمبەران بازنە بازنە دانیشتبوون هەر کاتێك دەیوویست لە بازنەکە نزیك ببێتەوە قەدەغە دەکراو دەردەکرا جا غوسل و خۆشووشتنی جەنابەتەکەی هاتە لای و دەستی گرت و لە تەنیشت من دایانیشاند.

لە ئۆممەتەکەم پیاوێکم بینی لە نێوان هەردوو دەستەکانی تاریکی بوو، وە لە دواوەی تاریکی بوو، وە لەلای ڕاستی تاریك بوو، وە لە لای چەپی تاریکی بوو و لە سەروویدا تاریکی هەبوو، بە ڕاستی ئەو دۆش دامابوو تیایدا، جا حەج و عومرەکەی هاتنە لای و لە تاریکیدا دەریان هێنا و بردیانە ناو ڕووناکی.

وە لە ئۆممەتکەمدا پیاوێکی بینی دەترسا و لە ئاگر و شەڕەکەی هەڵدەهات، جا خێر و سەدەقەکەی هاتنە لای و بووە پەردەیەك لە نێوان خۆی و ئاگرەکە و بووە سێبەریش لەلای سەری.

لە ئۆممەتەکەمدا پیاوێکم بینی قسەی لەگەڵ ئیمانداران دەکرد بەڵام ئەوان قسەیان لەگەڵ نەدەکرد، ئینجا پەیوەندی خزمایەتی و بەزەییەکەی هاتنەلای و وتی: ئەی گەلی ئیمانداران ئەو پیاوەی پەیوەندی خزمایەتی و بەزەیی بەجێ گەیاند قسەی لەگەڵدا بکەن، جا ئیماندارەکان قسەیان لەگەڵدا کرد و تەوقەیان لەگەڵ یەکتری کرد.

وە لە ئومەتەکەمدا پیاوێکم بینی فریشتەی سزادان دەوریان دابوو، جا کردەوەی فەرمان بە چاکە و نەهی کردنی لە خراپە هاتە لای و لە دەستی ڕزگاری کردن و خستییە بەردەم فریشتەی بەزەیی.

وه له ئۆمەتەکەمدا پیاوێکم بینی لەسەر چۆکەکانیدا کەوتبوو، و لەنێوان خۆیو خوای گەورە، پەردەیەك هەبوو جا رەوشتە جوانەکەی هاتە لای و دەستی گرت و بردییە لای زاتی خودای عز وَجل.

له ئۆمەتەکەمدا پیاوێکم بینی کتێبی کار و کردەوەکانی لەلای چەپیەوە بۆی هات، جا ترسەکەی لە خودای عزو جل هاتە لای و کتێبەکەی وەرگرت و لەلای دەستە راستی داینا.

له ئۆمەتەکەمدا پیاوێکم بینی تای تەرازووەکەی سووك بوو ئینجا ئەو منداڵە بچووکانەی پێش بلوغی مردبوون هاتنە لای و تای تەرازووەکەی بۆیان قورس کرد، پیاوێکم بینی لەسەر لێواری دۆزەخ بوو، جا تکا و پاڕانەوەکەی لە خودای عزوجل هاتەلای و رزگاری کرد و تێی پەڕاند.

له ئۆمەتەکەمدا پیاوێکم بینی خەریك بوو بکەوێتە ناو ئاگر، بەڵام فرمێسك و گریانەکەی لە ترسی خوا هاتە لای و رزگاری کرد لەم حاڵەتە.

له ئۆمەتەکەمدا پیاوێکم بینی لەسەر پردی سیرات وەستا بوو دەلەرزی و دەلەرایەوە هەروەك چۆن گەڵای دارخورما لەبەر رەشەبا دەلەرێتەوە، جا گومانی چاکەکەی بەرامبەر خوای عزوجل هاتە لای و دڵی وەستان و سەقامگیری کرد و رزگاری بوو.

له ئۆمەتەکەمدا پیاوێکم بینی لەسەر پردی سیرات دەخشا هەندێ جار بە گاگۆلکێ دەڕۆیشت و هەندێ جاریش خۆی پێوە هەڵدەواسی، جا نوێژەکەی هاتەلای و لەسەر هەردوو قاچەکانی وەستاندی و رزگاری کرد.

وه له ئۆمەتەکەمدا پیاوێکم بینی لەبەر دەرگاکانی بەهەشت وەستا بوو، تەنها دەرگاکان لەسەر ئەو داخرا بوو جا شەهادەی (أن لا الـه إلا الله) هاتە لای و دەرگاکانی بۆ کردنەوە و بردیانە بەهەشت).

❊❊❊

**پرسیار کردن لە گۆڕدا ئایا شتێکی گشتییە لەهەمبەر موسڵمانان و دووڕووەکان و کافرەکاندا یاخود تایبەتە بە کەسی موسڵمانی دووڕوو؟**

أبو عمر کوڕی عەبدولبەڕ لە (کتاب التمهید)دا دەڵێت: نیشانەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەوا فیتنە و ئاشوب لە گۆڕدا تەنها بۆ موسڵمان و دووڕوو دەبێت کە پەیوەندارن بە ئەهلی قیبلە و ئایینی ئیسلام بەشایەتدانی ئاشکرا، بەڵام کافری بێباوەڕ لەوانەنین کە پرسیاری لێ بکرێت لە بارەی خوا و ئایین و پێغەمبەرەکەی، بەڵکو پرسیار دەکرێت لە بارەی ئەهلی ئیسلام، جا خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە راوەستاویان دەکات و گومان دەخاتە دڵی درۆزنان و بێباوەڕان.

قورئان و سوننەش بەڵگەن لەسەر جیاوازی ئەو وتەیە، بەڵکو پرسیار کردن بۆ موسڵمان و کافرانیشە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ﴾ (إبراهيم: ٢٧).

واتە: (خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دونیادا، لەسەرەمەرگ و قیامەتیشدا، گوفتارییان رێك و پێکو دامەزراو دەبێت وە بە ئیمانەوە دەمرن، لەولاشەوە هەر ئەو خوایە ستەمکاران گومڕا دەکات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەکرێت).

لە هەردوو سەحیحدا، ئەنەس کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) کەوا دەفەرمووێت: (إن العبد إذاوُضع في قبرِهِ، وتولَّى عنهُ أصحابهُ ، إنهُ ليسمعُ قَرْع نعالِهم) [١٧٧].

---

(١٧٧) موسلم: (٢٨٧٠).

واته: (كاتێـك بەندەیـەك لـە گۆڕەكەیـدا دادەنرێـت، و هاوڕێكـانی ئـەوێ بـەجێ دەهێڵن، ئەوا مردووەكە گوێی لە دەنگی نەعلەكانیانە).

بوخاریش زیادی كردووە: (وأما المنافِق والكافر فيقال لهُ: ما كنت تقـول في هـذا الرجل؟ فيقول: لا أدري، كنْتُ أقـول مـا أقـول النـاس، فيقـال: لا دَرَيْـتَ ويـضرب بمطرقةٍ من حديد يصيحُ صيحة يسمعها من يليه إلاّ الثقلين)

واته: (بەڵام كافر و دووڕوو پێیـان دەوترێـت: چـی دەڵێیـت لـەبارەی ئـەو پیـاوە؟ دەڵێت: نازانم، ئەو شتەم دەوتەوە كە خەڵكی دەیانوت، جا پێی دەڵێن: نەتدەزانی و نەشـت خوێنـدووە جـا بـە چەكوشـێكی ئاسـن لێـی دەدەن هـاوارێكی وای لـێ بەرزدەبێتەوە هەموو شتێك لـەوێ گـوێی لـێ دەبـێ تـەنها ئـادەمیزاد و جنۆكـە نەبێت).

بەڵام دووڕوو و كافر، كە پێتی (واو) لە نێوانیاندایە ئـەوا لـە حەدیـسێكی ابـی سعيد الخدری(رضي الله عنه) كە إبن حبان و ئیمام ئەحمـەد ریوایـەتیان كـردووە پێـشتر بـاس كراوە: لە جەنازەیەكدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا بـووین(صلى الله عليه وسلم) جـا فـەرمووی: (يـا أيها النّاسُ، إن هذه الأمة تبتلى في قبورها، فإذا الإنسان دُفِنَ وتولى عنـهُ أصـحابهُ جاءه ملك وفي يده مطرقٌ، فأقعدهُ، فقال: ما تَقول في هذا الرجل؟ فـإن كـان مؤمنـاً قال: أشهدُ أن لا إله إلاّ الله وَحْدَهُ لا شـريك لَـهُ وأشـهدُ أنّ مُحمـداً عبـدهُ ورسـولهُ، فيقول له: صدَقتَ، فيفتحُ لهُ باباً الى النار فيقول لهُ: هذا منزلك لو كفرت بربِّك.

وأما الكافر والمنافقون فيقول له: ما تقول في هذا الرجل؟

فيقول: لا أدري.

فيقال: لا دَرَيْتَ ولا اهتديت.

ثم يفتح له باباً الى الجنة فيقول له: هذا منزلك لو آمنت بربّك، فأما اذا كفرت فإنّ الله أبدلك به هذا، ثم يفتح له باباً الى النار، ثم يقمعه الملك بالمطرقة قمعـةً يـسمعهُ خلقُ الله إلا الثقلين)

واته: ئەی خەڵکینە، ئەو ئوممەتە لە گۆڕەکەیدا تاقی دەکرێتەوە، جا کاتێك ئادەمیزاد کە بەخاك دەسپێردرا و هاوەڵەکانی بەجێیان هێشت فریشتەیەك دێتە لای و چەکوشێکی بەدەستەوەیە جا دایدەنێشێنێت وپێی دەڵێت: چی دەڵێیت دەربارەی ئەو پیاوە؟

ئەگەر ئیماندار بێت دەڵێت: أشهد ان لا اله الا الله وحدهُ لا شريك لهُ وأشهدُ أن محمداً عبدهُ ورسولهُ)

جا پێی دەڵێن: ڕاستت وت، ئینجا دەرگایەکی لەلای ئاگر بۆ دەکرێتەوە و پێی دەڵێن: ئەوە جێگای تۆ بوو ئەگەر کوفرت بەخوات بکردبایە.

بەڵام لەبارەی کافر و دووڕوو پێی دەڵێت: چی دەڵێیت لەبارەی ئەو پیاوە.

جا دەڵێت: نازانم

پێی دەڵێت: نەشتزانیوە و ڕێنموویش نەکراویت.

پاشان دەرگایەکی لەلای بەهەشت بۆ دەکرێتەوە و پێی دەڵێن: ئەو جێگای تۆ بوو ئەگەر باوەڕت بە خوای خۆت هێنابایە، لەبەر ئەوەی کوفرت کردووە، بۆیە خوای گەورە بۆی گۆڕیوویت بەمە، پاشان دەرگایەکی لەلای ئاگر بۆ دەکرێتەوە پاشان فریشتەکە بە چەکوشێك لێی دەدات وا هاوار دەکات هەموو بوونەوەرێکی خوای گەورە گوێی لێیە تەنها ئادەمیزاد وجنۆکە نەبێت).

لە حەدیسە درێژەکەی بەڕائی کوڕی عازبﷺ کە پێشتر باسمان کردووە: (بەڵام کاتێك خەریکە دەمرێت و لە دونیا دا دەبڕێت، فریشتەکان لە ئاسمانەوە بۆ سەری دادەبەزن و کفنێکییان پێیە لە ئاگر (وە حەدیسەکە باسکراوە تاکو دەڵێت) : پاشان لە گۆڕەکەیدا ڕۆحەکەی بۆ دەگەڕێتەوە لاشەکەی).

حەدیسەکە باس دەکات تاوەکو دەڵێت: (جا ئەگەر کافر بێت فریشتەی گیانکێشان دێتە لای و لەلای سەری دادەنیشێت (حەدیسەکە باس دەکات تاکو دەگاتە): ئەم ڕۆحە پیسە چییە؟ جا دەڵێت: فلانە، بە خراپترین بانگی دەکەن، جا

ئەگــەر  بردیانــە ئاسمــانی دونیــا و کۆتــایی هــات ئاسمانــەکانی دیکــەی لەســەر دادەخرێت، دەڵێت: جا لە ئاسمانەوە فڕێی دەدەنە خوارەوە: پاشان پێغەمبــەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ (الحج: ٣١)

واتە: (جا ئەوەی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار بدات، وەکو ئەوە وایە لە ئاسمانــەوە بەربێتەوە و باڵندە پەلاماری بدات یاخود رەشەبایەکی بەهێز بیفڕێنێت وبیبات بــۆ شوێنێکی دوور و قووڵ).

جا رۆحەکەی دەگەڕێتەوە لاشەکەی، دوو فریشتەی زۆر توند و بــەهێز دێنــەلای، دایدەنیشێنن و بە توڕەیی قسەی لەگەڵدا دەکەن، پێی دەڵێن: خوات کێیە؟ دەڵێت: ها نازانم، پێی دەڵێن: نازانیت و پێی دەڵێن: ئەو پێغەمبەرە چی بوو کــە لــەناوتانا ڕەوانە کرا بوو؟  دەڵێت: نازانم گوێم لە خەڵکی بوو شتێکییان دەووت، پێی دەڵێن: نەشتزانیووە، ئەمەش ئەو فەرموودەیەی خودایە:

﴿وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاءُ﴾ (ابراهيم: ٢٧)

واتە: (هەر ئەو خوایەیە ستەمکاران گومڕا دەکات و ئــەوەی پــەروەردگار بیــەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەکرێت).

ناوی (الفاجر) تاوانباران و خراپەکاران لــەقورئان و ســوننەدا پێناســەی هــەمان ناوی کافر کراوە، وەك خوای گەورە دەفــەرمووێت: ﴿إِنَّ الأَبْـرَارَ لَفِـي نَعِـيمٍ ۞ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ (الإنفطار: ١٣-١٤)

واتە: (بەراستی چاکان و خواناسان لەناو نــاز و نیعمەتــدا ژیــانی پــڕ لــە شــادی و خۆشەویستی دەبەنەسەر، بێگومان تاوانبــاران و تاوانکارەکــانیش لــەناو دۆزەخــدا ژیانی پڕ لە ئێش و ئازار دەبەنە سەر).

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٍ﴾(المطففين: ٧).

واتە: (وازبێنن لە تەرازووبازی چونکە بەڕاستی نامەی تاوانباران لە (سجين ) دایە).

لە ریوایەتێکی دیکە و لە حەدیسێکی البَّراء دا هاتووە: (کاتێك کافر نزیکی مردن دەبێتەوە و لە دونیا دادەبڕێت فریشتەکانی سزا و تووڕە لە ئاسمانەوە بۆی دادەبەزن، بەرگێکی لە ئاگریان پێیە، پۆشاکێکی ڕەشیان لەبەرە، جا دەوری لیّ دەدەن و ڕۆحەکەی دێننە دەرەوە هەروەك شیشێکی قۆلاپدارو بکرێت بەناو خوریەکی تەڕی ئالۆزدا هەموو خوریەکە بە یەکجار لەگەڵ خۆیادا دەهێنێتە دەرەوە بە هەمان شێوە ئەو گیان دەرچوونەش هەموو ئەو دەمار و دەزوولانەی ناو لەشی پارچە پارچە دەبێت، جا کە ڕۆحەکەی هاتە دەرەوە هەموو فریشتەکانی نێوان ئاسمانەکان و زەوی نەفرەتی لیّ دەکەن.

حەدیسەکە باس دەکات تا دەگاتە: (ئینجا مردووەکە گوێی لە دەنگی نەعلی ئەو کەسانەیە کە ئەویّ بەجیّ دەهێڵن، جا پێی دەڵێن: خوات کێیە؟ وە ئایینت چییە؟ وە پێغەمبەرت کێیە؟

دەڵێت: نازانم، جا پێی دەڵێن: هەر نەشتزانیووە)، ئەم حەدیسە حماد کوڕی سلمە لە یونس کوڕی خەباب، ئەویش لە المنهال کوڕی عمرو، ئەویش لە زاذان، ئەویش لە البراء ریوایەتی کردووە.

لە حەدیسێکی عیسی کوڕی المسیِّب، لە عمری کوڕی سابت، ئەویش لە البَّراء ریوایەتی کردووە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەرچووین لەگەڵ جەنازەی پیاوێکی ئەنسار، حەدیسەکە باس دەکات تاکو دەڵێت: (کاتێك کافرێك خەریکە دەمرێت و لە دونیا دادەبڕێت فریشتەکان لە ئاسمانەوە بۆی دادەبەزن و کفنێکی لە ئاگریان پێیە) جا حەدیسەکە باس دەکات تا دەگاتە: (جا ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ناوگۆڕەکەی، ئینجا فریشتەی مونکیر و نەکیر دێنە لای و بە دەنگە گڕەکانیان زەوی پڕ دەکەن، دەنگییان وەکو هەورە گرمەیە و بیلبیلەی چاویان وەك بروسکەیە،

جا دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: ئـەی فـلان خـوات کێیـە؟ دەڵێـت: نـازانم، ئینجـا لەلایەکی گۆڕەکە بانگەوازێك بانگ دەکات، نەشتزانیووە، بـە چەکوشـێکی ئاسـن لێی دەدەن ئەگەر ئەوەی لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا لێـی کۆببنـەوە هیـچی بـۆ ناوترێت، ئینجا گۆڕەکەی لەسەر تەسك دەبێتەوە تاوەکو پەراسوەکانی لەدواوە تێك دەشکێندرێت).

ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەی ریوایەتی کردووە لـە ئـەبی نـەزیر هاشـم کـوڕی ئەلقاسم وتی عیسی کوڕی المسیب بۆمانی گێراوەتەوە ئەم حەدیسـە پێـشتر بـاس کراوە.

لە حەدیسێکی محمد کوڕی مسلمە گێڕایتەوە لـە خـصیف، ئـەویش لـە مجاهـد، ئـەویش لـە البّـراء وتـی: ئێمـە لەگـەڵ جـەنازەی پیـاوێکی ئەنـساردا بـووین و پێغەمبـەریش(ﷺ) لەگەڵمانـدا بـوو، حەدیسـەکە بـاس دەکـات تـاکو دەڵێـت: پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرمووێت: (جـا کاتێـك کافرێـك لـە گۆڕەکـەی دادەنرێـت فریشتەی مونکیر و نەکیر دێنە لای و دایدەنیشێنن و پێـی دەڵـێن: خـوات کێیـە؟ دەڵێت: نازانم پێی دەڵێن: نەتزانیوە). ئەم حەدیسە باس کراوە.

بەگشتی ئەوەی حەدیسی البرّاء کوڕی عزابی ریوایەت کردووە تێیـدا وتوویـەتی: کاتێك کافرێك دەمرێت وە هەندێك لـەوان دەڵـێن: کاتێـك تاوانبارێـك دەمرێـت، هەندێکی دیکە دەڵێن: کاتێك دووڕوویێـك و بـەدگومانێك دەمرێـت، ئـەم وتەیـە لەلای هەندێك لەوانەی ریوایەت دەکەن گومانیان لەوەدا هەیە.

بەڵام ئەوەی باسی کافر و تاوانباری کردووە ئەوا گومانی تێدانیـە، و ریوایـەتی گومانی تیا نییە، لەگەڵ زۆرینەیانە، لە پێشتر لە ریوایەتی گومانی تێدایە، لەگەڵ تاکەکانە، لەسەر ئەویش لەنێوان هەردوو ریوایەتەکە دژایەتیەك نیە، چونکە کەسی دووڕووش پرسیاری لیٚ دەکرێت هەروەك کافر و ئیمانـدار پرسـیاری لـیٚ دەکرێـت لەناو گۆڕدا، جا خودای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەکات بە ئیمان و

باوەڕەوە، خوای گەورەش ستەمکارانیش گومڕا دەکات، ئەوانە کافرەکان و دووڕووەکانن.

ئەبو سەعیدی خودری لە حەدیسەکەیدا کۆیکردۆتەوە کەوا ئەبو عامر ئەلعقدی ریوایەتی کردووە، وتی عبادە کوڕی راشد بۆمانی گێڕاوەتەوە ئەویش لە دواد کوڕی ئەبی هند، ئەویش لە ئەبی ئەزیرە، ئەویش لە ئەبی سەعید وتی: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نامادەی جەنازەیەك بووین، حەدیسەکە باس دەکات، دەفەرمووێت: (وإن كان كافراً أو منافقاً يقول له: ماتقول في هذا الرجل؟ فيقول لا أدري)، واتە: (جا ئەگەر کافر یاخود دووڕووبێت پێی دەڵێن چی دەڵێی لەبارەی ئەو پیاوە؟ دەڵێت: نازانم).

ئەمەش روون و راشکاوانەیە کەوا پرسیار کردن بۆ کافر و دووڕووەکانە.

ئەبی عومەر(رضي الله عنه) لە وتەکەیدا دەڵێت: بەڵام کافری بێباوەڕ لەو کەسانەنین پرسیاری لێ بکرێت لەبارەی خوا و ئاین و پێغەمبەرەکەی.

لە راستیدا خوای گەورە لە قورئانەکەیدا رایگەیاندووە کەوا لە رۆژی دواییدا پرسیار لە کافر دەکرێت خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَا أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ﴾ (القصص: ٦٥).

واتە: (رۆژێك دێت خوا بانگییان دەکات و پێیان دەفەرمووێت: ئەوە وەڵامی پێغەمبەرتان چۆن دایەوە؟)

هەروەها دەفەرمووێت:﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ * عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾(الحجر: ٩٢-٩٣).

واتە: (سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەکەین بە گشتی، لەوکار و کردەوانەی کە دەیانکرد).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ﴾(الاعراف: ٦).

واته: (ئنيجا سوێند بێت به خـوا بێگومـان ئێمـه پرسـیار دەكـەین لەوانـەی كـە پێغەمبەرانیان بۆ رەوانە كراوە، سوێند بێت بەخوا لەپێغەمبەرانیش دەپرسینەوە).

ئەگەر لەدوا رۆژ پرسیارییان لێ بكرێت ئەی چۆن لەناو گۆڕەكانیان پرسیارییان لـێ ناكرێت؟ جا ئەوەی ئەبو عومەر(رضي الله عنه) باسی كردووە وانییە.

***

**پرسیاركردنی مونكیر و نەكیر**
**ئایا ئەو تەنها تایبەتە بەو ئوممەتە؟**
**یاخود بۆ ئەم و ئوممەتی دیكەشە؟**

ئەمە بابەتێكی خەڵكی قسەی لەبارەیەوە دەكەن، ابو عبیـد الترمـذي دەڵێـت: بەڵكو پرسیاركردنی مردوو تایبەتە بەو ئوممەتە، چـونكە ئوممەتـەكانی پـێش ئێمـە پێغەمبەرەكانیان بە پەیام بۆیان هاتوو، جـا ئەگـەر پـشتییان لـە پێغەمبەركـەیان كردبا و سەرپێچییان بكردایە ئەوا پێغەمبەرەكەیان وازیان لـێ دەهێنـان و لێیـان دووردەكەوتنەوە بە پەلە سزایان بۆ دەهات، جا كاتێك خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ (الانبیاء: ١٠٧).

واته: (ئەی موحەمەد(صلى الله عليه وسلم) ئێمە تۆمان رەوانە كردووە تەنها بۆ ئەوە نـەبێت كـە ببێتە رەحمەت و بەرەكەت بۆ هەموو جیهانەكان).

خوای گەورە سزای لەسەر هەڵگرتن و شمشێری پێـدان تـاوەكو بێنـە نـاو دیـنی ئیسلام، هەركەس هاتە ناو ریز و شكۆداری شمشێر و پاشان ئیمان لە دڵیدا جێگیر دەكات وسەبر و ئارامی دەدەنێ.

وە هەركەسیش لە شوێنی خۆی مایەوە ئەوا فەرمانی بە دووڕووی كردووە، ئەوا دڵخۆش دەبن بە كوفرەكانیان و نەفرەتیش لـە ئیمـان و بـاوەڕ دەكـەن، و پـەردە و

رووپۆشێك لەنێوان ئەوان و موسڵمانان دادەنرێت، جا كاتێـك مـردن خـوای گـەورە فیتنەو ئاشووبەكانی گۆڕییان لە چارە دەنووسێت بـۆ ئـەوەی بـە پرسـیار كـردن نهێنیەكانیان بۆ دەربهێنن:

﴿لِيَمِيزَ اللّهُ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ (الأنفال: ٣٧).

واتە: (بۆ ئەوەی خوا كەسانی دەروون پیس و ناپاك لەكەسانی دەروون خـاوێن جیـا بكاتەوە).

جا ﴿يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ وَيُضِلُّ اللّهُ الظَّالِمِينَ وَيَفْعَلُ اللّهُ مَا يَشَاء﴾ (إبراهيم: ٢٧).

لەمەدا هەندێك جیاوازن، لەوانە عبدالحق الأشبيلي والقرطبي دەڵـێن: پرسـیار كردن بۆ ئەو ئۆممەتە و ئۆممەتەكانی دیكەشە.

هەندێكیش وا دادەنێن كە لێپرسینەوە تەنها بۆ ئـەو ئۆممەتەیـە لەوانـەی ئـەبو عومەر عبدالبّر دەڵێت: لە حەدیسێكی زەیـدی كـوڕی سـابت دەگێڕێتـەوە كـەوا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (أنّ هذهِ الأمة تبتلى في قبورها).

واتە: (بێگومان ئەو ئوممەتە لە گۆڕەكەیدا تاقی دەكرێتـەوە). وە دەڵێـت لەوانەیـە ئەو ئوممەتە تایبەت بێت بەو لێپرسینەوەیە.

لـە راسـتیدا نـاڕەزایی دەردەبڕێـت لـە تایبـەتی كردنـی بـەو ئوممەتـە بـەو فەرموودەیـەی پێغەمبـەر(ﷺ):(أنّ هـذهِ الأمـة تبتلـى في قبورهـا). وە بـەو فەرموودەیـەی: (أوحي إلـيّ انكـم تمتحنـون في قبـوركم). ئەمـەش ئاشـكرایە لـە تایبەتمەندی بەو ئوممەتە، وتیان: وتەی دوو فریشتەكە بەڵگەیـە لەسـەر (مـا كُنـت تقول في هذا الرجل الذي بعثكم فيكم؟ فيقول المؤمن: أشهد أنه عبـدهُ وَرَسـولهُ) جـا ئەوە تایبەتە بـە پێغەمبـەر (ﷺ)، وە فەرموودەكـەی لـە حەدیـسێكی دیكـەدا هاتووە:

(إنكم بي تمتحنون، وعني تسألون ) واته: (ئێـوه بـه مـن تـاقی دەكرێنـەوه وه لەبارەی منیش پرسیارتان لیّ دەكرێت) [178].

هەندێكی دیكە دەڵێن: بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی پرسیار كردن تایبەت بێت بەو ئومەتە جگە لە ئومەتكانی دیكە، جا فەرموودەی: (إن هذهِ الأمة) یـان مەبەسـتی لێـی هـەموو گـەلانی خەڵكـە بەگـشتی هـەروەك خـوای گـەورە و میهرەبـان دەفەرموویّت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الآرْضِ وَلاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاَّ أُمَمٌ أَمْثَـالُكُم﴾ (الانعام: ٣٨).

واته: (هیچ زیندەوەرێك و گیانلەبەرێك نییە بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیـەك بە باڵەكانی بفڕێت و ئەوانیش ئومەت و گەلێك نەبن لە ئێوه).

هەموو رەگەزێك لە رەگەزەكانی گیانلەبەران پێی دەوترێت: گەل یاخود ئۆمەت.

هەروەها هەواڵ پێدانی پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی وتەی دوو فریشتەكە: (ما هـذا الرّجل الذي بعث فيكمْ؟) واته: (ئەو پیـاوه چـی بـوو كـەوا لـەناو ئێـوەدا رەوانـه كرابوو؟). ئەمەش هەواڵە بە ئۆمەتەكەی بەوەی لە گۆڕەكەیـدا تـاقی دەكرێتـەوە، ئەوەی دەرەوه ئاشكراشە، خوای گەورە زاناترە، كەوا هەموو پێغەمبـەرێك وابـوون لەگەڵ ئۆمەتەكەی، ئەوان لەپاش پرسیار كردنیان لە گۆڕەكەیاندا سزا دەدرێن.

***

[178] مسند أحمد: ٦/١٤٠

## ئایا منداڵان لە گۆڕەکانیاندا تاقی دەکرێنەوە؟

خەڵکی لەمەدا لەسەر دوو وتە جیاوازن

بیانووی ئەوانەی دەڵێن: ئەوان پرسیارییان لێ دەکرێت، کەوا نوێژ لەسەریان بڕیار دەدرێت وە پاڕانەوە بۆیان وە خوای گەورە لەسزا و فیتنەی گۆڕ دەیانپارێزێت[179]، هەروەك مالیك لە (موطأ) باس دەکات و لە ئەبی هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کەوا پێغەمبەر(ﷺ) نوێژی لەسەر جەنازەی منداڵێك کرد گوێی لە دوعاکەی بوو دەیفەرموو: (اللّهُم قه عذاب القبر). واتە: (خودایە لە سزای قەبر بیپارێزە).

بیانوو دەهێننەوە بەوەی عەلی کوڕی مەعبەد ریوایەتی کردووە، لە عائیشە ﷺ کەوا جەنازەی منداڵێکی بەلایدا تێپەڕی، دەستی بە گریان کرد، پێیان وت: ئەی دایکی ئیمانداران چی دەتگرێنێت؟ عائیشە فەرمووی: بۆ ئەو منداڵە دەگیریم بۆی بەزەیی و شەفەقەت بێت لەسەری لە گۆڕە وشارکردنی.

وە بەڵگە دەهێننەوە بەوەی هناد کوڕی السّری ریوایەتی کردووە و دەڵێت ئەبو معاویە بۆمانی گێڕایەوە، لە یەحیی کوڕی سەید کوڕی موسەیب، ئەویش لە ئەبو هورەیرە ﷺ وتی: لەسەر منداڵێك کە تازە لەدایك بوو نوێژی دەکرد کە هەرگیز تاوانی نەکردووە دەیفەرموو: خودایە رزگاری کە لە سزای گۆڕ[180].

دەڵێن: خوای پاك و بێگەرد عەقڵ و مەعریفەیان بۆ تەواو دەکات بۆ ئەوەی جێگای خۆیان بزانن، وە وەڵامەکەش وەرگرن کاتێك پرسیارییان لە بارەیەوە لێ دەکرێت.

---

(179) الموطأ: ١/٢٢٨

(180) تاريخ بغداد: ١١/٣٧٤

دەڵێن: لەراستیدا بەڵگە لەسەر ئەو حەدیسانە زۆرە کەوا ئەوان لە ڕۆژی دواییدا تاقی دەکرێنەوە، وە ئەشعەری لە بارەی ئەهلی سوننە و حەدیسدا قسە دەکات، ئەگەر لە دوا ڕۆژدا تاقی بکرێنەوە ئەوا هیچ شتێك قەدەغەیان ناکات لە گۆڕەکانیاندا تاقی بکرێنەوە.

هەندێکی دیکە دەڵێن: پرسیار کردن بەڵکو بۆ ئەو کەسەیە هۆش و فامی هەبێت بە پێغەمبەر و نێردراو، پرسیاریش دەکرێت لەو کەسەی ئایا باوەڕی بە پێغەمبەر و گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆی هەیە یاخود نا؟

جا دەڵێن: بۆ ئەوە: چی دەڵێی لەبارەی ئەو پیاوەی لە ناوتاندا بوو؟ جا منداڵێك ئەم شتانە لێك جیا ناکاتەوە، چۆن پێی دەڵێن: چی دەڵێی لەبارەی ئەو پیاوەی لەناوتاندا بوو؟ ئەگەر چی عەقل و تێگەیشتنەکەشی لەناو گۆڕدا بۆ بگێڕدرێتەوە، بۆیە پرسیارێکی لێ ناکرێت لەکاتێکدا زانست و زانیاری لەبارەیەوە نەبێت، ئەو پرسیارەش هیچ سوودی نییە، و ئەمەش بە پێچەوانەی تاقیکردنەوەکانیانن لە ڕۆژی دواییدا، چونکە خودای گەورە پێغەمبەرێکییان بۆ ڕەوانە دەکات و فەرمانیان پێ دەکات گوێڕایەڵی بن و عەقڵ و ژیریشیان لەگەڵدا بێت، جا هەرکەسێك گوێڕایەڵی کرد ڕزگاری دەبێت، و هەرکەسێکیش سەرپێچی فەرمانەکانی کرد دەخرێتە ناو ئاگر.

بەڵام حەدیسەکەی ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) مەبەستی نییە بە سزادانی گۆڕ، کە تێیدا منداڵێك سزا بدرێت لەسەر ئەوەی ملکەچ نەبووە و تاوانێکی ئەنجام داوە، چونکە خوای گەورە هیچ کەسێك سزا نادات بەبێ کردنی تاوان، بەڵکو سزای گۆڕ مەبەستەکەی: ئەو ئێش و ئازارەی کە مردوو بەهۆی کەسی تر تووشی دەبێت، نەك سزادانی لەسەر کارێك کە نەیکردووە، وەك ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام): (إن الميتَ ليعذب ببكاء أهله عليهِ). واتە: (بێگومان مردو لەسەر ئەو گریان و لاواندنەوەی کەس و کارەکەی بۆی دەکەن سزا دەدرێت).

واتە لەناوگۆڕدا تووشی ناخۆشی و ئەزیەت و ئازار دەبێت، نەك بەوەی بە تاوانی کەسێکی زیندوو سزا بدرێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (الانعام: ١٦٤) [181].

واتە: (هیچ کەسێك باری گرانی تاوانی کەسی تـر هـەڵناگرێت). پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (السفر قطعةٌ من العذاب) [182].

واتە: (سەفەر کردن پارچەیەکە لە سزا و ئازار). جا ئێش و ئـازار گـشتگیرە لـە سزادان، و گومانی تیا نیەکەوا لـەناو گـۆڕدا ئـێش و ئـازار وحەسـرەت و خـەم و خەفەت هەیە و لەوانیە کاریگەری لەسەر منداڵیشدا هەبێت، جا ئەزیەتی وئـازاری پێ دەخوات، بۆیە دەبێت نوێژی لەسەر بکرێت و لەخوا بپارێنەوە کـەوا لـە سـزای گۆڕ رزگاری بکات، خوای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە.



## ئەمەش ئاخاوتنێکە:
## ئایا سزای گۆڕ هەمیشەیە و بەردەوامە یاخود پچڕ پچڕە؟

وەڵامەکەی دوو جۆرە:

**جۆری یەکەم:** جۆری بەردەوامـە جگـە لـەوەی لـە هەنـدێ حەدیـسەکاندا هاتووە لەنێوان هەردوو نەفخەکەدا سزاکەیان لەسەر سووك دەبێت، ئەو کاتە کە لە گۆڕەکانیاندا هەڵدەستنەوە و دەڵێن:﴿يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا هَذَا﴾(یس: ٥٢).

واتە: (ئەی هاوار ئەوە کێ ئێمەی زیندوو کردووە؟ کێ ئێمەی لە شوێنی راکـشانمان لە گۆڕەکانمان دەرهێنا؟).

---

([181]) مصنف عبدالرزاق: (٦٦٧٥)، مسلم (٩٣٢).

([182]) مسلم: (١٩٢٧).

بەڵگەش لەسەر بەردەوامیەکەی خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوّاً وَعَشِيّاً﴾ (غافر: ٤٦).

واتە: (ئاگری دۆزەخە، بەیانیان و ئێواران نیشانیان دەدرێت، یاخود پیایاندا دەچزێنرێت).

هەروەها بەڵگەشە لەسەری کەوا پێشتر لە حەدیسێکی سەمرە کە بوخاری ریوایەتی کردووە لە خەونەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کەتێیدا هاتووە: (فهو يفعل به ذلك إلى يوم القيامة). واتە: (جا ئەم کارە دووبارە دەبێتەوە تاوەکو رۆژی قیامەت).

لە حەدیسی ئیبنو عەبباس لە چیرۆکی دوو گەڵا دارخورماکە: (لعله يخفف عنهما مالم تيبسا). واتە: (لەوانەی سزاکەیان لەسەر سووك ببێت تاوەکو دوو گەڵاکە وشك دەبنەوە).

جا سووك بوونی سزاکان پەیوەستە بە تەڕی دوو گەڵا دارخورماکە.

لە حەدیسێکی الربيع کوڕی أنس گێڕایتیەوە لە ئەبی العالیە ئەویش لەئەبی هورەیرە: (ثم أتى على قوم ترضخ رؤوسهم بالصخرة كلما رضخت عادت لايفتر عنهم من ذلك شئ). واتە: (پاشان گەیشتنە لای قەومێك سەریان بەبەرد پان دەکردەوە، هەر کاتێك کەللە سەریان دوو لەت دەبوو وەکو خۆی لێ دەهاتەوە هیچ کاتێك ئەم کارەیان لەسەر سوك نەدەبوو).

وە لە حەدیسی البّراء کوری عازب لە چیرۆکی کافردا: (ثم يفتح له باب إلى النّار فينظر الى مقعده فيها حتى تقوم الساعة) ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە. واتە: (پاشان لە گۆڕەکەیدا دەرگایەکی لە ئاگر بۆ دەکرێتەوە تەماشای جێگای خۆی دەکات لە ناو گۆڕەکەداهەتا قیامەت هەڵدەستێ).

لە ریوایەتێکی دیکەدا: (ثم يخرق لة خرقاً إلى النار فيأتيه من غمها ودخانها إلى يوم القيامة).

واتە: (پاشان کونێك یاخود دەلاقەیەکی لە گۆڕەکەیدا لەلای ئاگر بۆ دەکرێتەوە جا لەوێوە لە خەم و خەفەت و دوکەڵەکەی بۆ دێت تاکو ڕۆژی قیامەت).

**جۆری دووەم:** بۆ ماوەیەکە پاشان دەپچڕێت، ئەمەش سزای هەندێك یاخی بوون و سەرپێچیە کەواتاوانەکانیان سووکە و جا بە گوێرەی تاوانەکەی سزا دەدرێت، پاشان لەسەری سووك دەکرێت هەروەك بۆ ماوەیەك لەئاگردا سزا دەدرێت، پاشان سزاکەی لەسەر لادەچێت.

لە راستیدا سزا لەسەری پچڕ پچڕ دەبێت بە پاڕانەوە یاخود بە خێر و سەدەقە یاخود بە تەوبە کردن یاخود بە یادداشتی حەجکردن، یاخود خوێندنی قورئان لەلایەن هەندێك لە خزمانی پێی دەگات، یاخود ئەوانەی لەسەر دونیا شەفاعەت بۆ مردووەکانیان دەکەن، جا بەهۆی شەفاعەتەکانیان سزا لەسەریان لادەچێت.

بەڵام ئەو شەفاعەتە دەبێت بە ئیزن و مۆڵەتی خوای گەورە و میهرەبان بێت، هەر خوایە مۆڵەت بەو کەسە دەدات شەفاعەت بکات جا ئەوەی بیەوێت شەفاعەت کە دەبێتە بەزەیی خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ (البقرە: ٢٥٥).

واتە: (کێیە ئەوەی دەتوانێت تکا بکا لەلای ئەو بەبێ مۆڵەتی خۆی).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى﴾ (الانبياء : ٢٨).

واتە: (فریشەکانیش تکا کار نابن تەنها بۆ کەسانە نەبێت خوا پێی رازییە).

﴿مَا مِن شَفِيعٍ إِلاَّ مِن بَعْدِ إِذْنِهِ﴾ (یونس: ٣).

واتە: (هیچ کەس نییە شەفاعەت خواز و تکا کاربێت، مەگەر دوای مۆڵەتی ئەو زاتە).

﴿وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ﴾ (سبأ: ٢٣).

واتە: (هیچ تکایەکیش سوودی نییە لای خوا مەگەر بۆ کەسێك خوا مۆڵەتی بدات).

﴿قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعاً لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (الزمر: ٤٤).

واتە: (ئینجا پێیان بڵێ: تکاکار و تکا وەرگرتن و تکاکردن، هەر هەموو بەدەست خوایە، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەر ئەو خاوەنیانە).

ئیبن ئەبی ئەلدونیا باس دەکات و دەڵێت: محەمەد کوڕی موسی الصائغ بۆمی گێڕایەوە، ئەویش لە عەبدوڵلای کوڕی نافیع وتی: پیاوێك لە خەڵکی مەدینە مرد، لە خەودا بینی ئەو پیاوێکە وەك ئەوەی لە ئەهلی ئاگر بچێت، زۆر پێی دڵگیر بوو، پاشان دوای کاتژمێرێك یاخود چەند چرکەیەك بینی هەروەك لە پیاوێکی ئەهلی بەهەشت بچێت وابوو، جا پێی وت: ئەی نەمووت: تۆ لە ئەهلی ئاگری؟ وتی: لە راستیدا وابووم بەڵام لەکاتی بە خاك سپاردنم پیاوێکی چاکەخواز و بە تەقوا لەگەڵماندا بوو، جا شەفاعەتی بۆ چل کەس لە دراوسێکانی کرد من یەکێك بووم لەوانە.

عەمرو کوڕی جەریر دەڵێت: ئەگەر بەندەیەك دوعای بۆ برا مردووەکەی بکات فریشتەیەك دەچێتە لای گۆڕەکەی دەڵێت: ئەی خاوەنی ئەو گۆڕە غەریبە، ئەمە دیاری و بەخششی برایەکە بۆ تۆ[١٨٣].

بەشار کوڕی غالب دەڵێت: لە خەومدا رابعەم بینی، زۆر دوعا و پاڕانەوەم بۆ دەکرد، پێی وتم: ئەی بەشاری کوڕی غالب، دیاری و خەڵاتەکانت چین چین و قات قات لە نوور و رووناکی بۆ لای ئێمە دێت، وتم: ئەوە چۆن دەبێت؟ وتی: ئاوا دوعا و پاڕانەوەی زیندووەکانە بۆ مردووەکان ئەگەر بۆیان پاڕانەوە دوعا راگیراو دەبێت، جا پێی دەڵێن: ئەوە دیاری و خەڵاتی فلانە کەس بۆ تۆ[١٨٤].

إبن أبی الدنیا دەڵێت: ئەبو عوبەیدی کوڕی بوحەیر بۆ منی گێڕایەوە وتی: یەکێك لە سەحابەکان بۆ منی گێڕایەوە وتی: لە دوای مردنی برایەکم لە خەودا

---

(١٨٣) شرح الصدور: ٣٩٦

(١٨٤) شرح الصدور: ١٩٧

بینی، پێم وت: ئایا تکا و پاڕانەوەی زیندووەکان پێتان دەگات؟ وتی سوێند بە خوا وەکو نوور و ڕووناکی دەشەکێتەوە پاشان لە بەری دەکات(١٨٥).

❊❊❊

## ڕۆحەکان لە نێوان مردن تاکو ڕۆژی قیامەت لەکوێ جێگیر دەبن؟

١. ئایا لە ئاسمانداندان یاخود لە زەویدان؟
٢. ئایا لە بەهەشتدان یاخود نا؟
٣. ئایاماڵئاوایی لە لاشەکان جگە لە لاشەکانی کەوا تێی دابوو دەکات؟
٤. ئایا نیعمەت و خۆشی ونەزیەت و ئازار دەبینێت لە ناویدا؟

ئەمە مەسەلەیەکی گەورەیە و خەڵکی قسەی تێدا دەکات، و تێیدا ناکۆك و جیاوازن، هەندێك دەڵێن: ڕۆحی ئیمانداران لە بەهەشتدا لەلای زاتی خوا شەهیدەکان بن یاخود جگە لە شەهیدەکان ئەگەر هاتوو لەلای بەهەشت بەند کرابن بەهۆی تاوانێکی گەورە یاخود قەرزاری، بەهۆی لێخۆشبوون لەوان بەخوای خۆیان دەگەن و بۆیان بەزەیی دەبێت، ئەمەش مەزهەبی ئەبو هورەیرەو عەبدوڵڵای کوڕی عومەره رضي الله عنهما.

ئیمامی ئەحمەد و لە ریوایەتی کوڕەکەی عەبدوڵڵا دەڵێت: ڕۆحی کافرەکان لە ئاگردان و ڕۆحی ئیماندارانیش لە بەهەشتدان.

ئەبو عەبدوڵڵای کوڕی مندە دەڵێت: هەندێك لە سەحابە و تابعین دەڵێن: ڕۆحی ئیمانداران لەلای زاتی خودایە (عزو جل) لەسەر ئەمەش زیاتریان نەوتووە، وتی: لە کۆمەڵێك لە سەحابە و تابعین (شوێنکەوتووان) و ریوایەتیان کردووە کەوا ڕۆحی

---

(١٨٤) سەرچاوەی پێشوو: ٣٩٦

ئیمانداران لــە حــەوزی کەوســەرە، و ڕۆحــی کافرەکــانیش لــە بەرهووتــە، بیرێکــە لەحەزرەمەوت.

سەفوانی کوڕی عـەمرو دەڵێت: پرسیارم کـرد لـە عـامر کـوڕی عـەبـدوڵلا ابـا الیمان: ئایا ڕۆحی ئیمانداران کۆ دەبنەوە؟ وتی بەڵکو زەویە کەوا دەڵێـت: خـوای دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَـدْ كَتَبْنَـا فِـي الزَّبُـورِ مِـن بَعْـدِ الـذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَـا عِبَـادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ (الانبیاء: ١٠٥)

واتە: (سوێند بەخوا بەراستی ئێمە لەکتێبی زەبـووردا دوای تـەورات بڕیارمانـداوە کە بێگومان بەندە شیاو و چاکەکانم دەبنە خاوەنی زەوی) وتی: ئەو زەوییەیە کەوا ڕۆحی ئیمانداران تێیدا کۆدەبنەوە تاوەکو ڕۆژی زیندووبوونەوە.

دەڵێن: ئەو زەوییە یەکە خوای گەورە ئیمادارەکان لە دونیادا دەکاتە خـاوەنی، وە کەعب دەڵێت: ڕۆحی ئیمانـداران لـە (علـیین) لـە هـەرە بەرزەکانـە لـە ئاسمـانی حەوتــەم، وە ڕۆحــی کافرەکــانیش لــە (ســجین) لــەزەوی حەوتــەم لــە ژێــر وڵاتــی شەیتانەکان.

هەنــدێکی دیکــە دەڵــێن: ڕۆحــی ئیمانــداران لــە بــیری زەمزەمــە، و ڕۆحــی کافرەکانیش لە بیری بەرهووتە.

سەلمانی فارسی دەڵێت: ڕۆحی ئیمانداران لە بەرزەخـدا لەسـەر زەوی دەڕوات بـۆ هەرشوێنێك بیەوێت، و ڕۆحی کافرەکانیش لە (سجین)ــە، لە وتەیەکی دیکەیـدا: ڕۆحی ئیماندار بەسەر زەویدا دەڕوات بۆ هەر شوێنێك بیەوێت.

هەندێکی دیکە دەڵێن: ڕۆحی ئیمانداران لەلای دەستەڕاستی ئادەمــە، و ڕۆحــی کافرەکانیش لەلای دەستە چەپیەتی. هەندێکی دیکـە، لەوانـە إبـن حـزم دەڵێـت: جێگیر دەبێت پێش دروستکردنی لاشەکەی.

دەڵێت: لە بارەی ڕۆحەکان دەڵێن جێگیر دەبێت ئەمەش خوای گـەورە عزوجـل وە پێغەمـبەرەکەی(ﷺ) دەفەرموون کە سەرپێـچیان ناکـەین، ئەمــەش بەڵگــە و

سەلماندنێکی روون و ئاشکرایە، خودای عز وجل دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ (الاعراف: ١٧٢).

واتە: (یادی ئەوکاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارتت پشتا و پشتی نەوەی ئادەمی کۆکردەوە لە جیهانی پەنهان‌و شاراوەدا پەیمانی لێ وەرگرتن، کردنی بە شایەت بەسەرخۆیانەوە و پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟؟ هەموویان وتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتیمان داوە کە تۆ پەروەردگارمانیت، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لە رۆژی قیامەدا بڵێت: بەراستی ئێمە لەوە بێئاگابوون!!).

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ﴾ (الاعراف: ١١).

واتە: (سوێند بە خوا بەراستی ئێمە باوەگەورەی ئێمەمان دروستکرد و نەخش و نیگاری روالەت و روخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم).

راستە کەواخوای گەورە رۆحەکانی بە دەستە کۆمەڵ دروستکردووە.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (إن الأرواح جنود مجندة مما تعارف منها ائتلف وماتناكرمنها اختلف).

واتە: ( رۆحەکان وەك سەربازی بە کۆمەڵ وان ئەوەی یەکتریان ناسی هۆگری دەبێت، و ئەوەی رقیشییان لێبێت لێی جیا دەبنەوە).

خوای گەورە بەڵێن و شایەدی لێ وەرگرتن بە خوایەتی بەر لەوەی فەرمان بە فریشتەکان بکات سووژدە بەرن بۆ ئادەم ئەوی دروستکرد بە شێوەیەکی نەفس و نیگار و روالەت و ئاقڵمەند.

پێش ئەوەی بچێتە لاشەکان، لاشەکانیش لەو ڕۆژەدا خۆڵ و ئاوبوون، پاشان چۆنی ویست ئاوا جێگیری کرد، ئەویش ئەو بەرزەخەیە کەوا ڕۆحەکان لەکاتی مردندا بۆ لای دەگەڕێتەوە، بەڵام هێشتاش کۆمەڵ بە کۆمەڵ ڕۆحەکان دەنێرێت و فووی دەکات بەو لاشانەی لە مەنی دایك دەبن کەوا دەڵێت: لە ڕاستیدا ڕۆحەکان لاشەکان هەڵیان دەگرێت بۆ ئەو مەبەستەی یەکتر بناسن و یاخود رقیان لە یەکتر بێت، و ئەم ڕۆحەش زانیار و لێزانە لە جیاکردنەوەیان جا خوای گەورە لە دونیا تاقیان دەکاتەوە هەروەك بیەوێت، پاشان دەیانمرێنێت، ئینجا دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی بەرزەخ کەوا پێغەمبەر(ﷺ) لەشەوڕەوکەیدا لەلا ئاسمانی دونیادا ڕۆحی شادمان و خۆشگوزەرانەکانی لەلای دەستەڕاستی ئادەم بینی، و ڕۆحی خاوەن تاوانەکانیشی لەلای دەستە چەپی بینی، وە ڕۆحی پێغەمبەران و شەهیدەکانیش لەبەهەشتدان.

إبن حزم دەڵێت: ئەمەش قەولی هەموو ئەهلی ئیسلامە دەڵێت: ئەمەش فەرموودەی خوای گەورە و میهرەبانە: ﴿فَأَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ * وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ *وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ * أُوْلَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ * فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ * ثُلَّةٌ مِّنَ الأَوَّلِينَ * وَقَلِيلٌ مِّنَ الْآخِرِينَ﴾(الواقعه:٨-١٤).

واتە: (دەستەی ڕاستییان دەردەکەون، جا چووزانی ئەوانە لە چ خۆشیەکدان،

هەروەها دەستەی چەپ و لار و دێرەکانیشن ئای ئەو شوومانە لە چ سەرگەردانیەکدان؟!، دەستەی سێهەم پێشکەوتووەکانن، ئەوانەن کە پێشکەوتوون لە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوادا، ئا ئەوانە نزیك کراوەی بارەگای پەروەدگاریانن، لە باخەکانی بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتدان، دەستەیەکی زۆریان لەوانەن کە زووچوون بە دەم بانگەوازی خواوە، دەستەیەکی کەمیش لەوانەن کە دواتر بە شوێن ئەواندا ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر).

هەروەها دەفەرموویّت: ﴿فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ * فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ﴾ (الواقعە: ٨٨-٨٩).

واتە: (جا ئەگەر ئەو کەسەی کە لەسەرەمەرگدایە لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمە بێت، ئەوە ئیتر خۆش و کامەرانی و ئاسوودەییە بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەت چاوەڕێیەتی).

هێشتا رۆحەکان لەوێ دەبن تاوەکو ژمارەی رۆحەکان هەمووی تەواو دەبێت بە فووکردنی لەلاشەکاندا، پاشان دەگەڕێندرێنەوە بۆ بەرزەخ، جا قیامەت هەڵدەستێت، پاشان خوای گەورە دووبارە رۆحەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ لاشەکانی، ئەمەش ژیانی دووەمە، بوونەوەرەکان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت، تیپێك لە بەهەشتدا دەبن و تیپێکیش لە دۆزەخدا دەبێت، بە نەمری تێیدا دەمیننەوە(١٨٦).

ئەبو عومەر کوڕی عەبدولبەڕ دەڵێت: رۆحی شەهیدەکان لە بەهەشتدان، و رۆحی ئیماندارنیش لەسەر گۆڕەپانی گۆڕەکانیانن.

ابن المبارك دەڵێت: ابن جریج بۆی گێڕاوەتەوە، ئەویش لە مجاهد، ئەو لە بەهەشتدا نییە، بەڵکو لە بەرووبوومەکەی دەخۆن و بۆنە خۆشەکەی بۆن دەکەن.

معاویە کوڕی صالح دەڵێت: سەعید کوڕی سوید گێڕایەوە: کەوا پرسیاری کرد لە ابن شهاب لە بارەی رۆحی ئیمانداران، فەرمووی: پێیان راگەیاندووم کەوا رۆحی شەهیدەکان وەك باڵندەیەکی سەوز وایە بە عەرش هەڵواسراوە، هاتووچۆ دەکات بەناو باخەکانی بەهەشت، هەموو رۆژێ زاتی خواکەی دێتە لای و سەلامی لێ دەکات(١٨٧).

ابو عمر کوڕی عبدالبرّ دەڵێت: لە شەرحێکی حەدیسی ابن عمردا هاتووە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە مرد هەموو بەیانییان و ئێواران جێگاکەی پێ نیشان دەدرێت،

(١٨٦) الفصل في الملل: ٢/٧٠

(١٨٧) شرح الصدور: ٣٠٤

ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێت ئەوا لە ئـەهلی بەهـشتی پـێ نیـشان دەدرێـت، وە ئەگەر لە ئەهلی ئاگریش بێت پێی دەڵێن: ئەوە جێگاکەی تۆیە تاوەکو خوای گەورە لە رۆژی قیامەت زیندووت دەکاتەوە، وتی: بێگومان بۆی دەردەکەوێت لە چـوونی بۆ رۆحەکان لەناو گۆڕدا، ئەمەش راسترە لە وەی رۆحـەکان بـۆ لای دەچـن، خـوای گەورەش زاناترە، چونکە حەدیسـەکان بەم شێوەیە جوانتر هاتووە.

دەڵێت: ماناکەی لەلای منە نە رۆحەکە لەسەر دەوروپشتی گۆڕەکەی دەبێت، نە خووی پێوە دەگرێت و نەلێشی جیا دەبێتەوە، هەروەك مالك رحمه الله دەڵێـت: پێمـان راگەیاندراوە کەوا رۆحەکان پشوو دەدەن هەر چۆنییان بووێت.

وتی: مجاهد دەگێڕێتەوە و دەڵێت: رۆحەکان لەسەر گۆڕەیان و دەوروپشتی گۆڕەکانت بۆ ماوەی حەوت لە رۆژی بەخاك سپاردنی مردووەکە لێی جیا نابێتـەوە وە خـوای گەورەش زاناترە.

تیپێك دەڵێت: رۆحەکە لەپاش مردندا جێگیر دەبێـت و دەچـێتە لاشـەیەك کـە گونجاو بێت لەگەڵ رەوشت و سیفەتەکەی کـەوا لـە ژیـانی دونیـای هـەیبووە، جـا هەموو رۆحێك دەچێتە لاشەی گیانلەبەرێك کە پێکهاتە بێت لەگـەڵ ئـەو رۆحانـە، جا دڵ و دەروونی دڕندە دەچێت بـۆ لاشـەی گیانلەبـەرە دڕنـدەکان، رۆحـە سـەگ ئاساکان دەچـێتە لاشـەی سـەگەکان، و رۆحـە بـێ تاوانـەکانیش دەچـێتە لاشـەی گیانلەبەرە ماڵیەکان و بێ زیانەکان، و رۆحە سوك و ریسوا و نزمەکانیش دەچـێتە لاشەی مار و مێر و جڕ و جانەوەرەکان، ئەمەش وتەی ئەو کەسانەی کە ئینکـاری رۆژی زیندووبوونەوە دەکەن، ئەمەش وتەیەکە لە دەرەوەی وتەکانی ئەهلی ئیسلام.

❊ ❊ ❊



## كێیە وتوویەتی: رۆح لە بەهەشتدایە

جـا ئـەوەی دەڵێـت: رۆحـەكان لـە بەهەشـتدایە، بیـانوو دەهێنێتـەوە بـەو فەرموودەیەی خوای گـەورە:﴿فَأَمَّـا إِن كَـانَ مِـنَ الْمُقَـرَّبِينَ ۞ فَـرَوْحٌ وَرَيْحَـانٌ وَجَنَّـةُ نَعِيمٍ﴾(الواقعە:٨٨-٨٩).

واتە: (جا ئەگەر ئەو كەسەی كە لەسەرەمەرگدایە لە نزیكان و خۆشەویستانی ئێمە بێت، ئەوە ئیتر خۆش و كامەرانی و ئاسوودەییە بەهەشتی پڕ لـە نـاز و نیعمـەت چاوەڕێیەتی).

ئەمـەش خـوای پـاك و بێگـەرد و باسـی كـردووە لەوكاتـەی رۆح لـە لاشـە دەردەچێت. رۆحەكانیش دابەش كراوە بۆ سێ بەش:

(الْمُقَرَّبِينَ) راگەیاندراوە كە ئەو رۆحە لە بەهەشتی پڕ لە ناز و نیعمەتە.

(وأصحاب اليمين) بە ئیسلام حوكمی لەسەر دراوە كەوا ئەو رۆحە سەلامەتی لـە سزادان بۆ زامن و دەستەبەركراوە.

(ومكذبة ضالة) راگەیاندراوە كە ئـەو رۆحـە لـە خـوارەوەی ئـاگردا و دەگاتـە دۆزەخ، دەڵێن: ئەمەش یەكسەر لە دوای جیابوونەوی رۆح لـە لاشـە روودەدات، و خوای گەورە لە یەكەم سوڕەتدا باسی حاڵی ئەوانـە دەكـات لـە رۆژی قیامەتـدا و باسی بارودۆخیان دەكات لە پاش مردن و پاش زیندووبوونەوە، بیانوو دەهێننـەوە بەو فەرموودەیە: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ۞ ارْجِعِي إِلَـى رَبِّـكِ رَاضِـيَةً مَّرْضِـيَّةً ۞ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ۞ وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ (الفجر: ٢٧-٣٠).

واتە: (شایانی باسە بە ئیمانداری سەرفراز لە سەرەمەرگدا دەوترێت، ئەی خـاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی ئەی ئادەمیزای ژیر و هۆشمەند كە لە تەمەنی كۆتـایی دونیـادا پـەروەردگارت ناسـی و بـە جـوانی دەتپەرسـت، بگـەڕێرەوە بـۆ لای

پەروەردگارت کە تۆ لەو رازیت و ئەویش لە تۆ رازییە، دەبچۆرە ریزی بەندە چاکە نازدار و بەرێزەکانمەوە، بچۆرە بەهەشتە خۆشە رازاوەکەمەوە).

یەکێکی دیکە لەسەحابە شوێنکەوتوان: لەوبارەیەوە دەڵێت، لە کاتی دەرچوونیەتی لە دونیادا، فریشتە لەوەوە مژدەی پێ دەدات، و ئەم وتەیەش بە دوور ناخاتەوە کە دەڵێت: دەوترێت لە دوارۆژدا بۆی هەیە، وە دوترێت: لەکاتی مردن و لە کاتی زیندووبوونەوەدا بۆی هەیە وە ئەمەش لە مژدە پێدانەکانە کەوا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ (فصلت: ٣٠).

واتە: (ئەوانەی بەراستی وتیان: پەروەردگارمان (الله)یە لەوەودوا بەردەوام پابەندی ئەو رێبازە راستەبوون، ئەوە لەسەرەمەرگدا دەستە دەستە فریشتە دادەبەزن بۆ لایان، پێیان دەڵێن: هیچ ترس و بیمێکتان نەبێت لە داهاتوو، هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبێت بۆ رابردوو، مژدەتان لێ بێت بەو بەهەشتەی کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێ دەدرا).

ئەو دابەزینەش دەبێت لە کاتی مردن بێت، و دەبێت لە ناو گۆڕدا بێت، دەبێت لەکاتی زیندوو بوونەوە بێت، یەکەم موژدەی رۆژی کۆتاییە لەکاتی مردندا.

وە لە حەدیسێکی البرّاء کوڕی عازب باسکراوە کەوا فریشتەکە دەڵێت: بە رۆحەکە دەوترێت لەکاتی گیانکێشاندا، مژدەت لێبێت لە تۆ رۆح و رەیحان، ئەمەش لە رەیحانی بەهەشتە.

لە (الموطأ) بەڵگە دەهێننەوە بەوەی مالیك ریوایەتی کردووە، ئیبن شەهاب دەگێڕێتەوە ئەویش لە عەبدولرەحمان کوڕی کەعب کوڕی مالیك، کە باوکی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إنما نسمة المؤمن طائر يتعلق في الشجر الجنّة حتى يرجعه الله إلى جسده يوم يبعثه) [188].

---

([188]) الموطأ:(١/٢٤٠).

واته: (له راستیدا رۆحی ئیماندار باڵندەیەکە لـە بـەروبوومی درەختـی بەهەشـت دەخوات تاوەکو خوای گەورە رۆژی زیندووبوونـەوەی رۆحەکـەی دەگەڕێنێتـەوە بـۆ لاشەکەی).

ئەبو عومەر لە ریوایەتی مالیکدا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئـەو ئاگادارکردنـەوە و لێکدانەوەیەکە کەوا زەهری گوێی لێ بوو لـەو حەدیسـە لـە عەبـدولرەحمان کـوڕی کەعب کوڕی مالیك، هەروەها یونس ریوایەتی کردووە لە زەهری دەڵێت: گـوێم لـە عەبدولرەحمان کوڕی کەعب کوڕی مالیـك بـوو لـە بـاوکی دەگێڕێتـەوە، هـەروەها ئەوزاعیش ریوایەتی کردووە لە زەهری کە دەڵێت عەبدولرەحمان کوڕی کـەعب بـۆ منی گێڕاوەتەوە.

محەمەد کـوڕی یـەحیا (الـذهلي) ئـەم حەدیـسەی بەرزکردۆتـەوە بـەوەی کـەوا شەهیب کوڕی ئەبی حەمزە، محەمەد کوڕی برای زەهری وە صالح کوڕی کیسان لـە زەهری ریوایەتیان کردووە، ئەویش لە عەبدولرەحمان کوڕی عەبدوڵلا کـوڕی کـەعب کوڕی مالیك، ئەویش لە کەعبی باپیرەی، لێرەدا پچڕاوە.

ئەبو عومەر دەڵێت: مالیك و یونس کوڕی یەزید وە ئـەوزاعی و حـارس کـوڕی فوزەیل رێككەوتوون ریوایەت کردنی ئەو حەدیسە کەوا لە زەهرییـەوە گێڕاوەتـەوە ئەویش لە عەبدولرەحمان کوڕی کـەعب کـوڕی مالیـك، ئـەویش لـە باوکییـەوە وە ترمزی و جگە لە ئەویش بە راستییان داناوە [189].

ئەبو عومەر دەڵێت: بەڵام فەرموودەی (نسمة المؤمن)، (نـسمة) بـە مانـای رۆح دێت کەوا هـەمان حەدیـسی پێغەمبـەر(ﷺ) بەڵگەیـە لەسـەری، تـاوەکو رۆژی زیندووبوونەوەی خوای گەورە رۆحەکەی دەگەڕێنێتـەوە بـۆ لاشـەکەی، وە دەڵێـت: (نسمە) رۆح و دەروون و لاشـەیە، بنـچینەی ئـەو وتەیـەش (النـسمة) هـەر خـۆی ئادەمیزادەکەیە، وە دەڵێت لەوانەیە بەرۆح بڵێن (نسمة).

---

([189]) سنن الترمذي: (١٦٤١).

-خوای گەورەش زاناترە- چونکە ژیانی ئادەمیزدا بە رۆحەکەوەیە، ئەگەر لێی جیا بووەوە نامێنێت یاخود دەبێتە نەبوون، بەڵگەش لەسەر نسمەی ئادەمیزدا ئەو فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ): (من أعتق نسمة مؤمنة)[190].

وە شاعیر دەڵێت:

بأعظم منه تقًى في الحساب *** إذا النَسماتُ نَفَضْنَ الغُبارا

واتە: ئەو کاتەی لە رۆژی قیامەتدا خەڵکی لە گۆڕەکانیاندا زیندووبوونەوەە وە خەلیل کوڕی ئەحمەد دەڵێت: دڵ و دەروونی ئادەمیزاد و نەسیمی رۆحیشە، نەسیمیش کزەبایە وە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (تعلّق في شَجرة الجنّة).

لەم حەدیسەدا وشەی (تعلّق) بە فەتحەی ((لام)) ریوایەت کراوە ئەوا ماناکەی زیاترە. وە ریوایەتیش کراوە بە زەممەی (لام) یەك مانای هەیە ئەویش: خۆراك و لەوەڕە، دەڵێت: رۆحەکە لە بەروبوومی بەهەشت دەخوات و لە نێوان درەختەکاندا پشوو دەدات وە وشەی (العلوقه و العلاق و العلوق) خۆراك و لەوەڕ و پشوودانە، عەرەب دەڵێت: ما ذاق اليوم علوقاً. واتە : ئەمرۆ خواردنی تام نەکرد.

وە رەبیع ابی زیاد لە وەسفی ئەسپدا دەڵێت:

وَمجنّباتِ ما يذقْنَ علوقةً *** يَمصَعْنَ بالمُهَراتِ والأمْهَارِ

وە أعشی دەڵێت:

وفلاةٍ كأنّها ظَهرُ تُرْسٍ *** لَيس فيها إلاّ الرجيعَ عَلاقُ

دەڵێت: زاناکان لە مانای ئەو حەدیسەدا جیاواز و ناکۆکن، جا هەندێك لەوان دەڵێن: رۆحی ئیمانداران لە بەهەشتدایە لەلای زاتی خودا ئەگەر شەهیدەکان بن یاخود جگە لە شەهیدەکان، ئەگەر لەبەر دەرگای بەهەشت بەند نەکرابن بە تاوانێکی گەورە یاخود قەرزاری، وە بە خودای خۆیان دەگەن بە لێخۆشبوون و بەزەیی هاتوە بەوان.

---

(190) كنز العمال (29582)

دەڵێت: هەندێك بیانوو دەهێننەوە بەوەی ئەو حەدیسە تایبەت نەكراوە بە شەهید یاخود جگە لە شەهید.

هەروەها دیسان بیانوو دەهێننەوە بەو ریوایەت كراوە لە ئەبی هورەیرە: كەوا رۆحی ئیماندار و بێتاوانان لە (علیین) لە ئاسمانە هەر بەرزەكانە، وە رۆحی كافرەكانیش لە (سجین)ە لە هەرە خواردوەی زەوی، وە عەبدوڵلای كوڕی عومەریش وەك ئەمە دەگێڕێتەوە، ئەبو عومەر دەڵێت: ئەمە وتەیە لەسوننەدا بەرهەڵستكاری و دژایەتی دەكرێ مادام هیچ پاڵنەرێك نیە لە دروستی گواستنەوەكەیدا، ئەمەش فەرموودەكەی پێغەمبەرﷺ:(إذا مات أحدُكُمْ عرض عليهِ مقعده بالغداة والعشّي وإن كان من أهل الجنّة فمن أهل الجنّة، وأن كان من أهل النّار فمن أهل النّار، يقال لهُ: هذا مقعدك حتى يبعثك الله إليه يوم القيامة)[191].

هەندێكی دیكە دەڵێت: بەڵكو ئەو حەدیسە ماناكەی تەنها لە شەهیدەكانە بەبێ كەسانی دیكە، چونكە قورئان و سوننەت بەڵگەن لەسەر ئەمەیان، بەڵام لە قورئاندا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ * فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ﴾(آل عمران: ١٦٩-١٧٠).

واتە: (هەرگیز وا مەزانن و وادامەنێن ئەوانەی لە پێناوی خوا وا شەهید بوون و كوژران مردوون نەخێر وانیە بەڵكو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگارییان لە رزق و رۆزی هەمە جۆر و تایبەت بەهرەوەرن، زۆر دڵخۆش و شادمانن بەو بەخشش و زیادە فەزڵەی كە خوا پێی بەخشیوون).

بەڵام لە نیشانە و پیاو چاكاندا باسی حەدیسی ئەبی سەعید خودری (رەزای خوای لێ بێ) دەكات لە رێگای بەقی بن مخلد بەرزكراوەتەوە: (الشهداء يغدّون ويروحون ثم يكون مأواهم إلى قناديل معلقة بالعرش، فيقول لهم الرّب تبارك

---

[191] مسلم (٧١٤١).

وتعالى: هل تعلمون كرامة أفضل من كرامة أكرمتموها؟ فيقولون: لا، غير أن وددن أنّك أعدت أرواحنا في أجساعنا حتى نقاتل مرة أخرى، نقتل في سبيلك)[١٩٢].

واته: (شەهیدەکان دێن و دەچن پاشان رۆحەکانیان لەناو ئەو چرایانە جێگیر دەبێت کە بە عەرشی خوادا هەڵواسراوە، جا خودای گەورە و میهرەبان پێیان دەڵێت: ئایا دەزانن رێزێکی باشتر هەیە لەو رێزەی کەوا من لە ئێوەم ناوە؟ جا دەڵێن: نەخێر جگە لەوەی ئاواتە خوازین رۆحەکانمان بگەڕێنیتەوە لاشەکانمان تاوەکو جارێکی دیکە شەر بکەین ، ئینجا لە پێناوی تۆ بکوژرێین و شەهید بکرێین).

لە هنادەوە ریوایەت کراوە ئەویش لە ئیسماعیل بن المختار ئەویش لە عەتیە گێڕاویەتییەوە.

پاشان حەدیسەکەی ئیبن و عەبباس گێڕایەوە (رەزای خوای لێ بێ) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لما أصيب أخوانكم جعل الله أرواحهم في أجواف الطير خضر ترد أنهار الجنّة، وتأكل ثمارها، وتأوي إلى قناديل من ذهب مدلاة في ظل العرش، فلما وجدوا طيب مأكلهم ومشربهم ومقيلهم قالو: من يبلغ إخواننا إنّا أحياء في الجنّة نرزق لئلا ينكلوا عن الحرب ولا يزهدوا في الجهاد؟ قال : فقال عزوجل: أنا أبلغهم عنكم، فأنزل الله تعالى: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ (آل عمران: ١٩٦).

واته: (کاتێك براکانتان لە رۆژی جەنگی ئوحد شەهید بوون خوای گەورە رۆحەکانیانی لەناو سکی باڵندەیەکی سەوز دانا و بە رووباری بەهەشتدا گوزەر دەکەن، وە لەبەروبوومەکەی دەخۆن، و دەڕۆن بۆ ناو ئەو چرایانەی لە زێڕ دروست کراون و هەڵواسراون لە ژێر سێبەری عەرشدا، جا کاتێك ئەو خواردن و خواردنەوە و کەل و پەلە خۆشانەیان بینی دەڵێت: کێیە بە براکانمان رادەگەیەنێت ئێمە لە

---

([١٩٢]) شرح الصدور: ٣٠٥

بەهەشتدا زیندووین و رزق و رۆزیمان بۆ فەراهەم کراوە بۆ ئەوەی واز لە شەڕکردن نەهێنن و پشتی خۆیان تێ نەکەن و کەمتەرخەم نەبن لە جیهاد کردندا؟

وتی: (جا خودای عزوجل فەرمووی: من لە جیاتی ئێوە پێیان رادەگەیەنم، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند...).(ولا تَحسبنَّ الذين قُتِلوا....)(ال عمران:١٦٩)

وە حەدیسەکە لە مەسنەدی ئەبو ئەحمەد و ئەبو داود داهاتووە[١٩٣].

پاشان الاعمش باسی حەدیسەکان دەکات و لە عبدالله بن حرّه دەگێڕێتەوە ئەویش لە مسدوق وتی: پرسیار کرا لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لەبارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾(آل عمران: ١٩٦).

وتی: ئێمە پرسیارمان لە پێغەمبەر کرد و فەرمووی: (أرواحهُم في جوف الطير خضر تسرح في الجنة في أيها شاءت، ثمّ تأوى الى تلك القناديل، فأطلع إليهم ربّكَ إطلاعة، فقال: هَلْ تشتهون شيئاً؟ قالو: وأي شئ نشتهي ونحن نسرح في الجنّة حيث شئنا؟ ففعل بهم ذلك ثلاث مرات، فلما راوا أنهم لم يتركوا من أن يسألوا قالو: يا رب نريد أن ترد أرواحنا في أجسادنا حت نقتل في سبيلك مرة أخرى، فلما رأي أن ليس لهم حاجة تركوا) ئەو حەدیسە لە سەحیحەکەی موسلیم داهاتووە[١٩٤].

واتە: (رۆحەکانیان لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە لە بەهەشتدا پشوو دەدات لە هەر کوێیەك بیەوێت پاشان دەچێتە ناو ئەو چرایانە، جا خودای گەورە پێیان رادەگەیەنێت و ئاگاداریان دەکاتەوە، دەفەرمووێت: ئایا حەز لە شتی دیکە دەکەن؟ وتیان: حەز لە چ شتێکی دیکە بکەین وا ئێمە لە بەهەشتدا پشوو دەدەین بەهەر شێوێنێك بمانەوێت؟ ئەم وتەیەی سێ جار دووبارەکردەوە، جا کە زانیان

(١٩٣) مسند أحمد: ١/٢٦٦ وە سنن أبي داود (٢٥٢٠)

(١٩٤) مسلم: ١٨٨٧).

خوای گەورە وازییان لێ ناهێنێت لە پرسیارکردنە وتیان: ئەی خودایە دەمانـەوێت ڕۆحەکانمان بگەڕێنیتەوە لاشەکانمان تاوەکو لەپێناوی تۆدا بجەنگین جارێکی دیکـە. جا کە بینی پێویستی پێیان نیە وازی لێ هێنان)

لە سەحیحی بوخاریا لە ئەنەس گێڕاویەتیەوە، کەوا دایکـی ڕەبیـع کـچی البّـرا کە دەکاتە دایکی حارسە کوڕی سوراقە هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، ئایـا قسەم بۆ ناکەیت لە بارەی حارسە؟ ئەو لە ڕۆژی بـەدر کـوژرا بـوو کـەوا تیرێکـی نامۆ پێکای، ئەگەر لە بەهەشتدا بێت ئەوا سـەبر دەگـرم و ئەگـەر لـە شـوێنێکی دیکە بێت ئەوا لە گریاندا ناکەوم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (یا أُم حارثـةَ، إنهـا جنان وإن إبنك أصاب الفردوسَ الأعلى)

پاشـان لـەرێگای بقـی کـوڕی مەخلـەد گێڕایـەوە: کـە دەڵێـت یـەحیا کـوڕی عەبدولحەمید بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە ئیبن عیینە ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی یەزید، گوێی لە ئیبن و عەبباس بـوو دەیـووت: ڕۆحـی شـەهیدەکان لـەناو سـکی باڵندەی سەوزدایە هاتۆچۆ دەکات و لە بەروبوومی بەهەشت دەخوات.

پاشان لە معمرەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لـە قـەتادە وتـی: ڕۆحـی شـەهیدەکان لـە شێوەی باڵندەیەکی سپی دایە لە بەروبوومی بەهەشت دەخوات [١٩٥].

لە ڕێگای ئەبی عاصم النبیل دەگێڕنەوە، ئەویش لە ثـور کوڕی یەزیـد، ئـەویش لە خالیدی کوڕی معدان، ئەویش لە عەبدوڵڵای کـوڕی عومـەر و دەڵێـت: ڕۆحـی شەهیدەکان لە شێوەی باڵندەیەکی وەك ڕیشۆڵە وان یەکتر دەناسن و لە بـەروبوومی بەهەشت ڕزق و ڕۆزییان دەردێتێ[١٩٦].

ئـەبو عومـەر دەڵێـت: ئـەو هـەموو نیـشانانە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی ئـەوان شەهیدەکانن بێجگە لە کەسی دیکە، لە هەندێکییان: لە شـێوەی باڵندەیـە، و لـە

---

(١٩٥) مصنف عبدالرزاق: ٥/٢٦٤

(١٩٦) شرح الصدور: ٣٠٨

هەندێکی دیکەیان، لە ناو سکی باڵندەدان، و لە هەندێکی دیکەشیان وەك باڵندەیەکی سەوزە، دەڵێت: ئەوەی هاوشێوەیە لەلای من دەبێت وەك ووتەی ئەوە وابێت کە دەڵێت: وەك باڵندەیە یاخود لە شێوەی باڵندەیە بۆ هاوشێوەبوونی بۆ ئەو حەدیسەی باسکرا، لە حەدیسی کەعب کوڕی مالیك تێیدا دەڵێت: (نسمة المؤمن کطائر). واتە: (رۆحی ئیماندار وەك باڵندە وایە).

ئەیووتووە: لەنا سکی باڵندەدایە.

وتی: عیسای کوڕی یونس حەدیسی ابن منصور ریوایەت دەکات، لە الاعمش دەگێڕێتەوە ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕِ مرّە، ئەیش لە مسروق، ئەویش لە عەبدوڵڵا دەڵێت: وەك باڵندەیەکی سەوزە.

وتم : ئەوەی لە سەحیحی موسلمدا هاتووە: (لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە) ئەبو عومەر دەڵێ: لەسەر ئەو لێکدانەوە و راڤەکردنە وەك ئەوی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (بەڵکو رۆحی ئیماندار لەناو شەهیدەکاندا باڵندەیەکە لە دار و درەختی بەهەشت دەخوات).

وتم: هیچ دژکاریەك نیە لەنێوان ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ): (ئەگەر هەر کەسێك لە ئێوە مرد بەیانیان و ئێواران شوێنەکەی پێ نیشان دەدرێت، جا ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بێت، ئەوا لە ئەهلی بەهەشت و ئەگەر لە ئەهلی ئاگریش بێت ئەوا لەئەهلی ئاگری پێی نیشان دەردێت).

ئەو وتار و ئاخاوتنە مردوو لەسەر جێگاکەی و شەهیدبوون وەردەگرێت، هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (رۆحی ئیماندار باڵندەیەکە لە بەروبوومی درەختی بەهەشت دەخوات). ئەمە شەهید و جگە لە شەهیدیش لەخۆ دەگرێت، لەگەڵ بوونی پیشاندانی شوێنەکەی بەیانیان و ئێواران رۆحەکەی بەناو رووبارەکانی بەهەشت گوزەر دەکات و لە بەروبوومەکەی دەخوات.

بەڵام شوێنە تایبەتیەکە و ئەو خانووەی بۆتە ئامادەکراوە لەوانەیە ڕۆژی قیامەت بچێتە ناوی، و بەڵگەش لەسەری کەوا جێگای شەهیدەکان و خانو و کۆشکەکانیان کە بۆیان ئامادەکراوە هەرگیز ئەو چرایانە نین کە ڕۆحەکانیان لەبەرزەخدا بۆیان دەچن، جا ئەوانە شوێن مەنزڵگای خۆیان لە بەهەشت دەبینن، بەڵکو لەو چرایانە جێگیر دەبن کە بە عەرشدا هەڵواسراوە، جا چوونە ناوی تەواو و بێ کەم و کورتی ڕەنگە تەنها ڕۆژی قیامەت بێ، وە چوونە ناوی ڕۆحەکان بۆ بەهەشت لە بەرزەخدا ئەوە شتێکی دیکەیە.

ئەوەی جێگای سەرنجیشە خاوەن نەگبەتی و کەساسەکان هەموو بەیانیان و ئێواران ڕۆحەکانیان لەسەر ئاگر پێ نیشان دەردێت، جا ئەگەر ڕۆژی قیامەت چوونە ئەو شوێنە و جێگایەی کەوا لە بەرزەخدا پێیان نیشان دەدرا، ئەوا نیعمەت و خۆشگوزەرانی ڕۆحەکانیان لە بەهەشتدا شتێکی دیکەیە، ئەو ڕۆحە کە لەگەڵ لاشەکاندا نیعمەت و خۆش دەبینن ئەمەش شتێکی دیکەیە.

جا رزق و ڕۆزی پێدانی ڕۆح لە بەهەشت لە جیهانی بەرزەخدا ئەو خواردن و خواردنەوەیە نییە کە لەگەڵ لاشەکەیدا لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا دەیدرێتێ، لەبەر ئەوەیە فەرموویەتی: (لە بەروبوومی بەهەشت دەخوات). و بە تەواوی خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و رابواردن و کەیف و خۆشی جا ئەگەر ڕۆحەکە لە ڕۆژی قیامەت بۆ لاشەکەی گەڕایەوە، ئەوا دەردەکەوێت ئەو گوتار و ئاخاوتنە هاو دژ و بەرهەڵستکار نییە لە سوننەدا، بەڵکو یارمەتی سوننەت دەدات و لەگەڵی ڕێك دەکەوێت.

ئایا نابینیت ئەو حوکمەی تایبەتە بە شەهیدەکان پەیوەستە بە وەسفی شەهید بوون؟

هەروەك ئەو حەدیسەی مقدام کوڕی معد یکرب لە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە: (للشهيد عند الله ست خصال: يغفر لهُ في أول دمه، ويرى مقعده من

الجنّة ويحلى حلة الإيمان، ويزوج من الحوار العين، ويجار من عذاب القبر ويأمن من الفزع الأكبر، ويوضع على رأسه تاج الوقار الياقوتة منه خير من الدنيا وما فيها، ويتزوج إثنتين وسبعين من الحور العين، ويشفع في سبعين إنساناً من أقاربِه) [(١٩٧)].

واته: (شەهید لەلای خوا شەش شتی هەیە: لە یەکەم دڵۆپ لە خوێنی کە دەرژێت خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێت، جێگەی خۆی لە بەهەشت دەبینێت و بە خشڵی باوەڕ دەڕازێندرێتەوە، حۆری زۆر جوانی لێ مارە دەکرێت، پارێزراو و رزگاری دەبێت لە سزای گۆڕ و دڵنیا دەبێت لە راچڵەکینی ناو گۆڕدا، تاجی زێڕینی لەسەر دەکرێت و هەر گەوهەرێکی باشترە لە دونیا و ئەوی تێدایە، وە حەفتا و دوو لە حۆری بەهەشتی لێ مارە دەکرێت، تکا بۆ حەفتا لە کەس لە دۆست و نزیکانی دەکات).

جا ئەگەر ئەو حەدیسە تایبەت بێت بە شەهید فەرموویەتی (بۆ شەهید) نەیووتووە: بۆ ئیماندار، هەروەها لەو حەدیسە کە قەیس الجذامي گێڕاویەتیەوە (يعطي الشهيد ست خصال) [(١٩٨)] هەروەها هەموو ئەو حەدیس و دەقانەی تێیدا پەیوەست کراوە بە پاداشتی شەهید.

بەڵام ئەوەی پەیوەست کراوە بە پاداشتی ئیماندار، ئەو هەموو ئیماندارێك پلەی شەهیدی هەیە ئەگەر شەهیدیش نەبێت.

بەڵام ئەو دەق و نیشانانەی باس لە رزق و رۆزی شەهیدەکان دەکات، و بوونی رۆحەکانیان لە بەهەشت جا هەموو ئەمانە حەق و رەوان و ئەمەش بەڵگە نیە لەسەر نەچوونە ژوورەوەی رۆحی ئیمانداران بۆ بەهەشت، نەخاسمە راستگۆیان باشترن لە شەهیدەکان بەبێ ناکۆکی و جیاوازی لە نێو خەڵکدا، جا دەڵێین: بۆ

---

(١٩٧) سنن الترمذي: (١٦٦٣).

(١٩٨) مسند أحمد: (٤/٢٠٠).

ئەوانە ئەوەی کەوا دەڵێن لەبارەی رۆحی راستگۆیان ئایا ئەو رۆحە لە بەهەشتە یاخود نەخێر؟

ئەگەر وتیان: ئەو رۆحانە لە بەهەشتدان، هیچ بروبیانوویەك بۆ ئەوان نیە جگە لەو ئاخاوتنە نەبێت، جا ئەوهەموو دەقانە سەلمێنراوە کەوا بەڵگە لەسەر تایبەتمەندی رۆحی شەهیدەکان نیە لەو بارەیە، وە ئەگەر وتیان لە بەهەشتدا نییە بەهۆی ئەوەی رۆحەکانیان بەند دەکرێت و دەگیرێت کەوا دەبێت رۆحی سەحابە گەورە و بەرێزەکان وەك ئەبو بەکری سدیق و ئەبی کوری کەعب و عەبدوڵڵای کوری مەسعود و ئەبو دەردائە و حوزەیفەی کوری یەمانﷺ و ئەوانەی لەوانە دەچن لە بەهەشتدانین، بەڵکو تەنها رۆحی شەهیدەکان لە بەهەشتدان و ئەمەش مەعلومە و زانراوە ئاشکراکردنی درۆو دەلەسەی ئەوانە شتێکی پێویست و ناچارییە.

بەڵگەش لەسەر ئەمە کەوا خودای پاك و بێگەرد رۆحی شەهیدەکانی لەناو سکی باڵندەیەکی سەوز داناوە، جا ئەوانە کاتێك خۆیان بەخت کرد بۆ خودای گەورە و میهرەبان تاوەکو لاشەی تێدا لەناو برد، ئینجا لە بەرزەخدا لاشەیەکی باشتر لەو لاشەیە لە دونیادا هەیانبوو بۆیان ئامادە دەکرێت تاوەکو رۆژی قیامەت، جا نیعمەت‌و خۆشییەکەی بەهۆی ئەو لاشانەوە دەبێت و تەواوکەری نیعمەت و خۆشی رۆحەکان دەبێت.

بەم هۆیەوە دڵ و دەروونی ئیماندار لە شێوەی باڵندەیەکدایە، یاخود وەك باڵندەیەکە، دڵ و دەروونی شەهیدیش لەناو سکی باڵندە دایە، جا دەربرین و مەبەستی ئەو حەدیسە (رۆحی ئیماندار باڵندەیەکە)، ئەمە گشتگیر دەبێت بۆ شەهید و ئەوانی دیکە جگە لە شەهید، پاشان شەهیدی تایبەتمەند کرد بەوەی کەوا فەرموویەتی: (رۆحی شەهید لەناو سکی باڵندە دایە).

زانراویشه ئەگەر رۆحی شەهید لەناوسنگی باڵندەدا بێت راستی فەرمووده و جا ئەمه هەر خۆی باڵندەیه و درودو حەدیسەکەش تەواوکەری یەکترن، و بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کەوا هەق و راستی لەلایەن خواوەیە.

***

## ( بۆ ئەوانەی دەڵێن: بەوەی رۆح لە بەهەشتدا نییە )

وتەی مجاهد کە دەڵێت: رۆح لە بەهەشتدا نیە، بەڵام لەبەروبوومەکەی دەخۆن و بۆنی بەهەشت دەکەن برو بیانوو بۆ ئەو وتەیە دەهێننەوە بەوەی ئیمام ئەحمەد لە مەسنەدەکەی لە حەدیسێکی ئیبن ئیسحاق ریوایەتی کردووە لە (الحرث إبن فضیل) دەگێڕێتەوە، ئەویش لە مەحمودی کوڕی لەبیر، ئەویش لە ئیبن عەبباس، دەڵێت کەوا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (الشهداء علی بارق نهر بِباب الجنّة في قبّة خضراء یخرج علیهم رزقهم من الجنّة بُکرة وعشیة) [199].

واتە: (شەهیدەکان لەسەر شەوقی رووبارێکن لەبەر دەرگای بەهەشت لە (قبّة خضراء) بەیانیان و ئێواران لە بەهەشتدا رزق و رۆزییان بۆ دێتە دەرەوە).

ئەمەش نکۆڵی ناکات لە بەهەشت بوونیان، ئەم رووبارەش لە بەهەشتدایەو رزق و رۆزیان لە بەهەشت بۆ دێتە دەرەوە، جا ئەوان لە بەهەشتدان و کەچی ناچنە ئەو شوێنانەی کە لە بەهەشتدا بۆیان ئامادە کراوە، مجاهد نکۆڵی لە هەر چوونەژوورەوەیەك دەکات لەهەر روویەکدا.

ئەبو عەبدوڵڵا کوڕی مندە دەڵێت: موسای کوڕی عوبەیدە ریوایەتی کردووە، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی یەیزد، ئەویش لە ئوم کبشەی کچی مەعمور وتی:

---

(199) مسند أحمد: ١/٢٦٦، مجمع الزوائد: ٥/٢٩٤

پێغەمبەرﷺ هاتە لامان، پرسیاری ئەو رۆحانەمان لێ کرد، ئینجا وا وەسفی کرد بە سیفەتێك ئەهلی بەیتی هێنایە گریان.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إن أرواح المؤمنين في حواصل طير خضر ترعى في الجنّة، وتأكل من ثِمارِها، وتشرب من مائها، وتأوي إلى قناديل من ذَهب تحت العرش يقولون: ربّنا الحق بِنا إخواننا، وآتنا ما وَعدتّنا، وإن أرواح الكفار في حواصل طير سود تأكل من النّار، وتشرب من النّار، وتأوي إلى حجر في النّار، يقولون: رَبّنا لا تلحق بنا إخواننا ولا تؤتنا ماوعدتنا) [٢٠٠].

واتە: (رۆحی ئیمانداران لەناو چیکلدانی باڵندەیەکی سەوزدایە لە بەهەشت دەلەوەڕێت، و لە بەروبوومەکەی دەخوات و لە ئاوەکەی دەخواتەوەو دەچێت بۆ لای ئەو چرایانەی لە زێڕ دروستکراوە لە ژێر عەرشدایە، دەڵێت: خودایە بمانگەیەنە بە براکانمان، وە ئەو بەڵێنەی بە ئێمەت دابوو پێمان ببەخشە، و رۆحی کافرەکانیش لەناو چێکلدانەی باڵندەیەکی رەشدایە لە ئاگرەکەی دەخوات و لە ئاگرەکەی دەخواتەوە، دەچێتە ناو قوڵایی ئاگرەکە، دەڵێن: خودایە مەمانگەیەنە بەبراکانمان، و ئەو پەیمانەی بە ئێمەت دابوو پێمان مەبەخشە).

تەبەرانی دەڵێت: ئەبو زرعەی دیمەشقی بۆمانی گێڕایەوە، کەوا عەبدوڵلای کوڕی صالح گێڕایەوە ئەویش لە معاویەی کوڕی صالح، ئەویش لە حەبیب وتی: پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا لەبارەی رۆحی ئیمانداران، فەرمووی: (في طير خضر تسرح في الجنّة حيث شاءت). واتە: (لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە لە بەهەشت پشوو دەدات هەرچۆنێك بیەوێت).

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوای ئەی رۆحی کافرەکان؟

فەرمووی: (محبوسة في سجين) [٢٠١].

---

(٢٠٠) شرح الصدور: ٣١٠

(٢٠١) شرح الصدور: ٣٠٧

واتە: (لە سەجین بەند کراوە)، ئەبو الشیخ ریوایەتی کردووە، لە هیشام کوڕی یونس، لە عەبدوڵڵای کوڕی صالح، وە ئەبو مەغیرە ریوایەتی کردووە، لە ئەبی بکر کوڕی مریم، ئەویش لە ضمرة کورشی جبیب.

و ئەبو عەبدوڵڵای کوڕی مندە لە حەدیسێکی عنجار باس دەکات و دەگێڕێتەوە ئەویش لە (الثوري)ن ئەویش لە ثور کوڕی یەزید، ئەویش لە خالید کوڕی معدان، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێت: (أرواح المؤمنين في طير خضر كالزرازير تأكل من ثمر الجنّة)[٢٠٢]. واتە: (ڕۆحی ئیمانداران لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە لە شێوەی ریشۆڵە وایە لە بەروبوومی بەهەشت دەخوات).

یەزید رقاشی دەگێڕێەوە لە ئەنەس و عەبدوڵڵای شامی، ئەویش لە تەمیم الداری، ئەویش لە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (إذا عرج ملك الموت بروح المؤمن إلى السّماء استقبله جبريل في سبعين ألفاً من الملائكة كل منهم يأتيه ببشارة من السّماء سوي بشارة صاحبه، فإذا انتهى به إلى العرش خرّ ساجداً فيقول: الله عزوجّل لملكوت الموت: انطلق بروح عبدي فضعه في سدر مخضود، وطلح منضود، وظل ممدود، وماء مسكوب) بكر کوڕی خیس ریوایەتی کردووە لە ضرار کوڕی عومەر و ئەویش لە یەزید وە ئەبی عەبدوڵڵا.

واتە: (لەکاتێکدا فریشتەی گیانکێشان رۆحی ئیماندار بۆ ئاسمان بەرزدەکاتەوە، حەزرەتی جوبرائیل لەگەڵ حەفتا هەزار فریشتە پێشوازی لێ دەکات و هەر یەکێك لەوانە لە ئاسماندا موژدەی پێ دەدەن، جگە لە مژدە پێدانی هاوڕیەکەی، کاتێك گەیشتە لای عەرش کڕنۆش دەبات، ئینجا خودای عزوجل بە فریشتەی گیانکێشان دەفەرمووێت: رۆحی بەندەکەم ببە و برۆ ئینجا دایبنێ لە ژێر سیبەر-سدر-ی بێ دڕکدان، هەروەها درەختی مۆزیش کە بەرهەمەکانی چین چین لەسەریەکن، لەژێر

---

(٢٠٢) شرح الصدور: ٣٠٨

سێبەری دوور و درێژ لەو باخە خۆشانەدا، تاڤگەی جوان و حەوزو نافورەی رازەوەی تێدایە).



## (ئەوانەی دەڵێن: رۆحەکان لەسەر لێوارو حەوشەی گۆڕەکانیەتی)

بەڵام وتەی ئەو کەسەی کە دەڵێت: رۆحەکان لەسەر لێوار و گۆڕەپانی گۆڕەکانیەتی، ئەو کەسەی بیەوێت یاخود مەبەستیەتی کەوا ئەوە فرمانێکی پێویستە بۆی ئەوا هەرگیز جیاوازی گۆڕەپانی گۆڕەکان ناکات، ئەوەش هەڵەیە چونکە دەقەکانی کتێب و سوننە لە زۆر رووەوە بەرپەرچ و وەڵامی ئەمە دەداتەوە کەوا هەندێکمان باسکردووە ئەگەر خوا حەز بکات هەندێکی دیکەش باس دەکەین.

ئەگەر مەبەستی لەسەر گۆڕەپان بێت بەشێوەیەکی کاتی، یەکەمیان سەربەستی کردنیەتی لەسەر گۆڕەکەیان، ئەمەش لە بارەگا و مەنزڵگایەکەیەتی، ئەمەش رەوایە، بەڵام نەوتراوە جێگیر و چەسپاو گۆڕەپانی گۆڕەکە.

جا کۆمەڵێك چوونە ناو ئەو مەزهەبە لەوانە عەبدوڵلای کوڕی عبدالبرّ بوو، لە کتێبەکەیدا لە شەرحی حەدیسێکی ئیبن و عومەر دەڵێت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە مرد لە بەیانیان و ئێوارانداشوێنەکەی پێ نیشان دەدرێت، لە راستیدا بۆی ئاشکرا دەکرێت بەوەی کەوا رۆحەکان لەناو گۆڕەکاندان، ئایا نابینیت کەوا حەدیسە ئاماژە پێکراوەکان لەسەر ئەمە موتەواتیر و جێگیرە، هەروەها ئەو حەدیسانەی باس لەسەلام کردن دەکەن لەسەر گۆڕەکان؟

وتم: حەدیسە موتەواتیرەکانی دەوێت وەك حەدیسی ئیبن و عومەر، هەروەك حەدیسی البرّا کوڕی عازب کەوا پێشتر باسکراوە کە تێیدا هاتبوو: (هذا مقعدك حتى يبعثك الله يوم القيامة) وە نموونەی حەدیسی ئەنەس: (إن العبد إذا وضع في قبره وتولى عنه أصحابُه إنهُ ليسمع قرع نعالهم) [٢٠٣].

تێیدا هاتووە: (انّهُ يرى مقعده من الجنّة والنّار، وأنه يفسح للمؤمن سبعين ذراعاً، ويضيق على الكافر). هەروەك نموونەی حەدیسی جابر : (إن هذهِ أمتي تبتلي في قبورها، فإذا دخل المؤمن قبره وتولى عنه أصحابه أتاه الملك). وە لە حەدیسێکی دیکە: (وأنه يرى مقعده من الجنّة فيقول: دعوني أبشر أهلي، فيقال له: أسكن فهذا مقعدك أبداً) هەروەك هەموو ئەو حەدیسانەی باس لەنیعمەت و ئازاری گۆڕ دەکات و باسکراوە، وەك حەدیسەکانی باس لە سەلام کردن دەکات لەسەر خاوەن گۆڕەکان، قسە کردن لەگەڵیاندا، زانینی مردووەکانی لەکاتی سەردانی کردنی زیندووەکان بۆ لایان و هەموو ئەمانە پێشتر باس کراوە.

ئەم وتە و باسەش سوننەی دروست و ڕاست بەرپەرچی دەداتەوە، ئەو نیشانانەی کەوا پاڵنەرێکی بۆی نیە، و پێشتر ئەمە باسکراوە هەموو ئەو بەڵگانەی باسکرا کەوا ڕۆحەکان لە بەهەشتدان دەقا و دەق لەلای (الرفيق الاعلى)ن هەندێك لەزاناکان (الرفيق الاعلى) بە بەهەشت وەسف دەکەن و هەندێکی دیکەش بە زاتی پەروەردگار وەسفی دەکەن.

بۆمان دەرکەوتووە کە وا پیشاندانی شوێنی مردوو لە بەهەشت یاخود لە دۆزەخ بەڵگە نییە لەسەر ئەویە ڕۆح لەناو گۆڕدایە و نەك هەموو کاتێکیش لە نەمان و ونبوون دابێت لە هەموو ڕوویەکەوە، بەڵکو ڕۆحەکە سەرپەرشتی و پەیوەندی دەکات بە گۆڕەکە و ناوەوەی گۆڕەکەدا، جا ئەم قەدەرەش وایە شوێنەکەی پێ نیشان دەدرێت، بێگومان بۆ ڕۆحیش پلە و مەبەستێکی دیکەش هەیە ئەویش لە

[٢٠٣] مسلم: (٢٨٧٠)

بەهەشتدا دەبێت لەهەر سەرەوەی (علـیین)، پەیوەنـدی دەبێـت بـە لاشـەکەی بـە جۆرێـك ئەگـەر موسـڵمانێك سـەلامی لـێ کـرد خـودای گـەورە ڕۆحەکـەی بـۆ دەگەڕێنێتەوە وەڵامی سەلامەکەی دەداتـەوە، لـەلای ڕۆحـە بـەرز و ئیمانـدارەکان دەبێت.

بەڵکو لەم بابەتەدا زۆربەی خەڵکی دەکەونە هەڵە وبە جۆرێك بڕوایان وایە کـەوا ڕۆح لە ڕەگەزێکە پەیوەست نابێتەوە بە لاشەکان ئەگـەر ڕۆحەکـە بـردرا بـۆ ئـەو شوێنەی کە شایەنیەتی، ئەمەش هەڵەیەکی دیار و ئاشکرایە، بەڵکو ڕۆح دەکرێـت لەسەر ڕووی ئاسمانەکاندا بێـت لـە هـەرە سـەرەوەی (علـین)، و دەگەڕێتـەوە بـۆ گۆڕەکەش، ئینجا وەڵامی سەلام کردنیش دەداتەوە.

زانیاریش بەو کەسە دەدات کە سـەلامی لـێ دەکـات، کەچـی لـە شـوێنەکەی خۆیەتی، و ڕۆحی پێغەمبەر(ﷺ) هەردەم لەلای (الرفیق الاعلـی)یـە، و خـودای گەورە عزوجل ڕۆحەکەی دەگەڕێنتەوە بۆ نـاو گۆڕەکـەی و وەڵامـی ئـەو کەسـەش دەداتەوە کە سەلامی لێ دەکات، و گوێی لە قسەکردنەکەیەتی.

پێغەمبەرﷺ حەزرەتی موسای بینی لە گۆڕەکەیدا هەڵساوە و نوێژ دەکات، و لەگەڵ ئەوەش لە ئاسمانی شەشـەم و حەوتەمیـشدا بـینی، دەبینیـت لـە جوولـە و گواستەوەدا وەك چاوتروکان خێرایە، کەچی پەیوەندیشی هەیە بە گۆڕەکەی.

بێگومان سەلمێنراوە کەوا ڕۆحی خەوتوو بەرزدەبێتەوە تاوەکو حەوتـەمین تەبەقـەی دەبڕێت، لە ژێر عەرشدا کڕنۆش بۆ خودای گەورە دەبات، پاش ڕۆحەکە دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی لە کەمترین ماوەدا، هـەروەها ڕۆحـی مـردووش فریـشتەکان بـەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمانەکان، لە نێو زاتی دەستەکانی خوا ڕادەوەسـتێت، کڕنۆشـی بـۆ دەبات، کاروبارەکانی بۆ ڕێك دەخەن و فریشتەکان ئەو شوێنەی پـێ نیـشان دەدەن کە لە بەهەشتدا خودای گەورە بـۆ ئامـادە کـردووە، پاشـان دەیهێننـە خـوارەوە و دەبینێت کە دەیشۆن و هەڵیدەگرن و بە خاکیشی دەسپێرن.

له حەدیسەكەی البّراء كوڕی عازب كه پێشتر باسكرا: (إن النفس يُصعْد بها حتى توقف بين يدي الله فيقول: تعالى: إكتبوا كتاب عبدي في عليين، ثم أعيده إلى الأرض، فيعاد إلى قبره وذلك في مقدار تجهيزه وتكفينه).

وه له حەدیسێكی ئیبنو عەبباس باس دەكات و بە جۆرێك دەڵێت: (فيهبطون على قدر خراغة من غسله وأكفانه فيدخلون تلك الروح بين جسده وأكفانه).

وه هەروەها ئەبو عەبدوڵلا كوڕی مندە، لە حەدیسێكی عیسی كوڕی عەبدولرەحمان باس دەكات و دەڵێت: ئیبن شەهاب بۆ ئێمەی گێڕایەوە ئەویش لە عامر كوڕی سەعید، ئەویش لە ئیسماعیل كوڕی تەڵحە كوڕی عەبدوڵلا، ئەویش لە باوكییەوە وتی: لە دارستانەكەدا ویستم بگەڕێمەوە شەوم بەسەرداهات، ئینجا چوومە لای گۆڕی عەبدوڵلای كوڕی عومەر كوڕی حەزام، جا لەناو گۆڕەكەی گوێم لە دەنگی قورئان خوێندن بوو، قورئان خوێندی وام گوێ لێ نەبېوو، ئینجا چوومە لای پێغەمبەر(ﷺ) و بۆم گێڕایەوە فەرمووی: (ذلك عبدالله ألم تعلم ان الله قبض أرواحهم فجعلها في قناديل من زبرجد وياقوت، ثم علقها وسط الجنّة، فإذا كان الليل ردت إليهم أرواحهم، فلا يزال كذلك حتى إذا طلع الفجر ردت أرواحُهم إلى مكانها الذي كانت به) [٢٠٤].

واته: (ئەو عەبدوڵلایە ئایا نازانیت كەوا خوای گەورە رۆحیانی كێشاوە لەناو چرای وای داناوە كە لە دڕو گەوهەر دروست كراوە، پاشان لە ناوەڕاستی بەهەشتدا هەڵیواسیوە، جا كاتێك شەو داهات رۆحەكانییان بۆ دەگەڕێنێتەوە، بەم جۆرە دەمێنێتەوە تاوەكو بەیانی دادێت ئینجا رۆحەكان دەگەڕێنەوە ئەو جێگایەی كەوا لەوێ بوون).

لەو حەدیسەدا خێرایی گواستنەوەی رۆحەكانیان لە عەرشەوە بۆ ناو گۆڕەكانیان، پاشان گواستنەوەی لە گۆڕەكانیان بۆ شوێنەكەی خۆی ئاشكرا دەكات، بۆ ئەمەش

(٢٠٤) شرح الصدور: ٢٥٨

مالیك و هەندێك لە پێشەوایان دەڵێن: رۆح نێردراوێکە دەروات بۆ هەر شوێنێك کە بیەوێت کەچی خەڵکی رۆحی مردوو نابینێت کە لە شوێنێکی دوور دێت بۆ لایان ئەمە کارێکە هەموو خەڵکی بەگشتی دەیزانن و گومانی تێدا ناکەن، خوای گەورەش لە هەموو کەس زاناترە.

بەڵام لەسەلام کردن لەسەر خاوەن گۆڕەکان و قسەکردن لەگەڵیاندا بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کەوا رۆحەکانیان لە بەهەشتدا نین، کە رۆحەکەشی لە ناو گۆڕەکاندایە، ئەمەش گەورەی ئەوەی نادەمە(ﷺ) کەوا رۆحەکەی لەهەر سەرەوەی (علیین)ە لەگەڵ (الرفیق الاعلی)یە لە گۆڕەکەیدا سەلامی لێ دەکرێت و وەڵامی سەلامی موسڵمانەکە دەداتەوە.

بێگومان ئەبو عومەر پەسەندی کردووە، بەوەی کەوا رۆحی شەهیدەکان لە بەهەشتدایە، لەگۆڕەکانیدا سەلامیان لێ دەکرێت هەروەك سەلام لە کەسێکی تر دەکرێت، هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات کەوا سەلامیان لێ بکەین، هەروەك سەحابەکان سەلامیان لەسەر شەهیدەکانی ئوحد کرد.

هەروەها سەلێنراوە کەوا رۆحەکانیان لە بەهەشتدان و چۆنیان بوێت پشوو دەدەن هەروەك لە پێشتر باسمان کرد، دڵتەنگ و کەم ئارام نابن کەوا رۆحەکە دەچێتەوە دەستی فریشتە بەرزەکان و پشوو دەدەن و ئارام دەگرن لە بەهەشتدا هەرچۆن بیەوێت، لە کاتێکدا سەلامی ئەو موسڵمانەی لە گۆڕەکەیدا لێی دەکات دەبیستێت وە رۆحەکەی بۆ دەگەڕێتەوە تاوەکو وەڵامی سەلامەکە دەداتەوە، بۆ رۆحیش کار و فەرمانێکی دیکەش جگە لە کار و فەرمانی جەستە.

ئەمەش جوبریلە سەڵات و سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێت کە پێغەمبەر(ﷺ) بینی شەش سەد باڵی هەبوو، لەوانە هەر دوو باڵی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای پێ داپۆشی بوو، هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) تاوەکو ئەژنۆکانی لەنێوان هەردوو ئەژنۆی وە دەستەکانی خستە سەر هەردوو رانی

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەوەشدا ئەو فریشتەیە لە هەمان کاتدا لای فریشتە بەرزەکان لەسەر رووی ئاسمانەکان بە جۆرێك کە ئەو لەوێ جێگیرە، کەچی بەو نزیکیەش خۆی لە پێغەمبەر(ﷺ) نزیك خستەوە، جا ئیمان هێنان بەوە دڵێکی پاك و بێگەردی دەوێت بۆ ئەوەی لەو زانیاریانە شارەزا بێت.

***

## (کاروباری رۆح جیاوازە بەگوێرەی رۆحەکان)

ئەوەی دەشێت کەوا بیزانیت لە پێشتردا باسمان کرد کاروباری رۆح جیاوازە بەپێی بارودۆخی رۆحەکان لە بە هێز و لاوازی، گەورەیی و بچووکی، جا بۆ رۆحی گەورە و مەزن کاروبارەکە گەورەتر دەبێت، تۆ حوکم و یاسای رۆحەکان لەدونیا دەبینیت چۆن جیاواز دەبن بە گەورەترین جیاوازی، بەگوێرەی جیابوونەوەی رۆحەکان و چۆنیەتیان و هێز و خێرایی و لەسەر هاریکاری کردنی جا بۆ رۆحێکی بێ سنوور و رەها لە شەیدا بوون بە جەستەدا پابەندبوونی و کێشە و گرفتەکانی لە هەڵس و کەوت و هێز و تێپەڕبوون و تێکۆشان و خێرایی بەرزبوونەوە بۆ لای خوای گەورە و پەیوەست بوون بەخودایە.

نەك بۆ رۆحێکی بەبڕوبیانوو ریسوا و بە دیلکراو لە پەیوەست بوون بە لاشە و کێشە و گرفتەکانی، ئەگەر وابێت، ئەوا بەندکراوە بە لاشەکەیدا، جا چۆن دەبێت ئەگەر لێ دابڕا و لێی جیابووەوە، هەموو هێزەکانی لێ کۆبووەوە، کاتێك رۆحەکە لەلاشەکە جیابووەوە ئەوا کاروبارێکی دیکەی دەکەوێتە ئەستۆ.

لە راستیدا خەونەکان موتەواتیرەن لە چین و توێژەکانی ئەوەی ئادەم لەسەر کرداری رۆحەکان پاش مردنی، کەوا ناتوانیت بیخەملێنیت لەسەر شێوەکەی

لەکاتی پەیوەندی کردنی بە لاشە لە کاتێکدا تەنها ڕۆحێك یان دوان یاخود ژمارەیەکی کەم چەندەها سوپای بەهێز تێك دەشکێنێت، و پێغەمبەر(ﷺ) چەند خەونی بینووە[205] کەوا ئەبو بەکر و عومەری لەگەڵدا بووە لە خەودا کە ڕۆحەکانیان چەندەها سەربازی کوفر و ستەمیان تێك شکاندووە، لە کاتێکدا سەرکەوتوونە بەسەر سوپا زۆر بێ شومارەکانیان لەگەڵ زۆری ژمارەیان و چەك و تەقەمەنیان بەرامبەر لاوازی و کەمی ئیمانداران.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە کە ڕۆحەکانی ئیمانداران یەکتریان خۆش دەوێت و یەکتر دەناسن و بەیەکتریش دەگەن هەرچەندە دووری نێوانیان مەودایەکی دوور و درێژ بێت، کەچی یەکتر دەناسن و خۆیان بە یەکتر دەناسێنن، هەروەك پێشتر هاوڕێی یەکتر بووبن و لەیەك نەوە و عەشیرەت دابن.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێت: ڕۆحی ئیمانداران بە یەکتر دەگەن ئەگەر ماوەی نێوانیان دوور و درێژ بێت هەرچەندە یەکێکیان هەرگیز ئەوی تر نەبینێت، وە هەندێکیشیان ئەمەیان بەرزکردۆتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)[206].

عەکرەمە و موجاهید دەڵێن: ئەگەر ئادەمیزادێك نووست دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی ڕۆحەکە بڕوات و لەبنەڕەتیشدا ڕۆحەکە لە جەستەدایە، جا دەگاتە هەر شوێنێك ئەو بیەوێت مادام لە جەستەکە هاتۆتە دەرەوە و مرۆڤەکە خەوتووە، کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ جەستەکە ئادەمیزادەکە بەئاگا دێتەوە هەروەك بەو جێگایەی تیشکی ڕۆژ وایە کەوا لە زەوی دەدات و لە بنەڕەتیشدا پەیوەستە بە ڕۆژەوە[207].

---

(٢٠٥) سەیری موسلم: (٢٢٦١)، (٢٢٦٧) بکە.

(٢٠٦) مسند أحمد: (١٧٥/٢).

(٢٠٧) شرح الصدور: ٣٥٧

عەبدوڵڵای کوری مندە لە هەندێك خاوەن زانست و زانیاری دەگێڕێتەوە دەڵێت: کەوا رۆح لە کونە لووتی مرۆڤ درێژ دەبێتەوە، لە بنچینەشدا لەجەستە دایە، جا ئەگەر رۆحەکە بەتەواوی هاتە دەرەوە ئەوا دەمرێت، هەروەك کاتێك رووناکی چرا ئەگەر لە نێوان ئەو و نێوان فتیلەکە جیا ببێتەوە، ئایا نابینیت کەوا مەڵبەندی ئاگرەکە لە فتیلەکەوەیە، وە رووناکی و تیشکەکەی ماڵەوە پڕ دەکات؟ بەم شێوەیە رۆحیش لە کونەلووتی مرۆڤ درێژ دەبێتەوە لە خەوەکەیدا تاوەکو دەچێتە ئاسمان، و لە وڵاتاندا دەسوڕێتەوەو دەگات بە رۆحی مردووەکان.



## ( ئەوانەی دەڵێن: رۆحی ئیمانداران لەلای پەروەردگارە )

ئەوەی دەڵێت: رۆحی بڕواداران لەلای خودای مەزن و دلۆڤانە، هیچ زیادەڕەوی نەکردووە، تەنها پەیڕەوی کردووە لەگەڵ وتەکانی قورئان، کەوا دەڵێت: خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ (آل عمران: ١٦٩).

واتە: (بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگارییان لە رزق و رۆزی (هەمەجۆر و تایبەت) بەهرەوەرن).

لەوانە پیاوە زانا و ژیرەکان بیانوو بەو وتەیە بهێننەوە، بەو بیانووەی: لەوەی کە محەمەدی کوڕی ئیسحاق الصغانی ریوایەتی کردووە و دەڵێت، یەحیا کوڕی ئەبی بەکر بۆ ئێمەی گێڕایەوە، ئەویش لە محەمەد کوڕی عەبدولرەحمان کوڕی ئەبی (ذئب)، ئەویش لە محەمەد کوڕی عەمرو کوڕی عطاء، ئەویش لە سەعیدی کوڕی یەسار، ئەویش لە ئەبو هورەیرە، ئەویش لە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (إنّ الميت إذا خرجت نفسه يعرج بها إلى السماء حتى ينتهى بها إلى السماء التي

فيها عز و جل، وإذا كان الرجل السوء يعرج بها إلى السّماء، فإنه لا يفتح له أبواب، فترسل من السماء فتصير الى القبر) (٢٠٨).

واته: (له کاتێکدا مردوو که رۆحەکەی دەردەچێت بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان تاکو دەیبەنە ئەو ئاسمانەی کە زاتی پەروەردگاری لێیە، وە ئەگەر پیاوە مردووەکە کەسێکی خراپ و گوناهکار بێت، رۆحەکەی بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان، دەرگای ئاسمانەکانی بۆ ناکرێتەوە، ئینجا لەو ئاسمانەوە دەنێردرێتەوە بۆ ناو گۆڕەکەی).

ئەوە ئیسنادێکە پرسیار لە راستی و دروستی ناکرێت، ئەمەش لە مەسنەدی ئەحمەد و هی دیکەدا هاتووە.

ئەبو داود الطیالیسي دەڵێت: عماد کوری سلمه بۆ ئێمەی گێڕایەوە، لە عاصم کوری بهدله، ئەویش لە ئەبی وائل، ئەویش لە موسی الاشعری، وتی: رۆحی ئیماندار بۆن خۆشتر لە بۆنی میسك دێتە دەرەوە، جا فریشتکان بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمانەکان دەڵێن: ئێوە و ئەو رۆحە بەخێر بێن، ئینجا لێیان وەردەگرن، لە دەرگایە بەرزی دەکەنەوە، کە کارە چاکەکانی لێی بەرزبۆوە، ئینجا لە ئاسمانەکاندا دەگەشێنەوە وەك ئەوەی کاتێك رۆژ هەڵدێت تاوەکو دەیبەن بۆ لای عەرش، بەڵام کاتێك کەسێکی کافر رۆحەکەی دەردەچێت رۆحەکەی دەبەن، فریشتەکان دەڵێن ئەوە چییە؟ دەڵێن: ئەوە فلانی کوری فلانە ئەو کارە و ئەو کارەی کردووە، لەبەر خراپی کارەکانی فریشتەکان دەڵێن: بەخێر نەیت، بەخێر نەیت، بیگەڕێننەوە، جا دەینێرنەوە بۆ خواردوەی زەوی بۆ ناو گۆڕەکەی.

مالکی کوری ئیبراهیم دەڵێت: داود کوری یەزید الاودی گێڕایەوە وتی: لە عامر الشعبی بینییووە:

---

(٢٠٨) مسند أحمد: ٢/٣٦٤، وە سنن ابن ماجه(٤٢٦٢).

ئەویش لە حوزەیفەی کوڕی الیمان دەڵێت کەوا رۆحەکان لەلای پەروەردگارەوە دەست بەسەرن چاوەڕوانی بەڵێنەکەی دەکات تاوەکو فووەکەی پیادە دەکات [٢٠٩].

جەریر باس دەکاتو دەگێڕێتەوە: لە شەمر کوڕی عەتیە، ئەویش هیلال کوڕی یساف وتی: ئێمە و خەڵکانێك لەلای کەعب و رەبیع کوڕی خیشم و خالد کوڕی عرعرە دانیشتبووین، ئیبنو عەبباس هات، وتی: ئەوە کوڕە مامی پێغەمبەرتانە، وتی: شوێنەکەمان فراوان کرد و جا دانیشت. ئینجا وتی: ئەی کەعب، ئەوەی لە قورئاندا هاتووە دەزانم تەنها چوارشت نەبێت، مانای ئەوانەم پێ بڵێ: سجِّين چییە؟ و علیيون چییە؟ و سدرە المتنهى چیە؟ وە مانای ئەو ئایەتە چیە؟

کە خوای گەورە بۆ ئیدریسی فەرمووە : ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَاناً عَلِيّاً﴾ (مريم: ٥٧).

وتی: (علیّون): ئەوە ئاسمانی حەوتەمە رۆحی ئیماندارەکانی تیایە، بەڵام (سجِّين) ئەوا زەوی حەوتەمی هەر خوارەوەیە، رۆحی کافرەکانیش لەژێر چاڵی ئیبلیسە، بەڵام ئەو فەرموودەیەی خودای گەورە لە بارەی ئیدریس فەرموویەتی: ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَاناً عَلِيّاً﴾. واتە: (بۆیە ئێمە رێزی زۆرمان لێگرت و پایەدار و بەرز و بڵندمان کرد لە جێگە و رێگەی تایبەتدا).

خودای میهرەبان سروشتی بۆ دەنارد و دەیفەرموو من رۆژانە بەرزو بڵندت دەکەمەوە وەك کردەوە چاکەکانی نەوەی ئادەم، فریشتە راستگۆکان قسەی لەگەڵدا دەکەن و بە فریشتەی گیانکێشان دەڵێت مردنەکەی دوابخات تاوەکو کردەوە چاکەکانی زیاد بکات، جا لە نێوان هەردوو باڵەکانی هەڵیدەگرت و بەرزی دەکاتەوە تاوەکو دەگاتە ئاسمانی چوارەم ئینجا فریشتەی گیانکێشان پێی دەگات و لە بارەی پێداویستیەکانی قسەی لەگەڵدا دەکات، بە فریشتەکە دەڵێت: ئەو لەکوێیە؟

---

(٢٠٩) شرح الصدور: ٣٣١

دەڵێت: ئەوەتا لە نێوان هەردوو باڵەکانم دایە، فریشتەی گیانکێشان دەڵێت: جێی سەرسوڕمانە من فەرمانم پێکراوە لە ئاسمانی چوارەم ڕۆحی بکێشم، جا ڕۆحی دەکێشێت.

بەڵام (سدره المنتهی)، ئەمە سیدرەیەکە لەسەر سەری ئەو فریشتانەی عەرشیان هەڵگرتووە لەوێ زانست و زانیاری دورستکراوان کۆتایی پێ دێت، پاشان هیچ کەسێك لە دوای ئەمە زانیارییەکی لە بارەیەوە نییە بۆیە ناونراوە سدره المنتهی[٢١٠].

ئیبن مندە دەڵێت: وە هیب کوڕی جەریر لە باوکییەوە ریوایەتی کردووە، و یەعقوب القمی لە شمر ریوایەتی کردووە، خالید کوڕی عەبدوڵلا کوڕی عەوا، کورشی حوشب لە قاسم کوڕی عەوف لە رەبیع کوڕی خیثم ریوایەتی کردووە، وتی لە لای کەعب دانیشتبووین، جا باسی ئەمەی کرد.

یعلی کوڕی عبید لە الاجلح دەگێڕێتەوە ئەویش لە ضحاك وتی: ئەگەر ڕۆحی بەندەیەکی ئیماندار کێشرا ئەوا بەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمانی دونیا، جا فریشتە نزیکەکان لەگەڵ دەردەچن بۆ ئاسمانی دووەم پاشان سێیەم، پاشان چوارەم، پاشان پێنجەم، پاشان شەشەم، پاشان حەوتەم، تاوەکو دەگات بە سدره المنتهی، بە ضحاکم وت: بۆچی ناونراوە سدره المنتهی؟

وتی: چونکە کۆتایی دێت لەوێ هەموو فەرمانێك لەلایەن پەروەردگارەوە دەردەچێت کە گەڕانەوەی بۆ نییە، جا دەڵێت: پەروەردگارم! بەندەکەت فلانە بێگومان خودای گەورە لە بارەی ئەو لەوان زاناترە ئینجا خودای دلۆڤان چەکێکی سەرمۆری بۆ دەنێرێت کە دڵنیای دەکاتەوە لە سزادان و ئەمەش ئەم فەرموودەیەی

---

(٢١٠) تفسیر القرطبي: ١١/ ١١٨

پەروەردگارە کە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّا إِنَّ كِتَابَ الأَبْرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ* وَمَا أَدْرَاكَ مَا عِلِّيُّونَ* كِتَابٌ مَّرْقُومٌ* يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ﴾ (المطففين: ١٨-٢١) [٢١١].

واتە: (نەخێر دەستەی سەرفرازان دوورن لەو تەنگانەیە، بەڵکو نامەی کردەوەکانیان دۆسیەی رەفتاریان دا لە شوێنە بەرز و بڵندەکانە، جا تۆ چوزانی (عليون) چییە و چۆنە، نامەیەکی (دیار و ئاشکرایە، هەر بە رواڵەتیدا دیارە کە خاوەنی سەرفراز و بەختەوەرە، مۆر کراوو لۆك کراویشە، ئەو نامەیە فریشتە نزیکە بەرێزەکانی لای خوا دەیکەنەوە و بە سەرسامی و خۆشیە سەرنجی چاکە و خواپەرستی چاکان دەدەن و شایەتی لەسەر دەدەن).

ئەم فەرموودەیەش دوورنییە لەو وتەیەی کە وتوویەتی: ئەوانە لە بەهەشتدان، چونکە بە هەشت لەلای (سدرە المنتهى)یە، وە بەهەشتیش لەلای پەروەردگارە، و خودای گەورە و میهرەبانیش هەواڵی داوە کەوا رۆحی شەهیدەکان لەلای خۆیەتی، پێغەمبەریش(ﷺ) هەواڵی داوە کەوا رۆحی شەهید و ئیمانداران لە بەهەشتدا پشوو دەدات و دەسورێنەوە هەرچۆنی بیەوێت.

***

## ( ئەوانەی دەڵێن: رۆحی ئیمانداران لە ( جابیە ) دان )

هەروەها وتەیەك هەیە دەڵێت: کەوا رۆحی ئیمانداران لە (جابیە) [٢١٢] دان و رۆحی کافرانیش لە (حەزرەمووتە) لە بەرهوت، ئەبو محەمەد کوڕی حەزم دەڵێت[٢١٣]. ئەمە وتەی رافزییەکانە وە هەروەها دەڵێت: بەڵکو کۆمەڵێك لە ئەهلی سوننە ئەمە دەڵێن.

---

([٢١١]) تفسير القرطبي: ١٩/٢٦٢

([٢١٢]) الجابيە: ناوی شوێنێکە لە نزیك دیمەشق.

([٢١٣]) الفصل في الملل: ٤/٦٩

ئەبو عەبدوڵلا بن منده دەڵێت: لە کۆمەڵێك لـە سـەحابە و تـابعین ریوایـەتی کردووە، ئەحمەد کوڕی عاصم بۆی گێڕاوەتەوە، ئەویش لە هەمام

دەڵێت: قەتادە بۆی گێڕامەوە وتی: پیاوێك لە سەعید کوڕی موسەیب گێڕایەوە، ئەویش لە عەبدوڵلای کوڕی عمرو کەوا وتوویـەتی: رۆحـی ئیمانـداران لـە جابیـە کۆدەبێتەوە، و رۆحی کافرەکانیش لە خاکی سبخە لە حەزرەمەوت کۆدەبێتەوە پێی دەڵێن: برهوت[٢١٤].

پاشان لە رێگای حماد کوڕی سلمە گێڕایەوە، ئەویش لە عبدالجلیل کوڕی عەتیە، ئەویش لە شەهر کوڕی حوشب کـەوا کـەعب، عەبـدوڵلای کـوڕی عمـروی بینـووە خەڵکی زۆر پرسیاریان لەسەر ئـەم مەسـەلەیە لێکـردووە، بـە پیـاوێکی وتـووە، پرسیاری لیّ بکە رۆحی ئیمانداران و رۆحی کافران لە کوێ دایە؟

جا پرسیاری لیّ کرد، ئینجا عەبدوڵلا وتـی: رۆحـی ئیمانـداران لـە جابیـە دان، و رۆحی کافرانیش لە بەرهووت دان.

ئیبن منده دەڵێت: ئەبو داودو کەسانێکی لە عبدالجلیل ریوایەتی کردووە، پاشان لە حەدیسێکی سوفیان گێڕایەتیەوە ئـەویش لـە فـرات القـزاز، ئـەویش لـە ئـەبی توفەیل ئەویش لە عەلی، وتی: باشترین بیر لەسەر زەوی زەمزەمە، وە خراپترین بیر لەسەر زەوی لە بەرهووت دایە لە حەزرەمەوت، باشـترین دۆڵ لەسـەر زەوی دۆڵـی مەککەیە، ئەو دۆڵەش کە ئادەمی تێدا دابەزی لە هیندستان بۆ ئێوە باشـترینیانە، وە خراپترین دۆڵیش لەسەر زەوی دۆڵی (احقاف)ـە لـە حەزرەمـەوت کـەوا دۆڵـی رۆحی کافرانی تێدا فڕێ دەدرێت.

هەروەها ئیبن منده دەڵێت: حماد کوڕی سلمە ریوایەتی کردووە، لە عەلی کـوڕی زەید، ئەویش لە یوسف کوڕی میهران، ئـەویش لـە ئیبنـو عـەبباس، ئـەویش لـە عەلی، رق وکینەترین پارچە لەسەر زەوی دۆڵێکە لە حەزرەمـەوت پێـی دەوترێـت:

---

(٢١٤) شرح الصدور: ٣١٢

بەرهووت، کەوا رۆحی کافرەکانی تێدایـە، وە بیرێکـی تێدایـە لـە رۆژدا ئاوەکـەی ڕەشە هەروەك کێم و زوخاوە جڕ و جانەوەری تێدا دەچێت.

پاشان لە ڕێگای ئیسماعیل کوڕی ئیسحاقی قازی گێڕاوەتەوە و دەڵێـت: عـەلی کوڕی عەبدوڵلا بۆ ئێمەی گێڕایەوە، ئەویش لـە سـوفیان ئـەویش لـە ابـان کـوڕی سەعلەب وتی: پیاوێك وتی: دۆڵێـك هەیـە، واتـە: دۆڵـی حەزرەمـەوت، هـەروەك دەنگی خەڵکانێکی تێدا کۆدەبێتـەوە و دەڵێن: ون: ئەی دومە ئەی دومە! ابان وتی: پیاوێك لە خاوەن کتێبەکان بۆ ئێمەی گێڕایەوە کە (دومـە) ئـەو فریـشتەیە کـەوا لەسەر رۆحی کافرەکاندایە[٢١٥].

سفیان وتی: پرسیارمان لە خەڵکی حەزرەمەوت کرد لە بـارەی دۆڵەکـە، وتیـان: کەس ناتوانێت شەو تێیدا بمێنێتەوە[٢١٦].



## (ئەوانەی دەڵێن: رۆحەکان لەسەر زەوی کۆدەبێتەوە)

بەڵام وتەی ئەو کەسەی کە دەڵێت: کەوا رۆحەکان لـە زەویـدا کۆدەبێتـەوە خـودای گەورە لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِـي الزَّبُـورِ مِـن بَعْـدِ الـذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ (الأنبياء:١٠٥).

واتە: (سوێند بەخوا بەراستی ئێمە لە کتێبی زەبووردا دوای تـەورات بڕیارمانـداوە کە بێگومان بەندە شیاو و چاکەکانم دەبنە خاوەنی زەوی). جا ئەگەر ئەوەی خـوای گەورە لە بارەیەوە فەرموویەتی تەفسیری ئایەتەکە بێت، ئەوا تەفسیری ئـەو وتەیـە نیە.

---

(٢١٥) شرح الصدور: ٣١٧

(٢١٦) شرح الصدور: ٣١٧

خەڵكی ناكۆك جیاوازن لە بارەی ئەو زەوییە لێرەدا باسكراوە، سەعیدی كوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەبباس دەگەڕێتەوە و دەڵێت: ئەمە زەوی بەهەشتە، ئەمەش تەفسیر و لێكدانەوەی زۆربەی توێژەر و لێكدەرەوەكانەن لە ئیبنو عەبباسەوە وتەیەكی دیكەش هەیە و دەڵێت: ئەو دونیایە كەوا خوای گەورە بۆ محەمەد(ﷺ) رزگاری كردووە و ئەم وتەیەش وتەیەكی دروستە، هاوشێوەكەش ئەو فەرموودەیە كە خوای گەورە لە سورەتی(النور) دا فەرموویەتی: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾(النور: ٥٥).
واتە: (خوا بەڵێنی دڵنیا بەخش و تەواوی داوە بە وانەی باوەڕییان هێناوە لە ئێوەو كار و كردەوە چاكەكانیان ئەنجام داوە بە راستی لە ئایندەیەكی نزیكدا جێنشین و پایەداریان دەكات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین كردووە).

لە سەحیحێكی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە و دەفەرموێت: (زويت لي الأرض مشارقها ومغاربها، وسيبلغ ملك أمتي ما زوي منها)[٢١٧] واتە: (زەوی رۆژهەڵات و رۆژ ئاواییەكەی بۆ من كۆكرایەوە و گۆشەگیر بوو، جا لەوەی بۆ من كۆكرایەوە دەبێتە موڵك و میراتی ئۆممەتەكەم)

بەشێك لە لێكدەرەوەكان دەڵێن: مەبەست لەو حەدیسە: زەوی (بيت المقدس)ـە، ئەمەش ئەو زەوییەیە كە خودای گەورە بەندە چاكەكانی دەكاتە خاوەنی؛ ئەم ئایەتەش تایبەت نییە بەم مەسەلەیە.

### ( ئەوەی دەڵێت: رۆحی ئیمانداران لە ئاسمانی حەوتەم دایە )

ئەوانەی دەڵێن: كەوا رۆحی ئیماندارەكان لە (عليين)ـە لە ئاسمانی حەوتەمدا، بۆ رۆحی كافرەكانیش لە (سجين)ـە لە زەوی حەوتەم: ئەمە وتەی كۆمەڵێكە لە

---

(٢١٧) مسلم: (٢٨٨٩)،وە مسند احمد: ٥/٢٧٨

پێشینەکان و پاشینەکان و بەڵگەشیان لەسەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرمووێت: (اللهم الرفيق الأعلى)[218]. پێشتر حەدیسەکەی ئەبو هورەیرە باسکرا: (إن الميت إذا خرجت روحه عرج بها إلى السّماء حتى ينتهي بها الى السّماء السابعة التي فيهاالله عزوجل).

واتە: (کاتێك مردوو گیانی دەکێشرێت بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان تا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم کە خودای عزوجل لەوێیە).

فەرموودەی ئەبی موسی باسکرا: رۆحەکە بەرز دەکرێتەوە تاوەکو لەلای عەرش کۆتایی پێ دێت. وتەی حوزەیفەش باسکرا، رۆحەکەی لەلای پەروەردگار دەست بەسەرە، وە وتەی عەبدوڵلای کوڕی عومەریش باسکرا، ئەو رۆحانە لەلای خودای گەورە و دڵۆڤانە.

ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) باسکرا: (إن أرواح الشهداء تأوي الى قناديل تحت العرش).

حەدیسەکەی براء کوڕی عازبیش باسکرا، رۆحەکە لەئاسمانێکەوە بۆ ئاسمانێکی تر بەرز دەکرێتەوە،و لە هەموو ئاسمانێکدا فریشتە نزیکەکان لێی کۆدەبنەوە، تاوەکو دەیگەنن بۆ ئاسمانی حەوتەم، لە وتەیەکی دیکە: بۆ ئەو ئاسمانەی کەوا خودای عزوجل تیایەتی.

بەڵام ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەوێ جێگیر دەبێت و ئارام دەگرێت، بەڵکو بەرزی دەکەنەوە بۆ ئەوێ بۆ ئەوەی پیشانی خوای گەورەی بدەن، جا لەوێ فەرمانی بۆ دەدردەچێت و کتێبەکەی بۆ دەنوسرێت ئایا ئەهلی (عیلین)ە یاخود لە ئەهلی (سجين)ە، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ناو گۆڕ بۆ کاروبارەکان پاشان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لەوێ دانرابوو، جا رۆحی ئیمانداران لە (عليين)ە بەگوێرەی پلە و پایەیان، وە رۆحی کافرەکانیش لە (سجين)بە گوێرەی پلە و پایەیان.

---

(218) مسلم: (٢٤٤٤).

## ( بۆ ئەوانەی دەڵێن: رۆحی ئیمانداران لە بیری زەمزەم کۆدەبێتەوە )

هەندێك فەرموودە دەڵێت: رۆحی ئیمانداران لە بیری زەمـزەم کۆدەبێتـەوە، -
هیچ بەڵگە لەسەر ئەمە نییە لە قورئان و نە لە سونتەش، نـە وتـەی خاوەنەکـە
باوەڕی پێ دەکرێت، وە نـە دروستیـشـە، چـونکە ئـەو بـیرە جێگـای ئـەو هـەم
ئیماندارانەی تیا نابێتەوە، ئەمەش پێچەوانەی ئەو حەدیسەیە کەوا رۆحی ئیمان
باڵندەیەکە لە بەروبوومی درەختی بەهەشت دەخوات.

بە گشتی ئەو وتەیە لە هەموو وتەکانی دیکە نارەوا و خراپترە، وە لەو وتەیـە
خراپترە کە دەوترێت: کەوا رۆحی ئیمانداران لە (جابیـە)یـە، چـونکە ئـەو شـوێ
ئاسمانێکی فراوانی هەیە بە پێچەوانەی بیرە تەنگەبەرەکە.



## ( بۆ ئەوانەی دەڵێن: رۆحی ئیمانداران لە ژیانی بەرزەخی زەویدایە )

ئەو وتەیەی کەوا دەڵێت: رۆحی ئیمانداران لە بەرزەخدایە لەسـەر زەوی دەڕوا
بۆ هەر شوێنێك کە بیەوێت، ئەمە لە سەلمانی فارس ریوایـەت کـراوە، بـەرزەخی
بەربەستە لە نێوان دوو شت، هەروەك سەلمان مەبەستی بێت لەزەوییـەك لـە نێـ
دونیا و رۆژی دواییدا جا رۆح لەو زەویەدا بە ویستی خۆی هاتوچۆ دەکات.

ئەم وتەیەش بەهێزە چونکە لە دونیا دابڕاوە نەچۆتە رۆژی دوایی، بـەڵکو ئـەو
بەرزەخدایە لە نێوانیاندا، جا رۆحی ئیمانداران لـە بـەرزەخێکی فراواندایـە رۆ
رەیحان و خۆشی و نیعمەتی تێدایە، وە رۆحی کافرەکانیش لە بەرزەخێکی تـەنگ
ناخۆش دایە کەوا خەم و خەفەت و ئازاری تێدایە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِـن وَرَائِهِـم بَـرْزَخٌ إِلَـى يَـوْمِ يُبْعَثُـونَ﴾ (المؤمنـ
١٠٠)

واتە: (دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا، لە نێوان مردن و زیندووبوونـەوەدا تـا کاتێـك زیندوو دەکرێنەوە چاوەڕێ بێت).

جا بەرزەخ لێرەدا لە نێوان دونیـا و ڕۆژی دواییـە، وە بنـچینەکەی بەربەسـت و ڕێگرە لە نێوان دوو شت.

*** 

## ( بۆ ئەوانەی دەڵێن: ڕۆحی ئیمانداران لەلای دەستە ڕاستی ئادەم و هی کافرەکانیش لەلای چەپیەتی )

بەڵام ئەوەی کە دەڵێت: کەوا ڕۆحی ئیماندارەکان لەلای دەستی چەپی ئادەمـە، وە ڕۆحـی کافرەکـانیش لــە لای چــەپیەتی، ئەمــە حەدیــسێکی شــەوڕەوەکەی پێغەمبەرە(ﷺ)، هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی بـەو جـۆرە بـینی، ئەمـەش ئەوە ناگەیەنێت کە ڕێكو ڕاست لە ڕاستی و چـەپی ئـادەم بێـت، بـەڵکو دەشـێت ئەوانە لەلای ڕاستیدا بێت ئەوانە لە بەرزی و خۆشی و شادی بێت، ئەوانەی لـەلای چەپی بێت ئەوانە لە خوارەوە و ناخۆش و بەند کردن دا بێت.

ابـو محمـد کـوڕی حـەزم [٢١٩] دەڵێـت: ئـەو بەرزەخـەی پێغەمبـەر(ﷺ) لـە شەوڕەوەکەیدا بینی لە لای ئاسمانی زەویدا فەرمووی: ئەمەش لـە کـاتی نـەمان و پچڕانی تۆخمەکاندا بوو، وتی ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەژێری ئاسمانـدا بـوو بە جۆرێك تۆخمەکانی وەك (ئاو و خۆڵ و ئاگر و هەوا) پچڕاوە.

ئەوەی کە وتراوە، ئەگەر هاتوو خاوەن ڕۆحە شادومانەکان لەلای دەستە ڕاسـتی ئادەم بێت، ئادەمیش لە ئاسمانی دونیایە، سەلمێنراوویشە کە ڕۆحی شەهیدەکان لە ژێر سیبەری عەرش دان، عەرشیش لەسەر ئاسمانی حەوتەمدایە، جا چـۆن دەبێـت

---

([٢١٩]) الفصل في الملل: ٤/٦٧.

لەلای راستی ئادەم دابێت، ئایا چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لەوێ لە ئاسمانی دونیا ئەمەی بینیووە؟
وەڵامەکە لە چەند روویەکەوەیە:

**یەکەم**: ئەمە نەگونجاو نییە و قەدەغە ناکرێت لەوەی لە دەستە راستی ئادەم دا بێت لە شوێنێکی بەرزە، هەروەك رۆحی کافەرکانیش لەلای چەپیەتی لە رووی خوارەوە.

**دووەم**: نەشیاو و قەدەغە نابێت کەوا لە ئاسمانی دونیا پیشانی پێغەمبەر(ﷺ) درابێت و ئەگەر هاتوو لەسەرووی ئەمەوە جێگیرکرابێت.

**سێیەم**: لە راستیدا ئەو هەواڵی تەداوە کە هەموو رۆحە شادومانەکان لەوێ بووبن بەڵکو فەرموویەتی: (فإذا عن يمينه أسودة وعن يساره أسودة). بەڵکو زانراویشە کەوا رۆحی ئیبراهیم و موسى لە سەرەوەن لە ئاسمانی شەشەم و حەوتەمدان، وە رۆحی ئیماندارەکانیش بە گوێرەی پلە و پایەیان هەندێکییان لە هەندێکیان بەرزترن، هەروەك رۆحی کافرەکانیش هەندێکییان لە خوارەوەیە هەندێکیان دان بە گوێرەی پلە و پایەیان، خوای گەورەش زاناترە.

***

## دەربارەی راو پێشنیاری ئیبن حزم لە بارەی جێگیربوونی رۆح

بەڵام بە گوێرەی وتەی ئەبی محەمەد بن حەزم: رۆحەکە دەچەسپێ و جێگیر دەبێت بە جۆرێك پێش دروستبونی لاشەی دابێت، ئەمەش دەوەستێتە سەر ئەو مەزهەبەی کەوا خۆی هەڵیبژاردووە، ئەمەش رۆحی ئەو دروستکراوانەیە پێش جەستەکانیان، وە ئەمەش لەناو خەڵکدا دوو وتە هەیە، زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە رۆحەکان دوایی جەستەکان دروست بوونە. ئەوان دەڵێن: رۆحەکان پێش جەستەکان دروست بوونە ئەوا بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نییە لە قورئان و سوننەتەوە

نەیەکدەنگی زانایان تەنها ئەوە نەبێت کەوا لەهەندێك دەق تێگەیشتوون ئەمەش بەڵگە نییە لەسەری یاخود حەدیسە دروستەکان، هەروەك ئەبو محەمەد بن حزم بیانوو دەهێنێتەوە بەو فەرمودەیەی خوای گەورە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ (الأعراف: ١٧٢).

واتە: (یادی ئەو کاتەش بکەنەوە کە پەروەردگارت پێشتا وپشتی نەوەی ئادەمی کۆکردەوە (لە جیهانی پەنهان و شارەوەدا پەیمانی لێوەرگرتن) و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە (پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟). ئەو نیشانانەی کەوا پێشینەکان باسیان کردووە لە دەرچوونی نەوەی ئادەم لە بڕبڕەی پشتیدا، پاشان پەیمانی لێوەرگرتن و گەڕێندرانەوە بۆ بڕبڕەی پشتی و کەوا وەك و نەوە دەریاندەچووێنێت.

خوای پەروەردگاری دابەشی کردوون بۆ خۆشی و ناخۆشی، خودای گەورە و میهرەبان ئەجەل و رزق و رۆزیی و کردەوەکانیان کەوا لە خێر و شەڕ تووشیان دەبێت هەمووی بۆیان نووسیوە، پاشان دەڵێت: ئیسحاق وتی: زانایان یەکدەنگ و کۆکن کەوا رۆحەکان پێش جەستەکان هێناویانە قسە پێکردن: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ*أَوْ تَقُولُواْ إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ﴾ (الأعراف: ١٧٢-١٧٣).

واتە: (کردنی بەشایەت بەسەر خۆیانەوە (پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ هەموو وتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتیمان داوە (کە تۆ پەروەردگارمانیت)، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لە رۆژی قیامەتدا بڵێن، بەراستی ئێمە لەمە بێ ئاگا بووین!! یاخود نەوەك بڵێن: جا ئێمە چی بکەین، بە راستی ئێمە باو و باپیرانمان لە پێشدا هاوەڵیان بۆ خوا داناوە).

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ﴾ (الأعراف: ١١).

واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە (باوە گەورەی) ئێوەمان دروست کرد و نەخش و نیگاری ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان، ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێز بە فەرمانی خوا) جا هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد).

خوای گەورە هەموو ڕۆحەکانی بە یەکجار دروست کرد کەوا دەروونە، وە هەروەها پێغەمبەریش(ﷺ) لە حەدیسێکدا هەواڵی داوە: (أنّ الأرواح جنود مجندة فما تعارف منها أئتلف وما تناكر منها اختلف)

خوای گەورە پەیمان و شایەتی لێ وەرگرتن لە کاتێکدا ئەو دروستکراوێکی ڕوخسار کێشراو وئاقڵ بوو پێش ئەوەی فەرمان بە فریشتەکان بکات سوژدەی بۆ ئادەم ببەن، پێش ئەوەی ڕۆحەکە بچێتە جەستەکان، و جەستەکانیش لەو ڕۆژەدا تەنها خۆڵ بوون.

بۆ ئەو دەرکەوت و ساخبوونەوەیە باسی هەندێك دەکەین لە وەڵامدانەوەی پرسیار کردن لە بارەی ڕۆحەکان ئایا لەگەڵ جەستەکان دروست بوونە یاخود لە پێش جەستەکان؟ ئەگەر لێرەدا مەبەست قسە کردن بێت لەسەر جێگیر بوونی ڕۆحەکان لە دوای مردن، وە فەرموویەتی: لە ڕاستیدا لەو بەرزەخەدا سەقامگیر دەبێت کەوا لە پێش ئەوەی جەستەکان دروست بێت وە ستاوە لەسەر ئەو بیروباوەڕە کەوا باوەڕی پێیەتی، وە فەرموودەکەی کەوا ڕۆحە شادەکان و دڵخۆشەکان لەلای دەستە ڕاستی ئادەمن، و ڕۆحی کافرەکانیش لەلای چەپیەتی، هەروەك پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵی پێدراوە و فەرموودەکەی: ئەو ڕۆحانە لەو شوێنانەن کەوا توخم و پێکهاتەکان پچڕاون، ئەمەش هیچ بەڵگەی لەسەر نییە نەلە قورئان وە نە لە سوننەت، هاوشێوەشی نییە لەگەڵ وتەکانی زانا ئیسلامییەکان، حەدیسە

دروستەکانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی رۆحەکان لەسەرووی تۆخمەکانن لە بەهەشتدا لەلای پەروەردگار، بەڵگەی قورئانیش بەڵگە و متمانەیە لەسەر ئەمە، ئەبو محەمەدیش رێککەوتووە لەسەر ئەوەی رۆحی شەهیدەکان لە بەهەشتدان و زانراویشە کەوا راستگۆیان لەوان باشترن، جا چۆن دەبێت رۆحی ئەبی بەکری صدیق و عەبدوڵلای کوری مەسعود، وە ئەبی ئەلدەردا و حوزەیفەی کوری یەمان و ئەوانەی وەك ئەوانە ﷺ لەلای پچرانی تۆخمەکان بێت وەکو (ئاو و خۆڵ و ئاگر و هەوا). ئەمەش لە ژێر ئاسمانی دونیایە، وە ئایا دەبێت رۆحی شەهیدەکانی سەردەمی ئێمە لەسەرووی تۆخمەکانەوە بێت لەسەرووی ئاسمانەکاندا بێت؟

❊❊❊

## (بۆ ئەوانەی دەڵێت:
## کەوا جێگیربوونی رۆح بە ویست و ئارەزووی خۆی نیە)

بەڵام بە وتەی ئەو کەسەی دەڵێت: جێگیربوونی رۆح بە ئارەزووی خۆی نییە، ئەمەش وتەیەکە کە دەڵێت: رۆحیش نیشانەیەکە لە نیشانەکانی جەستە، کە ئەویش ژیانە، وە ئەمەش وتەی ئیبن باقلانی و ئەوانەی شوێنکەوتەی ئەون، هەروەها ئەبو هندیل العلافیش دەڵێت: دڵ و دەروون نیشانەیەکە لە نیشانەکان، ئەو وا دەستنیشان و جیای نەکردۆتەوە بەوەی کە ژیانە هەروەك ئیبن باقلای جیای کردۆتەوە، پاشان وتی: ئەو واتە رۆح نیشانەیەکە یاخود بەشێکە وەك بەشەکانی جەستە.

هەندێکی تر لایان وایە کاتێك لاشە دەمرێت رۆحەکەی ون دەبێت و نامێنێت وەك پێشتر باسکرا، وەك هەموو بەش و نیشانەکانی مەرجدار بە ژیان، هەندێکی دیکە لەوانە دەڵێن: ئەو نیشانەیە لە دوو سەردەمدا نامێنێت، هەروەك زۆربەی

ئەشعەرییەکان وا دەڵێن، جا لە وتەکانیان: کەوا رۆحی ئێستای ئادەمیزاد ئەو رۆحەی پێشتر نییە، وە نابێت لێی جیا بێتەوە و پاشان رۆحەکە بگەڕێتەوە بۆ ماوەی کاتژمێرێك زیاتر لە هەزار رۆحی بۆ بگۆڕێت لەسەردەمێك و ئەوەی دادێت، جا ئەگەر مرد هیچ رۆحێك نیە بەرزبکرێتەوە بۆ ئاسمان وپاشان بگەڕێتەوە بۆ ناوگۆڕ پاشان فریشتەکان هەڵیبگرن و دەرگای ئاسمانەکانی بۆ دەکەنەوە رۆحەکە نەخۆشی و نیعمەت دەبینێت و نە ناخۆشی و ئازار دەبینێت، بەڵکو تەنها لاشەکەیە خۆشی و ناخۆشی دەبینێت ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت ئەوا نیعمەت یاخود ئازاری دەدات جا ژیانی بۆ دەگەڕێتەوە لەو کاتەی دەیەوێت نیعمەتی پێ ببەخشێت یاخود سزای بدات، ئەگەر نا هیچ رۆحێك لەوێ نییە ئێستا وەستاو بێت بە خۆیەوە.

هەندێك لە زانایان دەڵێت: ژیان دەگەڕێتەوە بۆ کلێنجە واتە خوارووی ئێسکی بڕبڕەی پشت جا ئەمەیە نیعمەت و خۆش دەبینێت یاخود ناخۆشی و سزا و ئازار.

ئەم وتەیە قورئان و سوننەت و یەکدەنگی سەحابە رەتی دەکاتەوە، بەڵگە و شایەتی زانایان و ژیر و زرنگ و هۆشیاران، بێگومان خوای گەورە قسەی کردووە لەگەڵ دەروونلدا بە گەڕانەوە و چوونەژوورەوە و هاتنە دەرەوە، وە دەق و بەڵگەی دروست هەیە لەسەر ئەوەی رۆح بەرزدەکرێتەوە و دادەبەزێت و دەگیرێت و رەوانە دەکرێت و دەرگای ئاسمانەکان بۆ دەکرێتەوە و کڕنۆش دەبات و قەسەش دەکات، وەکفن دەکرێت لە کفنەکانی بەهەشت یاخود ئاگر، هەروەها فریشتەی گیانکێشان بە دەستی خۆی هەڵدەگرێت و پاشان فریشتەکان دەستا و دەستی پێدەکەن جا بە بۆنخۆشترین بۆنی میسك بۆندەکرێت، یاخود بۆنێکی بۆگەنی لێدێت، هەروەها لە ئاسمانێکەوە بۆ ئاسمانێکی تر دەنێردرێت، پاشان لەگەڵ فریشتەکان دەگەڕێتەوە سەرزەوی جا ئەوکاتەی رۆحەکە دەردەچێت چاو بە دوایدا دەکەوێت بە جۆرێك دەبینێت تاوەکو دەچێتە دەرەوە.

قورئـان دەيـــسەلمێنێت لەســەر ئـەوەی رۆح لـە شـوێنێك بـۆ شـوێنێكی دیكـە دەگوازرێتەوە تاوەكو دەگاتە گەروو لە جوولەكردنیدا، هەموو ئەوانەی باسمـان كـرد بەڵگەن لەسەر ئەوەی رۆحـەكان دەگـەن بە یـەكتر و یـەكتر دەناسـن، بێگومـان پێغەمبەر(ﷺ) لەشەورۆیەكەیدا رۆحەكانی بینی لە دەسـتی راسـتی ئـادەم و لـە دەسـتەی چـەپی بـوون، پێغەمبـەر(ﷺ) هـەواڵی داوە كـەوا رۆحـی ئیمانـدار باڵندەیەكی سەوزدایە، وە خوای گەورەش هەواڵی داوە لـەبارەی رۆحـی فرعـەون و یاوەرەكانی كەوا بەیانیان و ئێواران لەسەر ئاگری دۆزەخ پیشانی دەدرێت.

وە لە كاتێكدا ئیبن باقلانی پێـداگیری دەكـات لەوەلامەكـەداو دەڵێـت: لەسـەر ئەمەدا یەكێك لەو دووروەدا دەردەچێت، یان پیشاندانی لە ژیاندا لە یەكەم بەشـە لە بەشـەكانی جەستەدا دادەنرێت، وە یان ئەوەتا بۆ ئەو ژیانە و نیعمەت و ئـێش و ئازاردا لاشەیەكی دیكە دروست دەكرێت.

ئەو وتەیەكە لە مەبەست و نیەتێكی گەندەڵ و خراپدایە لە زۆر رووەوە، وە ئایـا چ وتەیەك لەو وتەیە خراپترە كەوا رۆحـی ئـادەمیزدا دابنێـت بـە نیـشانەیەك لـە نیشانەكانی هەموو كاتژمێرێك بگۆڕێت جار بە جار خۆشەویـستربێت، جـا ئەگـەر ئەو نیشانەیە واتە رۆحەكە جیابووەوە ئەوا لە پاش جیابوونەوەیەكە رۆحێـك نییـە نیعمـەت و خۆشـی وە سـزا و ئـێش و ئـازار ببینێـت وە نەبەرزدەبێتـەوە و نەداشدەبەزێت و نەدەشگیرێت و نەرەوانەش دەكرێتەوە؟

ئەو وتـەیە پێچەوانەیە لەگەڵ عـەقڵ و دەقەكانی قورئان و سوننەت و ئەخلاقـدا، ئەم وتەیەش هی كەسێكە كەوا خۆی نەناسێت، جا لە باسـەكانی دا هـاتوو بەڵگـە لەسەر هەڵبەستن و بووختانی ئەو بابەتە دەهێننەوە انشاءالله.

ئەمەش وتەیەكە كەسێك لە پێشینەكانی ئوممەت نـەیووتووە، و نـە لـە سـەحابە و شوێنكەوتوانیش و نەزایانی ئیسلامیش.

❊❊❊





## ئەوانەی دەڵێن:
## کەوا سەقامگیربوونی ڕۆح لە دوای مردندا لەناو لاشەیەکی دیکەیە؟

بەڵام ئەو وتەیە کە دەڵێت: کەوا جێگیربوونی ڕۆح لە دوای مردندا لەناو لاشەیەکی دیکەدا بێت جگە لەو لاشەیە، جا ئەم وتەیە هەق وناهەقی تێدایە.

جا هەق و ڕەواکەی کەوا پێغەمبەری ڕاستگۆ و باوەڕپێکراو(ﷺ) هەواڵی داوە لە بارەی ڕۆحی شەهیدەکان کەوا لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدایە، دەچن بۆ لای ئەو چراخانەی بە عەرشدا هەڵواسراوە، هەروەك لانە وایە بۆ باڵندەکان، بێگومان لە فەرموودەکەیدا ئاشکرای کردووە (جعل الله أرواحهم في أجواف طير خضر).

واتە: (خوای گەورە ڕۆحەکانیان لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدا داناوە).

بەڵام بە نیسبەت ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) : (نسمة المؤمن طائر يعلق في شجر الجنّة).

واتە: (ڕۆحی ئیماندار باڵندەیەکە لە دار و درەختی بەهەشت دەخوات).

لەوانەیە ئەو باڵندەیە بۆ ڕۆحەکە سوابوویێك بێت بۆ ئەو وەك لاشە، ئەمەش بۆ هۆکارێك لە ئیمانداران و شەهیدان دەبێت، لەوانەشە ڕۆحەکە لە شێوەی باڵندە بێت، ئەمەش خواست و ئارەزووی ئەبی محەمەد کوڕی حەزم و ئەبی عومەر کوڕی عبدالبّر، لەمەوپێش قسەیان کرد لەسەر وتەکانی ئەبی عومەر.

بەڵام ئیبن حزم [٢٢٠] کە دەڵێت: مانای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ: (نسمة المؤمن طائر يعلق)

ئەمە لەسەر دەرکەوتە و شێوەی دەرەوەیدایە، نەك لەسەر گومان و بۆچوونی نەزانەکان، لەکاتێکدا پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە کەوا ڕۆحی ئیماندار باڵندەیەکە

---

([٢٢٠]) الفصل في الملل: ٧٧/٤

دەخوات، بە مانای ئەو لە بەهەشتدا دەفڕێت، نەك شێوەكەی گۆڕابێت لە وێنەی باڵندەدا.

وتی: بەڵام ئەو زیادەیەی كەوا تێیدا هاتووە بەوەی لەناو سكی باڵندەیەكی سەوزدایە، بەڵكو ئەو سیفەتی ئەو چرایانەن كەوا بۆ لای دەچن، هەردوو حەدیسەكەش پێكەوە یەك حەدیسە، ئا ئەمەیە ئەوەی وتوویەتی بە مەبەستی فەسادی بە وتە و بە مانا، جا ئەو حەدیسە دەفەرمووێت ڕۆحی ئیماندار باڵندەیەكە لە دەرختی بەهەشت دەخوات هەمان ئەو حەدیسە نییە كە دەفەرمووێت ڕۆحی شەهیدەكان لەناو سكی باڵندەیەكی سەوزدایە، ئەوەی باسكراوە لەوانەیە لە حەدیسی یەكەمدا بێت، بەڵام لە حەدیسی دووەمدا لەوانەنیە وابێت، جا پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە: (أن أرواحهم في حواصل طير)، لە وشەی راڤەیەكی دیكەدا: (في أجواف طير خضر) وە لە وشە ودەربڕینێكی دیكەدا: (بيض) هاتووە، ئەو باڵندەیە پشوو دەدات لە بەهەشتدا و لە بەروبوومەكەی دەخوات و لە رووبارەكانی دەخواتەوە، پاشان دەچێت بۆ لای ئەو چراخانانەی لە ژێر عەرشدا ئەوچرایانە بۆ ئەو لانە وایە بۆ باڵندەكە، وە ئەو وتەیەی كە دەڵێت: لەناو سكی ئەو باڵندەیە بریتییە لە سیفەتی ئەو چراخانەی كەوا ڕۆحە كە بۆی دەچێت ئەمەش هەڵەیەكی هەمیشەییە.

بەڵكو ئەو چراخانە مەنزڵگا و لانەی ئەو باڵندانەیە جا لێرەدا سێ كاروبار هەیە حەدیسەكە دەریخستووە:

ڕۆحەكان، باڵندەیەكە كەوا ڕۆحەكە لەناو سكی دایە، وە ئەو چراخان و قوتیلاش مەنزڵگا و لانەن بۆ ئەو باڵندانە، و چراخان و قوتیلەكانیش جێگیرن لەژێر عەرشدا و پشوو نادەن، بەڵام باڵندەكە پشوو دەدات و دێت و دەڕوات و ڕۆحەكانیش لەناو سكی دایە.

وتراوه: لەوانەیە رۆحەکە خۆی وەك باڵندەکە لێ بکات، یاخود شێوازی خۆی وەك لاشەی باڵندەکە لێ کردووە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فِي أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاء رَكَّبَكَ﴾ (الإنفطار: ٨).

واتە: (لە هەر شێوە و شێوازێکدا کە ویستوویەتی تۆی رێکخستووە و ئەندامەکانتی بەیەکەوە لکاندووە). وە فەرموودەکەی بە مانا و دەربڕینێکی دیکە دەلالەت لەسەر دەکات، رۆحەکانیان وەك باڵندەیەکی سەوز وایە، هەروەها ئیبن ئەبی شیبە ریوایەتی کردووە کەوا ئەبو معاویە بۆی گێڕاوەتەوە ئەویش لە الاعمش، ئەویش لە عبدالله کوڕی مورە ئەویش لە مسروق، ئەویش لە عبدالله[٢٢١].

بەڵام حەدیسی کەعبی کوڕی مالیك: لە هەر چوار سوننەتەکە و مەسنەدی ئەحمەد دا هەیە، کەوا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إن أرواح الشهداء في طير خضر تعلق من ثمر الجنّة أو شجر الجنّة) [٢٢٢].

ترمزی دەڵێت: ئەو حەدیسێکی (حسن صحيح)ە، هیچ سڵەمینەوە و پارێزیەکی تیا نییە، هیچ یاسایەك لە یاساکانی شەرع بەتاڵ ناکاتەوە، وە پێچەوانەی هیچ دەقێکی قورئان و سوننەتێك نیە کە لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتووە، بەڵکو تەوەلە تەواوکاری رێزلێنانە لە شەهیدەکان لەلایەن پەروەردگارەوە کەوا ئەو لاشانەی لە بریتی ئەو لاشانەیان پێداوە کەوا لەپێناوی خودا پارچە پارچە بوون کە لەلاشەکانیان باشترە و دەبێتە مەرکەب و سواربووێك بۆ رۆحەکانیان بۆ ئەوەی بە تەواوی تامی نیعمەتەکەی خودای میهرەبان بکەن، جا ئەگەر قیامەت سەری هەڵدا ئەوا رۆحەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لاشانەی کە لە دونیادا هەیانبوو.

---

(٢٢١) شرح الصدور: ٣٠٥

(٢٢٢) مسلم: (١٨٨٧)، و ترمذي (١٠٢٨)

بەڵام حەدیسی ئیبن عەبباس: عوسمان کوڕی ئەبی شەیبە دەڵێت: عبدالله کوڕی ئیدریس بۆمانی گێڕایەوە، لە محەمەد کوڕی ئیسحاق ئەویش لە ئیسماعیل کوڕی امیە، ئەویش لە سەعیدی کوڕی جبیر، ئەویش لە ئیبن عەبباس وتی: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لَّما أصيب إخوانكم-يعني- يوم أُحد-جعل الله أرواحهم في جوف طير خضر ترد أنهار الجنّة، وتأكل من ثمارها، وتأوي إلى قناديل من ذهب مدلاة في ظل العرش، فلما وجدوا طيب مأكلهم ومشربهم مقيلهم قالوا: من يبلغ إخواننا عنا أ أحياء في الجنّة نرزق، لئلا ينكوا عن الحرب، ولا يزهدوا في الجهاد، فقال الله تعالى: أنا أبلّغهم عنكم، فأنزل الله تعالى: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾(آل عمران: ١٦٩) )[٢٢٣].

ئیمام ئەحمەد دەڵێت: (ئێمە هیچ سیفەتێك لە سیفەتەکانی خودای میهرەبان ناسڕینەوە و لانابەین لەبەر خاتری خراپەکاران‌و لەرێ لادەران)، چونکە ئەمە ئیش و کاری خاوەن بیدعە کارانە و ئەهلی سوننەش نازناوی وا لە وتە و قسەکانیان دەنێن کەوا خەڵکی گەمژەش لە بەری رابکات، وە ناوی دەنێن تێناخێن و خستنە پاڵ یەك و دەرخستن وە عەرشی خودای گەورە و دلۆڤان بە شوێن و جێگەیەك ناو دەبەن مەبەستێکە بۆ گەیشتنیان بە عەرش تا بە دوور خستنەوەی بەرزی بڵندیەکەی لەسەر دروستکردنەکەی و وەستان لەسەر عەرشەکەی، (تەفسیری ئەو وەستانەیان لەسەر عەرش لە پێشەوا مالیك پرسیووە، لە وەڵامدا فەرموویەتی: وەستانەکە حەقیقەتی هەیە، چۆنیەتیەکەی شاراوەیە، پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە، باوەڕ بوون پێی واجبە).

مەبەستیش لە (ناونان) کەوا (سوننە) دەستنیشانی کردووە راشکاو و روونە لەدانانی رۆحی شەهیدەکان لەناو سکی باڵندەیەکی سەوز یەك بەدوای یەکدا دێت و ئەو مانایە بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵکو بەدوای یەکداهاتنی بەتاڵ ئەوەیە ئەوەی

[٢٢٣] مسند أحمد: ٢٦٦/١؛ پێشتر مانای ئەو فەرموودانە شیکراوەتەوە.

دوژمنەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەیلێن لە مولحیدەکان و شوێنکەوتوانیانو ئەوانەی ئینکاری رۆژی دوایی دەکەن، بەوەی رۆحەکان پاش جیابوونەوەیان لە لاشەکانیان دەچنە لای گیانلەبەران و جرو جانەوەر ئەو باڵندانەی کەوا بۆ رۆحەکەی دەگونجێت، جا هەر کاتێ رۆحەکە لەلاشە جیابووەوە ئەوا دەچێتە لاشەی ئەو گیانلەبەرانە، لەوێ نیعمەت و خۆشی دەبینێت یاخود سزا و ئازار دەبینێت، پاشان لێی جیا دەبێتەوە، پاشان دەچێتە لاشەیەکی دیکە لەگەڵ کردەوە و ئەخلاقی ئەو بگونجێت، ئەمەش دووبارە دەبێتەوە، جا ئەمە میعاد و رۆژیی دواییە لەلای ئەوان و نیعمەت و سزاکەشە کە دەبینێت.

ئەو بەدوای یەکدا هاتنە بەتاڵە پێچەوانەیە بەوەی کەوا پێغەمبەر و نێردراوەکان لە سەرتاکەیان تا کۆتاییەکەیان لەسەر رێککەوتوون، ئەمەش کوفرێکە بەخودا و بە رۆژی دوایی.

ئەمەش کۆمەڵێکی دیکەن دەڵێن: کەوا جێگیربوونی رۆحەکان دوای جیابوونەوە لە لاشەکان دەچێتە لاشەی گیانلەبەر و درندەکان کەوا بۆ دەگونجێت، ئەمە بە تاڵترین و پیسترین قسە و دەربرینە، وە قسەیەکی دیکەش بەدوایدا دێت و دەڵێت: بە یەکجاری لەگەڵ مردندا نامێنێت و لێرەدا هیچ رۆحێك نامێنێت نیعمەت و خۆشی یاخود سزا و ئازار ببینێت، بەڵکو نیعمەت و خۆشی یاخود سزا و ئازار دەکەوێتە سەر بەشەکانی لاشە یاخود بەشێك لەلاشە.

یاخود دەکەوێتە سەر کلێنچکەی خوارەوەی بربڕەی پشت یاخود دەکەوێتە سەر شوێنێکی دیکە، جا خودای گەورە تێیدا لەزەت و خۆش و ئێش و ئازار دروست دەکات یان بەهۆی گەڕانەوەی ژیان بۆی هەروەك هەندێك لەزانا و تێگەیشتوان لەبارەی ئەم وتەیە وتویانە، یاخود بەبێ گەڕانەوەی ژیان کەوا هەندێکی دیکە وتوویانە، جا ئەمانە لە بەرزەخدا هیچ سزا و ئازارێکیان نیە تەنها لەسەر لاشەکانیان نەبێت، و هەندێکی تریش رووبەڕوویان دەبێتەوە، کەوا رۆح بە

ڕوویەکدا ناگەڕێتەوە بۆ ناو لەشە و پێشی ناگات، و نیعمەت و سزاش تەنها لەسەر ڕۆحەکەیە، سوننەتە ئاشکراو متەواتیرەکانیش قسەی ئەوان و ئەوانە ڕەتدەکاتەوەو دیاری دەکات ئەوا سزا و ئازار لەسەر ڕۆح و لاشەکەیە پێکەوە و هەریەکە و بە تەنیاش.

ئەگەر وترا: لە ڕاستیدا ئێوە باسی وتە و ڕەخنە و ناڕەزاییەکانی خەڵکیتان کرد لەبارەی جێگیربوونی ڕۆحەکان، کامەیان لەووتە و دەربڕینانە شیاو و پەسەند ترە تاوەکو باوەڕی پێ بکەین؟

دەڵێین: ڕۆحەکان لە سەقامگیربوونی لە جیهانی بەرزەخدا لە یەکتر جیاوازن بە جیاوازیەکی گەورە، لەوانە: ڕۆح هەیە لە هەر سەرەوەی (علیین) لای فریشتە بەرزەکانە، ئەمەش ڕۆحی پێغەمبەرانە عليهم السلام وە ئەوانە لە مەنزڵگا و شوێنەکانیان جیاوازییان هەیە هەروەك پێغەمبەر ﷺ لە شەوڕەوەکەیدا ئەوانی بینی.

لەوانە: ڕۆحەکان لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدان لە بەهەشتدا پشوو دەدات و هاتووچۆ دەکات هەرچۆن بیەوێت، ئەمەش ڕۆحی هەندێك لە شەهیدانە نەك هەموویان، بەڵکو شەهید هەیە لەبەر قەرزاری ڕۆحەکەی دەستی بەسەردا دەگیرێت لە چوونەژوورەوەی بۆ بەهەشت، یاخود بە هەر هۆکارێکی دیکە، کەوا لە مەسنەد داهاتووە، لە محەمەد کوڕی عبدالله کوڕی جحیش دەگێردرێتەوە، پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چی بۆ من دەبێت ئەگەر لە پێناوی خودا بکوژرێم؟ فەرمووی: (الجنّه)، واتە: (بەهەشت) جا کاتێك ڕۆیشت فەرمووی: (إلاّ الذين، سارّني بِهِ جبريل آنفاً) (٢٢٤).

واتە: (تەنها قەرزاری نەبێت، کەوا جوبریل پێشتر بۆی باس کردووم).

---

(٢٢٤) مسند أحمد: ١٣٩/٤

لەوانە: ئەوەی دەستبەسەر دەبێت لەبەر دەرگای بەهەشت کەوا لـە حەدیـسێکی دا هاتووە: (رأيت صباحكم محبوساً على أباب الجنّة)[٢٢٥].

واتە: (هاورێکەتانم بینی لەبەر دەرگای بەهەشت دەست بەسەر کرابوو).

لەوانە: ئەو کەسانە بارەگاکایان لە بەردەم دەرگای بەهەشتە، کەوا لـە حەدیـسێکی ئیبن عەبباسدا هاتووە:

(الشهداء على بارق نهر بباب الجنّة، في قبة خضراء يخرج عليهم رزقهم من الجنّة بُكرةً وعشية).

واتە: (شەهیدەکان لەسەر لێواری رووبارێکن لەبەردەم دەرگای بەهەشـتا، لـە قبـە خضرا، بەیانیان و ئێواران رزق و رۆزیان لە بەهەشتەوە بۆ دێتە دەرەوە).

ئەحمەد ریوایەتی کردووە، ئەمەش پێچەوانەی جەعفـەری کـوڕی ئـەبی تالێبـە بـە جۆرێك لە جیـاتی دەسـتەکانی دووبـاڵی بـۆ دانـراوە لـە بەهەشـتا پێـی دەفڕێـت هەرچۆنێك بیەوێت[٢٢٦].

لەوانە: ئەو رۆحانەی دەستبەسەرن لەسەر زەوی، رۆحەکەی بـەرز نابێتـەوە، بـۆ لای فریشتەکان، بەڵکو ئەمە رۆحێکی نزم و لە خوارەوەی زەویدایە، جا رۆحـەکانی زەوی لەگەڵ رۆحەکانی ئاسمانەکان کۆنابێتەوە، هەروەك لەدونیاشـدا لەگـەڵ یـەکتر نابنەوە، ئەو دڵ و دەروونەی لەزەویـدا نـەیتوانی رەزامەنـدی و خۆشەویـستی خـوا بەدەست بهێنێ و یادی بکات و هۆگری ببینێت و لێـی نزیـك بێتـەوە، ئـەوا دڵ و دەروونێکی نزم و لە خوارەوەی زەویدا دەبێت، وە لەپاش جیابوونەوەی لەلاشەکەیدا تەنها لەوێ دەمێنێتەوە.

هەورەکو دڵ و دەروونی بەرز و مەزن کەوا لە دونیا خەریك ببوو بە خۆشەویستی خوا و یادکردنی و نزیك بوونەوە و هۆگری بـوونی، وە پـاش جیابوونـەوەش لەگـەڵ

(٢٢٥) سەرچاوەی پێشوو: ١١/٥، سنن النسائي: ٣١٥/٥

(٢٢٦) سەیر: ترمزی (٣٧٦٣) بکە، وە مەسنەد ئەحمەد: ٢٦٦/١

رۆحە بەرزەکان دەبێت کە بۆ ئەو گونجاوە، پیاویش لەگەڵ ئەو کەسەیە لە بەرزەخدا لەرۆژی قیامەتدا کە خۆشی دەوێت، و رۆحی ئیماندار لەدوای جیابوونەوە دەگات بە رۆحی برا و هاورێکانی کە کردەوەی چاکیان ئەنجامداوە و لەوێ لەگەڵ یەکتر دەبن.

وە لەوانە: رۆحی داوێنپیسی و زیناکاران لە پیاو و ئافرەتان لە تەندووری ئاگردان، و رۆحیش لەناو رووباری خوێندا مەلەی تێدا دەکات و بەرد قووت دەدات، جا رۆحەکە دڵخۆش و شادومانەکان و خەمبار و ئازارەکان یەك جێگیربوونیان نیە، بەڵکو رۆح هەیە، لە هەرە سەرەوەی (علیین)ە، و رۆحیش هەیە لە خوارەوەی زەویە و بەرزنابێتەوە.

ئەگەر تۆ ئاواتەخوازی سوننەت و نیشانەکان بوویت لەو بابەتەدا، ئەوە بۆتۆ باشتر وایە گرنگی بدەیت بە بەڵگەنامەکانی ئەو بابەتە وا گومان مەبە کەوا لەنێوان ئەو نیشانە دروستانەدا لەو بابەتە بەرهەڵستکاری هەیە، جا ئەوانە هەموویان راست و رەوان و هەندێکییان ئەویتر دەسەلمێنێت، بەڵام کاروبار و گرنگیەکە لە تێگەیشتنی دایە، لە زانینی دڵ و دەروون و یاساکانی، چونکە ئەوە گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە جگە لە گرنگی کاروباری لاشە، وە رۆحیش لەگەڵ ئەوەی لە بەهەشتدایە، ئەو لە ئاسمانیشدایە، پەیوەندی دەکات و دەگات بە ژیانی ناوگۆڕ و بەو رۆحەی تیایەتی، ئەویش خێراترین شتە لە جووڵە و گواستنەوە و بەرزبوونەوە و دابەزیندا، رۆحیش دابەش دەبێت بۆ نێردراو وبەندکراو. بەرزی و نزمی، دوای جیابوونەوەش رۆح نەخۆش و ناخۆش و لەزەت و نیعمەت و سزاو ئازاری هەیە زۆر گەورەتریش لەوەی لەکاتی پەیوەندی هەبوو بە لاشە، لەو کاتەشدا نەخۆش و بەندی و ناخۆش و سزاو خەفەتباری بۆ هەیە، وە هەروەها لە هەمان کاتیشدا خۆشی و نیعمەت و لەزەت و شادومانی بۆی هەیە، رێك حاڵی لەو

لاشەیەدا وەك حاڵی کۆرپەڵە وایە لەسکی دایکی، لە دوای جیابوونەوەشدا حاڵـەتی وەك حاڵەتی دەرچوونیەتی لەسکی ئەو دونیایەدا.

جا بـۆ دڵ و دەروون چـوار جیهـان هەیـە، هـەر جیهانێـك لـەوەی پـێش خـۆی گەورەترە.

جیهانی یەکەم: لەناو سکی دایکە، ئەمەش حەسـرەت و تـەنگی و غـەم و سـێ تاریکاییە.

جیهانی دووەم: ئەمە جیهانێکە کەوا تێیدا گەورەتر دەبێت و هـۆگری دەبێـت و تێیدا خێر و شەڕی دەست دەکەوێت وە هۆکارێکیشە بۆ بەختەوەری و خەمناکی.

جیهانی سێیەم: جیهانی بەرزەخە ئەمەش فراوانتر و گەورەترە لەو جیهانەدا، بەڵکو رێژە و پەیوەندییەکەی بۆ ئەو وەك رێژە و پەیوەندی ئەو جیهانەیە بۆ یەکەمییان.

وە جیهانی چوارەم: جیهانی کۆتاییە یاخود رۆژی دواییە، ئەمەش بەهەشت یـاخود دۆزەخە، هیچ جیهانێکی دیکە نیە لە دوای ئەوجا خوای گەورە لەو جیهانانەدا پلە دوای پلە دەیگوازێتەوە تاکو دەیگەیەنێتە ئەو جیهانەی جگـە لـەو هیـچی دیکـە سوودی بۆی نابێت، لەویش زیاتر هیچی دیکە شایەنی ئەو نییە، ئەمیش بـۆ ئـەو دروست کـراوە وە کاروکردەوەکـانی ئـەوی گەیاندۆتـە ئـەو پایەیـە، لـە هـەموو جیهانێکیش لەو جیهانانـەدا حـوکم و یاسـا و کاروبارێـك هەیـە جیـاوازە لەگـەڵ جیهانەکەی دیکە.

جا گەورەیی و پیرۆزی بۆ خودای بەدیهێنەر وخوڵقێنـەر و کـەوا مـردن وژیـن و بەختەوەری و خەمناکی بە دەست ئەوە کەوا جیـاوزای دانـاوە لـە نێـوان پلـەکانی بەختەوەرییەکان و ناخۆشییەکان هـەروەك جیاوازیـشی دانـاوە لـە نێـوان پلـەکانی زانست و کاروکردەوەکان و هێز و توانایی و رەوشتەکانی.

جا هەر کەسێك ناسی وەك پێویست شایەتی بدات (أشهد أن لا إله إلاّ الله وحدَهُ لا شَريكَ له) کەوا خاوەنی هەموو شتێکە، وە هـەموو حەمـد و سوپاسـگوزارییەك

تەنها بۆ ئەوە، هەموو خێر و چاکەیەك بەدەست ئەوە،هەموو کار و فەرمانێك دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو، و هەموو هێز و توانەیەکیش تەنها شایەنی ئەوە، و هەموو قەزا وقەدەرێکیش بەدەست ئەوە، هەموو عیزەتێکیش، وەهەموو حیکمەتێکیش وە هەموو تەواوکارییەکی رەهاش لە هەموو رووەوە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، بە عیلم و زانستی خۆش راستی پێغەمبەر و نێردارەوەکانی خۆی ناسیوە، ئەوەی بۆ ئەوان هاتووە ئەوە راست و رەوایە، کەوا بیرمەند و زاناکان شایەتی بۆ دەدەن، ئەوەی بۆ ئەوان هاتووە ئەوە راست و رەوایە کەوا بیرمەند و زاناکان شایەتی بۆ دەدەن، ئەوەی سەرپێچی بکات ئەوە ناڕەوا و گومڕایە، وە سەرکەوتن و یارمەتیش لەلایەن خواوەیە.



## ئایا رۆحی مردووەکان سوود بە شتێك لە هەوڵ و کۆشیی زیندوەکان دەبینێت یاخود نا؟

وەڵامەش کەوا ئەو سوود بە دوو کاروفەرمان دەبینێت لە هەوڵ و کۆششی زیندووەکان کە لە نێوان ئەهلی سوننە لە بیرمەند و زانیان وە ئەهلی حەدیس و تەفسیر لەسەری رێککەوتوون:

یەکەمیان: ئەو کارەی کە مردوو لە ژیانیدا ببوە هۆیە بۆ ئەو.

دووەمیان: نزا و پاڕانەوەی موسڵمانان بۆ ئەو، وە داوای لێخۆشبوون بۆ ئەوە، وە خێر و چاکەکردن، و حەجکردن لەسەر خێر و چاکەیەك کەوا پەیوەندی بە پاداشتەکەی هەیە ئایا پاداشتی بەخشین بێت یاخود پاداشتی کارو کردووە بێت؟ جا لەلای جەماوەر بە گشتی پاداشتی کار وکردەوەکە بە خۆی دەیگاتێ، و لەلای هەندێ حەنەفیەکان بەڵکو پاداشتی بەخشین دەیگاتێ.

ناكۆكی و جیاوازییان له عیبادەتی جەستەی وەك رۆژوو و نوێـژ و خوێندنـەوەی قورئان و یادكرنەوەی خوا و تەسـبیحات، مەزهـەبی ئیمـام ئەحمـەد و جـەماوەری پێشینەكان ئەم سوودەی دەگاتێ، ئەمەش وتەی هەندێ له یارانی ئەبی حەنیفەیە.

ئیمام ئەحمەد دەیگەرێنێتەوە پاڵ ریوایەتی محەمەد كوری یەحیا الكمال دەڵێت: به ئەبی عبدالله وترا: پیاوێك كارێك دەكات لـه خێـر و چاكه لـه نوێـژكردن یـاخود سەدەقه و چاكەیەك یاخود هەر شتێكی دیكە، ئایا نیوەی بـۆ بـاوكی یـاخود بـۆ دایكی دەچێت؟

وتی: تكا دەكەم، یاخود وتی: مردوو هەموو شتێكی پێ دەگات له خێر و چاكه یاخود شتی تر، هەروەها دەڵێت: سێ جار ئایەتی كورسی بخوێنـه، وە ئایـەتی قـل هو الله أحد، بڵێ: خودایه خێری بۆ خاوەنی ئەو گۆرستانه بێت.

زانراویشـه لەمەزهەبی شافیعی و مالیكی ئەو خێره ناگات به مردوو.

هەندێك له ئەهلی بیدعه و ئەهلی كەلام دەڵێت بەهیچ جۆرێك نه نزا و پارانەوە وە نه شتی دیكه لەو بابەته ناگات به مردوو.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: (مَنْ سنَّ خيراً فاستُنَّ به كان لهُ أجرهُ، ومـن أجـور من يتبعه غير منتقص من أجورهم شيئاً، ومن سنّ شـراً فأسـتنّ ، بـه كـان عليـه وزره، ومن أوزار من يتبعه غير منتقص من أوزارهم شيئاً) [٢٢٧].

واته: (هەر كەسێك خێر و چاكەیەكی كرد و جا پەیرەوی كـرد ئـەوا پاداشـتەكەی وەردەگرێـت، ئـەوەی شوێنیـشی دەكـەوێت پاداشـتەكەی لـێ كـەم نابێتـەوە، وە هەركەسێك شەڕ و خراپەیەكی كرد و پەیڕەویش پێ كرد، ئەو شوێنیـشی دەكـەوێت گوناهەكانی هەڵدەگرێت و له گواناهەكەی ئەویش كەم نابێتەوە).

---

[٢٢٧] مسند: ٤/٣٨٧

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ : (لا تقتل نفساً ظلماً إلاّ كان على إبن آدم الأول كفلٌ من دمّها، لانه أول من سنّ القتل) [٢٢٨]. واتە: (هیچ کەسێك بەستەم مەکوژن ئیلا بەشێك دەگەڕێتەوە بۆ کوڕی ئادەم کە قابیل بوو هابیلی برای کوشت کەوا ڕێبازی کوشتنی دانا)

جا ئەگەر بۆ ئەمە سزا و تۆڵە سەندنەوە هەبێت، ئەوا بۆ چاکەو پاداشات و خێردا لە پێشترینیانە و شیا وترینیانە.

❊❊❊

## بەڵگە لەسەر سوود وەرگرتنی مردوو بە نزا و پاڕانەوە

بەڵگە و سەلماندیشی لەسەر سوود پێگەیاندنی کەوا دەبێتە هۆکارێك لە قورئان و سوننە و یەکدەنگی و بنەماکانی شەرعدا هاتووە، جا لە قورئاندا خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ﴾ (الحشر: ١٠) واتە: (ئەوانەش کە بە شوێن کۆچبەران و پشتیوانانندا هاتن (تا کۆتایی دونیا ئەمە دوعا و نزیایە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمە و لە برایەکانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئێمەیان گرتەبەر). خوای پەروەردگار حەمد و سەنای ئەو کەسانە دەکات بۆ ئیماندارەکانی پێش خۆیان بە نزا و پاڕانەوە بۆیان جا ئەمیش بەڵگەیە لەسەر سوود و گەیاندنیان بە نزا و پاڕانەوەی زیندووان.

دەکرێت بووترێ: بەڵکو ئەو لەوانە بە نزا و پاڕانەوەی ئەوان سوودیان پێگەیشتووە، چونکە پێش ئەوان کەوتوون لە ئیمان و و باروەڕدا، جا کاتێ شوێنیان کەوتن هەروەك پەیڕەکان بوون لە بەدەست هێنانی بۆیان، بەڵام سەلمێراوە

[٢٢٨] مسلم : ١٦٧٧

لەسەر سودپێگەیشتنی مردوو بە نزاو پاڕانەوەی یکدەنگی خەڵکان لەسەر دوعـا و پاڕانەوە بۆی لە نوێژی جەنازەدا.

لەحەدیسێکدا ئەبی هورەیرە (رەزای خوای لـیّ بێـت) دەڵێـت پێغەمبـەرﷺ) فەرموویەتی: (اذا صَلّيتم علی الميت فاخلـصوا لـه الـدعـاء) [٢٢٩]. واتـە: (ئەگـەر نوێژتان لەسەرمردوو کرد ئەوا بە دڵسۆزی دوعای بۆ بکەن).

لە سەحیحێکی موسلم دا لە حەدیـسێکی عـەوف کـوڕی مالیـك دەگێڕێتـەوە، پێغەمبەرﷺ) نوێژی لەسەر جەنازەیەك دەکـرد منـیش دوعایـەکم لەبـەر کـرد، پێغەمـبەرﷺ) دەیفەرموو: (اللّهُم أغفر له وأرحمـهً وعافـهُ وأعـف و عنـه، وأکـرم نزلهُ، وسّع مدخلهُ، واغلبيه بالماء والثلج والبرد، ونقهً من الخطايا كما نقّيت الثـوب الأبيض من الدّنس، وابدله داراً خيراً من داره، واهلاً خيراً مـن أهلـه وزوجاً خـيراً من زوجة، وأدخلهُ الجنة، وأعدهُ من عذاب القبر وعذاب النار) [٢٣٠].

واتە: (خودایە لێی خۆش ببە و رەحمێکی پێ بکە، لێی ببورە لە گونـاهی بـسڕەوە، وە شوێنێکی باشی بدەرێ لە بەهەشت و گۆڕی فراوان بکەن بە ئاو و بەفر و تـەرزە بیشۆرە لە گوناهەکانی پـاکی بکـەرەوە هـەر وەك کراسـی سـپی لـە پیـسی پـاك دەبێتەوە، و شوێنی بگۆڕە باشتر لەو شوێنەی ئیستای، کـەس و کـاری باشـتر لـە کەس و کارەکەی، وە هاوسەرێك باشـتر لـە هاوسـەرەکەی، و بیخـەرە بەهەشـت و بیپارێزەی لە سزای گۆڕ و سزای ئاگر).

لە وائلة بن الاسقع دەگێڕێتـەوە دەڵێـت: پێغەمبـەرﷺ نوێـژی لەسـەرپیاوێك دەکرد لە موسڵمانان جا گوێم لیّ بوو دەیفەرموو: (اللهُم أن فلاناً بن فلان في ذمتكّ

---

([٢٢٩]) ابو داود ریزایەتی کردووە (٣١٩٩).

([٢٣٠]) موسلم ریوایەتی کردووە: (٩٦٣)

وحبل جوارك، فقه من فتنة القبر وعذاب النار، وانت هذا الوفاء والحق، فأغفر له وارحمهُ إنه غفور الرحيم) [٢٣١].

واته: (خودایه ئەوه فلاّنی کوڕی فلاّن له ئەستۆی تۆ و لەژێر چاودێری و بەهاناوه چوونی تۆدایه، جا له فیتنه و ئاشوبی ناوگۆڕو سزای ئاگر بیپارێزه، تۆش خاوەنی پەیمان و راستی و رەوایت، لێی خۆش ببه و رحمی پێ بکه و به راستی تۆ پەروەردگارێکی لێبووردە و بەزەیی).

ئەمەش زۆره له حەدیسەکان، بەڵکو مەبەستی لەنوێژکردنه لەسەر مردووەو هەروەها نزا و پاڕانەوه بۆی له دوای بەخاك سپاردنی.

له حەدیسێکی عوسمانی کوڕی عەففانﷺ دەڵێت: پێغەمبەرﷺ ئەوکاتەی له خاکسپاردنی مردوویەك دەبووەوه لەسەری دەوستا و دەیفەرموو: (أستغفروا لأخيكم، وأسالوا له التثبت فأنه الآن يُسال) [٢٣٢].

واته: (داوای لێخۆشبوون بۆ ئەو برایەتان بکەن و داوا لەخوا بکەن چەسپاو بێت لەسەر وەلاّمەکانی، چونکه ئێستا ئەو پرسیاری لێ دەکرێت).

هەروەها نزا و پاڕانەوه لەبۆیان لەکاتی سەردانی کردنی گۆڕەکانیان، هەروەك له سەحیحی موسلم دا له حەدیسێکی بریدەی کوڕی خەصیب دا هاتووه دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فێری دەکردن ئەگەر چوون بۆ گۆڕستان بڵێن: (السلام عليكم يا أهل الدار من المؤمنين والمسلمين، وإنا إنشاء الله بكم لاحقون، نسأل الله لنا ولكم العافية) [٢٣٣].

واته: (سەلاّمی خواتان لێ بێت ئەی خاوەن ماڵ له ئیمانداران و موسڵمانان، وه ئێمەش بەویستی خوای گەوره پێتان دەگەین ، رەحمی خوای گەوره له وانەی پێش

---

[٢٣١] سنن أبي داود: (٣٢٢١).

[٢٣٢] سنن أبي داود: (١٥٤٧).

[٢٣٣] مسلم: ٩٧٤

ئێمە و پاش ئێوەش بێت، داوا لەخوای گەورە دەکەم لە ئێمەو لە ئێوەش خۆش ببێت).

لە سەحیحی موسلم دا هاتووە کەوا عائیشە﵁ پرسیاری کرد لە پێغەمبەرﷺ ئەگەر داوای لێخۆشبوون لە خاوەنی گۆڕستان بکەم چی بڵێم؟ فەرمووی: (قولي: السلام على أهل الديار من المؤمنين والمسلمين، ويرحم الله المستقدمين منا والمستأخرين، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون)

واتە: (بڵێ: سەلامی خوای گەورە لە ئێوە ئەی خاوەن ماڵ لە ئیمانداران و موسڵمانان، وە خوای گەورە ڕەحم بەوانەی لە پێش ئێوەش و لەدوای ئێوەش بکات، انشاء الله ئێمەش پێتان دەگەین).

هەر لە سەحیحەکەیدا، لە عائیشە﵁ دەگێڕێتەوە پێغەمبەرﷺ لە شەوێك لە دوا شەوەکانیدا بۆ بەقیع دەرچوو، جا فەرمووی: (السلام عليكم دار قوم مؤمنين، وأتاكم ما توعدون غداً مؤجلون، وإنا إن شاء الله بكم لاحقون، اللهم أغفر لأهل بقيع الغرقد) [٢٣٤].

واتە: (سەلامی خوای گەورە لە ئێوە ئەی خاوەن ماڵ لە ئیمانداران، وە ئێمەش سبەی پێتان دەگەین بەو بەڵێنەی بە ئێوە و ئێمەش دراوە، وە انشاء الله ئێمەش پێتان دەگەین، خودایە لە ئەهل و دانیشتوانی بەقیع الغرقد خۆش ببە).

پێغەمبەرﷺ بەکار و کردەوە و فێرکردنیش دوعا و پاڕانەوەی بۆ مردووەکان کردووە، و نزا وپاڕانەوەی سەحابە و شوێنکەوتوانی و وە موسڵمانانیش سەردەم لە دوای سەردەم زیاترە لەوەی باسکراوە، زۆرتریشە لەوەی ئینکاری دەکات، لە کاتێکدا خوای گەورە دێت پلەی بەندەیەك لە بەهەشتدا بەرز دەکاتەوە، جا دەڵێت: ئەمە لە کوێ بوو؟ پێی دەوترێت: ئەمە بە نزا و پاڕانەوەی کوڕەکەتە بۆ تۆ[٢٣٥].

---

(٢٣٤) مسلم: ٩٧٤

(٢٣٥) مجمع زوائد: ١٠/٢١٠

## (لە گەیشتنی پاداشتی خێر و چاکە کردن بۆ مردوو)

بەلاّم پاداشتی خێر و چاکە دەگات بە مـردوو، چـاکە لـە دوو سـەحیحەکە لـە عائیشەوە رضي الله عنها دەگێڕێتـەوە: پیاوێـك هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا دایکم لەناکاو مرد و وەسیەتیشی نەکرد، وا گومان دەبـەم ئەگـەر قسەی کردبا ئەوا وەسیەتی خێر و سەدەقەی دەکرد، ئایا ئەگەر خێر و سەدەقەی بۆ بکەم کرێ و پاداشتی بۆی هەیە؟ فەرمووی (بەڵێ)[236].

لە سەحیحی بوخاریدا لە عبـداللە ی کـوڕی عـەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتـەوە: کـەوا دایکـی سـەعدی کـوڕی عبـادە مـرد، لـەو کاتـەدا ئـەو لای نـەبوو، هاتـە لای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دایکی وەفاتی کردووە، منـیش لـەلای نەبووم، جا ئایا سوودی پێ دەگات کەوا خێر و چاکەی بۆ بکەم؟ فەرمووی (بەڵێ).

لە سـەحیحێکی موسـلمدا لـە ئـەبی هـورەیرەوە رضي الله عنه دەگێڕێتـەوە: پیاوێـك بـە پێغەمبەری وت ﷺ: باوکم مرد پارە و سـامانێکی زۆری بەجێهێـشت، وەسـیەتی نەکرد، ئایا دەکرێت لەجیاتی ئەو خێر ی بۆ بکەم؟ فەرمووی : (بەڵێ)[237].

لـە سـوننەتەکاندا و مەسـنەدی ئیمـام ئەحمـەد، لـە سـەعدی کـوڕی عبـادە، دەگێڕێتەوە: دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا دایکی سەعد مرد و کامە خێر و چـاکە باشە بۆ؟

فەرمووی (ئاو)، جا بیرێکی هەڵکەند وە فەرمووی: (هذه لأم سعد)[238]. واتـە: (ئەمە بۆ دایکی سەعدە).

---

(٢٣٦) مسلم: ١٠٠٤

(٢٣٧) مسلم: ١٦٣٠

(٢٣٨) مسند أحمد: ٧/٦، ئبن ماجه: ٣٦٨٤، وه ترمزي: ٦٦٩

له عبدالله ی کوڕی عەمرو کەوا عاصی کوڕی وائـل لـه سـەردەمی نەزانینیـدا نەزری کرد سەد وشتری بکاتە قوربانی، بەلاّم هیشامی کـوڕی عـاص لەبەشـەکەی پەنجای کردە قوربانی، بەلاّم عەمر لەو بارەیەوە پرسـیاری کـرد لـه پێغەمبـەر جـا فەرمووی: (أما أبوك فلو أقر بالتوحيد فصمت وتـصدقت عنـه نفعـه ذلـك) [٢٣٩].
واتـه: (ئەگـەر باوکـت لەسـەر یەکتاپەرسـتی جـێگیر بووایـه جـا رۆژ و گـرتن و سەدەقەکانت لەجیاتی ئەو سوودی بۆ ئەو دەگەیاند).
ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردوە.



## له گەیشتنی پاداشتی رۆژوو گرتن بۆ مردوو

بەلاّم گەیـشتنی پاداشـتی رۆژوو لـه هـەردوو سـەحیحەکە لـه عائیـشەوە دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من مات وعليـه صـيام صـام عنـه وليّه) [٢٤٠].
واتە: (هەرکەسێ مردوو و رۆژووی لەسەر بوو ئەوە دەبێت سەرپەرشتیاری لەجیاتی رۆژووی بگرێتەوە).
هەروەها لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە، ئیبن عەبباس دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك هاتە لای خزمـەتی پێغەمبـەر ﷺ وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا دایکـم مردووە و رۆژووی مانگێکی لەسەرە، ئایا لـەجیاتی بیگرمـەوە؟ فـەرمووی: (نعم فدين الله أحق أن يقضى) [٢٤١]. واتە: (بەڵێ بێگومان قەرزی خوا لەهەمووی هەقترە بگەرێتەوە).

---

[٢٣٩] مسند أحمد: ٢/١٨٢.
[٢٤٠] مسلم: ١١٤٨
[٢٤١] مسلم: ١١٤٨

له ریوایه‌تێکی دیکه‌دا، ئافره‌تێك هاته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌رﷺ جا وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا دایکم مردووه و که‌چی رۆژووی نه‌زری له‌سه‌ره، ئایا له جیاتی بیگێڕمه‌وه؟ فه‌رمووی (أفرأيت لو كان على أمك دين فقضيته أكان يؤدي ذلك عنها؟).

واته: (ئایا ئه‌گه‌ر بینیت دایکت قه‌رزی یه‌کێکی له‌سه‌ره ئایا ئاماده‌ی له جیاتی بیده‌یته‌وه؟)

ئافره‌ته‌که وتی: به‌ڵێ، پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: (فصومي عن أمك). واته: (ئینجا که‌واته له جیاتی دایکت به‌رۆژوو به).

ئه‌م وته‌یه‌ش هی بوخارییه و لێکدانه‌وه‌که ته‌نها هی خۆیه‌تی.

له به‌ریده‌رضي الله عنه ده‌گێردرێته‌وه و ده‌ڵێت: من له‌لای پێغه‌مبه‌رﷺ دانیشتبووم، ئافره‌تێك هاته‌خزمه‌تی وتی: من خێرێکی نه‌بڕاوه‌م بۆ دایکم کردووه، دایکم مرد جا پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: (وجب أجرك وردّها عليك الميراث).

واته: (تۆ خێره‌که‌ت کرد و میراته‌که‌ش بۆ تۆ گه‌ڕایه‌وه).

جا وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ وه ئه‌و رۆژووی مانگێکی له‌سه‌رد ئایا له‌جیاتی بیگرمه‌وه؟

فه‌رمووی: (صومي عنها) واته: (رۆژووه‌که‌ی له جیاتی بگره‌وه)، ئافره‌ته‌که وتی: ئه‌و هه‌رگیز حه‌جی نه‌کردووه، ئایا له‌جیاتی ئه‌و حه‌جی بۆ بکه‌م؟ فه‌رمووی: (حجي عنها) [٢٤٢]. واته: (له جیاتی ئه‌و حه‌ج بکه‌). موسلیم ریوایه‌تی کردووه، له وته‌یه‌کی تردا هاتووه دوو مانگ به‌رۆژوو به.

له ئیبنوعه‌بباس‌رضي الله عنه ده‌گێردرێته‌وه: (که‌وا ئافره‌تێك سواری که‌شتیه‌کی ده‌ریا بوو نه‌زری کرد ئه‌گه‌ر خوای گه‌وره رزگاری بکات ئه‌وا مانگێك به‌رۆژوو ده‌بێت، جا خوای گه‌وره رزگاری کرد، به‌ڵام تاوه‌کو مرد به‌رۆژوو نه‌بوو، ئینجا کچه‌که‌ی یان

---

(٢٤٢) مسلم: ١١٤٩

خوشکەکەی هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئینجا فەرمانی دا کەوا لەجیاتی بەرۆژوو بێت [٢٤٣]. ئەهلی سوننە و ئیمام ئەحمەد ریوایەتی کردووە.

هەروەها لە پێغەمبەرﷺ دەگێردرێتەوە لە گەیشتنی خێر و پاداشتی رۆژووگرتن لە جیاتی مردوو یاخود پێدانی خۆراك بۆ فەقیر و هەژار.

لە سوننەدا لە ئیبنو عومەرﷺ دەگێردرێتەوە، کەوا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من مات وعليه صيام شهر فيطعم عنه لكل يوم مسكين) [٢٤٤].

واتە: (هەرکەسێ مردوو رۆژووی مانگێکی لەسەر بوو ئەوا دەبێت لەجیاتی ئەو لەهەر رۆژێکدا خواردنی هەژارێك بدات).

ترمزی و ئیبن ماجە ریوایەتیان کردووە، ترمزی دەڵێت: ئێمە نازانین لە کوێوە بەرزکراوەتەوە تەنها لەم روودوە نەبێت، راستیەکەش لە ئیبن عومەر هاتووە لە وتەکەیدا وەستێنراوە (موقوفاً).

لەسوننەتی ئەبی داود، لە ئیبنو عەبباس دەگێڕێتەوە دەڵێت: ئەگەر یەکێك لە مانگی رەمەزان نەخۆش کەوت و پاشان مرد و رۆژووی نەگرت لەجیاتی ئەو خواردن بدەن، وە گێڕانەوەی رۆژووی بۆ نابێت، بەڵام ئەگەر نەزری کردبوو ئەوا دەبێت سەرپەرشتیارەکەی بۆی بگێڕێتەوە [٢٤٥].

***

---

(٢٤٣) مسند احمد: ٢/٢١٦

(٢٤٤) ترمزی (٧١٨)، ابن ماجه ١٧٤٧

(٢٤٥) سنن ئەبی داود (٢٤٠١)

## (لە پێگەیشتن و دەستکەوتنی خێرو پاداشتی حەجکردن)

لەبارەی پێگەیشتن و پاراستی حەجکردن بۆ مردوو، لە سەحیحی بوخاریدا، لە ئیبنو عەباس‌ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێك لە جەهینە هاتە لای پێغەمبەرﷺ و پێی ووت: دایکم نەزری کردبوو حەج بکات بەڵام تاکو مرد حەجی نەکرد، ئایا من لەجیاتی ئەو حەج بکەم، فەرمووی: ((حجي عنها، أرأيت لو كان على أمك دين أكنت قاضيته؟ أقضو الله فالله أحق بالوفاء)) [٢٤٦]. واتە: ((لەجیاتی ئەو حەج بکە، ئایا ئەگەر بینیت قەرزێك لەسەر دایکت هەبوو ئایا تۆ بۆی دەدەیتەوە؟ قەرزی خوا بدەنەوە چونکە لە هەموو کەس مافی زیاترە وەفاداربیت بەرامبەری)).

هەروەها حەدیسی بەریدەش پێشتر باسکرا کە تێیدا هاتووە: دایکم هەرگیز حەجی نەکردووە، ئایا لەجیاتی ئەو حەج بکەم؟ فەرمووی: ((لەجیاتی ئەو حەج بکە)).

لە ئیبنو عەباس‌ﷺ دەگێڕدرێتەوە: خێزانی سنان کوڕی سلمه الجهنی پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد: کەوا دایکی مردووەو حەجی نەکردووە، ئایا خێرو پاداشتی بۆی هەیە حەجی لەجیاتی بکات؟ فەرمووی: ((نعم. لو كان على أمها دين فقضته عنها ألم يكن يجزيء عنها)) [٢٤٧]، واتە: ((بەڵێ، ئەگەر لەسەر دایکی قەرزێك هەبێت و لەجیاتی بیداتەوە ئایا پاداشتی بۆ نابێت؟)). نسائی ڕیوایەتی کردووە.

دیسان لە ئیبنو عەباس ڕیوایەت کراوە: ئافرەتێك لەبارەی باوکیەوە کە مردبوو پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد کەوا حەجی نەکردبوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((حجّي عن أبيك)) [٢٤٨]، واتە: لەجیاتی باوکت حەجی بۆ بکە دیسان لەوێوە ڕیوایەت کراوە، پیاوێك ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باوکم مردووە هیچ حەجی

---

([٢٤٦]) فتح الباري: ١٣/ ٢٩٦.

([٢٤٧]) مسند أحمد: ١/ ٢١٢.

([٢٤٨]) النسائي: ٥/ ١١٨.

نەکردووە ئایا لەجیاتی ئەو حەجی بۆ بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((أرأيت لو كان على أبيك دين أكنت قاضيته؟)). واتە: ((ئایا بینیووتە لەسەر باوکت قەرزێك هەبێت دابێتتەوە؟))، ووتی: بەڵێ، فەرمووی ((فدين الله أحق)) [249]. وە تەواوی موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا دانەوەی قەرز لە ئەستۆی مردووەکە دەکەوێت ئەگەرچی لە کەسێکی بیانیش بێت کە لەلای مابێتەوە، کەوا حەدیسی ئەبی قتادە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کاتێك مردووێك دوو دیناری قەرزی لەلا مابوو، کاتێك بۆیان دایەوە پێغەمبەرﷺ لەبارەیەوە فەرمووی: ((الآن بردت عليه جلدته)) [250]. واتە: ((ئێستاکە سزاو ئازار لەسەر پشتی سارد کرایەوە)).

هەمووش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەوا زیندوو ئەگەر مردووی لە ئەستۆدابوو ئەوە مافێکە لە مافەکان سەرفرازی بکات و سوودی پێبگەیەنێت و لە تاوان ڕزگاری بکات تا ئەو کاتەی لە ئەستۆی زیندوو دەکەوێت.

جا ئەگەر لە ئەستۆو دەستەبەری زیندوو کەوت بە دەق و بە کۆدەنگ لەگەڵ ئەوەش بەخۆی ئەوەی لەسەریەتی ئەنجامی بدات ئەگەرچی پێی ڕازی نابێت بەڵکو بۆی دەگەڕێتەوە، جا لابردن و پەڕاندنی لە ئەستۆی مردوو بە ڕزگاربوونە لەبەر ئەوەی ناکرێت لەپێشتر و باشتر بەجێ بهێندرێت. وە ئەگەر سوودی گەیاندن بە ڕزگاربوون و لابردن وە هەروەها سوود دەگەیەنێت بە خەڵات و بەخشین، جیاوازی لەنێوانیاندا نییە چونکە پاداشتی کارو کردەوە مافێکی پێشکەشکراوێکی بەخشندەیە، جا ئەگەر داینا بۆ مردوو ئەوا بۆ ئەو دگوازرێتەوە. هەروەك هیچ مافێك لەسەر مردوو نیە لە قەرز و قەرزدانەوە و شتی لەو بابەتە ئەمەش مافێکی پاكو پوختی زیندووە، جا ئەگەر گەردنی ئازادکرد ئەوا گەردن ئازادی و ڕزگاربوونیەکەی دەگاتێ، لەدەستەبەر و ئەستۆی دەکەوێت، ئینجا هەردووکیان

---

[249] النسائي: ٥/ ١١٨.

[250] مسند أحمد: ٣/ ٣٣٠.

مافێکه بۆ زیندووەکە، جا چ دەقێك یاخود پێوەرێك یاخود یاسایەك لـە یاسـاکانی شەرع پێویست دەکات بە گەیشتنی یەکێکیان و قەدەغەکردنی گەیشتنی ئەویتر؟

ئەو دەقانەش دیار و ئاشکران لەسەر گەیشتنی خێرو پاداشتی کردەوەکـان بـۆ مردوو ئەگەر کەسی زیندوو ئەو کارو کردەوانەی لەجیاتی بۆی کرد، ئەمـەش ئـەو پەڕی پوخت و ڕاستی پێوەرە، چونکە خێرو پاداشت مافێکه بۆ بکەر.

پێغەمبەرﷺ ئاگاداری کردۆتەوە بە گـشتی خێـر و پاداشـتی ڕۆژوو گـرتن ئەمەش تەنها وازهێنان و مەبەستە بە دڵ پێی هەڵدەستێ کەسیش تێـی ناڕوانێـت تەنیا خوای گەورە نەبێت، و بەکارکردنی ئەندامانی لەش نیـە لەسـەر گەیـشتن بـە پاداشت و چاکە کەوا ئەمەش کارکردن بە زمان و گوێگرتن و بەچاو بینین بەڕێگای یەکەم.

بەشێوەیەکی ڕوونتر ڕۆژوو گرتن نیەت و مەبەستێکی پوخت و پاراوە، وە خـۆ گرتن لەشتە دروستکراوەکان، ئەوکاتە خودای گەورە خێر پاداشتەکەی دەگەیـەنێت بە مردووەکە جا چۆن بە خوێندنەوەیەك کەوا ئەمەش کاروکردەوە و نیەتە، بـەڵکو ناشبێتە هۆکارێك بۆ نیەت و مەبەست، جا گەیشتنی پاداشـتی ڕۆژوو بـۆ مـردوو ئاگادارکردنەوەی تێدایە لەسەر گەیشتنی گشت کارو کردەوەکانی دیکە.

خواپەرستیش دوو بەشە: سامانی و دارایی، وە جەسـتەیی. قـسەی شـەقام و گشتی ئاگاداری کردۆتەوە بە گەیشتنی پاداشتی خێـرو سـەدەقە، دەڵێـت: لەسـەر گەیشتنی گشت خوا پەرستیە داراییەکان، وە ئاگاداری کردۆتـەوە بـە پێگەیـشتنی پاداشتی ڕۆژوو گرتن لەسەر گەیشتنی پاداشتی گشت خوا پەرستیە جەستەییەکان، وە هەواڵی داوە بە گەیشتنی پاداشتی حەجکردنی ئاوێتە و کـۆکراوە لـە دارایـی و جەستەیی، جا هەرسێ جۆرەکان جێگیرە بە دەق و گرنگـی پێـدان. وە یارمـەتی و هاوکاریش بە خودای بەخشندەو دلۆڤان.

ئەوانەی بەرهەڵستکاری دەکەن لە گەیشتن دەڵێن: خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ (النجم: ٣٩). واتە: ((بەڕاستی ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێك نیە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆی کردوویەتی))، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (یس: ٥٤)، واتە: ((خەڵکینە دڵنیابن کە تەنها پاداشتی کارێك دەدرێتەوە کە دەتانکرد))، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ (البقرە: ٢٨٦)، واتە: ((هەرکارێکی چاك ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هەر خراپەیەکی کردبێت تەنها بەخەی خۆی دەگرێت))، وە لە پێغەمبەردوەﷺ جێگیر بووە کەوا فەرموویەتی: ((إذا مات العبد إنقطع عمله إلا من ثلاث: صدقة جارية عليه، أو ولد صالح يدعوا له، أو علم ينتفع به من بعد موته)). واتە: ((ئەگەر بەندەیەك مرد کارو کردەوەکانی دەپچڕێت تەنها لە سێ شتدا نەبێت: خێر و چاکەیەکی نەوەستاو و بەردەوام، یاخود کوڕێکی چاك و لەبار نزاو پاڕانەوەی بۆ بکات، یاخود زانستێك لە دوای مردنیدا سوودی پێ بگەیەنێت)).

هەروەها لە حەدیسێکی ئەبی هورەیرەوە کە باسکراوە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((إن مما يلحق الميت من عمله و حسناته بعد موته علماً نشره)) ئەم حەدیسە بەڵگە لەسەر ئەوەی کەوا لەڕاستیدا هۆکارێك بووە بۆ سوود پێگەیاندنی.

هەروەها حەدیسی ئەنەس دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((سبع يجري على العبد أجرهُنَّ، وهو في قبره بعد موته: من علّم علماً، أو أكرى نهراً، أو حفر بئراً، أو غرس نخلاً، أو بنى مسجداً، أو ورَّث مصحفاً، أو ترك ولداً صالحاً يستغفر له بعد موته)) [٢٤١]، واتە: ((حەوت شت هەیە لەسەر بەندە خێر و پاداشتەکەی بەردەوامە، ئەمەش لە دوای مردنیدا لەناو گۆڕەکەیەتی: هەرکەسێ یەکێکی فێری زانستێك بکات، یاخود ڕووبارێك بەکرێ بدات، یاخود بیرێکی ئاو

(٢٤١) مجمع الزوائد: ١٦٧/١.

هەڵکەوێت، یاخود دار خورمایەك بچێنێت، یـاخود مزگـەوتێك دروسـت بکـات، یاخود پەرتووکێکی بەسوود بەجێ بهێڵێـت، یـاخود منـداڵێکی چـاك و ئیمانـدار بەجێ بهێڵێت لەدوای مردنیدا دوعای بـۆ بکـات)). ئەمـەش بەڵگەیەکـە لەسـەر ئەوەی جگە لەوانە خێرو پاداشتی لێ دەستناکەوێت.

دەڵێن: بەخشینیش ناردن و گواسـتنەوەیە، گواسـتنەوەش لـە یەکێکـەوە بـۆ یەکێکی تر لە ڕاستیدا دەبێت بـە مـافێکی پێویـست، وە کـارو کـردەوەش خێـرو پاداشت واجب ناکات، لەبەر ئـەوەی ئەمـە تـەنها فـەزڵ و چـاکە و بەخـشینێکی خوایە، جا بەندە چۆن دەتوانێت خێرو چـاکە لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی دیکـە بگوازێتەوە تەنها لەسەر بەخشینێك کەوا لەسەر خوا پێویست نابێت، بەڵکو ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت دەیداتێ وە ئەگـەر ویستیـشی لەسـەر نـەبێت نایـداتێ وە ئەمەش هاوشێوەی هەژارێك وایە لەسەر ئەوەی تکاو نزا دەکات بـۆ ئـەوەی خێـرو چاکەیەکی پێبکەوێت.

دەڵێن: هـەروەها پەسـەندکردن و کەسـان ویـستیش بـە هۆکارەکـانی خێـرو پاداشت خراپ و بێزراوە، ئەمەش کەسانی خۆ نەویست و چاکە کاریش بە نزیکی و خزمایەتیە. جا چۆن چاکەکردن بە هەمان خێـر و پاداشـتە کـەوا ئەمـەش نیـاز و مەبەستە؟ جا ئەگەر چـاکەکاریش ناپەسـەند و نەویـستراو کـرد بـەهۆکارێك ئـەوا ئامانج و مەبەست لە پێشتر و باشترە.

هەروەها ئیمامی ئەحمەد دواکەوتن لەڕیزی پێشەوە بە قێـزەوەن دادەنێـت، وە پەسەند کردنیش بەشێکی دیکە دەکات، لەکاتێکدا لە هیواو ئارەزووی تێدایـە لـە هۆکاری خێرو چاکە دانەوە، لە ریوایەتێك ئیمام ئەحمەد دەڵێت: کاتێك لە پیاوێـك پرسیارکرا لە ڕیزی پێشەوە دوادەکەوێت و باوکی لـە جێگاکـەی دادەنێـت، ووتـی: شتێکی واگرنگ و سەیر نیە بۆ من، ئەمەش بۆ ئەوەی چـاکەیەك لەگـەڵ باوکیـدا بکات بێجگە لەمەش.

دەڵێن: هەروەها ئەگەر بەخشینیش بۆ مردوو ئاسان بوایە ئـەوا گواسـتنەوەی چاکە و بەخشین بۆ زیندوو ئاسانتر دەبوو.

هەروەها ئەگەر خەڵاتکردن و پێشکەشکردن گونجاو بوایە ئەوا پێشکەشکردنی چاکە واجب دەبوو لەسەرزیندوو، هەروەك پێشکەشکردنی خێرو چاکەی خۆبەخـشان دەکرێت بۆئەوەی کەوا خۆی بۆ بەخت دەکات.

دەڵێن: ئەرك و بارگرانی تـاقی کردنـەوەو گیرۆدەبـوون بـە لـەجیاتی دانـان و گۆڕینـەوە قایـل ناکرێـت و وەرناگیرێـت، وە مەبەسـتیش ئەوەیـە گوێڕایـەڵی و خواپاراستییەکەی ئەو تەنها بۆ خۆیـەتی، ئەگەرچـی دەتوانێـت سـوود بگەیـەنێت بەوەی لەو کارو کردەوەیەی دەیکات پێشکەشی کەسێکی دیکەی بکات و ئەمـەش خوای گەورە بۆخۆی لە هەموو کەس لە پێشترە بۆ ئـەم کـارە. لەڕاسـتیدا خـودای گەورە حوکمی داوە بەوەی کەوا کەس سوودمەند نابێت تەنها بە هـەوڵ و کۆشـشی خۆی. ئەمەش فەرمایشت و یاسای خوایە و بڕیاردانیشە لەسەر دروستکراوەکەی.

هەروەك ئەمەش بەرنامە و ڕێبازەکەیەتی لە فەرمان و یاسـاکەیدا، هـەروەها نەخۆشیش کەس لەجیاتی ئەو حەب و دەرمانی ناخواتەوەو برسی و تینووی نابێت، وە کەسی قەرزاریش هیچ کەسـێك لـەجیاتی ئـەو خـواردن و خواردنـەوەو پۆشـاك لەخۆی ناگرێتەوە.

دەڵێن: جا بۆئەمەش خوای گـەورە ڕازی نابێـت کەسـێك لـەجیاتی کەسـێك ئیسلامەتی بکات و وە یەکێك لـەجیاتی یـەکێکی دیکـە نوێـژبکات، جـا ئەگـەر سەری خواپەرستیەکان نەکرێت خێرو پاداشتەکەی ببەخـشرێت لـق و ڕێـچکەکانی چۆن دەبێت.

دەڵێن: بەڵام دوعا و پاڕانەوە ئەوا پرسیار و ئارەزوویەکە بۆلای خـوای گـەورە دەگەڕێتەوە کەوا چاکە و بەخشێشکە دەیکات لەسەر مردوو وە عـەفوی دەکـات و

لێیدەبووریت، ئەمەش بەخشش و پێشکەشکردنی خێر چاکەی کاری زیندووە بۆ مردووەکە.

دەڵێن: ئەوانەی بریتین لە گەیاندنی خواپەرستیەکان کەوا دەکرێت لەجیاتی ئەو ئەنجام بدرێت وەك سەدەقە و حەج و خواپەرستیەکان دوو جۆرن: جۆرێکیان لەجیاتی ئەو ئەنجام نادرێت بەهەر شێوەیەك وەك ئیسلام بوون و نوێژو خوێندنەوەی قورئان و ڕۆژوو گرتن. ئەم جۆرەش خێرو چاکەکەی تایبەتمەندە بە بکەرەکەی سەرپێچی ناکرێت و بۆشی ناگوازرێتەوە هەروەك ئەو لە ژیاندا کەس لەجیاتی ئەوی دیکە نەیدەکرد، جگە لە بکەرەکەش هیچ کەس لەجیاتی ئەو کارە کە ناکات.

وە جۆرێکیش لەجیاتی ئەو دەتوانرێت ئەنجام بدرێت وەك دانەوەی قەرز و دەرکردنی خێرو چاکە و حەجکردن جا ئەمە خێرەکەی دەگاتە مردوو" چونکە ئەو ڕازی دەبێت بە نوێنەرایەتی وە لەژیانیدا بەندە دەتوانێت لەجیاتی ئەو بیکات، جا پاش مردنیشی ئەوا دەبێتە ڕێگایەکی لەپێشتر و باشتر.

دەڵێن: بەڵام لە حەدیسێکدا ئەگەر یەکێك مردوو ڕۆژووی لەسەر بێت و سەرپەرشتیارەکەی لەجیاتی ئەو بەڕۆژوو بێت، ئەوا وەڵامەکەی لەچەند ڕوویەکەوەیە.

**یەکەم**: ئەوەی مالیك لە ((مؤطأ))ەکەی ووتویەتی، دەڵێن: کەس لەجیاتی کەس بەڕۆژوو نابێت، دەڵێن: ئەمەش فەرمانێکە هەموومان لەسەری کۆکین و جیاوازی و ناکۆکی تێدانیە.

**دووەم**: ئیبنو عەباس رضي الله عنه حەدیسێکی ڕۆژوو گرتنی لەبارەی مردوو ڕیوایەت کردووە، کەوا نسائی لەوی ڕیوایەت کردووە، محمد کوڕی عبد الاعلی بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە یزید کوری زریع، ئەویش لە حجاج الاموال، ئەویش لە أیوب کوڕی موسى، ئەویش لە عطاء کوڕی أبی رباح، ئەویش لە ئیبنو

عەباس ﷺ ووتی: کەس لەجیاتی کەس نوێژ ناکات و کەسیش لەجیاتی کەس ڕۆژوو ناگرێت[٢٥٢].

سێیەم: حەدیسێك هەیە کەوا ناکۆكو جیاوازن لە ئیسنادەکەیدا، خاوەنی ((المفهم في شرح مسلم)) [٢٥٣] ئاوای ووتووە.

چوارەم: کەوا نەیار و بەرهەڵسکارە بە دەقی قورئانی پیرۆز کە پێشتر باسمان کردووە لەم فەرموودەیەی خودای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ (النجم: ٣٩)

پێنجەم: نەیار و بەرهەڵسکارە بەوەی کە نسائی ریوایەتی کردووە، ئیبنو عەباس ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کەوا فەرموویەتی: ((لا يصلي أحد عن أحد ولا يصوم أحد عن أحد، ولكن يطعم عنه مكان كل يوم مداً من حنطة))، واتە: ((کەس لەجیاتی کەس نوێژ ناکات و کەسیش لەجیاتی کەس بە ڕۆژوو نابێت، بەڵام لەجیاتی ئەو خواردنی دەدرێتێ لەجێگای هەر ڕۆژێك چنگێك گەنم دەدرێت)).

شەشەم: نەیار و بەرهەڵستکارە بە حەدیسێکی محمد کوری عبدالرحمن کوری ئەبی لیلی، ئەویش لە نافع، ئەویش لە ئیبنو عمر ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت: ((من مات وعليه صوم رمضان يطعم عنه))، واتە: ((هەرکەسێك مرد وە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی لەسەر بێت لەجیاتی ئەو خواردن دەبەخشێت)).

حەوتەم: کەوا نەیارو بەرهەڵستکارە بە پێوەر و یاسایەکی دیارو ئاشکرا لەسەر نوێژ و ئیسلام و تەوبە کردن، بەوەی کەوا هیچ کەسێك لەجیاتی ئەوەی دیکە نایکات، شافعی دەڵێت لەوەی قسەی لێدەکرێت لەسەر گێڕانەوەی ئیبنو

---

([٢٥٢]) الموطأ: ١/ ٣٠٣.

([٢٥٣]) کە ئەویش ((أحمد کوری عمر القرطبي))ە لە ساڵی (٦٥٦)ك کۆچی دوایی کردووە.

عەباس: ئیبنو عەباس ناوی نەبردووە لەوەی کەوا دایکی سعد نەزری کردبوو، جا لەوانەیە نەزری حەجکردن یاخود عـەمرە یـاخود خێـر و سـەدەقەی کردبێـت، جا ئەمری کردووە بە گێڕانەوەو کردنی لەجیاتی ئەو، بەڵام هەرکەسێ نـەزری کـرد بـە نوێژ یاخود رۆژوو گرتن پاشـان مـرد ئـەوا لـەجیاتی ئـەو کـەفارەتی رۆژووەکـەی دەدات، بەڵام لەجیاتی ئەو بـەرۆژوو نابێـت، و لـەجیاتی ئـەویش نوێـژ ناکـات، و لەجیاتی ئەو کەفارەتی نوێژیش نادات.

پاشان ووتی: ئەگەر ووتیان: ئایا لـە پێغەمبـەرﷺ ریوایـەت کـراوە کـەوا فەرمانی کردبێت کەسێك لەجیاتی یەکێکی دیکە بـە رۆژوو بێـت؟ دەڵێـت: بـەڵێ ئیبنو عەباسﷺ لەپێغەمبەریﷺ گێڕاوەتەوە.

جا ئەگەر ووتیان: ئـەی بۆچـی حەدیـسێك نـا هێننـەوە؟ دەڵێـت: حەدیـسی زەهری، لە عبید الله گێردراوەتەوە، ئەویش لـە ئیبنـو عـەباسﷺ، ئـەویش لـە پێغەمبەرﷺ بە نەزر ، کە چی لەگەڵ زەهریدا هاتووە، وە عبیـد الله دانیـشتنی دوور و درێژی هەبووە لەگەڵ ئیبنو عەباس، جا کاتێك جگـە لـەو یـەکێکی دیکـە دێت، لە پیاوێکەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە ئیبنو عەباس مانای: هـیچ حەدیـسێك نیە بەو بچێت کەوا لەبەر کرابێت و پارێزراو بێت، ئەگەر ووتیان: ئایـا ئـەو پیـاوە دەناسیت کەوا ئەو حەدیسەی هێناوە هەڵەی کردبێت لە گێڕانەوەی لە لایەن ئیبنـو عەباس؟ دەڵێن: بەڵێ، هـاوەڵانی ئیبنـو عـەباس ریوایـەتیان کـردووە، لـە ئیبنـو عەباسەوە کەوا لەبارەی ئیبنو زوبێر دەڵێت: کەوا ئیبنو زوبیر لـە ((متعـة الحـج)) گێڕاوەیەتیەوە، ئەوەش ریوایەت دەکـات کـە لـە ئیبنـو عـەباس وەرگـیراوە کـەوا ((متعة النساء))ە، ئەمەش هەڵەیەکی نا پەسەند و بێمانایە.

ئەمە وەڵامێکە لـەبارەی گرتنـی رۆژوو، بـەڵام کـرداری حـەجکردن لەوانـە پاداشتی ماڵ بەخشین پاداشتەکەی پێی بگات، بەڵام کردارەکانی شێوازو جۆرەکـان کە ئەمەش وەك کردارەکانی نوێژکردن لەوانەیە بکەوێتە سەر بکەرەکەی.

((أصحاب الوصول)) دەڵێت: ئەوەی باستان کرد شتێکی وای تیانیە نەیارو بەرهەڵستکاری بەڵگەی قورئان و سوننەو ڕێککەوتنی پێشینەی ئوممەت و پێویستیەکانی یاساکانی شەرع بێت، ئێمە وەڵامی هەموو ئەوانە دەدەینەوە کەوا باستان کردووە لە ویژدان و دادپەروەری.

بەڵام ئەو فەرموودەیەی خودای گەورە: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ (النجم: ٣٩)، واتە: ((بەڕاستی ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێك نیە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆی کردوویەتی))، لە ڕاستیدا خەڵکی جیاوازی لە شێوەی لێکدانەوەی مەبەست لە ئایەتەکەدا هەیە، کۆمەڵێك دەڵێن: ئا لێرەدا مەبەست لە ئادەمیزادەکە: کافرە، بەڵام مرۆڤی ئیماندار ئەوەی کە کردوویەتی خۆی خاوەنیەتی کارو کردەوەکانیشی بۆ ئەو بە بەڵگەیە کەوا باسمان کرد، ووتیان: وە ئامانجیش لەو تایبەتمەندی و دەستنیشانکردنەیە یە، ئەمەش دروستە ئەگەر بەڵگەی لەسەر هەبوو.

ئەم وەڵامدانەوەیەش زۆر لاوازە، نموونەی ئەو گشتیەش تەنها کافری پێ پەرچ نادرێتەوە. بەڵکو ئەمە بۆ موسلمان و کافرە وەك ئەو فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (النجم: ٣٨)، واتە: ((لەو پەڕاوو کتێبە پیرۆزانەدا هاتووە: کە هیچ گوناهبارێك گوناهی تاوانبارێکی تر هەڵناگرێت)).

کارنامەکەش هەمووی لە یەکەمەکەیەوە تا کۆتاییەکەی وەك کارێکی پوخت و پاراوە لە توانایی و خواستی گشتیدا بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى * ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَى﴾ (النجم: ٤٠- ٤١). واتە: ((بێگومان هەوڵ و کۆششەکەی دەبینرێتەوە لە قیامەتدا * پاشان پاداشت دەدرێتەوە بەتێرو تەسەلی). ئەمەش بێگومان بە گشتی خێرو شەڕ دەگرێتەوە، بێگومان چاکە و خراپە وە ئیماندار و کافریش دەگرێتەوە. هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه * وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَه﴾(الزلزلە: ٧- ٨)،

واتە: (( جا ئەوەی بەقـەدەر سـەنگی گەردیلەیـەك خێـر و چـاكەی ئـەنجام دابێـت دەبینێتەوە ٭ ئەوەش كە بەقـەدەر سـەنگی گەردیلەیـەك شـەڕو خراپـەی هـەبێت، دەبێتەوە)).

هەروەك خوای گەورە لەو حەدیسە قودسیەدا دەفەرموێت: ((یاعبـادي، إنمـا هي أعمالكم أحصيها لكم ثم أوفيكم إياها فمن وجد خيراً فليحمـد الله ومـن وجـد غير ذلك فلا يلومنَّ إلاّ نفسـه)) [٢٤٤]، واتە: ((ئەی بەندەكانم، بـەڵكو ئەمـە كـارو كردەوەكانتانە بۆتان هەژماردەكەم پاشان لەگەڵیدا داپەروەر دەبم جا هەر كەسـێك لە كارو كردەوەكانی خێرو چاكەی بینی با حەمدو سوپاسـگوزاری خـودا بكـات وە هەركەسێكیش شتێكی جگە لەمەی بینی با تەنها سەرزەنشتی خۆی بكات)).

ئەمەش وەك ئەم فەرموودەیە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَاقِيهِ﴾ (الأنشقاق: ٦)، واتە: ((ئەی ئینسـان بەڕاسـتی تۆ خۆت زۆر ماندوو دەكـەیت، زۆر ڕەنـج و زەحمـەت دەكێشـسیت، سـەرەنجامیش دەبـێ بگەڕێیتـەوە بـۆ لای پـەروەردگارت (تـا پاداشـتی ڕەنـج و هەوڵەكـەت وەربگریـت)). باهەڵنەخەڵـەتێت بـە قـسەی زۆر لـە لێكـدەرەوەكان لـە ووشـەی ((ئینسان)) لە قورئانی پیرۆزدا: ئینسان لێـرەدا ئـەبو جەهلـە، وە ئینـسان لێـرەدا عەقەبەی كوڕی ئەبی مُعیطة وە ئینـسان لێـرەدا وەلیـدی كـوڕی موغیرەیـە، جـا قورئان لەمەدا دوای خستووە، بەڵكو ئادەمیزادیش ئەو ئادەمیزادەیە بەو شێوەیەی كە هەیە بەبێ دەستنیشانكردنی یەكێك وەك ئەو فەرموودەیەی خوای گـەورە: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ﴾ (العصر: ٢)، واتە: ((بەڕاسـتی ئـادەمیزاد لـە زەرەرمەنـدی و خەسـارەتمەندیدایە)) وە ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لِرَبِّـهِ لَكَنُـودٌ﴾ (العادیـات: ٦)، واتـە: ((بـە بەڕاستی ئادەمیزاد لە ئاستی پەروەردگاریدا زۆر ناسوپاس و حەق نەناسە)) وە ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا﴾ (المعارج: ١٩)، واتە: ((بەڕاسـتی ئـادەمیزاد بـە شـێرزەیی و

[٢٤٤] مسلم: (٢٥٧٧).

تەنگەتاوی دروستکراون)). وە ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى ۞ أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى﴾ (العلق: ٦-٧)، واتە: ((بەڕاستی خەڵکی سەرکەشی دەکەن، یاخی دەبن، ستەم دەکەن۞ لەبەرئەوەی هەر ئادەمیزاد هەستی کرد دەوڵەمەند و بێ نیازە (لە ڕووی ئابووری، یان تەندروستی یان زانستی..... هتد) یەوە)) وە ﴿إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ (إبراهيم: ٣٤)، واتە: ((بەڕاستی زۆربەی ئینسانەکان زۆر ستەمکارو خوانەناس و سپڵەن))، وە ﴿وَحَمَلَهَا الْإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ (الأحزاب: ٧٢)، واتە ((کەچی ئادەمیزاد هەڵیگرت و گرتیە ئەستۆی خۆی، بەڕاستی زۆر ستەمکار و نەفام بوو)). جا ئەمەش کاروباری ئادەمیزادە لە جۆری خود و دڵ و دەروونی خۆی و دەرچوونی لەو سیفەتانە بە چاکەو نیعمەتی خواکەی، وە یارمەتیدەر و هاوکار بە خودای خۆی، هەر خوداشە ئیمانی لای بەندەی خۆی خۆشەویستکردووە، وە لەدڵیدا ڕازاندوویەتیەوە، وەکو دووڕوویی و یاخی بوونی لەلا قێزەوەن کردووە، وە هەر ئەویشە ئیمانی لەدڵیدا جێگیر و واجب کردووە. کەوا پێغەمبەر و نێردراوو پیاوچاکەکانی لەسەر دینی خۆی جێگیر کردووە، هەر ئەویشە خراپەو داوێن پیسی لەوان لابردووە، لەبەردەم پێغەمبەرﷺ لەسەر دەریایەك تاوان و گوناه ئەم هۆنراوەی دەووتەوە.

والله: لولا الله ما أهدتينا *** ولا تصدّقنا ولا صلّينا[255]

هەروەها خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ﴾ (يونس: ١٠٠)، واتە: ((هیچ کەس بۆی نیە باوەڕبهێنێت (هەتا هەوڵ نەدات و خۆی ماندوو نەکات و بیر نەکاتەوە) ویستی خواشی لەسەر نەبێت))، وە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ﴾ (المدّثر: ٥٦)، واتە: ((جا ئەو خەڵکە یا دادوەری وەرناگرێت و بیر لەم ڕاستیانە ناکاتەوە مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت)). وە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾

---

([255]) سەیری: موسلم (١٨٠٢) بکە.

(التكـوير: ٢٩)، واتـه: ((ویـستی ئێـوەش نایەتـەدی مەگـەر کاتێـك خـوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت، (هەرکەس ویـستی خێـری هـەبێت خـوای گـەورە سەربەستی لێ زەوت ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئـەوە پـێش دێـت کـە وویـستی خوای لەسەرەو توانای تێگەیشتنمان لە نهێنی و شاراوەکان زۆر سـنووردارە)). جـا ئەمە خوای هەموو جیهانە بەگشتی خوایەتیەکی تەواوە بۆ هەموو ئەوانـەی لـەناو جیهاندان لە خاوەنداریەتی و فەرمانەکان و توانایی و بارەکاندا.

کۆمـەڵێك دەڵـێن: ئایەتەکـە هەواڵدانـە بـە یاسـایەك لـەپێش ئێمـەدا، وە لەڕاستیدا یاساکەمان دەریخستووە لەسەر ئـەوەی هـەوڵ و کۆششەکەی بۆخۆیـەتی ئـەوەی بـۆی تێکۆشـاوە، هـەروەها ئەمـەش لـە یەکـەمیان لاوازتـرە یـاخود لـە ڕەگەزەکەیدا، ئەگینا خوای گەورە هەواڵی بەو داوە هەواڵێك بڕیاری لەسەر دابێـت و پێی ڕازی بێت نەك هەواڵێك بڕیاری لەسەر نەدابێت و بەتاڵ بێت، وە بۆ ئەمـەش خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَى﴾ (الـنجم: ٣٦)، واتە: ((ئایا ئاگادار نەکرابوو بەوەی لە پـەڕاوەکانی موسـادا بـوو؟)). جـا ئەگـەر ئەمە بەتاڵ و بێ سوود بێت لەو یاسـایەدا هـەواڵی پـێ نـەداوە هـەواڵێك بڕیـاری لەسەر دابێت پێ ی ڕازی بێت.

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن: ئایەتی ﴿لَيسَ للإنسان إلاّ ماسـعى﴾ اللام: بەمانای: لەسـەر دێـت، واتـە: ﴿لَـيسَ للإنـسان إلاّ ماسـعى﴾. وە ئەمـەش لـە دوو ووتـەی یەکەمیان بە تاڵترە. چونکە ئەو بابەتی قسەکردنەکەی وەرگێڕاوە بۆ دژی ماناکـەی کە لێی تێگەیشتووە، وە شتی لەو نموونەیەش ناکرێت و ناگونجێت. زمـانیش بـۆی ناگونجێت، وە بەڵام ڕێزمانی: ﴿وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ﴾ (غافر: ٥٢)، واتە: ((نەفرین هـەر بـۆ ئەوانە)). ئەمەش لەسەر پلەو پایەی خۆیەتی واتە شانس و چارەنووسی ئەوانە.

کۆمەڵێکی دیکەش دەڵێن: ئایەتەکـە لەبەرگیراوەیـە و فەرمایـشتەی خـوای گەورە: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (الطور: ٢١)،

واتە: ((جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و نەوەکانیشیان بە ئیمان و باوەڕەوە شـوێنیان کەوتوون، ئەوانە لە بەهەشتدا پێك شاد دەکەینەوە)). ئەمەش لـە ئیبنـو عـەباس وەرگیراوە، هەروەها ئەمەش لاوازە، حوکمیش نادرێت بەسەر ئایەتەکـە تـەنها بـە ووتەی ئیبنو عـەباس‌ﷺ نـەك جگـە لـەویش بـەوەی وەرگـیراوە، کـۆ کردنـەوەو یەکخستنەوە لەنێوان دوو ئایەتەکە نە نەشیاوە و نەقەدەغە کراویشە، چونکە لەدوا ڕۆژ نەوەکان شوێن باوکەکانیان دەکەون هەروەك لە دونیادا شوێنیان کەوتبوون، ئەم شوێن کەوتنەش لە بەخشندەیی باوکەکانە خێـر و چـاکەکانیانە کـەوا بەکۆشـشی خۆیان بەدەستیان هێناوە، بەڵام بوونی نەوەکان بە گەیشتنی بەوان بە پلەیەك بەبێ کۆشش کردن وەك ئەوان، جا ئەمەش لەوان نیە، بەڵکو ئەمە بۆئەو باوکانەیـە کـە خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە کەوا نەوەکانیان لە بەهەشتدا پێیان دەگەن، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ وە فەرمودەی: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ (الـنجم: ٣٨- ٣٩)، هـەردوو ئایەتەکـە دادپـەروەری و عەدالـەتی خودای گەورەو حیکمەت و تەواوی پیرۆزی یەکانی دەردەخات، وە ئەقڵ و داهێنـان شایەدن بە هەردوو ئایەتەکە.

یەکەمیان: پێویـستە کەوا کەس بەتاوانی کەس سزانادرێت، دووەمیـان: کـەوا هیچ کەسێك بەکارو کردەوەو کۆششی خۆی نەبێت ڕزگاری نابێت، جـا یەکـەمیان: بەندە دڵنیا دەبێت بەو تاوان و گوناهەی کە کەسـێکی دیکـە جگـە لـەو دەیکـات هەروەك پاشا و سەرکردەکانی دونیا دەیکات،

دووەمیـان: لـە تـەماعکاری دەپـچڕێت لـەکاتی ڕزگـار بوونیـدا بـەکارو کردەوەکانی باوك و پێشینەو گەورەکانی هەروەك هاوەڵانی تەماعکارە درۆزنـەکان کردوویانە.

هاوشێوەکەش ئەم فەرمودەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَّنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى وَمَا كُنَّا

مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الإسراو: ١٥)، واته: ((ئەوەی هەوڵی دابێت ڕێبازی ڕاست و دروست بگرێت، ئەوە بەڕاستی بە قازانجی خۆی تەواو دەبێت و هەر خۆی بەهرە لە هیدایەتەکەی وەردەگرێت، ئەوەش گومڕا بووەو ڕێبازی سەر لێشێواوی گرتۆتەبەر، ئەوە بێگومان هەر خۆی زەرەر دەکات و گومڕاییەکەی لەسەری دەکەوێت، کەس گوناهی کەسی هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین)). ئەمەش وەك ئەم ئایەتەیە کە لەپێشتر باسمان کردووە: ﴿أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾(النجم: ٣٨)، واتە: ((کە هیچ گوناهبارێك گوناهی تاوانبارێکی دیکە هەڵناگرێت)) جا حوکم و یاسای پەروەردگار بۆ دوژمنەکانی بە چوار حوکم و یاسایە ئەمەش مەبەستی دادوەری و حیکمەتە.

**یەکەم**: ڕێبازی ڕاست و دروستی بەندەکان بە ئیمان و بیروباوەڕ کارو کردەوەی چاك بۆ خۆیەتی نەك کەسێکی دیکە.

**دووەم**: گومڕاییەکەش بە لەدەست دەرچوون و ناکۆکیەی دەکەوێتە سەر خۆی، نەك لەسەر یەکێکی دیکە جگە لە خۆی.

**سێیەم**: هیچ کەسێك گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێت.

**چوارەم**: هیچ کەسێك سزا نادرێت تەنها پاش دامەزراندنی بڕوبیانووەکەی لەسەری بە پێغەمبەرەکەی.

جا تێڕوانین بەوەی کەوا لەناو ئەو چوار یاسایانەدا هەیە لە حیکمەت و دادوەری و چاکە و بەخشندەیی پەروەردگارە، وەڵام دانەوەشە بۆ خاوەنی لەخۆ باییبوون و تەماعکارە درۆزنەکان، لەسەر خاوەن نەزانین بە پەروەردگار و بە ناوە جوانەکانی و سیفاتەکانی.

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە ئادەمیزاد: زیندووە نەك مردووە، ئەمەش هەمووی لە خراپ بەکارهێنانی ووشەی گشتیە.

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن: ئەمەش وەڵامی ئەبی وەفا کوڕی عقلیە، ووتی: وەڵامی باش لەلای من دەبێت بڵێت: ئادەمیزاد بە هەوڵ و کۆششی خۆی و باشی و جوانی تێکەڵبوونی هاوڕێ ی چاك پەیدادەکات، منداڵی دەبێت و هاوسەر پێك دەهێنێت، و خێر و چاکە دەکات، و دڵی ئەچێت بۆ ناوخەڵکی خۆش دەوێن، جا ئەوانیش بەزەییان پێدا دێتەوە، و ڕێنمایی دەکەن بۆ خواپەرستی، ئەمەش نیشانەیە بۆ هەوڵ و کۆششەکەی، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((إن أطيب ما أكل الرجل من كسبه، وإن ولده من كسبه))[256]. واتە: ((خۆشترین شتێك کە پیاو خواردبێتی ئەوەیە کە بە ڕەنجی خۆی پەیدای کردبێت، منداڵیش چاکترین بەرهەمی خۆیەتی)).

لەحەدیسێکی دیکەدا نیشانە دەکاتە سەری: ((إذا مات العبد انقطع عمله إلاّ من ثلاث: علم ينتفع به من بعده، وصدقة جارية عليه، أو ولد صالح يدعو له))[257]، واتە: ((ئادەمیزاد کە مرد کۆتایی بە کردەوەکانی دەهێنرێت تەنها لەسێ شت نەبێت: زانستێك سودی لێ وەربگیرێت، وە خێرو چاکەیەکی نەبڕاوە، یان منداڵێکی چاك دوعای بۆ بکات)).

وتەیەکی شافعی هەیە دەڵێت: ئەگەر کوڕەکەی بۆ ئەو خۆی بەخشکرد و ملکەچی کرد بۆ حەجکردن ئەوا دەبێتە هۆکارێك بۆ پێویست بوونی حەجکردن لەسەری هەتا ئەگەر لە ماڵ و سامانەکەیدا زیادی کرد ئەوە بە پێچەوانەی خۆبەخشەرێکی بیانیە.

ئەمەش وەڵامێکی مامناوەندیە پێویستی بە تەواوبوونە، جا بەندە بە ئیمان و گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی تێدەکۆشێت لە سوود گەیاندن بە کارو کردەوەکانی ئیمانداران لەگەڵ کار و کردەوەکانی خۆی، هەروەك لە ژیاندا بەکارو

---

(256) سنن الترمذي: (٣٥٨) وة سنن أبو داود (٣٥٢٨) وة مسند أحمد: ٦/ ٣١.

(257) مسلم (١٦٣١) وة سنن أبو داود (٢٨٦٣).

کردەوەکانی سوودیان پێدەگەیەنێت لەگەڵ کارو کردەوەکانی ئەوان، چونکە ئیمانداران هەندێکیان بە کردەوەی هەندێکی دیکە سوود بە یەکتر دەگەیەنێت کەوا بەشداری تێدا دەکەن وەك نوێژی بەکۆمەڵ چونکە هەریەکێك لەوانە بیست و حەوت پلە لە نوێژەکەی زیاد دەکات ئەمەش بۆ بەشداری کردنی کەسانی دیکە لە نوێژکردن لەگەڵیدا، جا کردەوەی یەکێکی دیکە هۆکارێکە بۆ زیادبوونی خێر و پاداشتەکەی، هەروەك کردەوەی ئەویش هۆکارێکە بۆ زیاد بوونی خێر و پاداشتی ئەویتر، بەڵکو هەندێك دەڵێن: نوێژ بەگوێرەی ژمارەی نوێژکەران پاداشت و چاکەکەی زیاتر دەبێت، هەروەك بەشداری کردنیان لە جیهاد و حەج و فەرمانکردن بە چاکە و دوور خستنەوە لە خراپە وە هاریکاریکردن لەسەر چاکە و تەقواو کار و کردەوەی چاك.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً))، واتە: ((بەندەی ئیماندار بۆ ئیماندار وەك بینا وایە هەندێك هەندێکیان توند و تۆڵ دەکات)). وە پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا[258].

زانراویشە کەوا ئەمە لەکاروباری ئایین دا لەپێشترە، وەك لەکارو باری دونیادا. جا چوونی موسڵمان لەگەڵ تەواوی موسڵمان لە پەیمانی ئیسلامدا لە گەورەترین هۆکارە بۆ سوود گەیاندنی هەریەکێك لە موسڵمانان بۆ هاوەڵەکەی لە ژیانیداو لەدوای مردنیشدا، وە بانگەوازی موسڵمانان لە چواردەوریاندا کۆ دەبێتەوە.

خودای پەروەردگار هەواڵی داوە لەبارەی هەڵگرانی عەرش و ئەوانەی لەچواردەوریاندان: کەوا ئەوان داوای لێخۆشبوون لە ئیمانداران دەکەن و بۆیان دەپارێنەوە[259].

---

([258]) موسلم: (٢٥٨٥).

([259]) سەیری: سوورەتی غافر، ئایەتەکانی (٧- ٩) بکە.

هـــەواڵی داوە لـــەبارەی دوعـــاو پاڕانـــەوەی پێغەمبـــەرەکانی وە داوای لێخۆشبوونیان دەکەن بۆ ئیمانداران وەك نـوح[٢٦٠] وە ئیـبراهیم[٢٦١] وە محمـد ﷺ[٢٦٢]. جا بەندە بە ئیمان و بیروباوەڕەکـەی دەبێتـە هـۆی گەیـشتنی ئـەو دوعـاو پاڕانەوەیە بۆی، هەروەك خۆی کوشـشی کردبێـت، ئەمـەش ڕوون دەبێتـەوە کـەوا خودای تاك و تەنیا ئیمانداری کردۆتە هۆکارێك بۆ سوود گەیاندنی هاوەڵەکـەی بـە دوعا و پاڕانەوەی براکانی لە ئیمانداران وە هەوڵ و تێکۆشانیان، جـا ئەگـەر بـووە هـۆی ئـەوەی هـەوڵ و تێکۆشـانەکەی گەیاندیـە ئـەو پاڕانەوەیـە، وە ووتـەی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە عـەمروی کـوڕی عاصـی فـەرموو: ((إن أباك لو كان أقر بالتوحيد نفعه ذلـك))، واتـە: ((ئەگـەر بهاتایـە باوکـت بڕیـاری بهێنایە بە باوەڕکردن بە تاك و تەنهایی خوا ئەوا ئەو سوودەی پێدەگەیشت)).



## ( لەبارەی سزانەدانی بەندە بە کردەوەی یەکێکی دیکە )

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَهَا مَـا كَـسَبَتْ وَعَلَيْهَـا مَـا اكْتَـسَبَتْ﴾ (البقرة: ٢٨٦)، واتە: ((هەرکارێکی چاك ئەنجام بدات قازانجی تـەنها بۆخۆیـەتی و هـەر خراپەیـەکی کردبێـت تـەنها یەخـەی خـۆی دەگرێـت و لەسـەر خۆیـەتی)). دەفەرمووێت: ﴿وَلَـا تُجْـزَوْنَ إِلَّـا مَـا كُنـتُمْ تَعْمَلُـونَ﴾ (یـس: ٥٤)، واتـە: ((تـەنها پاداشتی کارێك دەدرێتەوە کە دەتانکرد). کەواتە ئەم ئایەتە ئاشکرای کـردووە لـە مانا و مەبەستەکە کەوا هیچ کەسێك بە تـاوان و گونـاهی کەسـێکی دیکـە سـزا نادرێت. جا خودای پاك و بێگەرد دەفەرمووێت: ﴿فَالْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَلَا

---

(٢٦٠) سەیری: سوورەتی نوح، ئایەتی (٢٨) بکە.

(٢٦١) سەیری: سوورەتی إبراهیم، ئایەتی (٤١) بکە.

(٢٦٢) سەیری: سوورەتی الفرقان، ئایەتی (٦٢) بکە.

تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (يس: ٥٤)، واته: ((ئينجا ئەم جارە دەدرێت: ئەمڕۆ هیچ کەس ستەمی لێ ناکرێت بەهیچ شێوەیەك، خەڵکینە دڵنیابن کە: تەنها پاداشتی کارێك دەدرێتەوە کە دەتانکرد)). جا ئەمە بە درۆ دەخاتەوە کە دەڵێت ستەمی لێ دەکرێت و لە خراپیەکانی زیاد دەکرێت، یاخود لە چاکەکانی کەم دەکرێتەوە، یاخود بەهۆی کەسێکی دیکە سزا دەدرێت، دووری نەخستۆتەوە کەوا بە کردەوەی چاکی یەکێکی دیکە سوودی پێدەگات، نەك لەسەر ڕووی پاداشت، دەکرێت سوود گەیاندنەکەی بۆ ئەو ڕێنمایی کردن بێت بۆ ئەو نەك پاداشت لەسەر کردەوەکەی، بەڵکو ئەو خێر و سەدەقەیە کە خودای گەورە بەهۆی ئەو چاکەی لەگەڵدا کردووە، بەڵکو ئەمەش دیاری و خەڵاتێکە لەسەر دەستی هەندێك لە بەندەکانی بەخشیویەتی نەك لەسەر ڕووی پاداشت دانەوە.



### (لەبارەی دەرخستن و ساخبوونەوەی کەسانی کەوتوو)

بەڵام بەڵگەی ئێوە لەسەر حەدیسی پێغەمبەرﷺ: ((إذا مات العبد انقطع عمله))، واتە: ((ئادەمیزاد کە مرد کۆتایی بە کردەوەکانی دێت)) ئەمە بەڵگەیەکی پووچ و بێ مانایە، چونکە پێغەمبەرﷺ نەیفەرمووە: کۆتایی بە سوودەکانی دێت بەڵکو هەواڵی داوە لەبارەی کۆتایی پێهاتنی کردەوەکانی، بەڵام کردەوەیەکی دیکە جگە لەمە ئەوا بۆ بکەرەکەیەتی، لەبەر ئەوە خەڵاتەکەی پێشکەش بەو کردووە تەنها پاداشتی کردووەی بکەرەکەی پێ دەکات نەك پاداشتی کاروکردەوەکە، جا پچڕان و کۆتایی هێنان شتێکە، سوود پێگەیشتنیش شتێکی دیکەیە، هەروەها حەدیسێکی دیکە هەیە کە فەرموویەتی: ((إن مما يلحق الميت من حسناته وعمله))، واتە: ((لە ڕاستیدا ئەوەی مردوو پێیدەگات لە خێر و چاکەو کاروکردەوەکانیەتی)).

## ( لەبارەی گواستنەوەی دروستکراو لەسەر دروستکراو )

بەڵام لەبارەی ووتەکانتان: بەخشین گواستنەوەیە، گواستنەوەش لەوانەیە ببێت بە مافێکی پێویست، جا ئەمەش گواستنەوەی دروستکراوە لەسەر دروستکراو.

بەڵام گواستنەوەی دروستکراو لەسەر دروستکەر ئەمە کاروبارێکی دیکەیە پێوەرەکەی دروست نابێت لەسەر گواستنەوەی بەندەکان هەندێکیان لە هەندێك، ئایا ئەمەش لە بەتاڵترین پێوەر و خراپترینیان نیە، ئەوەی کەوا تەواوی ئوممەت بەتاڵی دەکاتەوە لەسەر سوود پێگەیاندنی بەدانەوەی قەرزەکەی و ئەو مافانەی لەسەریەتی، وە لێخۆشبوون لەوەی لەسەریەتی وەرگێڕانەوەی خێر و سەدەقە و حەجکردن لەجیاتی ئەو، ئەو دەقەی کە ڕێگایەك نیە بۆ وەڵامدانەوەو گێڕانەوەی لە جیاتیدا، وەك ڕۆژوو، ئەم پێوەرە خراپانە بەرهەڵستکاری دەقەکانی شەرع و یاساکانی ناکات.



## لەبارەی ووتەکانیان:
## خەڵك خوایی بە هۆکاری پاداشت ڕق و قین و بێزراوە )

لەبارەی ووتەکانتان: کەسان ویست بەهۆکاری پاداشت نەویستراوە، ئەمە مەسەلەی چاکەکردنی خەڵك خوایی یە بەخزمایەتی جا چۆن چاکەکاری هەمان پاداشتە کەوا ئەوە مەبەستەکەیە؟

وەلامی یەکەم: چاکەکردن بەهۆی خزمایەتی بەلگەیە لەسەر ئارەزووی لە چاکەکردنەکە، وە دواکەوتن لە کردارەکە، جا ئەگەر گونجا چاکەکەش بکرێت ئەوا سەردەکێشێت بۆ واز لێهێنان و تەمبەڵی و دواکەوتن. بە پێچەوانەی بەخشینی

پاداشتەکە، بۆیە بکرەکە پێداگیری دەکات لەسەر ئەوە پاداشتەی سوودی پێ بگەیەنێت یاخود سوود بە برا موسڵمانەکەی بگەیەنێت. جا نێوانەکانیان جیاوازیەکی ئاشکرا هەیە.

وەڵامێکی دیکە: کەوا خوای پاك و بێگەرد پێشنیار و پێشبڕکێ ی خۆش دەوێت بۆ خزمەتکردنەکەی و ڕکابەرایەتی تێیدا، ئەمەش خەبەر دەدات لە بەندایەتی کردن، فریشتەکانیش حەز بە ململانێ و ڕکابەری دەکەن لە گوێڕایەلی و خزمەتکردنی، جا چاکەکردنی کەسان و ویست لێرەدا جیاوازە بۆ مەبەستی بەندایەتی کردن، خودای گەورە و میهرەبان فەرمان بە بەندەی خۆی دەکات بەو خۆمایەتیە یان بەناچاری یاخود بە خۆشەویستی، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاء وَالأَرْضِ﴾(الحديد: ٢١)، واتە: ((پێشبڕکێ بکەن بۆ بەدەست هێنانی لێ خۆشبوون لەلایەن پەروەردگارتانەوە و بەدەست هێنانی ئەو بەهەشتەی کە پانیەکەی وەك پانتایی ئاسمان و زەویە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَبِقُواْ الْخَيْرَاتِ﴾ (البقرة: ١٤٨)، واتە: ((جا پێشبڕکی بکەن لە چاکەکاندا).

بێگومان سەحابەکان هەندێك پێشبڕکێ ی هەندێکیانی دەکرد بەهۆی خزمایەتی، عومەر دەڵێت: سوێند بەخوا نەبوبەکر هیچ کاتێك بەپێش من نەدەکەوت بۆ خێر و چاکە ئیللا منی بەپێش خۆی دەخست. تاوەکو ووتی: سوێند بەخوا هەرگیز لە خێر و چاکە کردندا پێشت ناکەوم[٢٦٣].

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾ (المطففين: ٢٦)، واتە: ((جا با لەپێناوی ئەوەدا پێشبڕکێکەران پێشبڕکێ بکەن)).

❊❊❊

(٢٦٣) سنن أبي داود (١٦٧٨)، الترمذي (٣٦٧٥).

## لەبارەی ووتەکانیان:
## ئەگەر بەخشین بۆ مردوو بکرایە ئەوا بۆ زیندوو دەکرا

بەڵام لەبارەی ووتەکانتان: ئەگەر چاکە بەخشین بۆ مردوو بکرایە ئەوا بۆ زیندوو دەکرا وەلامەکەی لە دوو ڕووەوەیە:

یەکەمیان: هەندێ لە زاناکان بۆی ڕۆیشتوون وەك لە هاوەڵەکانی ئەحمەد و کەسانی دیکە، قازی دەڵێت: قسەی ئەحمەد تایبەتمەند نیە بە مردوو، چونکە ئەو دەڵێت: کە چاکەیەك دەکات ئەوا نیوەکەی بۆ دایك و باوکی دەبێت، وە جیاوازیشی نەکردووە، کەچی أبو وفاء کوڕی عقیل بەرپەرچی دەداتەوە و دەڵێت: ئەوەماوەو دووری تێدایە، بە ئەمەش دەستکاری کردنە بە شەرع، لە ڕاستیدا خوای گەورە ڕێگایەکی بۆ ئێمە داناوە بۆ گەیاندنی سوود بۆ مردوو وەك لێخۆشبوون و نوێژ لەسەر مردوو.



## (ئەگەر چاکە بەخشین بکرایە
## ئەوا نیوەی وە چارەگێکی پاداشتەکەی دەبەخشرا)

بەڵام لەبارەی ووتەکانیان: ئەگەر ئەوە بکرایە ئەوا بەخشینی چاکە و پاداشت نیوەی وە چارەگێکی بۆ مردوو دەبوو، جا وەڵامەکەش لە دوو ڕووەوەیە:

**یەکەمیان:** قەدەغە بوونی هاوەڵێەتی و خزمایەتی، ئێوە هیچ بەڵگەیەکتان لەسەری باس نەکردووە تەنها داوا نەبێت.

**دووەمیان:** پەیوەست بوون بەمەوە ووتەش تێیدا ئیمام ئەحمەد لە ڕیوایەتی محمد کوڕی یحیی الکحالی مەبەستەکەی دەرخستووە، وە ئاراستەی کردووە ئەوا پاداشتە موڵکی خۆیەتی، ئەگەر بیەوێت هەمووی بۆی دەبەخشێ وە ئەگەر بیەوێت

هەندێکی دەبەخشێت، ڕوونی دەکاتەوە ئەگەر پاداشتە کە ببەخشێت بەسەر چوار مردوودا بۆ نموونە ئەوا هەر یەکێك دانە چارەکێکی دەست دەکەوێت، جا ئەگەر تەنها چارەگێکی بەخشی ئەوا ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ خۆی دەبێت.

***

## ( لەبارەی ووتەکانیان: ئەگەر پاداشت بۆ مردوو بچووایە ئەوا هێشتا کردەوەی بۆ خۆی دەکرد )

بەڵام لەبارەی ووتەکانتان: ئەگەر ئەوە بگونجابووابە ئەوا زیاتر کاروو کردەوەی بۆ خۆی دەکرد، جا ووتتان: کەوا دەبێت ئارەزووی بێت لە کرداری بەخشینەکەی بۆ مردوو، ئەگەر نا نایگاتێ.

وەڵامەکە: ئەو مەسەلەیە دیاریکراو نیە لە ئەحمەد، مەرجیش نیە لە قسەی پێشینەکان لە هاوەڵەکانی، بەڵکو پاشینەکان باسیان کردووە، وەك قازی و شوێنکەوتووانی.

(عبدالله)ی کوڕی حمدان دەڵێت: هەرکەسێك خۆی بەخش کرد لە کرداری باش لە خێر و چاکە و نوێژ و ڕۆژوو حەج و عومرە و خوێندنەوەی قورئان و ئازاد کردن، جگە لەمەش لە خواپەرستی جەستەیی ئەوا دەبێت بۆ لەجیاتی کەسانی دیکە، وە عیابەدەتی ماڵ و سامان، ئەوا هەموو پاداشتەکەی یان نیوەی دەگەڕێتەوە بۆ مردوویەکی موسلمان هەتاکو پێغەمبەریش ﷺ، دوعای بۆ بکە و یاخود داوای لێخۆشبوونی بۆ بکە یاخود هەرچی لەسەریەتی لەمافی شەرعی بۆی بدەرەوە، یاخود پێویستە لەجیاتی ئەو سوودی پێ بگەیەنێت، وە خێر و پاداشتەکەی بۆ بگەیەنە.

نهێنی مەسەلەکە کەوا دەبێ مەرجی بەدەستهێنانی پاداشتەکە یەکەمجار دەبێت بۆ کەسەی دەبەخشێت رووبدات و دەکرێت بۆ بکەرەکە بکەوێت، پاشان لە بکەرەکەوە بگوازرێتەوە بۆ یەکێکی تر، مەرجیش ئەوەیە پێش کردارەکە یاخود ئەو ماوەیەی کە هێشتا کارەکەی نەکردووە مەبەستی وا بێت پێی بگات، دەڵێت: ئەگەر نیەت و مەبەستی نەبێت ئەوا پاداشتەکە بۆ بکەردکە دێت، جا رازی نابێت پاداشتەکەی بگوازرێتەوە بۆ یەکێکی دیکە جگە لەخۆی، چونکە پاداشتەکە لەسەر کارەکە رێك دەخرێت وە کاریگەریش لەسەر کارتێکەر رێك دەخرێت، بۆ ئەمەش ئەگەر بەندەیەکی لەخۆی ئازاد کرد کەوا گوێڕایەڵی ئەو ببوو، جا ئەگەر گوێڕایەڵیەکەی گواستەوە بۆ یەکێکی دیکە پاش ئازاد کردنەکەی ئەوا بە ناکۆکی ناگوازرێتەوە ئەگەر ئازادی کرد لە یەکێکی دیکە، جا گوێڕایەڵیەکەی بۆ ئازادکەرێکی دیکە دەبێت جگە لەخۆی. هەروەها وەك ئەوەی قەرزێك لەجیاتی خۆی بداتەوە، پاشان لەدوای دانەوەی قەرزەکە ویستی بیگەڕێنیتەوە بۆ یەکێکی دیکە ئەوە نابێت. هەروەها ئەگەر حەج یاخود ڕۆژوو یاخود نوێژ بکات بۆخۆی. پاشان ویستی بیگەڕێنێتەوە بۆ یەکێکی دیکە ئەوا نابێتە موڵکی ئەو، کەوا ئەوانەی پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد لەبارەی ئەمە پرسیاریان لێ نەکرد لەبارەی بەخشینی کردەوەی چاکە لەدوای خۆی، بەڵکو پرسیاریان لێکرد لەوەی چ کارێك بکەین بۆ مردوو، هەروەك سەعد ووتی: ((ئایا خێر و چاکە لەجیاتی دایکم بکەم سوودی پێدەگات؟)). نەیووت: کەوا پاداشتی ئەو خێر و چاکەی دەیکەم دەبەخشم بە دایکم.

هەروەها ووتەی ئافرەتێکی دیکە: ئایا لەجیاتی دایکم حەج بکەم؟ ووتەی پیاوێکی تر: ئایا لەجیاتی باوکم حەج بکەم؟ جا پێغەمبەرﷺ مۆڵەتی پێدان لە کردنی کارەکە لەجیاتی مردوو نەك بەخشینی پاداشتی ئەو کردەوانەی بۆ خۆیان دەیکەن بۆ مردووەکانیان، ئەوەش نازانرێت ئایا لەبارەی ئەمە هەرگیز پرسیار لە

پێغەمبەرﷺ کراوە. وە ناشزانرێت لە یەکێك لە سەحابەکان ئەو کارەی کردبێت.
فەرموویەتی: پەروەردگار پاداشتی ئەو کارانەی کە پێشتر کردووە، بۆ فلان کەس نیشاندە، یاخود پاداشتی ئەو کارەی بۆ خۆم کردوومە.

جا ئەمە نهێنی مەرجەکانە، هەر کەسێ مەرجی دانەنا بۆ ئەمە دەڵێت: پاداشتەکە بۆ بکەرەکەیە.



**(لەبارەی بەخشینی پاداشتی واجبەکان کەوا واجبە لەسەر زیندوو)**

لەبارەی ووتەکانتان: ئەگەر بەخشین هەبوایە ئەوا بەخشینی پاداشتی شتە واجبەکان دەکرا کەوا واجب و ئەرکە لەسەر زیندوو.

وەڵامەکە: ئەو زۆرەملێ و سەپاندە لەسەر بنچینەیەك لە مەرجدا لە گەیاندنی نیەت و مەبەستی کردارەکە لەبارەی مردووە شتێکی مەحاڵە. واجبیش وایە دروست نیە لەجیاتی کەسێکی دیکە بیکات، جا ئەوەش واجبە لەسەر بکەرەکە کە پێویستە لەسەری کەوا نیاز و مەبەستی بێت بە کردارێکی باش بۆ خودای گەورە.

بەڵام ئەوەی نیەتی کارەکەی نەبێت بۆ کەسێکی تر، ئایا دەکرێت پاداشتی فەرزێك لە فەرزەکانی بۆ مردوو بگەڕێتەوە؟ ئەمە دوو ڕووی تیایە: ئەبوعبداللە ی کوڕی حەمدان دەڵێت: پاداشتی فەرزێك لە نوێژ یاخود ڕۆژوو یان شتێکی دیکە جگە لەوانە دەشێت بۆی ببێت وە بکەرەکەی لە جێگای ئەو دەیکات.



## (لەبارەی ووتەکانیان:
## ڕاسپاردنەکان تاقیکردنەوەن لەجیاتی بوون وەرناگیرێت)

بەڵام لەبارەی ووتەکانتان، کەوا ڕاسپاردەکان ئەزموون و تاقیکردنەوەن ناکرێت لەجیاتی یەکێکی دیکە ئەنجام بدرێت، مەبەست لێی دیاریکردنی پێسپێردراوە بکەرەکە بۆ ئەوانی تر.

وەڵامەکە لەبارەی: ئەمەیان قەدەغە نابێت کەواتە یاسادانەرەکە بۆ موسلمان ئەوەیە کەوا سوود بگەیەنێت بە براکەی بە شتێك لە کارەکەی، بەڵکو ئەمە لە تەواوکەری چاکە و ڕەحمەتی خوایە بۆ بەندەکانی. وە لە تەواوی ئەو یاسایە یە کەوا یاسای بۆیان داناوەو دەمەزراوە لەسەر دادپەروەری چاکە و یەکتر ناسین.

خودای گەورە فریشتەکانی خۆی دروستکردووە و عەرشیان هەڵگرتووە دوعاو پارانەوە بۆ بەندە ئیماندارەکانی دەکەن، داوای لێخۆشبوون بۆیان دەکەن، بۆیان داوادەکەن کە بیانپارێزێت لە خراپە، وە فەرمانی بە پێغەمبەرەکانی داوە کەوا داوای لێخۆشبوون لە ئیماندارانی پیاو و ئافرەت بکەن، لەڕۆژی قیامەتیشدا پلەو پایەیەکی بەرز و ستایشکراویان دەداتێ بۆ ئەوەی شەفاعەت بکەن لە تاوان و گوناهەکانیان لە شوێنکەوتووانی و لە ئەهلی سوننەت[٢٦٤]. هەروەها خوای گەورە فەرمانی پێکردووە کەوا درووود لەسەر هاوەڵەکانی بنێرین لە ژیانیاندا وە لە دوای مردنیشیاندا، بۆیە پێغەمبەرﷺ لەسەر گۆڕەکانیان دەوەستا جا دوعای بۆ دەکردن.

پێغەمبەرﷺ مۆڵەتی داوە لە حەجکردن و ڕۆژوو گرتن لەجیاتی مردوو ئەگەر تاقیکردنەوە لە هەقیدا پێویستی کرد، وە سوجدەی سەهوو لەلای ئەو کەسانە لەدوای پێش نوێژ نوێژدەکەن وازی لێ دەهێنرێت بۆ تەندروستی نوێژی

---

(٢٦٤) سەیری: ترمذي (٣١٣٧) بکە.

پێش نوێژ وە لەسەهوو و خوێندنەوەی فاتیحە دەهێڵدرێت بۆ پێش نوێژەکە ئەو بیگرێتە ئەستۆی خۆی.

هەموویان خوای گەورە وەك یەك خێزان دروستی کردوون، جا خۆشەویسترین کەس بۆ ئەوان ئەو کەسەیە زیاتر سوود بە خێزانەکەیان بگەیەنێت[٢٦٥]. و ئەگەر خوای گەورە ئەو کەسەی خۆش بوێ کە سوود بە خێزانەکەی بگەیەنێت بە قوومێك ئاو وە جامێك شیرو پارچەیەك نان، جا چۆن دەبێت ئەوەی سوودیان پێ بگەیەنێت لە حاڵەتی لاوازی و هەژاریان، وە لەکاتی بێکاریان، وە لەکاتی پێویستیان بۆ شتێك شت و مەك و پێداویستیان بۆ دابین بکەن کە نەیانبووە؟ جا خۆشەویسترین کەس لەلای خوا ئەو کەسەیە سوود بەخزم و نزیکەکانی بگەیەنێت لەو حاڵەتەدا.

بۆ ئەمەش ووتەیەك هاتووە لەلای پێشینەکان کەوا هەرکەسێك ڕۆژانە حەفتا جار بڵێت: خودایە لە من و لە دایك و باوکم و لە هەموو موسڵمانان و ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتانی خۆش ببە ئەوا بە ژمارەی موسڵمانان و ئیمانداران پاداشتی وەردەگرێت، ئەمەش بە دوور نازانرێت چونکە ئەگەر داوای لێخۆشبوونی بۆ براکانی کرد ئەوا خێر و پاداشت و چاکە بۆ ئەوان هەیە. بێگومان خودا چاکە و پاداشتی چاکەکاران وون ناکات.



---

([٢٦٥]) مجمع الزائد: ٨/ ١٩١، وە سەیری: فیض القدیر: ٣/ ٥٠٥ بکە.

## ( لەبارەی ووتەکانیان: ئەگەر چاکەی کەسێکی دیکە سوودی بۆیان هەبوایە ئەوا تەوبەو لێخۆشبوونەکەی بۆ ئەوان سوودی دەبوو )

لەبارەی ووتەکانیان: کەوا ئەگەر کاری کەسێك سوودی بۆیان هەبوایە ئەو تەوبەو ئیسلام بوونی لەجیاتی ئەو سوودی بۆی دەبوو.

جا ئەو گومانە لەسەر دوو وێنە دێتەوە:

وێنەیەك پێویست دەکات پێداویستیەکانی لەنێوان دوو فەرمانـدا لێی داوا بکات. پاشان نەبوونی پێداویستیەکەی دیاری دەکرێت نەبوونی پێداویستیەکانی دەدرێت.

وێنەکەش ئاوایە ئەگەر کردەوەی کەسێکی تر سوودی بۆ ئەو هەبێت ئەوا ئیسلامی بوونی و تەوبە کردنەکەی لەجیاتی ئەو سوودی دەبوو، بەڵام ئەمە سوودی بۆ نابێت و کردەوەی کەسێکی دیکەش سوودی پێ ناگەیەنێت.

وێنەی دووەم: کەوا دەڵێت: بە ئیسلام بوون و ملکەچی کەسێکی دیکە و تەوبەکردنی لەجیاتی ئەو سوودی پێ ناگەیەنێت، جا بەنوێژ کردن و ڕۆژوو گرتن و قورئان خوێندنەکەشی لەجیاتی ئەو سوودی پێ ناگەیەنێت.

بەڵام یەکەمیان: چونکە پێوەری بەریەك کەوتنە کاتێك دەقەکان تێیدا دەردەکەوێت وە گەل و ئوممەت لەسەری کۆ دەبنەوە.

بەڵام دووەمیان: چونکە ئەوە کۆمەڵێکە ئەوەی خوا جیای دەکاتەوە لەنێوانیدا دیاریدەکات، جا خودای گەورە نێوان ئیسلام بوونی پیاوێك لە کەسێکی دیکە وە لە نێوان خێرو چاکە و حەجکردن و بەندە ئازاد کردنەکەی جیا دەکاتەوە، پێوەری یەکسان بوون لەنێوانیاندا لە ڕەگەزی پێوانەکردنی ئەوانەی پێوانەی ڕێباز و سوود خۆری دەکەن لەسەر فرۆشتن.

بەڵام سێ یەمیان: خودای گەورە و میهرەبان ئیسلامی کردۆتە هۆکارێك بۆ سوود گەیاندن بە موسڵمانان هەندێك بۆ هەندێکیان لە ژیان و لەدوانی مردنیش، جا ئەگەر بەهۆی کردەوەی موسڵمانەکان سوودی پێ نەگەیەنرا ئەوا ئەو سوودەی دەست ناکەوێت هەروەك پێغەمبەرﷺ بە عەمروی فەرموو: ((إن أباك لو كان أقر بالتوحيد فصحت أو تصدقت عنه نفعه ذلك)) [٢٦٦]، واتە: (بێگومان باوکت ئەگەر بڕیاری بە تاك و تەنهایی خوا بدایە ئەوا ئەگەر بە ڕۆژوو بوایت یاخود خێر و چاکەت لەجیاتی کردبایە ئەوا سوودی بۆ ئەویش دەبوو)).

ئەمەش هەروەك خوای گەورە ئیسلامی گێڕاوە بەهۆکارێك بۆ سوود گەیاندن بە بەندە کاتێك کردەوەیەکی خێر دەکات، جا ئەگەر ئەو هۆکارە نەبووایە ئەوا لە کردەوەی خێرەکەی سوودی پێنەدەگەیشت. و لێی ڕازی نەدەبوو. هەروەك دڵسۆزی و بەدواداچوونیش هۆکارێکە بۆ قەبوول بوونی کردەوەکان، ئەگەر لەدەستی چوو ئەوا کردەوەکانی لێ قەبووڵ ناکرێت، وە هەروەك دەست نوێژ و هەموو مەرجەکانی نوێژکردنی کردۆتە هۆکارێك بۆ تەندروستیەکەی، جا ئەگەر لە دەستی چوو ئەوا تەندروستیەکەی لەدەست دەچێت.

❊❊❊

## (لەبارەی ووتەکانیان: عیبادەت و خواپەرستی دوو جۆرە)

بەڵام لەبارەی ووتەکانیان: خواپەرستی دوو جۆرە: جۆرێکیان دەچێتە بواری لەجیاتی کردنی کردەوەکە جا بەخشینی پاداشتەکەی دەگاتە مردوو، وە جۆرێکی دیکەیان لەجیاتی ئەو نابێت و پاداشتەکەی ناگاتێ.

---

[٢٦٦] مسند أحمد: ٢/ ١٨٢.

ئەمە هەمان مەزهەب و داوایە، جا چۆن نـارەزایی و بیـانووی لێـدەگرن؟ وە ئایا ئەم جیاوازیەت لە کوێ هێناوە؟ وە لە چ پەرتووکێك، یـان لـە چ سـوننەتێك؟ یان لە چ شتێکی گرنگ و پـڕ بایـەخ، بەڵگـە بێـت لەسـەر تـاوەکو چـارەنووس و کۆتاییەکەی بۆ ئەو پێویست بکات.

لەڕاستیدا پێغەمبـەرﷺ بڕیاریـداوە ڕۆژوو بگیرێتـەوە لـەجیاتی مـردوو لەگەڵ ئەوەش ڕۆژوو ناچێتە ناو نوێنەری کردن، وە بڕیاری داوە بۆ ئۆممەتەکەی کەوا هەندێك لەجیاتی هەندێکیان فەرزی کیفایە بەجێ بگەیـەنێت، جـا ئەگـەر یـەکێك لەجیاتی ئەوانی تر کارەکەی کـرد ئـەوا تـاوان و گونـاه لەسـەریان لادەچـێت، وە بڕیاریداوە بۆ سەرپەرشتیاری منداڵ کەوا ئەقڵی پێداناشکێت لەجیاتی ئەو ئیحـرام و کارەکانی شێوازی حەجکردن بکات، وە حـوکمیش بـۆ ئـەو پاداشـت و چـاکەیە بەکردنی جێگر و نوێنەرەکەی لەجیاتی ئەو.

ئەبو حەنیفە- ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت: ئەو کەسەی هاوڕێیەتی دەکات ئیحرام لەجیاتی ئەو کەسە دەکات کە لە هۆش خۆی چووەو لەگەڵیەتی، جا ئیحرام بەستنی هاوەڵەکەی بەپێ ی پلـەو پایـەی ئیحرامەکـەی دەبێـت، یاسـادانەرەکەش ئیسلام بوونی دایك و باوك بە پلەو پایەی ئیسلام بـوونی منداڵـەکانیان دادەنێـت، ئەوەی پاداشتی حەج و سەدەقە و گەردن ئازادی گەیاند هەر ئەویشە کەوا پاداشتی ڕۆژوو و نوێژ و خوێندنەوەی قورئان و مانەوەی لە مزگەوت دەگەیەنێت، لەڕاستیدا خەونی ئیمانداران زۆر قسەی لەسەر کـراوە، هەواڵـەکان زۆر دووبـارە بوونەوەتـەوە لەسەر مردووەکان کەوا ئەوانەی بۆیان دەبەخشن لە خوێندنەوەی قورئان و نوێژکردن و سەدەقە و حەج و شتی دیکە بە گەیانـدنی پاداشـتەکە بۆیـان، پێغەمبـەرﷺ دەفەرموێت: ((أرى رؤياكم قد تواطأت على أنها في العشر الأواخـر)) [٢٦٧]، واتـە:

---

([٢٦٧]) مسلم: (١١٦٥).

بێگومان خەونتەکانتان بەڕاستو دروست دەزانم لەسەر ئەوەی کەوا (شەوی قەدر لەمانگی ڕەمەزاندا لە دە ڕۆژی کۆتاییەکاندایە).

پێغەمبەرﷺ خەونی ئیماندارانی بە ڕاست و دروست داناوە، ئەوەش هەروەك گێڕانەوەی فەرموودەکانیان بەڕاست و دروست داناوە لەوەی بینیوویانە وە ئەوانە لە گێڕانەوەی قسەکانیان درۆ ناکەن و هەروەها خەونەکانیشیاندا ئەگەر بینیان.



## (لەبارەی بەرپەرچدانەوەی حەدیسێکی پێغەمبەرﷺ)

بەڵام بەرپەرچدانەوەو گەڕاندنەوەی حەدیسێکی پێغەمبەرﷺ کە ئەو فەرموویەتی: ((من مات وعليه صيام صام عنه وليه))، واتە: ((هەرکەسێ مرد وە ڕۆژووی لەسەر بێت با سەرپەرشتیارەکەی لەجیاتی ئەو بە ڕۆژوو بێت)). بەو ڕووانەی کەوا باسکردن، جا ئێمە سەردەکەوین بۆ فەرموودەی پێغەمبەرﷺ وە بۆ ڕاستی و دروستیەکەش ڕێك کەوتنەکەی ئاشکرا دەکەین لەم ڕووانەدا.

بەڵام بێکار و درۆزنەکان بۆ ئێمە بەسە کە بەرهەڵستکاریەکەی پێشوو مایە پووچە بۆ فەرموودەیەکی سەحیح و پوخت کەوا کار لە هێزی وپتەوی ناکات، هیچ ڕێگایەکیش نیە بۆ چاوپێکەوتن و ڕوو بەڕوو بوونەوە تەنها بەگوێرایەڵی و ملکەچی و خۆ بەدەستەوە دان و ڕازی بوون نەبێت. لەلای ئێمە لەوە باشتر نیە، بەڵکو باشترە و زۆریش باشترە لە خۆ بەدەستەوە دان بۆی و قسە کردن لەو بارەیەوە ئەگەرچی جیاوازی لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا کردبێت.

بەڵام لەبارەی ووشەکانتان: بە ووتەی مالیك لە ((موطأ))ەکەیدا بەرپەرچی دەدەینەوە: کەس لەجیاتی کەس بە ڕۆژوو نابێت.

بەڵام لەبارەی ووشەکەی: ئەوە فەرمانێکی بە کۆمەڵەو یەکدەنگیە لای ئێمە و ناکۆکی تێدانیە، جا مالیك- ڕەحمەتی خوای لێبێت- ئەم ووتەیەی بۆ هەموو ئوممەت نەکردووە لە ڕۆژهەڵاتی زەوی تا ڕۆژئاواییەکەی، بەڵکو تەنها بۆ خەڵکی مەدینە قسەی کردووەو کە تێیدا ڕایگەیاندووە، و جیاوازی نێوانیانی ڕانەگەیاندووە. بەڵکو هەموو خەڵکی مەدینە یەکدەنگبوون لەسەری، وە لەکاتی هەر ناکۆکیەك پێویستە بگەڕێتەوە لای خواو پێغەمبەرﷺ. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ (النساء: ٥٩)، واتە: ((خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان دەربارەی حوکمی خوای، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەیﷺ (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت))، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، (ڕەفتار کردنتان) بەو شێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان)).

ئەگەر مالیك و خەڵکی مەدینە ووتیان: کەس لەجیاتی کەس بە ڕۆژوو نابێت، ئەوا حاکم کوڕی عتیبە وە سلمە کوڕی کهیل ڕیوایەتیان کردووە، لە سعید کوڕی جبیر، ئەویش لە ئیبنو عباس: فەتوای داوە لە گێڕانەوەی مانگی ڕەمەزان لەجیاتی مردووەکە نان بدات وە لە نەزر کردنیشدا لەجیاتی بە ڕۆژوو دەبێت.

ئەمەش مەزهەبی ئیمام ئەحمەد و زۆر لە خاوەنی حەدیسەکە و ئەمەش ووتەی ئەبی عوبێدە، وە ئەبو ثور دەڵێت: لەکاتی نەزردا لەجیاتی بەڕۆژوو دەبێت وە شتی تریش، حسن کوڕی صالح لەبارەی نەزر کردن دەڵێت: سەرپەرشتیارەکەی بە ڕۆژوو دەبێت.



## ( لەبارەی ووتەکانیان:
## کەوا ئیبنو عەباس ئەو ڕیوایەتی حەدیسی ڕۆژوو دەکات لەجیاتی مردوو )

بەڵام لەبارەی ووتەکانتان: کەوا ئیبنـو عـەباس خـۆی حەدیـسی ڕۆژووگـرتن لەجیاتی مردوو دەگێڕێتـەوە، دەڵێـت: کـەس لـەجیاتی کـەس بـە ڕۆژوو نابێـت، مەبەستیش لەمە دەکرێت سەحابەیەك بە پێچەوانە فەتوای دابێت لەوەی ریوایـەتی کردووە ئەمەش فێڵ و هەڵخەڵەتانـدن نیـە لـە ڕیوایەتەکەیـدا، چـونکە ڕیوایـەت کردنەکەی پارێزراوو دوور لە هەڵەیە، بەڵام فەتواکردنەکەی پارێزراوو دوور لە هەڵە نیە. دەشبێت حەدیسەکەی لە بیر چووبێت، یاخود بۆچوون و لێکدانەوەکەی، یاخود باوەڕم بۆی هەیە بە مەزەندەی خۆی بەرهەڵستکارێکی شیاو و پەسەندە یـاخود بـۆ چەند شتێکی دیکە لەو هۆکارانە، لەسەر ئەوەی کەوا فەتوای ئیبنو عەباس نـەیار و بەرهەڵستکارنیە بۆ حەدیسەکە، چونکە ئەو فـەتوای داوە لـە ڕەمەزانـدا کـەس لەجیاتی کەس بە ڕۆژوو نابێت، وە لەبارەی نـەزریش فـەتوای داوە کـەوا لـەجیاتی مردوو بە ڕۆژوو بێت، ئەمەش پێچەوانە نیە بۆ ڕیوایەتەکەی، بەڵکو حەدیـسەکەی لەبەر کردووە لەسەر نەزر کردن.

پاشان حەدیسەکە: ((من مـات وعليـه صـيام صـام عنـه وليـه)). ئەمـە لـە ڕیوایەتی عائیشەدا ﷺ جێگیرە و بڕیاری لەسەر دراوە، جا ئەگەر ئیبنـو عـەباس پێچەوانەی بووبێت جاچبوو، جا ناکۆکی و پێچەوانەی ئیبنـو عـەباس ناوزڕانـدن و هەڵخەڵەتاندن نیە لە ڕیوایەتی دایکی ئیمانداران. بەڵکو گێڕانەوەی ووتـەی ئیبنـو عەباس رضي الله عنه بەڕیوایەتی عائیشە رضي الله عنها لـە پێـشتر بـووە لـە گێڕانـەوەی ریوایـەتی عائیشە رضي الله عنها بە ووتەی ئەو.



**( لەبارەی ووتەکانیان: کەوا حەدیسێکی جیاوازە لە ئیسنادەکەی دا )**

لـەبارەی ووتـەکانتان: کـەوا حەدیـسێکە نـاکۆکی و جیـاوازی هەیـە لـە ئیسنادەکەیدا جا قسەیەکی سەرکێش و سەرەڕۆ ووتەکەی قەبووڵ ناکرێن، حەدیسی سەحسح جێگیرە ڕێك کـەوتوون لەسـەر دروسـتیەکەی وە موسـلم و بوخـاری لـە سەحیحەکەیاندا ڕیوایەتیان کردووە، و جیاوازیان نیە لە ئیسنادەکەی.

ئیبن عبد البر دەڵێت: لـە پێغەمبـەرﷺ دەگێڕێتـەوە کـەوا فەرموویـەتی: ((من مات وعليه صيام صام عنه وليه))، واتە: ((هەرکەسێ مرد و ڕۆژووی لەسەر بێت با سەرپەرشتیارەکەی لەجیاتی ئەو بەڕۆژوو بێـت)). ئیمـامی ئەحمـەد چاکی کردۆتەوە و پێداچۆتەوە، شافعیش لەسەر دروستیەکەی ووتەکەی بـەدڵ بـووە، جـا ووتی: لە پێغەمبەرﷺ ڕیوایەت کراوە لـەبارەی ڕۆژوو گـرتن لـەجیاتی مـردوو، ئەگەر بڕیاری لەسەر دابوو لەجیاتی بیگرنەوە هەروەك لەجیاتی ئەو حەج دەکرێـت، بێگومان بڕیاریشی لەسەر داوە، ئەمە مەزهەبی شافعی یە.

بەیهەقی دەڵێت: پاش گێڕانەوەی ئەو ئاخافتنە لە شافعی: ئینجا گەڕاندنەوەو تەواو کردنی ئەرکەکان لەجیاتی مردوو شیان و جێگیر بوو بە ڕیوایـەتی سـەعیدی کوڕی جوبەیر و موجاهید و عگـارە و عەکرِمـەش لـە ئیبنـو عـەباس گێڕایـەوە، لەزۆربەی ڕیوایەتەکاندا ئەو ئافرەتەی پرسیاری کرد پـێ دەچـێت هـەمان چیرۆکی دایکی سەعد نـەبێت. وە لـە ڕیوایـەتی هەندێکیانـدا هـاتووە: لـەجیاتی دایکـت بەڕۆژوو بە.

لەبارەی ووتەکانتان: کەوا نەیارو ناکۆکـە بـە دەقـی قورئـان خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ (الـنجم: ٣٩)، واتـە: ((بەڕاسـتی ئادەمیزاد خاوەنی هیچ شتێك نیە تەنها ئەوە نەبێت کە خۆی کردوویەتی)) خراپـی ئەتەکێت و پەیرەوی کردن لـە ئاخـاوتن دا، وە هەڵەیـەکی گـەورە لـە مانـادا، وە

خودای گەورە پێغەمبەرەکەی ﷺ پاراستووە کەوا ناکۆکی سوننەتەکەی بێت بۆ دەقەکانی قورئان، بەڵکو پشتگیری بکەو یارمەتیدەر بە بۆی، لەمەو پێش بە تەواوی قسەمان لەسەر ئەو ئایەتە کردووە، لە کاتێکدا کە لەنێوان ئەو و نێوان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەرهەڵستکاری و ناکۆکیەك نیە، بەڵکو لە بەرهەڵستکاری و ناکۆکیی دا وا گومان دەبرێت لە خراپی تێگەیشتنە، ئەمەش شێواز و بۆ چوونێکە و خۆورەوشتێکی زەمکراو و نەویستراوە.

لەبارەی ووتەکانتان: کەوا دژو بەرهەڵستکارە بەوەی نسائی ڕیوایەتی کردووە، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێردرێتەوە کەوا فەرموویەتی: ((لا يصلي أحد عن أحد، ولا يصوم أحد عن أحد ولكن يطعم عنه كل يوم مدحنطة)) جا هەڵەیەکی چەپەڵ و ناشیرینە، لەبەر ئەوەی نسائی ئاوا ریوایەتی کردووە: محمد کوڕی عبد الاعلى بۆمانی گێڕایەوە، يزيد کوڕی زریع بۆی گێڕینەوە، ئەویش لە حجاج الاحول بۆی گێڕاوەتەوە، ئەویش دەڵێ أيوب کوڕی موسی بۆمانی گێڕایەوە، ئەویش لە عطاء کوڕی ئەبی رباح، ئەویش لە ئیبنو عەباس رضي الله عنهما دەڵێت: کەسێ لەجیاتی کەس نوێژ ناکات وە کەسیش لەجیاتی کەس بەڕۆژوو نابێت، بەڵام لەجیاتی ئەو نان دەدرێت لەجێگای هەر ڕۆژێك بە قەدەر ژەمێك خواردن.

ئاوا ووتەی ئیبنو عەباس ریوایەت کراوە، نەك ووتەی پێغەمبەر ﷺ، جا چۆن ووتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ووتەی ئیبنو عەباس بەرهەڵستکار و دژکار دەکرێت، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز ئەو قسەیەی نەکردووە، وە چۆن دەڵێت: لە هەردووس سەحیحەکەدا لەلای ئەو سەلمێنراوە کەوا فەرموویەتی: ((من مات وعليه صيام صام عنه وليه؟)) چۆن دەڵێت: وە لە حەدیسێکی بریدەدا دەڵێت کەوا موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە: کەوا ئافرەتێك بە پێغەمبەری

ووتﷺ دایكم مردووەو ڕۆژووی مانگێكی لەسەرە، فەرمووی: ((صومي عن أمك)) [268].

لەبارەی ووتەكانتان: دژو نەیارە بە حەدیسێكی ئیبنو عومەرؓ: ((من مات وعليه صوم رمضان يطعم عنه)) جا لەو سەمت و شێوازەدا كەوا حەدیسێكی ناڕەوایە لەسەر پێغەمبەری خواﷺ.

بەیهەقی دەڵێت: حەدیسی محمد كوڕی عبدالرحمن كوڕی ئەبی لیلی لە نافیع دەگێڕێتەوە، ئەویش لە ئیبنو عومەرؓ، ئەویش لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە كەوا فەرموویەتی: ((من مات وعليه صوم رمضان يطعم عنه))، واتە: ((هەر كەسێ مرد و ڕۆژووی ڕەمەزانی لەسەر بێت لەجیاتی ئەو نان دەدرێت)) ڕاست نیە، وە محمد كوڕی عبدالرحمن زۆر بەد گومان و خەیاڵاویە، وە لە ڕاستیدا هاوەڵانی نافیع ڕیوایەتیان كردووە، لە نافیع، ئەویش لە ئیبنو عومەرؓ لە ووتەكەیدا.

بەڵام لە بارەی ووتەكانتان: كە بەرهەڵستكارە بە پێوەرێكی دیار و ئاشكرا لەسەر نوێژ و ئیسلام تەوبە كردندا، ئەوا كەس لەجیاتی كەس نایكات.

*** 

## (لەبارەی قسەی شافعی: لە بەهەڵەدابردنی گێڕانەوەی حەدیسی ئیبنو عەباس دا)

بەڵام ووتەو ناخاوتنی شافعی- ڕەحمەتی خوای لێبێت- لە هەڵە پێبردنی گێڕانەوەی حەدیسی ئیبنو عەباسؓ: كەوا دایكی سەعد نەزری كردبوو بەڕۆژوو بێت، سەركەوتووترین خەڵك كەوا لەجیاتی ئەو وەڵامی دەداتەوە ئەویش بەیهەقیە، وە ئێمە بە گوفتاری خۆی قسەكەیان باسكرد، لە پەرتووكی ((المعرفة)) پاش

---

[268] مسلم: (١١٤٩).

ئەوەی خۆی قسە دەکات و دەڵێت: ((لەڕاستیدا ڕێدانی بەجێهێنان و گێڕانەوەی ئەرکەکان لەسەر مردوو جێگیر بوو بە ڕیوایەتی سەعیدی کوڕی جوبەیر و موجاهید و عطاء و عەکرەمە، لە ئیبنو عەباس گێڕدراوەتەوە، وە لە ریوایەتێکدا زۆرترینیان: کەوا ئافرەتێك پرسیاری لە عائیشە کرد، پێ دەچێت ئەمە چیرۆکی دایکی سەعد نەبێت، لە ڕیوایەتی هەندێکیاندا: ((لەجیاتی دایکت بەڕۆژوو ببە)) ووتی: شایەدی بۆ دەدرێت لە دروستی ڕیوایەتی عبداللە ی کوڕی عطاء المدنی دەڵێت: عبد اللە کوڕی بریرة السلمی بۆی گێڕامەوە ئەویش لەباوکی، ووتی: من لە خزمەت پێغەمبەرﷺ دانیشتبووم ئافرەتێك هاتە لای و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من خێرێکی نەبڕاوەم بە دایکم بەخشی، جا دایکم مرد، وە خێرێکی نەبڕاوەکە ماوەتەوە، فەرمووی: ((قد وجب أجرك ورجعت إليك في الميراث))، واتە: ((تۆ خێر و پاداشتەکەت بەجێگەیاند ئێستا لە خێر کەوتووە وە لەمیراتدا خێرەکە بۆتۆ گەڕاوەتەوە)). ئافرەتێك ووتی: دایکم مردووە ڕۆژووی مانگێکی لەسەرە، فەرمووی: ((صومي عن أمك))، واتە: ((لەجیاتی دایکت بەڕۆژوو ببە)). ئافرەتێك ووتی: دایکم مردووە و حەجی نەکردووە؟ فەرمووی: ((فحجّي عن أمّك)) [٢٦٩]، واتە: ((لەجاتی دایکت حەج بکە)). موسلم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە.

وتم: ئەبوبەکر کوڕی ئەبی شیبە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت، أبو معاویە بۆمانی گێڕاوەتەوە، لە الاعمش، ئەویش لە مسلم البطین، ئەویش لە سعیدی کوڕی جبیر، ئەویش لە ئیبنو عەباس ووتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دایکم مرد وە ڕۆژووی مانگێکی لەسەرە ئایا دەکرێت لەجیاتی بگرمەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((لو كان عليها دين أمنت قاضيه عنها؟))، واتە: ((ئەگەر قەرزێکی لەسەر بوایە لەجیاتی ئەو نەتدەگەڕاندەوە؟))،

---

(٢٦٩) مسلم: (١١٤٩).

پیاوەکە ووتی: بەڵێ. فەرمووی: ((فدين الله أحق أن يقضى))، واتە: ((جا قــەرزی خوا شایستەترە کەوا بگێڕدرێتەوە)).

وە ئەبو خشیمە ریوایەتی کردووە و دەڵێـت: معاویـەی کـوڕی عـومرو بـۆی گێڕاینەوە، کەوا زائدە لە الاعمش وەریگرتووە، جا باسی کردووە.

نیسائی ڕیوایەتی کردووە، لە قتیبەی کـوڕی سـعید دەڵێـت: عبثـر بۆمـانی گێڕایەوە، ئەویش لە الاعمش وەریگرتووە، جا باسی کردووە.

جا ئەمە حەدیسی دایکی سعد نیە بە خستنە پاڵ و بـەزۆری، لەبـەر ئـەوەی چیرۆکی دایکی سعد مالیك ڕیوایەتی کردووە، لە الزهری، ئەویش لە عبدالله کوڕی عبدالله کوڕی عتبە، ئەویش لە ئیبنـو عـەباس ((کـەوا سـەعدی کـوڕی عبـادە ڕاوێژی بە پێغەمبەرﷺ کرد، ووتـی: دایکـم مـردووەو نەزریـشی لەسـەرە؟ جـا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((اقضه عنها))، واتە: ((لەجیاتی ئەو نەزرەکەی بـۆ بدەوە))، ئاوا لە هەردوو سەحیحەکە دەریانهێناوە[270].

ئاوا لە حەدیسەکەدا پارێزراوە کەوا نەرزێکە و ناوی نـەهاتووە، جـا دەکرێـت ئەوە لە حەدیسی الاعمش هاتبێت، ئەویش لە سعیدی کوڕی جـبیر لەسـەر ئـەوەی کەوا پێغەمبەرﷺ وازی هێنابێت لە باسکردنی زیاتر بۆ سعد لـەبارەی نەزرەکـە ئایا نوێژکردن بوو، یاخود خێر و چـاکە یـاخود ڕۆژوو گـرتن بـوو، لەگـەڵ ئـەوەش ئەوەی نەزربکات بێگومان ئـەوە نـەزردەکات، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی جیاوازی نیە لەنێوان گەڕاندنـەوەی نـەزری ڕۆژوو گـرتن و نوێـژکردن، وە ئەگـەرنا پێغەمبەرﷺ پێی دەفەرموو: ئایا نەزرەکە چی یە؟ جا ئەگەر نەزر دابەش بکەین بۆ دوو بەش: نەزرێك قەبووڵ دەکرێت لەجیاتی مردوو بگێڕدرێتـەوە وە نـەزرێکیش قەبووڵ ناکرێت.

❊❊❊

[270] مسلم: (١١٤٩)

**(ووتەو بۆچوونەکانی زانایان لەبارەی ڕۆژوو گرتن لەجیاتی مردوو).**

ئێمە باسی ووتەو بۆچوونی زانایـان دەکـەین لـەبارەی رۆژوو گـرتن لـەجیاتی مردوو نەوەکو بە هەڵەدابچێت کەوا لە مەسەلەیەکدا هەموو تێیدا ناکۆکن.

عبداللە ی کوری عبـاس دەڵێـت: لـە نـەزرکردن دا رۆژوو لـەجیاتی مـردوو دەگیرێتەوە، وە نـان دەدرێـت لـەجیاتی گەڕاندنـەوەی ڕۆژووی ڕەمـەزان، ئەمـەش مەزهەبی ئیمام ئەحمەدە.

ئەبو ثور دەڵێت: لە نەزرکردن و فەرزدا ڕۆژوو لـەجیاتی مـردوو دەگێڕێتـەوە، ئەگەر هاتوو نەزر بێت یاخود فەرز.

ئەوزاعی دەڵێت: سەرپەرشتیاری لە جێگای ڕۆژوو خێرو چاکەیەك دەکات، جا ئەگەر دەستی نەکەوت ئەوا لە جیاتی بـەڕۆژوو دەبێـت، ئەمـەش ووتـەی (سـفیان الثوري)، لە یەکێك لە دوو ڕیوایەتەکانی گێڕاویەتیەوە.

حسن دەڵێت: ئەگەر هاتوو ڕۆژووی مانگێکی لەسەر بوو، ئەوا دەگونجێت سی پیاو لە ڕۆژێکدا لەجیاتی ئەو بەڕۆژوو بن.

وە ئەبو عبید القاسم کوڕی سەلام دەڵێت: لە نـەزر و کردنـدا لـەجیاتی ئـەو بەڕۆژوو دەبێت وە لە فەرزیشدا لەجیاتی ئەو نان دەدرێت.



**(لەبارەی ووتەکانیان:**

**تەنها لە حەجکردندا پاداشتی بژێوی دەگات بۆ مردوو)**

لەبارەی ووتەکانتان: کەوا لە حەجکردندا پاداشتی بژێوی پێی دەگـات بـەبێ کردەوەکانی شێوازی حەجکردن جا ئەمە تەنها داوایەکە بـەبێ بەڵگـە و سـەلماندن،

سونـنەتيش رەتی دەكاتەوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ فەرمووپەتی: ((حـج عـن أبيك)) [٢٧١]، واتە: ((لەجياتی باوكت حەج بكـە))، وە بـە ئافرەتەكـەی فـەرمـوو: ((حجي عن أمك)) [٢٧٢]، واتە: ((لەجياتی دايكت حەج بكە)). جـا هـەواڵی داوە كە حەجكردن خۆی لەجياتی مردووە. وە نەيفەرمووە: كـەوا بـژێوی و خـەرجكردن ئەو لەجياتی دەكرێت.

هەروەها بەو كەسەی فەرموو كە دەيويـست لـەجياتی شـبرمة حـەج بكـات: ((حج عن نفسك ثم حج عن شبرمة)) [٢٧٣]، واتە: ((تۆ لەجياتی خۆت حـەج بكـە، پاشان لەجياتی شبرمە حەج بكە)).

كاتێـك لـەبارەی منداڵەكـەی كـە لەگەڵيـدا بـوو ئافرەتێـك پرسـياری لـە پێغەمبەرﷺ كرد ووتی: ئايا ئەمە حەجی بۆ هەيە؟ پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ((نعم)) [٢٧٤].نەيفەرموو: بەڵكو تەنها پاداشتی بژێوی و حەجی بۆی هەيە، بـەڵكو ڕايگەياند كەوا حەجی بۆ هەيە، لەگەڵ ئەوەش كەوا ئەو هيچ كـارێكی نـەكردووە، بـەڵكو سەرپەرشـتيارەكەی لـەجياتی ئـەو كارەكـانی شـێوازی حـەجكردن بـەجێ دەهێنێت.

پاشان كەوا بريكارەكەی لەجياتی مردوو لە پارەی خۆی هـيچ سـەرف ناكـات جگە لە خەرجی نيشينگەكەی، جـا چ شـتێك خـەرجی پاداشـت دەكاتـە خـەرجی نيشينگەكەی بۆ بڕوبيانوو هێنانەوە لەجياتی ئەو، لەكاتێكدا ئەو لەسەر حەجكردن خەرجی نەكردووە، بەڵكو ئەمە خەرج و بژێوی نيشينگە ياخود سـەفەرەكەيە، ئـەو ووتەيەش سوننە و پێوەر ڕەتی دەكاتەوە. وە خوای گەورەش زاناترە.

❊ ❊ ❊

---

([٢٧١]) سنن أبي داود (١٨١٠) والترمذي (٩٣٠).

([٢٧٢]) لەمەوپێش باسی ئەم حەديسەمان كردووە.

([٢٧٣]) سنن أبي داود (١٨١١).

([٢٧٤]) مسلم: (١٣٣٦)، ورة الموطأ: ١/ ٤٢٢.

## (ئایا پاداشت به مردوو دەگات کەوا بە زوبان و قسە ببەخشرێت یاخود تەنها نیەت بەسیەتی؟)

جا دەڵێت: ئایا مەرج دادەنرێت لە گەیشتنی پاداشتەکە کەوا بەزوبان ببەخشرێت یاخود لە گەیشتنی تەنها نیەتی بکەرەکە بەسەر کەوا بیبەخشێت بۆ یەکێکی تر؟

دەڵێت: سوننەت لەیەك حەدیسیشدا بەخشینی پاداشتی بە زوبان و قسەکردن بە مەرج دانەناوە، بەڵکو پێغەمبەرﷺ بکەرەکەی ئازاد کردووە لە چۆنیەتی بەخشینەکە بۆ کەسێکی تر، وەك ڕۆژوو، و حەجکردن، وخێرو چاکەو سەدەقە، ئەمەشی بە بکەرەکە نەفەرمووە: بڵێ پەروەردگارا ئەوە لەجیاتی فلانی کوڕی فلانە، وە خودای پاك و بێگەردیش زانایە بەنیەت و مەبەست و کردەوەی بەندەی خۆی، جا ئەگەر بە قسە ووتی ئەوا دروستە، ئەگەر بەقسەش نەیووت ئەوا بە نیەت و مەبەست بەسە بۆ ئەوەی پێیبگات، خوای گەورەش زاناترە.

جا ئەو ئەگەر کارێکی بۆخۆی کرد پاشان نیەتی هێنا کەوا پاداشتەکەی بۆ کەسێکی دیکە بێت ئینجا تەنها بەهۆی نیەت نەیدا بەکەسەکە، هەروەك ئەگەر نیەتی وابوو کەوا شتێك ببەخشێت، یان کەسێك ئازاد بکات، یان خێر و چاکەیەك ئەنجام بدات، بەڵام بەهۆی نەهێنانی نیەت کارەکەی نەکرد.

لێرەدا ئەمە ڕوون دەکاتەوە ئەو ئەگەر شوێنێکی دامەزراند بە مەبەستی دروستکردنی مزگەوتێك، یان قوتابخانە، یان ئاوادانێك وە هەر شتێك لەم بابەتە، ئەوا دەبێتە وەقف و تەرخانکردن بۆ کارەکە لەگەڵ نیەتەکەی وە پێویستی بە قسەکردن نیە.

هەروەها ئەگەر بەنیەتی زەکات پارەیەکی دا بە هەژارێك ئەوا زەکاتەکەی لەسەری لادەچێت ئەگەرچی بە قسەو ئاخافتنیش نەیووت، هەروەها ئەگەر

لەجیاتی کەسێکی زیندوو یاخود مردوو قەرزێکی دایەوە ئەوا لە ئەستۆی دەکەوێت ئەگەر نەشیووت: ئەوە لەجیاتی فلانە.

جا لەبەر ئەوەی دەڵێت: پێغەمبەرﷺ ڕێنمایی کردوون بۆ ڕۆژوو وە سەدەقە و حەجکردن بەبێ پێ ووتن.

دەڵێت: پێغەمبەرﷺ ئەوانی خەبەر نەداوە بۆ ئەم کارە، بەڵکو ئەمە دەرچوونێکە لێی وەڵامدانەوەیە بۆیان، جا ئەمە پرسیاری لێکردووە لەبارەی حەجکردن لەجیاتی مردووەکەی جا پێغەمبەریشﷺ مۆڵەتی پێداوە، وە ئەمەش پرسیاری لێکردووە لەبارەی ڕۆژوو گرتن لەجیاتی مردووەکەی جا ئەویش مۆڵەتی پێداوە، وە ئەمەش پرسیاری لێکردووە لەبارەی سەدەقە و خێر و چاکە جا ئەویش مۆڵەتی پێداوە، قەدەغەی نەکردوون جگە لەوانە.

چ جیاوازیەك هەیە لەنێوان گەیشتنی پاداشتی ڕۆژوو کەوا تەنها نیەت هێنان و نەهێنانە وە لەنێوان گەیشتنی پاداشتی ووتن و باسکردن؟

نهێنی مەسەلەکەش کەوا پاداشتەکە مولکی بکەرەکەیە، جا ئەگەر پاداشتەکەی بەخشی و پێشکەشی کرد بۆ برا موسڵمانەکەی ئەوا خودای گەورە پێی دەگەیەنێت، جا کێ یە ئەوەی لەوەدا تایبەتی دەکات لە پاداشتی خوێندنەوەی قورئان وە قەدەغەی دەکات لەسەر بەندەیەك کەوا بیگەیەنێت بۆ برا موسڵمانەکەی؟ ئەمە کردەوەی خەڵکانێکە هەتا ئەوانەی کاروکردەوەی خراپ و ناشیرین دەکەن لە گشت سەردەمەکاندا، وە پێداگرتنی ئەو زانایانەی ڕەتی ناکەنەوە.

کە دەڵێت: چی دەڵێت لەبارەی بەخشین بۆ پێغەمبەری خوداﷺ؟

دەڵێن: لە زاناکانی پاشینەکان ئەوەی خۆشی دەوێت، وە لەوانەی خۆشی ناوێت و بە بیدعە سەیری دەکات، سەحابەکان ئەو کارەیان نەکردووە، وە پێغەمبەرﷺ پاداشتی هەموو کارێکی خێری هەیە لە ئوممەتەکەی بێ ئەوەی لە

پاداشتی بکەرەکەی شتێك کەم بکاتەوە، چونکە هەر ئەو بوو ئومەتەکەی نیشاندا لەسەر هەموو کارێکی خێر، وە ڕێنمایی کردن و داوای لێکردوون بۆ ئەم کارە، هەر کەسێ داوای کرد بۆ بەخشینی ئاتەمە پاداشتێکی بۆی هەیە وەکو ئەو پاداشتانەی شوێنی دەکەوێت بێ ئەوەی لە پاداشتەکانیان شتێك کەم بێتەوە[٢٧٥]. هەموو بەخشین و ڕێ ی ڕاست و زانستێك لە ڕاستیدا ئومەتەکەی لەسەر دەستی ئەو بەدەستی هاتووە جا وەك پاداشتی ئەو کەسەی شوێنی دەکەوێت بۆ دەبەخشرێت، ئەگەرچی بۆشی نەبەخشێت، خوای گەورەش زاناترە.

ئەگەر ووتیان: ئایا ڕوونکردنەوەی بەخشینەکە پێویست دەبێت لەسەری بەوەی کەوا بڵێت: پەروەردگارا ئەگەر ئەو کاردت قەبووڵ کرد وە منت ڕاوەستاو کرد لەسەری ئەوا پاداشتەکەی بدە بە فلان یاخود نا؟

دەڵێت: ئەمە ناوەستێتە سەر ووشە دەربڕین و مەبەست، بەڵکو لەو مەرجەشدا سوودی نیە، چونکە خوای گەورە خۆی ئەو کارە دەکات، ئەگەر مەرجی کرد یاخود مەرجی نەکرد.

ئەگەر ووتیان: چ شتێك لە هەمووی باشترە کەوا پێشکەش مردوو بکرێت؟ دەڵێت: باشترینیان ئەوەیە لە هەموو بەسوود تر بێت بۆخۆی، جا گەردن ئازاد بوون و سەدەقە باشترە لە ڕۆژوو گرتن لەجیاتی ئەو، وە باشترین سەدەقەش ئەوەیە پێویستیەکی ئەو چارەسەر بکەیت وە بەردەوام و نەبڕاوەش بێت، حەدیسێکی پێغەمبەرﷺ هەیە لەم بارەیەوە: ((أفضل الصدقة سقي الماء)) ، واتە: ((باشترین سەدەقە ئاودانە یاخود ئاو گێڕە)). لێرەدا مەبەست لەو شوێنەیە کە ئاوی تێدا کەم بێت، و تینوویەتی تێدا زۆر بێت، وە ئەگەر نا ئاودان و ئاو گێران لەسەر ڕووبار و کانی باشترینە لە پێدانی خۆراك لەکاتی پێویستیدا، هەروەها دوعا و پاڕانەوەو لێخۆشبوون بۆی ئەگەر دوعاکە بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و ملکەچی بێت ئەمە

---

(٢٧٥) مسند أحمد: ٢/ ٣٩٧، رة مسلم: (٤٦٧٤).

لەکاتی خوێیدا باشترە لە خێر و چاکە بۆی، وەك نوێـژن کـردن لەسـەر جـەنازە و وەستان لەسەر گۆڕەکەی بۆ دوعا کردن.

بەگشتی باشترین شت کە پێشکەش مـردوو بکـەیت گـەردن ئـازاد بـوون و سەدەقەیە، وە داوای لێخۆشبوون بۆی، و نزا و پاڕانەوە بۆی، و حەجکردن لەجیاتی ئەو.

بەڵام خوێندنەوەی قورئان و پێشکەشکردن بەو بەخۆشی خۆت و بەبێ کـرێ، جا ئەمە پاداشتەکەی پێی دەگات هەروەك پاداشتی ڕۆژوو و حەجکردنی پێدەگات.

ئەگەر وتیان: ئەمە لە پێشینەکاندا زانراو نیە وە ناشکرێت لەیەکێکی لەوان بگوازرێتـــەوە لەگـــەڵ توونـــدی پێـــداگیریان لەســـەر خێـــر و چـــاکەکردن وە پێغەمبەریش ﷺ ڕێنمایی بۆیان نەکردووە، بەڵکو ڕێنمایی کـردوون بـۆ دوعـا و پاڕانەوەو لێخۆشبوون و سەدەقە و حەجکردن و ڕۆژوو گرتن، جـا ئەگـەر پاداشـتی خوێندنەوەی قورئان بگەیشتایە ئەوا ڕێنمایی دەکـردت بـۆ ئـەم کـارە و ئـەوانیش دەیانکرد.

جا وەڵامەکە: کەوا سەرچاوەی ئەو پرسیارە ئەگەر هاتوو سـەلمێنراو بێـت بـە گەیشتنی پاداشتی حـەجکردن و ڕۆژوو و پاڕانـەوەو لێخۆشـوون، پێـی بڵـێ: ئـەو تایبەتمەندیە چیە کەوا گەیشتنی پاداشتی خوێندنەوەی قورئان قەدەغـە دەکـات وە پێویست دەکات پاداشتی ئەو کردەوانە پێی بگات، ئەمە شتێك نیە تەنها جیاوازی دروستکردنە لەنێوان شتە هاوشێوەکان، وە ئەگەر دانپیانەنرێت بـە گەیـشتنی ئـەو شتانە بۆ مردوو جا ئەمە بڕو بیانوو کردن نیە بە سـوننەو یەکـدەنگی و یاسـاکانی شەرع؟

❊ ❊ ❊

## دەربارەی : ئایا ڕۆح دروستکراوێکی کۆنە یاخود نوێ یە؟

جا ئەگەر ڕۆح دروستکراوێکی تازەو نوێیە و ئەمەش لە فەرمانی خودایە، جا چۆن دەبێت فەرمانی خوا دروستکراوێکی نوێ بێت؟ وە بێگومان خوای گەورە ڕایگەیاندووە کەوا لە ئادەمدا لە ڕۆحەکەی فووی پیا کردووە. جا ئەو خستنە سەریە بۆ ئەو ئایا بەڵگە لەسەر ئەوەی کەوا کۆنە یاخود نەخێر؟ وە ئایا ڕاستی ئەو زیادە و خستنە سەرە چی یە؟ ڕاشیگەیاندووە، لەبارەی ئادەم کەوا بە دەستی خۆی دروستی کردووە وە لە ڕۆحەکەیدا فووی پیا کردووە، جا زیادکردنی دەست و ڕۆح بۆی یەك زیادکردنە.

ئەو مەسەلەیە جیهانی تێدا هەڵخلیسکاندووەو بە هەڵەی بردووە، کۆمەڵێکیش لە ئەوەی ئادەمی تێدا گومڕا کردووە، وەخوای گەورە شوێنکەوتووانی پێغەمبەرەکەی تێدا هیدایەت داوە بۆ دڵنیاییەکی ئاشکرا و ڕاستیەکی دڵڕفێن. هەموو پێغەمبەران- سەلامی خوایان لێبێت- یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کەوا ڕۆح نوێکارە خولقاوە دروستکراوە پەروەردە کراوە (ڕێکخراوە) یاخود ئامادەکراوە، ئەمە بە ناچاری دڵنیاو ناسراوە لە ئایینی پێغەمبەران- صەلات و سەلامی خوایان لێبێت- هەروەك لە ئایینی ئەوانیشدا بە ناچاری ناسراوە دڵنیان کەوا جیهان نوێکارە، وە گەڕاندنەوەی لاشەکانیش ڕاستیە، بێگومان خوای گەورە تاك و تەنها و خولقێنەرە وە ئەوەی بوونی هەیە دروستکراوی ئەوە، وە سەردەمی سەحابە و شوێنکەوتووان و شوێن کەوتەی شوێنکەوتووان بەسەر چوو نەما، ئەوان لە سەدەیەکی باش بوون لەسەر ئەوەی بەبێ جیاوازی نێوانیان لە ڕووداوەکانیاندا، دروستکراوێکە هەتا بە هەڵکەوتووی دەرکەوت ئەو کەسەی تێگەیشتنەکەی کورتیهێنا لە قورئان و سوننەدا، جا وای دەربری کەوا ڕۆح کۆنە دروستکراو نیە، بیانووی هێنایەوە کەوا ئەو لە فەرمانی خوایە وە فەرمانی ئەویش دروستکراو نیە، بەوەی خوای گەورە بۆی زیاد کردووە

داویەتە پاڵ ئەو هەروەك زانست و قورئان و توانا و بینین و بیستن و دەستی خۆی بۆی زیادە کردووە، وە هەندێکیشیان هەڵوەستە دەکەن دەڵێن: نالێین دروستکراوە وە ناشڵێین دروستکراو نیە.

لەم بارەیەوە حافظ أصفهانی پرسیاری لە ئەبو عبداللە کوڕی مندە کرد ووتی: پرسیارکەرێك پرسیاری لێکردم لەبارەی ڕۆح کەوا خودای گەورە بالاّ و ڕاستێتی گیانلەبەر و لاشەکانیانی لێ پێك هێناوە. وە هەندێك لە قەومەکان باس لە ڕۆح دەکەن و دەڵێن کەوا ڕۆح دروستکراو نیە، هەندێکی دیکە تایبەتی دەکەن لەوەی ڕۆحە پیرۆزەکانن کەوا ئەو لە زاتی خودایە، ووتی: من ئاماژە بەوە دەکەم جیاوازی قسەو گوفتارەکان ئەوانەی پێشینەکانیان، دەبینم لەنێوانیاندا جیاوازی لە ووتەکانیاندا لە قورئان و فەرموودەدا، ووتەکانی سەحابە و شوێنکەوتووان و زانایان، پاش ئەمە باسی ڕووەکانی ڕۆح دەکەم لە قورئان و فەرموودەدا، وە هەڵەی قسەکەر کە بەبێ زانیاری لەبارەی ڕۆح وتوویەتی ڕوون دەکەمەوە، کەوا قسەکانیان هاوشێوەو ڕێکەوتی قسەی جەهمی و هاوەڵەکانیەتی: جا بۆیە دەڵێن: خۆشی و سەرکەوتن لەلای خواوەیە: کەوا خەڵکی جیاواز و ناکۆکن لەبارەی زانست و زانیاری ڕۆح وە شوێنەکەی لەناو دڵ و دەرووندایە.

هەندێکیان دەڵێن: ڕۆحەکان هەمووی دروستکراون، ئەمەش مەزهەبی ئەهلی جەماعەت و فەرموودەن، وە بیانوو دەهێننەوە بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: ((الأرواح جنود مجنّدة، فما تعارف منها أئتلف، وما تناكر منها أختلف)) [٢٧٦].

واتە: ((ڕۆحەکان وەکو سەرباز وان هەرکاتێك ڕۆحی ئیماندار گەیشتە یەك یەکتر دەگرن وە هەرکاتێك رقی لێ بوودوە لێ ی لادەدات)). وە سەربازی بە زۆر سەربازکراو شتێك نیە تەنها دروستکراوە.

---

(٢٧٦) مسلم: (٢٦٣٨).

هەندێکی دیکە دەڵێن: ڕۆحەکان لە ژێر فەرمانی خودان، خوای گەورە ڕاستیەکەی شاردۆتەوە و زانستەکەشی لەبارەی دروستکردنی، لەم بارەیەوەش بیانوو بەم فەرمودەی خوای گەورە دەهێننەوە:﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾(الإسراء: ٨٥)[٢٧٧].
واتە: ((بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (نازانم چیەو چۆنە)).

هەندێکی دیکە دەڵێن: ڕۆحەکان نوورێکە لە نوورەکانی خوای گەورە و ژیانێکە لە ژیانی ئەوە، و بیانوو دەهێننەوە بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (د.خ): ((إن اللهّ خلق خلقه في ظلمة، وألقى عليهم من نورة)) [٢٧٨]، واتە: ((خوای گەورە بوونەوەرەکانی لە تاریکایی دروست کردووە، وە دای پێیان بە نووری خۆی)).

پاشان باسی جیاوازی دەکات لەبارەی ڕۆحەکان ئایا دەمرێت یاخود نا؟ ئایا لەبەرزەخدا لەگەڵ جەستەکانیان ئازار دەدرێت و لەکاتی جێگیری و وەستانیدا لە دوای مردن؟ ئایا ئەو دڵ و دەروونە یاخود شتێکی دیکەیە؟

محمد کوری نصر المروزی لە کتێبەکەیدا دەڵێت: پۆلێك لە زندیقەکان[٢٧٩] وە پۆلێك لە ڕافزەکان لەبارەی ڕۆحی ئادەم لێکدانەوە دەکەن هەروەك دیانەکان لەبارەی ڕۆحی عیسا لێکدانەوەیان کردووە، وە قەومێکی دیکە لێکدانەوەیان نەکرد لەوەی کەوا ڕۆح لەزاتی خودا جیا بۆتەوە، جا بۆ ئیمانداردەوە گۆڕاوە، چونکە عیسی لەلای دیانەکان ڕۆحێکە لە خواوەیە بۆ مەریەم گۆڕاوە لەلای ئەواتن ڕۆح دروستکراو نیە.

پۆلێك لە زندیقەکان و پۆلێك لە ڕافزەکان دەڵێن: کەوا ڕۆحی ئادەم وەك ئەو وایە و دروستکراو نیە، وە فەرموودەی خوای گەورەیان ڕاڤە کردووە: ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ

---

([٢٧٧]) سەیری: تەفسیر قرطبي: ١٠/ ٣٢٤ بکە.

([٢٧٨]) مسند أحمد: ٢/ ١٧٦، وە مجمع الزوائد: ٧/ ١٩٣.

([٢٧٩]) زندیق: ئەوەیە باوەڕی بە بەردەوامی جیهان هەیە لەڕێگا و مەزهەبی زەردەشتیەکان.

مِن رُّوحِي﴾ (الحجر: ٢٩)، واتە (لەو ڕۆحە تایبەتیەی کە من (بەدیهێنەری ئـەوم)، پێمبەخشی))، وە فـەرمودەی خـوای گـەورە: ﴿ثُـمَّ سَـوَّاهُ وَنَفَـخَ فِيـهِ مِـن رُّوحِـهِ﴾ (السجدة: ٩)، واتە: ((پاشان ئادەمیزادی بە ڕێـك و پێكـی ڕیکخـست، لـە ڕۆح و گیانێك کە خۆی خاوەنیە فووی پێداکرد)) جا وتیان کەوا ڕۆحی ئـادەم دروسـتکراو نیە هەروەك ئەوەی تەفسیری کردووە دەڵێت: کە نوورێك لە خواوە بێت دروسـتکراو نیە. ووتیان: پاشان لەدوای ئادەم بووە وەسیەتی دوای خۆی، پاشان ئەو لە هـەموو پێغەمبەرێك و سەرپەرشتیارێکەوە گۆڕا تـا گەیـشتە علـی پاشـان بـۆ حەسـەن و حوسێن، پاشان لە هەر سەرپەرشتیارێك و پێشەوایەك تێیدا ئیمامەکە فێـر بکـات پێش هەموو شتێك وە پێویست ناکات لەکەس فێر بێت.

جیاوازی و ناکۆکی لەنێوان موسڵمانان نیە کە ڕۆحەکان لە ئادەم و نـەوەکانی و عیسا و ئەوانەی لە هەر نەوەیەکی ئـادەمن هـەمووی دروسـتکراوە بـۆ خـودای گەورە کەوا دروستی کردووە و دایمەزرانـدووەو پێکـی هێنـاوەو دایهێنـاوە، پاشـان زیـادەی کـردووە، بـۆ خـودی خـۆی هـەروەك هـەموو گیانلەبـەرێکی بـۆ خـۆی زیادەکردووە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِـي السَّمَاوَاتِ وَمَـا فِـي الأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ﴾ (الجاثيـة: ١٣)، واتە: ((هەرچی لە ئاسمانەکان زەویدا هەیە بـۆ ئەوەی رام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێنـاوە، هەموویـشی تێکـڕا بەخششن لەلایەن ئەو زاتەوە)).

شێخی ئیـسلام ئیبن تیمیە دەڵێت: ڕۆحی ئادەمیەکان دروسـتکراوە داهێنـراوە بە یەکدەنگی و ڕێککەوتنی پێشینەی ئوممـەت و پێـشەواکانی وە هـەموو ئـەهلی سوننە، وە یەکدەنگی زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی ڕۆح دروستکراوە جگە لەیـەکێك لە پێشەواکانی موسڵمانان نەبێت وەك محمد کوڕی نصر المروزی پێشەوای بەناوبانگ کەوا ئەو خەڵکی سەردەمی خۆی فێرکرد بە یەکدەنگی و جیاوازی، هـەروەها ئـەبو محمد کوڕی قتیبە لە ((کتاب اللفظ)) دەڵێت: کاتێـك قـسە دەکـات لـەبارەی ڕۆح

دەڵێت: ڕۆحە پاکەکان، ووتی: خەڵکی یەکدەنگن لەسەر ئەوەی خوای گەورە دروستکەری ڕۆحە.

ئەبو ئیسحاق بن شاقلا لە وەڵامدانەوەی لەبارەی ئەو مەسەلەیەدا ووتی: لەبارەی ڕۆح پرسیار کرا ئایا ڕۆح دروستکراوە یاخود دروستکراو نیە؟ ووتی: ئەوە گومانی تێدانیە ئەوەی بۆ ڕاستی سەرکەوێت کەوا ڕۆح لە شتە دروستکراوەکانە. لەو مەسەلەیەدا کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان و گەورەکان قسەیان تێدا کردووە و وەڵامی ئەو کەسانەیان داوەتەوە لەسەر ئەوەی کە پێداگیری دەکات لەوەی ڕۆح دروستکراو نیە. وە پاشان جەهمی بانگەوازی فەرمانێك دەکات جا دەڵێت: من ئایەتێکم لە کتێبی خوا کە (قورئانە) دۆزیووەتەوە کەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان دروستکراوە، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ (النساء: ١٧١)، واتە: (بەڕاستی مەسیح، عیسای کوڕی مەریەم جگە لەوەی فرستادەی خوایە (شتێکی تر نەبووە)، لەدایك بوونەکەی بە فەرمانی خوا بووە کە لە مەریەمدا (بەرجەستەبووە)، عیسا ڕۆح و گیانێکی (تایبەتە) لەلایەن خواوە بەخشراوە)). عیساش مەخلوقە، پێمان ووت: خودای گەورە فەهم و تێگەیشتنی قورئانی لێ قەدەغە کردووی، کەوا عیسا ووشە و ئاخافتنی بەسەر دا تێدەپەڕێت، چونکە ئێمە ناومان لێی ناوە لەدایك بوو وە منداڵ و گەنج و هەرزەکار، دەخوات و دەخواتەوە و ئەو فەرمانی پێکراوە بە فەرمان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە. پاشان ئەو لە نەوەی نوح و لە نەوەی ئیبراهیمە. جا حەلال نیە بۆ ئێمە ئەوەی لە قورئاندا دەیڵێین وە لە بارەی عیساشەوە نەیڵێین، ئایا گوێتان لە فەرموودەکانی خوایە دەفەرمووێت: کە لە قورئاندا چی لەبارەی عیسا ﷺ ووتراوە؟ بەڵام ماناکە لە فەرموودەی خودای گەورە: ﴿إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ (النساء: ١٧١)، جا لەدایك بوونەکەی بە فەرمانی خوا بووە کە لە

مەریەمدا (بەرجەستە بووە) پێی فـەرموو: ببـە، جـا عیـسا ﷺ بـوو، وە دیـان وجەهمیەکان درۆیان بەسەر خوادا کردووە لەبارەی عیسادا، وە ئەمەش جەهمیەکان ووتیان:

ڕۆحی خوا وە لەدایك بوونەکەی عیسا ﷺ ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت کـە لەدایك بوونەکەی دروستکراوە، وە دیانـەکان دەڵـێن: عیـسا ڕۆحـی خوایـە و لـە ڕۆحەکەشی لە خودی خۆیەتی، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الآرْضِ جَمِيعًـا مِّنْـهُ﴾ (الجاثيـة: ١٣)، واتـە: ((هەرچـی لـە ئاسمانەکان و زەویداهەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێـوە فەراهـەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخشش لەلایەن ئەو زاتەوە))، دەڵێـت: لـە فـەرمانی ئەو دایە، تەفسیری ڕۆحی خوا لە ڕاستیدا ماناکەی: بـە بەخـششی خـوا دروسـتی کردووە هەروەك دەڵێـت: بەنـدەی خـوا و ئاسمـانی خـوا وە زەوی خـوا، بێگومـان ئاشکرای کردووە بەوەی کەوا ڕۆحی مەسیح دروستکراوە، وەك هـەموو ڕۆحـەکان، وە خوای گەورە ئەو ڕۆحەی زیادەکردووەو خستوویەتیە سەری کـەوا بـۆ مەریـەمی ناردووە، وە ئەمەش بەندەو پێغەمبەرەکەیەتی، بەڵگەش نیە لەسـەر ئـەوەی کـەوا کۆنە و دروستکراو نیە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَـا فَتَمَثَّـلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا * قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا * قَالَ إِنَّمَا أَنَـا رَسُـولُ رَبِّـكِ لأَهَـبَ لَـكِ غُلَامًـا زَكِيًّـا﴾ (مـريم: ١٧- ١٩)، واتـە: ((ئێمـەش جـوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای وەکو بەشەرێکی تەواو (خۆی خستە بەر چاوی)* مەریـەم ووتی: بەڕاستی من پەنا دەگرم بە خوای میهرەبان لەتۆ ئەگەر کەسـێکی بەتـەقواو لـەخواترس بیـت* جوبرەئیـل ووتـی: (مەترسـە) دڵنیابـە مـن تـەنها نێـردراوی پەروەردگاری تۆم، تا منداڵێکی خاوێنت پـێ ببەخـشم)). جـا ئـەو ڕۆحـە ڕۆحـی خودایە، وە ئەویش بەندەو پێغەمبەرەکەیەتی.

***

## ( لەبارەی سەلماندنی دروستکردنی ڕۆح )

ئەوەی بەڵگە دەدات لەسەر دروستکردنی چەند ڕوویەکە:

**ڕووی یەکەم**: خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾(الرعد: ١٦)، واتە: ((خوا بەدیهێنەر و دروستکاری هەموو شتێکە))، جا ئەم ووشە و دەربڕینە گشتی یە تێیدا تایبەتمەند نەکراوە بەهیچ ڕوویەك، وە لەمەشدا سیفەتەکانی ناچێتە ناویەوە، لەبەر ئەوەی لەناوەڕۆك و مەبەستی دیار و ئاشکرایە بەناوی خۆیەتی، جا خوای پەروەردگار هەر خۆی خودایەکی وەسفکراوە بە هەموو سیفەتە تەواوەکان، جا زانست و توانا و ژیان و ویست وبیستن و بینینی وە هەرهەموو سیفەتەکانی لەناو ناوە جوان و پیرۆزەکانی دیار و ئاشکران، نەك لەناو شتە دروستکراوەکان، هەروەك زاتی خۆی نەچۆتە ناویەوە، جا هەر خۆی ستایشکراوە بەزاتی پیرۆزی سیفەتە دروستکارەکەی وە ئەوەی دیکە هەمووی دروستکراوە.

بەڵکو زانراویشە کەوا ڕۆح ئەو خودایەنیە وە سیفەتێکیش نیە لە سیفەتەکانی، و بەڵکو ڕۆح بریتی یە لە دروستکراوێك لە دروستکراوەکانی، جا ڕووداوی دروستکردنەکەشی هەروەك ڕووداوی دروستکردنی فریشتەکان و جنۆکە و ئادەمیزادە.

**ڕووی دووەم**: فەرموودەی خودای گەورەیە بۆ زەکەریا: ﴿وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا﴾ (مريم: ٩)، واتە: ((بەڕاستی پێش تریش تۆم دروست کردووە، وەنەبێت شتێك بوو بێت (نە ناوت هەبووە نە بوون)...)) ئەو لێدوانە بۆ ڕۆح و جەستەکەیەتی نەك تەنها بۆ جستەکەی، لەبەر ئەوەی جەستە بەتەنیا نەتێدەگات وە نە قسە دەکات و نە ئەقڵی بەشتێکدا دەشکێت، لەڕاستیدا ئەوەی کەوا تێدەگات و ئەقڵی دەبێت و قسە دەکات ڕۆحەکەیە.

**ڕووی سێیەم:** خوای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿وَاللَّـهُ خَلَقَكُـمْ وَمَـا تَعْمَلُـونَ﴾ (الصافات: ٩٦)، واتە: ((لەکاتێکدا خوا بەدیهێنەری ئێوەش و ئـەم بتانەشـە کـە دروستتان کردوون (نەشیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن!!) )).

**ڕووی چوارەم:** خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَـوَّرْنَاكُمْ ثُـمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ﴾ (الأعراف: ١١)، واتە: ((سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمـە (باوەگـەورەی) ئێوەمـان دروسـت کـردو نـەخش و نیگـاری ڕوالـەت و ڕوخـساری ئێوەمان کێشا، پاشان ووتمان بە فریشتەکان: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سـوژدەی ڕێز بە فەرمانی خـوا) )). هەواڵەکـەش لـە ڕاسـتیدا ڕۆحـەکانمان و جەسـتەکانمان وەریدەگرێت هەروەك گـەل و ڕای گـشتی وا دەڵێـت. وە لەوانەیـە و دەشـێت ئـەم ڕووداوانە لەسەر ڕۆحەکان بێت پێش دروستکردنی جەستەکان.

**ڕووی پێنجەم:** دەقەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی خودای پەروەردگار: خـودای ئێمـە و خـودای بـاب و بـاپیری یەکەمینمانـە وە خـودای هـەموو شـتێکە، ئـەو خوایەتیەش گـشتگیرو تـەواوە بـۆ ڕۆحـەکانمان، جـا ڕۆحـەکانیش پـەروەردەکراو و موڵکی ئەوە هەروەك جەسـتەکان وان، وە هـەر پـەروەردەکراوێکی خاوەنـدار ئـەوا دروستکراویشە.

**ڕووی شەشەم:** یەکەم سوورەت لە قورئان ((الفاتحه)) یە دەیسەلمێنێ کەوا ڕۆحەکان لە چەند ڕوویەکەوە دروستکراون:

یەکەم: خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ﴾ (الفاتحـه: ٢)، واتـە: ((سوپاس ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایـە، کـە خـاوەن و پـەروەردگاری هـەموو جیهانیـان و هـەموو بوونـەوەرە)). ڕۆحـەکان لـە کـۆی بوونـەوەر ئـەو خواوەندیەتی.

دووەم: خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحه: ٥)، واتـە: ((خوایە: تەنها هەر تـۆ دەپەرسـتین و هـەر لـەتۆش داوای یارمـەتی و پـشتیوانی

دەکەین (لەکاروباری دین و دونیاماندا، بەتایبەت لەو کاروبارانـەدا بـەتۆ نـەبێت، بەکەسـی تر لەبەندەکانت ناکرێـت) )). جـا ڕۆحـەکان بەنـدەن و هەوڵـەویش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکـات وە ئەگـەر دروسـتکراویش نـەبێت ئـەوا بەندایـەتی دەکردو داوای یارمەتی و پشتیوانیشی لێدەکرد.

سێیەم: بەڕاستی ڕۆح فەقیر و هەژارە بۆ ڕێنمویی بەدیهێنەرەکـەی داوای لێـدەکات کەوا ڕێنمویی بکات بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستەکەی کە ئیسلامە.

چوارەم: بەخشندەو بە نیعمەتە لەسەری و بەزەیی پێکراوە، وە هەندێ جـاریش بـە ڕق و کینەیە لەسەری و گومڕا و سەرگەردان دەبێت، ئەمـەش کاری پـەروەردەکراوو خاوەندارە، نەك کاروباری شتێکی کۆنی دروستنەکراو.

ڕووی حەوتەم: دەقەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کـە ئـادەمیزاد بـە کـۆی گشتی بەندەن، وە بەندایەتیەکەشـی تـەنها لەسـەر لاشـەکەی ڕووی نـەداوە بـەبێ ڕۆحەکـەی، بـەڵکو بەندایەتیەکـەی لـە بنـچینەدا ڕۆحەکەیـەتی و بەندایـەتی لاشەکەشی شوێنی ئەو کەوتووە هـەروەك لـە یاسـاکاندا شـوێنی کـەوتووە. هـەر ڕۆحیشە لاشەکە دەجولێچنێ و بەکاری دەهێنێت، ئەویش شوێنی ڕۆح دەکەوێت لە بەندایەتی کردن.

ڕووی هەشتەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا﴾ (الإنسان: ١)، واتە: ((بەڕاسـتی ماوەیـەکی زۆر لە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هـات کـە شـتێکی وانـەبوو ناوبرێـت))، جـا ئەگـەر ڕۆحەکەی کۆنیش بێت ئەوا ئادەمیزاد هیچ شتێکی وا نـەبوو باسـی بکرێـت، جـا دەکرێت ئادەمیزاد بە ڕۆحەکەی بێت نەك تەنها بە لاشەکەی هەروەك دەڵێن:

یاخادم الجسم کم تشقی بخدمته ❊ فأنت بالروح لا بالجسم إنسان

ڕووی نۆیەم: دەقەکان بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی خـودای پـەروەردگار هـەر هەبووە، هیچ شتێکی دیکە بوونی نەبووە هەروەك لە سـەحیحی بوخاریـدا جـێگیر

كراوه له حەدیسێکی عمران کوڕی حصین کەوا ئەهلی یەمەن ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هاتووینە خزمەتت بۆئەوەی لە ئایین شارەزامان بکەیت و تێمانبگەیەنێت، لە یەکەم فەرماندا لەو بارەیەوە پرسیارت لێدەکەین. جا فەرمووی: ((كان الله ولم يكن شيء غيره، وكان عرضه على الماء، وكتب في الذكر كل شيء)) [٢٨٠]، واتە: ((خوای گەورە هەر بووە و هیچ شتێك جگە لەو بوونی نەبووە، عەرشەکەی لەسەر ئاو بووە، وە لە قورئانی پیرۆزدا هەموو شتێکی نووسیوە))، جا لەگەڵ خودا هیچ ڕۆح و دڵ و دەروونێکی کۆن یەکسانی بوونی و لێهاتوویی ئەو نیە، خودای مەزن و دلۆڤان لەسەر ئەمەدا بەرز و گەورەیە، بەڵکو ئەو یەکەمە و تەنهایە کەس بەشداری لە یەکەمینی ناکات جگە لە زاتی خۆی نەبێت.

**ڕووی دەیەم:** دەقەکان بەڵگەن لەسەر دروستکردنی فریشتەکان ئەوانە ڕۆحێکن پێویستیان بە لاشەکان نیە ڕێکی بخەن و کارەکانی پێ ئەنجام بدەن، ئەوانە پێش دروستکردنی ئادەمیزاد و ڕۆحەکەی دروستکراون، ئەگەر ئەوەی کەوا ڕۆح بە قسە دێنێت لە جەستەی ئادەم بە نەفخەکەی دروستکراوە، جا چۆن دەبێت ڕۆحی نوێ بە نەفخەیەکی کۆن ببێت؟ جا فووەکە هۆکاری بەدەستهێنانی ڕۆحەکەیە و بۆی ڕوودەدات، هەروەك جووتبوون و پەڕین هۆکاری پێکهێنانی لاشەکەیەتی، وە خۆراکیش هۆکاری گەشە سەندنەکەیەتی، جا تۆخمی ڕۆح لە فووی خاوەنەکەیە، وە تۆخمی لاشەکەش لە تێکردنی ئاوە لە زێ (ڕەحم) دا، جا ئەو تۆخمە ئاسمانیە، ئەو تۆخمەش خاکیە وە لە خەڵکیەوەیە هەرکەسێك تۆخمی ئاسمانی بەسەریدا سەرکەوت ئەوا ڕۆحەکەی بەرز و پیرۆز دەبێت هاوشانی فریشتەکان دەبێت، لەوانەش هەرکەسێك تۆخمی زەوی بەسەریدا سەرکەوت ئەوا ڕۆحەکەی نزم و خاکیە و

(٢٨٠) فتح الباري: ٦/ ٢٨٦.

ڕیسوایە و دەبێتە هاوشانی ڕۆحە نزمەکان. جا خاوەن دەسەڵات باوکە بۆ ڕۆحەکەی وە خۆڵیش باوکە بۆ لاشە و جەستەکەی.

**ڕووی یازدەهەم:** حەدیسێکی ئەبی هوریرە کەوا لە سەحیحی بوخاری دا هاتووە و لە پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە دەفەرموویێت: ((الأرواح جنود مجنّدة فما تعارف منها أتلف وماتناكر منها اختلف)) [٢٨١]، سەربازی دەستبەسەر و زۆرە ملێش شتێك نیە تەنها دروستكراو نەبێت، ئەو حەدیسە ئەبو هوریرە و عائیشەی دایكی ئیمانداران و سەلمانی فارسی و عبدالله ی كوڕی عەباس و عبدالله ی كوڕی مسعود، وعبدالله ی كوڕی عەمرو علی كوڕی ئەبی تالیب و عەمرو كوڕی عەبسە- ڕەزای خوا لە هەموویان بێت- لە پێغەمبەرﷺ ڕیوایەتیان كردووە.

**ڕووی دوازدەهەم:** ڕۆح وەسف دەكرێت بە مردن و دەستبەسەر داگرتن و بەند كردن و ڕەوانە كردن، وە ئەمەش كرداری دروستكراوێكی تازەی پەروەردەكراوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الزمر: ٤٢)، واتە: ((هەر خوا كە گیانەكان دەكێشێت لەكاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانەش كە نەمرد لە خەوەكەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە، جا ئەو كەسەی كە خوا بڕیاری مردنی دابێت ڕۆحەكەی دەگرێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئەوكەسەش كە ڕۆژی تەواو نەبووبێت دەینێرێتەوە بۆی تا كاتێكی دیاریكراو بەڕاستی ئالەو دیاردانەدا چەندەها بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ كەسانێك كە تێفكرن و بیربكەنەوە)). نەفسیش ئالێرەدا بە تەواوی ڕۆحەكانن.

لەهەردوو سەحیحەكەدا لە حەدیسێكی عبدالله ی كوڕی قەتادەی ئەنساری هاتووە، ئەویش لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە، ووتی: لەسەفەردا شەوێك لەگەڵ

[٢٨١] مسلم: (٢٦٣٨)، پێشتر ئەو حەدیسە باسكراوە.

پێغەمبەرﷺ هات و چۆمان دەکرد، ووتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر لەگەڵماندا کەیف و خۆشی بکەیت، فەرمووی: ((إني أخاف أن تناموا فمن يوقظ للصلاة))، واتە: ((من لەوە دەترسم ئەگەر نووستن کێ بۆ نوێژ هەڵتاندەستێنێتەوە؟)) بیلال ووتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا لەلای قەومەکەی دانیشت، پاڵیان دایەوە، و بیلالیش پشتی دا بە ووشترەکەیدا و چاوەکانی خەو بەسەریدا زاڵبوو، جا کاتێك پێغەمبەرﷺ لە خەو هەڵسا بینی رۆژ دەرکەوتووە، جا فەرمووی: ئەی بیلال، کوا ئەوەی بە ئێمەت ووت؟ بیلال ووتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردووە هیچ کاتێك بەم جۆرە خەو بەسەرمدا زاڵ نەبووە، ئینجا پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: ((إن الله قبض أرواحكم حين شاء، وردها حين شاء)) [٢٨٢]، واتە: ((بەڕاستی خوای گەورە هەرکاتێك بیەوێت ڕۆحەکانتان دەکێشێت، وە دەینێرێتەوە هەر کاتێك بیەوێت)).

جا ئەو ڕۆحەی دەستی بەسەر داگیراوە ئەو دەروونەیە کەوا خوای گەورە دەیمرێنێت لەکاتی مردنیدا وە لەکاتی خەوتنیدا کەوا فریشتەی گیانکێشان دەیمرێنێت، هەر ئەویشە کەوا پێغەمبەرەکانی خودای میهرەبان دەمرێنێت وە هەر ئەویشە لەلای خاوەنەکەی دادەنیشێت و ڕۆحەکەی بەبێ ویستی خاوەنەکەی لەلاشەکەی دەهێنێتە دەرەوە، وبە کفنێك لە بەهەشت یاخود لە دۆزەخ کفتی دەکات و بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاسمان، جا فریشتەکان سەلاواتی لەسەر لێ دەدەن یاخود نەفرینی دەکەن، لەنێوان زاتی پیرۆزی دەستەکانی خوا ڕادەوەستێ و فەرمانی بەسەر دا دەدات، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ زەوی دەچێتەوە ناو گۆڕ ئینجا پرسیاری لێدەکرێت و تاقیدەکرێتەوە جا سزا دەدرێت و یاخود نیعمەت و خۆشی بۆ دێت، وە هەر ئەویشە دەچێتە ناو سکی باڵندە سەوزەکان لە بەهەشتدا دەخواتەوە، و هەر ئەویشە بە بەیانیان و ئێواران ئاگری پێ نیشاندەدرێت، هەر ڕۆحیشە

---

(٢٨٢) فتح الباري: ٢/ ٦٦.

ئیماندار دەبێت و کافریش دەبێت و گوێڕایەڵ و ملکەچ دەبێت وە یاخی و گومڕاش دەبێت، و هەر ئەویشە نیشانەی خراپەکاریە، لۆمە و سەرزەنشکارە، هەر ئەویشە ژیر و ئارامە بۆ خودای خۆی لە ژێر فەرمان و یادکردنەوەیدا، هەر ئەویشە سزا دەدرێت و خۆشی دەبینێت و شاد و دڵخۆش دەبێت و ماندوو و دڵتەنگ دەبێت و بەند دەکرێت و ڕەوانەش دەکرێتەوە. هەر ئەویشە ساغ و نەخۆش و لەزەت دەبینێت و ئازار دەکێشێت و دەترسێت و خەمبار دەبێت، هیچ شتێکی وانیە تەنها دروستکراوێکی داهێنەرە، وە سیفەتی دامەزراوەیەکی بەدیهێنەرە و لەژێر فەرمانی دروستکارو بەدیهێنەرەکەی کەوا زاتی پاکی خودای گەورەیە کارەکان ڕادەپەڕێنێت.

لەکاتی خەوتندا پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: ((اللهم أنت خلقت نفسي وأنت توفاها، لك مماتها ومحياها، فإن أمسكتها فارحمها، وإن أرسلتها فاحفظها بما تحفظ عبادك الصالحين)) [٢٨٣]، واتە: ((پەروەردگارا دڵ و دەروونی منت دروستکردووە و هەر تۆش دەیمرێنێت، مردن و ژیانی بۆ تۆیە، جا ئەگەر گرتت و دەستبەسەرت کرد ئەوا ڕەحمی پێبکە، وە ئەگەر ناردتەوە ئەوا بیپارێزە بەوەی بەندە چاکەکانت پێ دەپارێزیت)). هەر خودای گەورەیە دروستکاری ڕۆح و دەروونەکانە هەروەك دروستکاری لاشەکانە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَا إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ (الحديد: ٢٢)، واتە: ((هیچ بەڵاو ڕووداوێك لە زەویدا، بۆتان پێش نەهاتووە کە لە- لوح المحفوظ- دا تۆمارمان نەکردبێت پێش ئەوەی ڕووداوەکە پێش بێت، ئەو کارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە)).

زانراویشە ڕۆح ئەگەر کۆن و دروستکراو نەبووایە ئەوا بەخۆی دەوڵەمەند دەبوو بە بوونی و سیفەتەکان و تەواویەکانی، وە ئەمەش نارەواترین ناڕەوایە،

---

[٢٨٣] مسلم: (٢٧١٢).

چونكه هەژاری بۆ خوای گەورەو پەروەردگاری لە بوونی وە تەواوی و چاكیەتی ئەوا لە پێداویستیەكانی خودی خۆیەتی وە پاكانە بۆ كراویش نیـە بـە كـەم و كـورِی و ناتەواوی، جا خودای گەورە دەوڵەمەندە بە خودی خۆی، وە ئەویش فەقیر و هەژارە پێویستی پێیەتی، خوای گەورەش بەشداری پێناكات و پێویستیـشی بـە بەشـداری ئەو نیە، هەروەك بەشداری پێنەكردووە لە خوایەتی و دەسەڵاتی تەواو و پیرۆزیـدا، جـا شـایەدی دروسـتكردن و ڕوودان لەسـەر ڕۆحـەكان وەك شـایەدی یـە لەسـەر لاشەكان.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاء إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ (فـاطر: ١٥)، واتـە: ((ئـەی خەڵكینـە ئێـوە هـەژارو نـەدارن و هەمیشە موحتاجی خوان، (لە هەموو كات و شوێنێكدا و بۆ هەموو شتێك) هـەر تەنها خوایە كە بێ نیازە و شایانی سوپاسە))، هەروەها دەفـەرموویێت: ﴿فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ* وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ* وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَّا تُبْصِرُونَ﴾ (الواقعـة: ٨٣- ٨٥)، واتە: ((باشە" ئێوە بۆچی بیر ناكەنـەوە، ڕۆژێـك دێـت كـە: ڕۆحتـان دەكاتـە گـەرووتان* ئێـوەش بـەدەوری ئـەو كەسـەدا بـێ دەسـەڵاتانە تەماشادەكەن و سەرنج دەدەن* لەكاتێكدا كە ئێمە لە ئێوە نزیكترین لێـی، بـەڵام ئێوە نامانبینن)). ئەم قسەكردن و ووتارە فەقیری و هەژاری ڕۆح و لاشەكان پیشان دەدات و ئەمەش تەنها بۆ لاشەكان نیە، وە ئەم دەوڵەمەندی و دەسەڵاتە تـەواوەش تەنها بۆ خودایە جگە لەو كەس بەشداری تێدا ناكات.

هـەموو ئەوانـەی باسـكران لـەو وەڵامدانەوەیـە لـە حوكمـەكانی ڕۆح و كاروبارەكانی و جێگیربوونی لە دوای مردن، جا ئەوە بەڵگە لەسەر ئەوەی كەوا ڕۆح دروستكراوە پەروەردەكراوە ئامادەكراوە كەوا كۆن نیە.

**( لەبارەی ماناو مەبەستەکانی ڕۆح لە قورئاندا )**

بەڵام ئەو کۆمەڵەیەی کەوا بیانوو دەهێنێتەوە، یاخود ئەوانە دەهێننەوە کە پەیڕەو و هاوشێوەی قورئانە، و وازهێنان لە قایی و پتەویەکەی، ئەمەش کرداری هەموو گومرایی و بیدعەکارانە.

پتەوی قورئان لە یەکەمینی تا کۆتاییەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا خودای مەزن و دلۆڤان دروستکاری ڕۆحەکانە و بەدیهێنەریشیانە.

هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾(الإسراء: ٨٥)، واتە: ((بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چیە و چۆنە) )). ئەوەی دیار و ئاشکرایە ئالێرەدا هەرگیز مەبەستی بە فەرمانی داخوازی نیە کەوا ئەو یەکێکە لە جۆرەکانی قسەکردن، بەڵکو مەبەستەکە: کەوا ڕۆح قسە و گوفتارەکەیەتی کەوا فەرمانی پێدەکات، و لەڕاستیدا مەبەست بە فەرمانی کردەن لێرەدا: نوێنەر یاخود پێسپێردراوە و ئەوەش عورف و نەریتێکە بەکارهاتووە لە زمانی عەرەبیدا، وە لە قورئانیشدا لەو بابەتەدا زۆر هەیە، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَتَى أَمْرُ اللّهِ﴾ (النحل: ١)، واتە: ((فەرمانی خوا بەڕێوەیە و وا گەیشت)) واتە: نوێنەرەکەی کەوا قەزا و قەدەرەکەیەتی، وپێی دەفەرمووێت: ببە، هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ مِن شَيْءٍ لِّمَّا جَاء أَمْرُ رَبِّكَ﴾(هود: ١٠١)، واتە: ((ئەوسا ئەو پەرستراوانەیان کە لەجیاتی خوا هاواریان لێ دەکرد، فریای هیچ شتێکیان نەکەوتن کاتێك فەرمانی پەروەردگاری تۆ هات))، بەمانای: نوێنەرەکەی کەوا فەرمانی بە لەناوچوونیان، و هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلاَّ كَلَمْحِ الْبَصَرِ﴾(النحل: ٧٧)، واتە: ((بەرپابوونی قیامەت پێش نایەت وەك چاوتروکاندنێك یان کەمتر لەوەش)).

هەروەها دروستبوونیش بەکاردێت بـە مانـای: دروسـتکراو، هـەروەك خـوای گەورە بۆ بەهەشت بەکاری دەهێنێت: تۆ رەحمەت و بەزەیی منیت[٢٨٤] وە ئەمـەش بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کۆنە و دروستکراو نیە، بەهەر رووەکەوە، و هەنـدێك لـە پێشینەکان لـە تەفـسیر و لێکدانەوەکەیـدا دەڵێـت: بـە فـەرمانی خـوا لـە لاشـە دروستکراوەکان روویداوەو تێپەڕیوە و بەتوانای خوای گەورەش جێگیر بووە.

ئەمەش دەوەستێتە سەر ئەوەی کەوا لەئایەتەکەدا مەبەسـت لـە رۆح: رۆحـی ئادەمیزادە، لەوەشدا جیاوازی و ناکۆکی لەنێوان پێشینەو پاشینە (السلف والخلف) هەیە، وە زۆربەی پێشینە" بەڵکو هەموویان لەسەر ئەوەن کەوا رۆحە بەرپرسیارەکە لێی کە لە داهاتووە ئەوا رۆحەکانی ئادەمیزادنین بەڵکو ئـەو رۆحەیـە کـەوا خـوای گەورە لە کتێبەکەیـدا لـەبارەی ئـەودا هـەواڵی داوە، لـە رۆژی قیامەتـدا لەگـەڵ فریشتەکان هەڵدەستیتەوە ئەمەش خوای گەورە و بە دەسەڵاتە[٢٨٥].

لە سەحیحەکەدا لە حەدیسێکی الأعمش دا سەلمێنراوە، ئەویش لە ئیبراهیم، ئەویش لە علقمە، ئەویش لە عبدالله ووتی: لەو کاتەی من لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) لە گەرمای مەدینـەدا دەرۆیـشتم بـەلای کەسـێکی جوولەکـەدا تێپـەڕبووین، جـا هەندێك بە هەندێکیان دەووت: دەربارەی رۆح پرسیاری لێبکـەن، هەنـدێکی دیکـە دەیانووت: پرسیاری لێ مەکەن لەوانە بە شتێك زانیاری دەربارەی هەبێت و رقتـان لێی بێتەوەو پێتان ناخۆش بێت، وە هەندێکی دیکە ووتیان: پرسیاری لێدەکەین جا پیاوێك هەڵسا و ووتی: ئەی باوکی قاسم، رۆح چیە؟ جا پێغەمبـەرﷺ بێـدەنگ بوو، ئینجا زانی کەوا ئەو وەحی بۆ دێت، لە کاتێکدا بۆ ئاشـکرا بـوو فـەرمووی: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾

---

([٢٨٤]) مسلم: (٢٨٤٦) وە فتح الباری: ٨/ ٥٩٤.

([٢٨٥]) سەیری: ئایەتی (٣٨) لە سورەتی (النبأ) بکە، وە تفسیر القرطبي: ١٩/ ١٨٦)

(الإسراء: ٨٥) [٢٨٦]، واته: ((پرسیارت لیٚ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چیە و چۆنە) بلیٚ: ڕۆح بەشیٚکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چیە و چۆنە) و هیچتان پیٚنەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها شتیٚکی کەم نەبیٚت)).

ئاشکرایە ئەوان کاتیٚك پرسیاریان لیٚکرد لەبارەی فەرمانیٚك نازانریٚت تەنها بە وەحی نەبیٚت، وە ئەویش ڕۆحە کەوا لەلایەن خواوەیە کەس لیٚی نازانیٚت.

بەلاّم ڕۆحەکانی نەوەی ئادەم لە غەیب و پەنهانیدا نیە، لەڕاستیدا بەشیٚکی زۆر لە خەلکی لە بیٚزار و وەڕس بووەکان قسەی تیٚدا دەکات، کەوا لەزانیاریەکانی پیٚغەمبەراندا هیچ وەلاّمیٚکی لەبارەیەوە نیە.

جا ووتراوە: لەڕاستیدا أبو الشيخ ووتی: حسین کوڕی محمد کوڕی إبراهیم بۆمانی گیٚڕایەوە، إبراهیم کوڕی حکم پیٚمانی ڕاگەیاند، لە باوکیەوە، ئەویش لە السدی، ئەویش لە ئەبی مالیك، ئەویش لە ئیبنو عەباس ووتی: قورەیش عەقەبەی کوڕی ئەبی موعیط و عبدالله ی کوڕی ئەبی ئومەییە کوڕی موغیرەیان بۆلای جولەکەی مەدینە نارد پرسیاریان لەبارەی پیٚغەمبەرەوە کرد ﷺ، جا پیٚیان ووتن: ئەو دەرچووە کەوا پیاویٚك بانگەوازی ئەوە دەکات کە پیٚغەمبەرە، ئەو نە لەسەر ئایینی ئیٚمە و نە لەسەر ئایینی ئیٚوەیە، ووتیان: جا کیٚ بەدوای کەوتووە؟ ووتیان: پیٚشینانی ئیٚمە و لاوازەکان و کۆیلەکان و ئەوانەی خیٚریان پیٚوە نیە، بەلاّم گەورە پیاوان و ماقولاّنی قەومەکەی بەدوایان نەکەوتوون، جا ووتیان: بیهیٚنن پرسیاری لەبارەی سیٚ خەسلەتی لیٚ بکەن کەوا پیٚتان دەلیٚت، جا ئەگەر وەلاّمی دانەوە ئەوا پیٚغەمبەریٚکی ڕاستگۆیە، وە ئەگەر زانیاریشی لەبارەیەوە نەبوو ئەوا درۆزنە، پرسیاری لیٚبکەن دەربارەی ڕۆح کەوا خوای گەورە لە ئادەمدا فووی پیا کردووە، ئەگەر پیٚتانی ووت: ئەو لە خواوەیە، پیٚی بلیٚن: چۆن خوای گەورە شتیٚك سزا دەدات کە ئەویش لە خۆیەتی جا لەو بارەیەوە پرسیاری لە جوبرەئیل کرد، ئینجا

---

(٢٨٦) مسلم: (٢٧٩٤).

خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ (الإسراء: ٨٥)، ئەو دروستكراوەو لە دروستكراوی خودایە، نەك ئەو لە خوداوەیە.

دەڵێن: وەك ئەو ئیسنادە بیانووی پێناگیرێت، لەبەر ئەوەی كە تەفسیرو لێكدانەوەی السدی یە، ئەویش ئەبی مالیك ڕیوایەتی كردووە، وە شتی نادیار و نا پەسندی تێدایە، كارنامەی ئەو چیرۆكەش لە پرسیار كردن لە سەحیح و مەسنەدەكاندا هەموو پێچەوانەیە لەگەڵ كارنامەی السدی، و أعمش و مغیرەی كوڕی مقسم لە إبراهیم ڕیوایەتیانكردووە، ئەویش لە علقمە، ئەویش لە عبداللە ووتی: پێغەمبەرﷺ، بەلای كۆمەڵێك لە جوولەكە تێنەپەڕی و منیش لەگەڵیدا دەڕۆیشتم جا پرسیاریان لێكرد لەبارەی ڕۆح، ووتی: جا پێغەمبەرﷺ، بێدەنگ بوو وا گومانم برد كەوا ئەو وەحی بۆ دێت، جا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ﴾ (الإسراء: ٨٥) بە مانای: ئەی جوولەكە ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُتوا مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ [٢٨٧]،هەروەها ئەو لە خوێندنەوەی عبداللە بوو جا جوولەكەكان ووتیان: هەروەها وەك ئەمەش لە تەورات دا هەیە كەوا ڕۆح بەشێكە لە فەرمانی پەروەردگارﷻ.

جریر كوڕی عبدالحمید و كەسانی دیكە لە موغیرە ڕیوایەتیان كردووە.

یحیی كوڕی زەكەریا كوڕی ئەبی زائدە ڕیوایەتی كردووە: لە داود كوڕی ئەبی هیند، ئەویش لە عەكرەمە، ئەویش لە ئیبنو عەباس ووتی: جوولەكەكان هاتن بۆ لای پێغەمبەرﷺ پرسیاریان لێكرد دەربارەی ڕۆح جا پێغەمبەرﷺ بە شتێك وەلامە نەدانەوە، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾(الإسراء: ٨٥) [٢٨٨].

---

([٢٨٧]) عبداللە ئاوای خوێندەوە، وە لەبنەڕەتدا: ((وما أوتیتم)).

([٢٨٨]) مسند أحمد:/١/٢٥٥، سەیری: تەفسیری ابن كثیر:(٣/٦٤) بكە.

جا ئەمەش لاوازی حەدیسی السدی پیشان دەدات، ئەو پرسیار لێکردنەش دەڵێت لە مەککە بوو، لەبەر ئەوەی ئەو حەدیسە و حەدیسی ئیبن مسعود ڕوون و ئاشکرایە کە پرسیار کردنەکە لە مەدینە بووە ڕاستەوخۆ لەلایەن جوولەکەکانەوە بووە.

ئەوانەی ئەو ئایەتەیان ڕیوایەت کردووە لە ئیبنو عەباس تووشی گەورەترین شپرزەیی و لێشێواوی بوون لە تەفسیر کردنەکەدا، یاخود دەبێت ئەمەیان لەلایەن ڕیوایەتەکانەوەیە، یاخود دەبێت ووتەکانیان شپرزەیی تێدابێت، ئێمەش باسی ئەوەمان کردووە و باسی ڕیوایەتی (السدی) یشمان کرد، کە لە ئەبی مالیك وەریگرتووە، وە ڕیوایەتی داود کوڕی ئەبی هیند، لە عەکرمە وەریگرتووە، ناکۆکی و پێچەوانەی تێدایە، لە ڕیوایەتی داود کوڕی ئەبی هیند ئەو شێواویە هەیە، جا مسروق کوڕی مرزبان و إبراهیم کوڕی ئەبی تالیب، ئەویش لە یحیی کوڕی زەکەریا، لە ئیبنو عەباس: کە جولەکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەرﷺ....... حەدیسەکە.

محمد کوڕی نصر المروزی دەڵێت: ئیسحاق بۆ ئێمەی گێڕایەوە، کەوا یحیی کوڕی زەکەریا بە ئێمەی ڕاگەیاندووە، ئەویش لە داود کوڕی ئەبی هیند، ئەویش لە عەکرمە، ئەویش لە ئیبنو عەباس ووتی: قورەیشییێك بە جوولەکەیەکی ووت: شتێکمان پێیدە تاوەکو پرسیاری دەربارەی لێبکەین لەو پیاوە، جا ووتیان: پرسیاری دەربارەی ڕۆحی لێبکەن، جا ئایەتەکە دابەزی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ﴾ (الإسراء: ٨٥).

ئەمەش پێچەوانەی ڕیوایەتەکانی دیکە و حەدیسی ئیبن مەسعودە.

ڕیوایەتی سێ یەم لە ئیبنو عەباس: هشیم دەڵێت: ئەبو بشر بۆمانی گێڕایەوە، لە موجاهد، ئەویش لە ئیبنو عەباس" بلێ ڕۆح فەرمانێکە لە فەرمانی خوای گەورە، و دروستکراوە هەروەك خوای گەورە شتەکانی تری دروستکردووە، وێنەو نیگاری کێشاوە وەك وێنە و نیگاری ئەوەی ئادەم، هیچ فریشتەیەك لە

ئاسماندا دانابەزێت تەنها دەبێت یەکێك لە ڕۆحەکانی لەگەڵدا بێت، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئەو ڕۆحە نیە کەوا لەنەوەی ئادەم دا هەیە.

ڕیوایەتی پێنجەم لەوی وەرگیراوە: ئیبن مندە دەڵێت: عبدالسلام کوڕی حرب ڕیوایەتی کردووە، لە خصیف، ئەویش لە موجاهد، ئەویش لە ئیبنو عەباس: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ (الإسراء: ٨٥)، لە ڕاستیدا لە قورئاندا دابەزیوە بە پلەو پایەی ببە، ئێمەش وا دەڵێین هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ (الإسراء: ٨٥) پاشان لە ڕێگای خصیف وەرگیراوە، ئەویش لە عەکرەمە، ئەویش لە ئیبنو عەباس ئەو کەوا چوار شتی تەفسیر نەکردووە: الرقیم والغیسلین والروح، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ﴾ (الجاثية:١٣) ، واتە: ((هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ڕام هێناوە، بۆ خزمەتگوزاری ئێوە فەراهەمی هێناوە، هەموویشی تێکڕا بەخشش لەلایەن ئەو زاتەوە)).

لە ڕیوایەتی پێنجەمدا جوبیر ڕیوایەتی کردووە، لە ضحاك، ئەویش لە ئیبنوعەباس، کەوا جولەکەکان پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد دەربارەی ڕۆح: جا فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾(الإسراء:٨٥) بەمانای: دروستکراوێکە لە دروستکراوی من: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ مانای: ئەگەر پرسیارتان لە دروستکردنی دڵ و دەروونی خۆتان وە لە بارەی چوونە ناوی خواردن و خواردنەوەو دەرچوونیشیان ئەوا هەقی سیفەتەکەی وەسفم بۆ کردوون.

دیسان لە ئیبنو عەباسدا لە ڕیوایەتی شەشەمدا هاتووە: عبدالغنی کوڕی سعید ڕیوایەتی کردووە، کەوا موسی کوڕی عبدالرحمن بۆمانی گێڕایەوە، لە ئیبن جریج، ئەویش لە عطاء، ئەویش لە ئیبنو عەباس، ئەویش لە مقاتل، ئەویش لە

ضحاك، ئەویش لە ئیبنو عەباس لەبارەی ئەو فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ﴾، کە قورەیشەکان کۆبوونەوە جا هەندێك بە هەندێکیانی ووت: سوێند بە خوا نابێت محمد درۆبکات، چونکە لەناو ئێمە دا بە ڕاستگۆیی و دەستپاکی دامەزراوەو گەورە بووە، بۆی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکەن، داوای سەرکەوتنی بۆ دەکەن، دڵنیان بەوەی کەوا بۆ ئەوان کۆچ دەکات، بۆ ئەو دەبن بە پاڵپشت جا پرسیاری لەبارەیەوە لێیان بکەن جا جوولەکەکان پێیان ووتن: پرسیاری سێ شتی لێ بکەن، پرسیاری لێبکەن لەبارەی ڕۆح، کەوا لە تەوراتدا چیرۆك و لێکدانەوەکەی تێدا نیە تەنها باسی ناوی ڕۆح نەبێت، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ (الإسراء: ٨٥).

***

## ڕۆحیش لە قورئاندا لەسەر ژمارەیەك ڕووداو هاتووە.

**یەکەم:** وەحی (سروش) وەك ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾ (الشورى: ٥٢)، واتە: ((ئەی محمدﷺ ئا بەو شێوەیەی کە ووتمان ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە کردیت لەلایەن خۆمانەوە (کە ژیانبەخشە بە ڕۆح و گیان و عەقڵ) ))، هەروەها ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾ (غافر: ١٥)، واتە: ((ئەو زاتە وەحی و نیگا بە فەرمانی خۆی دەنێرێت بۆ هەرکام لە بەندەکانی کە بیەوێت (قورئان ڕۆحە، چونکە ژیانبەخشە بە عەقڵ و دڵ و دەروون) ))، ناونراوە ڕۆح: ڕۆحێك کاتێك لە ژیاندا دڵ و ڕۆحەکان بەدەست دەکەوێت.

**دووەم:** هێز و کۆڵنەدان و سەرکەوتن کەوا پشتگیری ئەو کەسە دەکات کە دەیەوێت لە بەندە ئیمانداکانی هەروەك دەفەرمووێت: ﴿أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ

الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ﴾ (المجادلة: ٢٢)، واته: ((خوا ئیمان و باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووەو جێگیری کردووەو لە بەهرە و میهرەبانی تایبەتی خۆی، بەهێز و گیانێکی تایبەتی لەلایەن خۆیەوە (مەبەست قورئان و ئیمانە) پشتگیری کردوون و یارمەتی داون)).

**سێیەم:** جوبرەئیل، هەروەك ئەم فەرمودەیەی خوای گەورە: ﴿نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ۞ عَلَى قَلْبِكَ﴾ (الشعراء: ١٩٣- ١٩٤)، واتە: ((جوبرائیل ئەمین (فریشتەی وەحی) دایبەزاندووە ۞ بۆسەر دڵی تۆ ئەی محمدﷺ. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ (البقرة: ٩٧)، واتە: ((هەرکەسێك دوژمنی جوبرەئیلە، (بابزانێت) کە هەر ئەو جوبرەئیلە بە فەرمانی خوا دایبەزاندۆتە سەر دڵت))، کە ئەویش ((جوبرەئیل) گیانی پیرۆزە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ﴾ (النحل: ١٠٢)، واتە: ((ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: روح القدس (جوبرەئیل ئەم قورئانەی) لەلایەن پەروەردگارتەوە بە حەق و ڕاستی دابەزاندووە)).

**چوارەم:** ئەو ڕۆحەی کەوا جوولەکە پرسیاری لەبارەی کردووە، جا وەڵامیان داوەتەوە بەوەی کەوا لە فەرمانی خوایە، دەڵێت: ئەو ڕۆحەکە کە لە فەرمودەی خوای گەورە باس کراوە: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ﴾ (النبأ: ٣٨)، واتە: ((ڕۆژێك دێت جوبرەئیل و فریشتەکان بە ڕیز دەوەستن و ورتەیان لێ نایەت و هیچ قسە ناکەن))، وە ئەمەش ئەو ڕۆحەیە کە باسکراوە لە فەرمودەکەیدا: ﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم﴾ (القدر: ٤)، واتە: ((لەو شەوەدا فریشتەکان کە جوبرەئیلیشیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەسەر ڕوخسەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان، بە جۆرەها فەرمان و کار (بەتایبەت بۆ سەردانی خواپەرستان، بۆ سەردانی مزگەوتەکان، بۆ گوێگرتن لە قورئان و.. هتد))

**پێنجەم**: مەسیحی کوری مەریەم،خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾(النساء:١٧١)، واتە: ((بەراستی مەسح، عیسای کوری مەریەم جگە لەوەی کە فرستادەی خوایە(شتێکی تر نەبووە).لە دایك بوونەکەی بە فەرمانی خوابووە کە لە مەریەمدا(بەرجەستەبوو)، عیا رۆح و گیانێکی (تایبەتە) لەلایەن خواوە بەخشراوە)). بەڵام رۆحی نەوەی ئادەم ناوی لە قورئاندا نەکەوتووە تەنها بە دەروون نەبێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ﴾ (الفجر: ٢٧)، واتە: ((شایانی باسە بە ئیمانداری سەرفراز لەسەرە مەرگەیدا دەوترێت ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی)) . خوای گەورە دەفەرمووێت﴿وَلَا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾( القيامة: ٢)، واتە: ((سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو و نەفسی ڕەخنە لە خۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات)). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ (یوسف: ٥٣).واتە(بەڕاستی نەفس (ئەگەر بە نووری خواناسی ئاوەدان نەبێت) زۆر فەرماندەرە بە گوناه و هەڵە و تاوان ) . خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَخْرِجُواْ أَنفُسَكُمُ﴾ (لأنعام: ٩٣)، واتە ((دەی ڕۆحتان دەرکەن)) هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا * فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ (الشمس: ٧،٨)، واتە: (( سوێند بە دەروون و ئەو زاتەی کە بەرێك و پێکی بەدیهێناوە* جا توانای خراپە و چاکەو خوانە ناسی و خواناسی تێدا دابین کردووە))، وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ الْمَوْتِ﴾ (آل عمران: ١٨٥)، واتە: ((هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت)). بەڵام لە سوننەدا بە ووشەی دەروون و ڕۆح هاتووە.

مەبەستیش: کەوا بوونەکەی لە فەرمانی خوادایە بەڵگە نیە لەسەر هاتنی کەوا دروستکراو نیە.

***

## (له بارەی ساخبوونەوە و دەرکەوتن لەسەر زیادکردن
## (خستنە سەر)ی ڕۆح بۆ خودای گەورە)

بەڵام بۆ دەرکەوتن و ئاشکرابوونیان بە خستنە ڕێ یاخود زیادکردنی ڕۆح بۆ لای خودای گەورە بە فەرموودەی خوای گەورە﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾(الحجر: ٢٩)، واتە: ((لەو ڕۆحە تایبەتیەی کەمن (بەدیهێنەری ئەوم)، پێمبەخشە)) جا دەگونجێت بزانرێت کەوا وەپاڵنراوی بۆ لای خودای پاك و بێگەرد دوو جۆرە: هەندێك سیفەت هەیە بە خۆی پێی هەلناستێت وەك عیلم و زانست و توانا و قسەکردن و گوێگرتن وبینین، جا ئەمە خستنەری سیفەتێکە بۆ وەسفکراو. جا زانستی و قسەکردنی و ویستی و توانای و ژیانی سیفەتێکن بۆ دروستکراو نیە.وە هەروەها ڕوخساری وە دەستی زاتی پاکی خوای گەورە.

دووەم: زیادکردن یاخود خستنە سەری شتی ماقوولی بە جیا لە جیاتی ئەو وەك خانوو و ووشتر و بەندە و پەیامبەر و ڕۆح. جا ئەوەش زیادکردنی بەدیهاتووە بۆ داهێنەرەکەی دروستکراو بۆ دروستکارەکەی، بەڵام سەباری ئەمەش پێویستی تایبەتمەندی و ڕێزلێنان دەکات کەوا خرانە پاڵەکە لە شتی دیکە جیابکرێتەوە، وەك ماڵی خواوە ئەگەر هاتوو ماڵەکان هەمووی موڵکی ئەو بێت، هەروەها ووشترەکەی خوا کە کراوە بە موعجیزە وە وشترەکان هەمووی ملك و دروستکراوی ئەوە، بەڵام ئەمە زیادکراوێکە بۆ پەرستراویەکەی پێویستە خۆشەویستی بۆی هەبێت و میهرەبانیەکەی و ڕێزلێنانەکە. بە پێچەوانەی زیادکردنە گشتیەکەی بۆ خوایەتیەکەی هەر کارتێك دەگونجێت پێویستی دروستکردن و داهێنانەکەی بێت، جا خستنە پاڵ و زیادەکردنی گشتی پێویستی بە دۆزینەوە و داهێنان هەیە، بەتایبەتی پێویستی هەڵبژاردن ، خوای گەورە هەرچیەکی بیەوێت دروستی دەکات و هەڵیدەبژێرێت وەك ئەوەی دروستی کردووە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ

مَا يَشَاء وَيَخْتَارُ﴾ (القصص: ٦٨)، واتە: ((هەر پەروەردگاری تۆیە هەرچیەکی بویێت دروستی دەکات و هەڵیدەبژێرێت)). وە بۆ زیادکردنی ڕۆح بۆ لای خۆی لە زیادکردنی تایبەتی یە نەك لە گشتیەکان، نەك لە بابەتی زیادەکردنی سیفەتەکان، جا هیوادارم ئەو بابەتە دڵنیات بکاتەوە. لەبەر ئەوەی رزگارت دەکات لە گومراییە زۆرەکان کەوا ئەوەی خوا ویستی لەسەر بێت تێی کەوتووە، جا ئەگەر ووتیان: جا چی دەڵێن لە بارەی ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ (الحجر: ٢٩)، واتە: ((لەو ڕۆحە تایبەتی کە من (بەدیهێنەری ئەوم) پێمبەخشی)). جا بەخشین و فووەکەی خستۆتە پاڵ نەفسی خۆی و ئەمەش راستەوخۆ لێی پێویست دەکات و دەگونجێت و هەروەك ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾ (ص: ٧٥)، واتە: ((بەدوو دەستی قودرەتی خۆم دروستم کردووە)). بۆیە لە دروستکردندا نێوانی هەردووکیانی لەو حەدیسە سەحیحە بەیەکتر بەستەوە. وە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ((فيأتون آدم فيقولون: انت آدم أبو البشر، خلقك الله بيده، ونفخ فيك من روحه، وأسجد لك ملائكته و علَّمكَ اسماء كل شيء))[٢٨٩]، واتە: ((فریشتەکان ئادەم دەهێنن و پێی دەڵێن: تۆ ئادەمی باوکی ئادەمیزادی، خوای گەورە بەدەستی قودرەتی خۆی تۆی دروستکردووە، و لەڕۆحە تایبەتیەی کە ئەو بەدیهێنەری ئەوەپێی ببەخشی، وە فەرمانی بە فریشتەکان کرد سوجدەی ڕێز ببەن بۆ تۆ و ناوی هەموو شتێکی فێرکردی)). ئینجا باسی چوار تایبەتمەندیان بۆ ئادەم کرد کەوا لە وانی دیکە پێی دەناسرێتەوە، ئەگەر چی ڕۆحەکەش کەوا لەو دایە بەڵام ئەو لە بەخششی خودایە ئەمە تایبەت نیە بەو ڕۆحە.

دەڵێن: ئەو بابەتی کەوا واجبی کرد بۆ ئەو کۆمەڵەیە کە ووتیان ڕۆحەکە پێش کەوتووە، هەندێکیان تێیدا وەستاون و هەڵوەستەیان کرد، لە مەبەستی

---

([٢٨٩]) مسلم: (١٩٤).

قورئان نەگەیشتن. بەڵام ڕۆحی وە پاڵنراو بۆ پەروەردگار ئا ئەو ڕۆحە دروستکراوە خوای گەورە بۆ نەفسی خۆی زیادەی کردووە سەرباری تایبەتمەندی و ڕێزلێنان هەروەك لەگەڵیدا، بەڵام گیان بەخشینەکە، خوای گەورە لە بارەی مەریەم دەفەرموێت ﴿الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾ (التحريم:١٢)، واتە: ((کەوا داوێنی خۆی بە پاکی ڕاگرت، ئێمەش لەو ڕۆحە کە بەدەستمان،فوومان پێداکرد)).

لە جێگایەکی دیکە وا ڕایگەیاندووە: کە خوای گەورە فریشتەی بۆ ڕەوانە کرد، ئینجا فووی کرد لە داوێنی مەریەمدا[٢٩٠]، ئەو فووەش زیادکردن و خستنە پاڵ بوو بۆ خوای گەورە بە فەرمان و مۆڵەتی پەروەردگار، و ڕاستەوخۆش بۆ پێغەمبەر.

بەڵام ئەو ڕۆحە نێردراوەی بۆ مەریەم ئەوە ڕۆحی خودایە کەوا لە ناو ڕۆحەکەکاندا هەڵیبژاردووە بۆ خۆی، جا بۆ مەریەم لە پلە و پایەکی باوکدا بوو بۆ گشت جۆرەکان، کاتێك فووی پێداکرد لەوکاتەی چووە ناو داوێنی مەریەم ئەوە وەکو دەرزی لێدانی نێرینە بوو بۆ مێینە بە بێ پەرین و جووتبوون. بەڵام ئەوەی ئادەم جیای دەکاتەوە کەوا دروست نەکراوە وەك دروستکردنەکەی مەسیح لەدایك. وە نەك وەك دروستکردنی هەموو جۆرەکان لە دایك و باوك وەنە ئەو ڕۆحەش کەوا خودای گەورە فووی پیاداکردووە فریشتەیە کەوا لە هەموو منداڵەکانی فووی پیادا دەکات. و بەڵکو لە حەدسەکە باسی کردووە ئەوەی جیای دەکاتەوە جگە لە خۆی، چوار شتن: خوای گەورە بە دەستی قودرەتی خۆی دروستی کردووە، و لە و ڕۆحە تایبەتیەی کە خۆی بەدیهێنەریەتی گیانی پێبەخشیوە، و سوجدە بردنی فریشتەکان بۆ ئەو، وە فێرکردنی ناوی هەموو شتەکان .

٭٭٭

[٢٩٠] سەیری: تفسير القرطبي: ١١/٩٠ بکە.

## ئایا دروستبوونی ڕۆحەکان کەوتۆتە پێشەوە لەسەر جەستەکان یاخود دروستبوونی کەوتۆتە دواوەی جەستەکان؟

ئەو مەسەلەیە دوو بۆ چوون و ئاخاوتنی بە ناوبانگ و ناسراوی تێدایە بۆ خەڵکی کە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و کەسانی دیکە باسیان کردووە و قسەشیان لەسەر کردووە، ئەوەی بۆ چوونی بۆ پێشخستنی دروستکردنی ڕۆحەکەیە لەسەر جەستە محمد کوری نصرالمروزی و ئەبو محمد کوری حزمە، ئیبن حزمیش یەکدەنگ بووە، ئێمەش باسی پەڵپ و بیانووی هەردوو تیپەکە دەکەین وە هیچ لەوانە شیاوتر نیە لە ڕاستیەوە.

دەڵێت هەرکەسێ بۆ چوونی بۆ پێش خستنی دروستکردنی ڕۆحی هەبێت لەسەر دروستکردنی جەستە: خوای گەورە دەفەرمووێت﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ السَّاجِدِينَ﴾ (الأعراف:١١)، واتە: (( سوێند بە خوا بەراستی ئێمە (باوەگەورەی) ئێوەمان درووست کردووە نەخش و نیگاری ڕواڵەت و روخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان: ئادەی سوجدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێز بە فەرمانی خوا) جا هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس (کە فەرمانی خوای شکاندو) لە سوژدە بەران نەبوو)).

وتیان: پاشان بۆ ئامادەکردن و ڕێك و پێکی و ماوەکە، لەوانە ئایەتەکە ئەوە لە خۆی بگرێت کە دروستکردنی ڕۆحەکە پێشکەوتووبێت لەسەر فەرمانی خوا بۆ فریشتەکان بە سوژدە بردنیان بۆ ئادەم و لە ڕاستیدا ئەوەی دیار و ئاشکراشە کەوا جەستەکانمان ڕووداوێك بووە پاش ئەمە.

دەڵێن: بەڵگەش لەسەر ئەم فەرموودەی خوای گەورەیە ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى﴾

(الاعراف:١٧٢). واته( یادی ئەو کاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارت پیشتاوپشتی نەوەی ئادەمی کۆکردەوە (لە جیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێ وەرگرتن) و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و (پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: بەڵێ).

دەڵێن: و ئەو قسە پێکردن و شایەتی دانە ڕەنگە بۆ ڕۆحەکانمان بوو بێت ئەگەر جەستەکانیش نەبووین ئەو کاتی ئەو هەبووە.

جا لە (موطأ) دا مالیك بۆمان دەگێڕێتەوە، لە زەیدی کوری ئەبی ئەنیسە، کەوا عبدالحمید کوری عبدالرحمن کوری زید کوری خەتتاب پێی ڕاگەیاندووە، ئەویش لە موسلیم کوری یەساری جەهنی، کەوا عومەری کوری خەتتاب لە بارەی ئەم ئایەتە پرسیاری کرد: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (الأعراف:١٧٢) جا وتی: گوێم لێبوو پێغەمبەرﷺ لەو بارەیەوە پرسیاری لێکرا، ئینجا فەرمووی: ((خلق الله آدم ثم مسح ظهره بيمينه، فاستخرج منه ذريته، فقال: خلقت هؤلاء للنار و بعمل اهل النار يعملون، و خلقت هؤلاء للجنة وبعمل اهل الجنة يعملون))، واتە: (( خوای پەروەردگار ئادەمی دروستکرد پاشان بە دەستی قودرەتی ڕاستەی هێنای بە پشتیا، جا نەوەکانی لێ دەرهێنا یاخود پەیداکرد، جا فەرمووی: ئەوانەم دروست کردن بۆ ناو ئاگر و بە کردەوەی ئەهلی ئاگر کاردەکەن، و ئەوانەم دروست کردن بۆ ناو بەهەشت و بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کاردەکەن)). پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چ کردەوەیەك؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ( ان الله اذا خلق الرجل للجنة استعمله بعمل اهل الجنة حتى يموت على عمل من اعمال أهل الجنة، من دخله به الجنة، وإذا خلق العبد للنار استعمله بعمل أهل النار حتى يموت على عمل من اعمال أهل النار، فيدخله به النار)) [٢٩١]، واتە: ((خودای گەورە کاتێك پیاوێك دروست دەکات بۆ ناو

---

([٢٩١]) الوطأ: ٢/٨٨٨، و الترمذي:( ٣٠٧٥).

بەهەشت بەکاری دەهێنێت بەکارکردنی ئەهلی بەهەشت تاوەکو دەمرێت لەسەر کارو کردەوەکانی ئەهلی بەهەشت دەبێت، جا دەیباتە بەهەشت، جا ئەگەر بەندەیەك دروست بکات بۆ ناو ئاگر ئەوا بەکاری دێنێت بە کرداری ئەهلی ئاگر هەتا دەمرێت لەسەر کارو کردەوەی ئەهلی ئاگر دەبێت، جا دەیباتە ناو ئاگر)).

حاکم دەڵێت: ئەمە حەدیسێکە لەسەر مەرجی موسلیمە، دیسان حاکم لەرێگای هیشام کوری سعد ریوایەتی کردووە، لە زیدی کوری ئەسلەم، ئەویش لە صالح، ئەویش لەلایەن ئەبی هورریرە وە بەرزکراوەتەوە: ((لما خاق الله ادم مسح ظهره فسقط من ظهره كل نسمة هو خالقها الى يوم القيامة امثال الذر، ثم جعل بين عيني كل انسان منهم وبيصا من نور، ثم عرضهم على ادم)).

فقال: من هؤلاء يارب؟ قال: هؤلاء ذريتك، فرأى رجلا منهم اعجبه وبيص مابين عينيه.

فقال: يارب، من هذا؟ فقال: هذا ابنك داود يكون في آخر الأمم، قال: كم جعلت له من العمر؟ قال: ستين سنة قال: يارب من عمري أربعين سنة.

فقال الله تعالى: اذا يكتب و يختم فلا يبدل، فلما انقضى عمر ادم جاء مللك الموت.

قال: اولم يبق من عمري اربعون سنة؟ فقال: اولم تجعلها لا بنك آدم؟ قال: ((فجحد، فجحدت ذريته، ونسي وفنسيت ذريته، وخطيء فخطئت ذريه))[٢٩٢]، واتە: (( کاتێك خوای گەورە ئادەمی دروست کرد پشتی سریەوە و پاکی کردەوە جا هەر رۆحێك کە لە پشتدا لە دایك دەبێت ئەو دروستکاریەتی تا رۆژی قیامەت بە وێنەی مێروو لە، پاشان لە نێوان هەردوو چاوی هەر ئادەمیزادێك لەوان شەوقێکی درەوشاوە لە نور دانراوە، پاشان پیشانی ئادەم دەدرێت.

---

(٢٩٢) حاکم ریوایەتی کردووە: ٢/٣٢٥.

جا دەفەرمووێت: ئەی پەروەردگار ئەوانە کێن؟ دەفەرمووێت: ئەوانە نەوەی تۆن، جا پیاوێك لەوان دەبینێت روناکی نێوان چاوەکانی لا سەیر دەبێت.

ئادەم دەڵێت: ئەی پەروەردگار، ئەوە چیە؟ خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەمە داوودی کوڕتە دەبێتە دوایین ئومەت، دەڵێت: تەمەنت چەند بۆ ئەو داناوە؟ فەرمووی: شەست ساڵ ووتی: ئەی پەروەردگار لە تەمەنی من چل ساڵی تری بۆ زیاد بکە.

ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێت: کەواتە دەنوسرێت و مۆری لێدەدرێت و ناگۆردرێت، جا کاتێك تەمەنی ئادەم بەسەر چوو و کۆتایی هات فریشتەی گیانگیشان بۆ لای هات.

ووتی: ئەدی هێشتا چل ساڵ لە تەمەنی من نەوماوە؟ جا فەرمووی: ئەی بۆ کورەکەت ئادەم ڕەوانە نەکرد؟ ووتی: جا ئادەم نەچووە ژێر بارەوە و نکۆڵی لێکرد، ئینجا نەوەکانی نکۆلیان لێکرد، وە ئادەم لە بیری کرد، جا نەوەکانیشی ئەودیان لە بیرکرد، ئادەم هەڵەی کرد جا نەوەکانیشی هەڵەیان کرد)) . ووتی: ئەمە لەسەر مەرجی موسلیمە، و ترمیزی ریوایەتی کردووە [٢٩٣].

دەڵێت: ئەمە حەدیسێکی حسن سەحیحە، و ئیمام ئەحمەد لە حەدیسێکی ئیبنو عەباس ڕیوایەتی کردووە، دەڵێت: کاتێك ئایەتی قەرزاری دابەزی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((أن أول من جحد آدم)) [٢٩٤]، واتە: ((یەکەمین کەس کە لە ناڕەزایی دەربری و نکۆڵی کرد ئادەم بوو). وە محمد کوری سعد ئەمەی بۆ زیاد کرد: ((ثم اکمل الله لادم الف سنة، و لداود مائة سنة)) واتە: ((پاشان خوای گەورە هەزار ساڵی تری بۆ ئادەم تەواوکرد، وە بۆ داودیش سەد ساڵ)).

---

(٢٩٣) سنن الترمذي: (٣٠٧٦).

(٢٩٤) مسند احمد: (١/٢٥١).

له سەحیحی حاكم دا دیسان له حەدیسێكی ئـەبی جەعفـەری ڕازی دەڵێت: ڕەبیعی كوری ئەنەس بۆ ئێمەی گێڕاوەتەوە، له ئـەبی عالیـە، ئـەویش لـه ئـەبیی كوری كەعبی له بارەی ئەو فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿واذا اخذ ربك من بني آدم من ظهورهم ذُرِّيتهم﴾ ئایەتەكە دەڵێت: لەو ڕۆژەدا هەموویانی بۆ كۆدەكاتـەوە هیچ زیندەورێك نامێنێت تا ڕۆژی قیامەت، ئینجا روحـەكانیان بـۆ دەنێردرێتـەوە پاشان وێنەو ڕواڵەتی روخساریان و دەیانهێننه قسە و ئینجا قسەدەكەن، و پەیمان و بەڵێن و شایەدیان لێوەردەگیرێت: ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ (الأعراف:١٧٢)، واتـە: (( (له جیهانی پەنهان و شاراوە دا پـەیمان لێـوەرگرتن) و كردنـی بـە شـایەت بەسـەر خۆیانەوە و (پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو ووتیان: بەڵێ شایەدیمان داوە( كه تۆ پەروەردگارمانیت)، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی نـەوەكو لـه ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: بەراستی ئێمە لەمە بـێ ئاگـا بـووین!!)). دەڵێـت: خـوای گـەورە دەفەرمووێت جا من هەر حەوت ئاسمانەكا ن و هەر حەوت زەویم بەسـەر خۆتانـەوە كردووە، بەشایەد، و باوە گەورەتان ئادەم شـایەدە بـە سـەرتانەوە:﴿أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾. جا هیچ هاو بەشـێكم بـۆ پەیـدا نەكـەن و مـن پێغەمبەرانی خۆم بۆتان ڕەوانە دەكەم بۆ ئەوەی پەیمان و بـەڵێنی منتـان بـۆ بـاس بكات و بە بیرتان بهێنێتەوە. و كتێبەكانی خۆتان بۆ ڕەوانـه دەكـەم، جـا ووتیـان: شایەدی دەدەین تۆ خودا و پەروەردگاری ئێمەیت هیچ خوایەكی دیكەمان نیه جگه له زاتی تۆ نەبێت. وە باوكیان ئادەم بۆیان بەرزدەكاتەوە جا دەبینێت له ناو ئەواندا دەولەمەندی و هەژاری و رووخـسار جـوان و شـتی دیكـەش هەیـە. دەڵێـت ئـەی پەروەردگارم خۆزگە له ناو بەندەكانت هەمووت یەكسان دەكـرد، جـا دەڵێـت مـن حەزدەكەم سوپاسگوزاریت بكەم، لـه ناویانـدا پێغەمبـەران دەبینێـت وەك چـرا و گوڵە ئەستێرە وان، جا لەو بارەیەوە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت:﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ

النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ﴾ (الأحزاب: ٧)، واتە: ((بیریان بخەرەوە کـە ئێمـە پەیمانمان لە پێغەمبـەران وەرگرتـووە پـەیمانی یـەکتا پەرستـی، پـەیمانی گەیانـدنی بانگەوازی خوا، بـە تایبـەت لـە تـۆ ئـەی محمـدﷺ و لـە نـوح). وە هـەروەها دەفەرموویت ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ﴾ (الرّوم: ٣٠)، واتـە: ((ئـەی ئینـسان بـەدڵێکی پـاك و بێگـەردەوە ڕووبکەرە بەرنامـە و ئـاییـنی خـودا و ئـەملا و ئـەولا مەکـە. خەڵکینـە ئێـوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروستکردووە (واتـە قورئـان کـە تەلۆك و نەخشەی ژیانی نادەمیزادەکانە لێی لامەدەن)، هیچ جـۆرە گۆرانکاریـەك لە هیچ نەخشەو دروستکراوێکی خوادا نی یە)). ئەمەش ئەو فەرموودەیە یـە کـە دەفــەرموویت: ﴿هَـذَا نَـذِيرٌ مِّـنَ النُّـذُرِ الْـأُولَى﴾ (الـنجم: ٥٦)، واتــە: ((ئـەم پێغەمبەرەش هۆشیار کەرەوەیە کە لە هۆشیار کەرەوانی پێشوو)). هەروەها خـوای گەورە دەفەرموویت ﴿وَمَا وَجَدْنَا لأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ وَإِن وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ﴾ (الأعـراف:١٠٢)، واتە: ((بەشی زۆری ئەو خەڵکە سەر گەردانەمان دەست نەکەوت کە پەیمان شکێن نەبن و بەراستی زۆربـەی ئەوانـەمان بەدەرچـوو لـە ئـاییـنی خـوا دەستکەوت)). وە ڕوحی عیساش لەو ڕوحانە بوو کەوا پەیمانی لێوەرگیراوە، جا ئەو ڕوحە نێردرا بۆ مەریەم کاتێك کەنارگیری کرد لە کـەس و کـاری و شـوێنیکی لـە ڕۆژهەڵاتی (بيت المقدس) هەڵبژار بۆ خواپەرستی. ئەمەش ئیـسنادێکی سـەحیح و دروستە.

ئیسحاقی کوری ڕاهویە دەڵێت: بقیە کوری ولیـد بۆمـانی گێڕایـەوە، ووتـی: زوبەیدی کوری ولیـد پێـی ڕاگەیانـدووم، لـە ڕاشـد کـوری جومعـە، ئـەویش لـە عبدالرحمن موری ئەبی قەتادەی بەسری، ئەویش لەباوکیـەوە، ئـەویش لـە هیـشام کوری حکیم کوری حزام کەوا پیاوێك ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئایـا کـارو کردەوەکان دەستپێدەکات یاخود کاتەکە تێپـەڕیووە بـە مانـای (قـەزاو قەدەرەکـە

بریاری لەسەردراوە)؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((إن الله لما اخرج ذرية آدم من ظهره اشهدهم على أنفسهم ثم أفاض بهم في كفيه. فقال: هؤلاء للجنة، وهولاء للنار، فأهل الجنة ميسرون لعمل أهل الجنة و أهل النار ميسرون لعمل أهل النار)) (٢٩٥).

واتە: ((خودای گەورە کاتێك نەوەی ئادەمی لە پشتیدا دەرهێنا کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە پاشان لە هەردوو لەپی دەستەکانی پڕی کردن، جا فەرمووی: ئەوانە بۆ بەهەشتن، وە ئەوانەش بۆ ناو ئاگرن، جا ئەهلی بەهەشت بە ئاسانی کار بۆ ئەهلی بە هەشت دەکەن و ئەهلی ئاگریش بە ئاسانی کار بۆ ئەهلی ئاگر دەکەن)).

وە محمدی کوری نصر دەڵێت: محمد کوری یحیی بۆ مانی گێڕایەوە، کەوا سەعید کوری ئەبی مەریەم بۆ ئێمەی گێڕاوەتەوە، وە لەیس کوری سەعید پێی راگەیاندووین، ئیبن عجلان بۆمی گێڕایەوە، لە سەعید کوری سەعیدی مەقبەری، ئەویش لە باوکیەوە ئەویش لە عبدالله کوری سەلام. ووتی: خوای گەورە ئادەمی دروستکرد پاشان هەردوو دەستەکانی درێژکرد و یەکتریان گوشی فەرمووی: هەڵبژێرە ئەی ئادەم، ئینجا ئادەم ووتی: خودایە راستەم هەڵبژاردو وە هەردوو دەستەکانی راستەن،جا هەردوو دەستەکانی پانکردەوە، بینی نەوەکانی تێدایە؟ جا ووتی: ئەی پەروەردگارا ئەوانە کێن؟ فەرمووی: هەرکەسێ لێبوومەوە لە دروستکردن لە نەوەی تۆ لە ئەهلی بەهەشتدایە تاکو رۆژی قیامەت.

دەڵێت: ئیسحاق پێی راگەیاندین، کەوا جەعفەری کوری عون بۆ ئێمەی گێڕایەوە، ئەهشام کوری سەعد بە ئێمەی ڕاگەیاند، لە زەید کوری ئەسلەم، ئەویش لە ئەبی هوریرە، ئەویش لەپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (( لمَّا خلق الله آدم مسح

(٢٩٥) سەیری تفسیری أبن کثیر: ٢/٢٧٤ بکە.

ظهره، فسقط من ظهره كل نسمة هو خالقها من ذريته الى يوم القيامة)) [296]،
واته: ((كاتێك خوای گەورە،ئادەمی دروستکرد دەستی قوردەتی بە پشتیدا هێنا، جا لە پشتیدا هەر روحێك بوو بێت لە نەوەکانی ئەو دروستکاریەتی تاکو ڕۆژی قیامەت)).

ئیسحاق و عەمرو کوری زرارە بۆمانی گێڕایەوە، کەوا ئیسماعیل لە کەلسوم کوری جەبر پێی ڕاگەیاندووین، ئەویش لە سعیدی کوری جوبەیر، ئەویش لە ئیبنو عەباس لە بارەی ئەو ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (الأعراف: ١٧٢)، بە نووعمانی ووت: پەروەردگاری تۆ دەستی موبارەکی بە پشتی ئادەم دا هێنا جا هەر ڕۆحێکی لێ دەرچوو ئەو دروستکاریەتی تا ڕۆژی قیامەت ئا ئەمە عەرەفە ریوایەتی کردووە، ئینجا پەیمانی لێوەرگرتن: ﴿أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا﴾ (الأعراف: ١٧٢).

محمد کوری نصر لە تەفسیری السیدی باس دەکات، لە ئەبی مالیك و ئەبی صالح دەگێڕێتەوە، ئەویش لە ئیبنو عەباس، و لە مورە الهدانی، ئەویش لە ئیبن مەسعود، ئەویش لە خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لە بارەی ئەم فەرموودەیە: ((وإذا أخذ رَبُّكَ من بني آدم))، کاتێك خوای گەورە ئادەمی لە بەهەشت دەرکرد پێش ئەوەی لە ئاسمان دابەزێت دەستی قوردەتی بەلای ڕاستی پشتی ئادەمدا هێنا، جا نەوەیەکی سپی لێ ی دەرهێنا وەك مرواری و هەروەك شێوەی مێروولەی وورد، جا پێیانی فەرموو: بە ڕەحمەت و بەزەیی من بڕۆنە بە هەشت، وە دەستی بەلای چەپی پشتیدا هێنا، جا نەوەیەکی ڕەشی لێ دەرچووندا لە شێوەی مێروولەی وورد، جا فەرمووی: بڕۆنە ناو ئاگر بایەختان پێنادەم، جا لە مەشدا بە جۆرێك دەفەرموێت ﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ ( الواقعة: ٢٧)، واتە: ((دەستەی ڕاستەکان)). ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ﴾ ( الواقعە: ٤١)، واتە: ((دەستەی

---

([296]) تقريب التهذيب: ٢/٣١٨ .

چەپەکان)).پاشان پەیمانی لەوانیش وەرگرت فـەرمووی ﴿الـست بـربکم قـالو بلـی﴾ هیچ کەسێك نیە لە نـەوەی ئـادەم ئـیلا ئـەو دەزانێـت کـەوا( الله) پـەروەردگاری ئەوە.وە هەموو ئەو ئایەتانەی کە باسمان کردن بـە مانـای : ئـەو ڕۆژەی پـەیمانی لێوەرگرتن.

ئیسحاق دەڵێت: ڕوومی کوری عتادە پێی ڕاگەیاندین، کـەوا موسـای کـوری رەبدی پێی ڕاگەیاندووین و ووتویەتی: گـوێم لـە محمـد کـوری کـەعبی قـرزی بـوو دەیووت: لە بارەی ئەو ئایەتـەدا﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ﴾ (الأعـراف:١٧٢)، واتە: ((یادی ئەو کاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتا و پشتی نـەوەی ئـادەمی کۆکردەوّتەوە (لە جیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێ وەرگـرتن) )). بـە مانـای هەموویان ڕازی بوون بۆی بە ئیمان و باوەر و زانین، وە ڕۆحەکانیش هـەبوون پـێش ئەوەی لاشەکانیان دروست بکات.

دەڵێت: الفضل کوری موسی بۆمانی گێڕایەوە، لە عبدالملك، ئەویش لە عطاْ لە بارەی ئەو ئایەتەوە: دەفەرمووێت: لـە برِبـڕەی پـشتی ئـادەم وەرنـەدەرەوە لـەو کاتەوە پەیمانی لێوەرگرتن، پاشان ئەوانی ناردنەوە بۆ برِبرِەی پشتی ئەو.

ئیسحاق دەڵێت: عەلی کوری ئەجلـەمی لـە زەحـاك دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: خوای گەورە لەو ڕۆژەی لە پشتی ئادەم دروستیکردووە هـیچ نابێـت تـا هەڵـسانی قیامەت، جا وەك مێروولەی وورد دەریان دەهێنێـت دەفـەرمووێت ﴿أَلَسْتَ بِـرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى﴾ (الأعراف: ١٧٢) فریشتەکان ووتیان: ﴿شَهِدْنَا أَن تَقُولُـواْ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَـافِلِينَ﴾ (الأعـراف: ١٧٢). پاشـان بەدەسـتی ڕاسـتەی گرتـی و فەرمووی: ئەوانە لە بەهەشتدان، و ئەوانی دیکەی گرت و فەرمووی: ئەوانـەش لـە دۆزەخ دان.

لە تەفسیری ئیبن عبینە، لە رەبیعی کوری ئەنـەس دەگێڕێتـەوە، ئـەویش لـە ئەبی عالیە﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًـا وَكَرْهًـا﴾ (آل عمـرا: ٨٣)،

واتە: ((هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بەرەزامەندی بێت یا بەناچاری تەسلیم و ملکەچی پەروەردگان))، ووتی: ((ئەو رۆژەی پەیمانی لێ وەرگرتن)).

ئیبن ئیسحاق دەلێت: تا لەو کاتەدا ئەوان بریاری خۆیان دابوو و ملکەچی فەرمانی خوابوون. ئەمەش کەوا خوای گەورە رایگەیاندووە، و فەرموویەتی﴿أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى﴾ (الأعراف:١٧٢). خوای پەروەردگاریش وتووێژ ناکات تەنها ئەوا لە ئاخاوتن و وتووێژەکەی دەگات. وەلامیش ناداتەوە تەنها لەو کەسەی لە پرسیارەکە تێدەگات.



## ( لەبارەی بیانوو و نارەزایی بەوەی ئیبن مەندە ریوایەتی کردووە )

دیسان نارەزاییان دەربریووە بەوەی عبداللە ی کوری مەندە ریوایەتی کردووە، محمد کوری سابیر بوخاری پێمان راگەیاندووە، کەوا محمد کوری مونزر کوری ئەسەدی هروی بۆ ئێمەی گێراوەتەوە، کە دەلێت جەعفەر کوری هارون مصصی بۆمانی گێرایەوە، ئەویش لە عەتبە کوری سکن، ئەویش لە أرطاة کوری مونزر، ئەویش لە عطاءکوری عولان،ئەویش لە یونس کوری حەلبەس، ئەویش لە عەمرو کوری عەبسە، ووتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بووﷺ دەیفەرموو: ((إن الله خلق أرواح العباد قبل العباد بألفي سنة، فما تعارف منها ائتلف، وما تناكرمنها اختلف))، واتە: (( خوای گەورە روحی بەندەکانی لە پێش بەندەکانی بە دوو هەزار ساڵ دروستکرد، جا ئەوەی یەکتریان ناسی هۆگری یەکتر بوون، وە ئەوەیش ئینکاری لێی کرد جیاواز دەبێتەوە)). جا ئەمە هەندێکە ئاوا نارەزایی پێی دەردەبرن.

هەندێکی دیکە دەلێت: قسەکە لەگەڵ ئێوە دایە لە شوێن دا.

یەکەمیان:- باسکردنی بەڵگە کـە لەسـەر رۆحـەکان کـە دروسـتکراوە پـاش دروستکردنی لاشەکان.

دووەمیان:- وەڵامەکە بەچی بۆتان ڕوون بکرێتەوە.

لە شوێنی یەکەمدا، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿يَا أَيُّهَا النَّـاسُ إِنَّا خَلَقْنَـاكُم مِّـن ذَكَـرٍ وَأُنثَـى﴾ (الحجـرات: ١٣)، واتـە: ((ئـەی خەڵکینـە بێگومـان ئێمـە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروستکردووە کە باوکـە ئـادەم و دایکـە حەوایـە)). ئەمە ئاخاوتنێکە بۆ ئادەمیزادێك کەوا ڕۆح و لاشەی هـەبێت جـا بەڵگـە لەسـەر ئەوەی کەوا هەمووی دروستکراوە پاش دروستکردنی دایك و باوك ، خـوای گـەورە لەم ئایەتەدا دەریخستوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّـن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ﴾ (النساء: ١)، واتـە: ((ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لـە تاکە نەفسێك دروستکردووە، هـەر لـەو نەفسـەش هاوسـەرەکەی بـەدیهێنا و لـەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خـستۆتەوە و بـڵاو کردۆتـەوە، هـەروەها لـەو خوایـە بترسن)). ئەمەش ئاشـکرایە کـە دروسـتکردنی تـەواوی جـۆری ئـادەمیزاد پـاش دروستکردنی ڕەسەنەکەیەتی.

جـا ئەگـەر ووتیـان: ئەمـەش پێشخـستنی دروسـتکردنی روحـەکان لەسـەر لاشـەکانی بـەدوور ناخاتـەوە کـەوا لـەدوای دروسـتکردنی بـاوکی ئـادەمیزاد دروستکراوە هەروەك نیشانەکانی پێشوو بەڵگەیە لەسەری.دەڵێت: گـەر خـوا حـەز بکات ئاشکرای دەکەین و ڕوونی دەکەینەوە کەوا ئەو نیـشانانەی باسـکران بەڵگـە نیە لەسەر پێشخستنی روحەکان لە لاشەکان پێشخستنێکی جێگیر و چەسپاو، وە مەبەستەکەشی پـاش دروسـتی و جێگیربـوونی دەیـسەلمێنێ لەسـەر ئـەوەی کـەوا پەروەرگارەکەی بەدیهێنەرەکەی کە خوای پەروەردگارە روحەکـەی وێنـا کـردووە وە دروستبوونی و کات و ئەجەلی و کردەوەکانی پێوانە کردووە و بڕیاری لەسـەر داوە،

وە ئەو وێنانەی لە تـوخمی خـۆی دەرهێنـاوە، پاشـان بـۆ ئـەوەی گەڕاندۆتـەوە، و قەدەری داناوە لەسـەر هاتنـە دەرەوەی هـەرتاکێك لەتاکـەکانی لـەو کاتـەی بـۆی دانـاوە،وە بەڵگـەش لەسـەر ئـەوەی کـەوا بەدروسـتکردنێکی جێگـر و چەسـپاو دروستکراوە، لە دواییدا بەردەوام بووە بە بـوون و زینـدوویی و زانـایی و قسەکار هەمووی لەیەك شوێن و بابەتدا. پاشان لێی بنێردرێتەوە بـۆ لاشـەکان کۆمـەڵ لـە دوای کۆمـەڵ هەروەك محمد کوری حزم وادەڵێت.

نیـشانە باسـکراوەکان لەبـەر ئـەوەی بەڵگەیـە لەسـەر سـەلماندنی قـەدەر و وچارەنووسـی پێـشوو، و هەنـدێکیان بەڵگـە دەدات لەسـەر ئـەوەی کـەوا خـوای پەروەردگار نموونە و وێنە و ڕواڵەتی دەرهێناوە، ئەهلی دڵخۆش و ئەهلی خەمباری لێك جیاکردۆتەوە، بەڵام ئاخاوتنیان و قسە پێکردنیان و ملکەچیان بۆی بە خوایـە تیەوە شایەتی دانیان لەسەر خۆیانەوە بـە بەندایەتیـە، جـا ئـەوەی لـە سـەلەف و پێشینە ووتویەتی ، بەڵکو ئـەوە پەسـەند و دروسـتکراوبێت لەسـەر تێگەیـشتنی ئایەتەکە، وە ئایەتەکە دەسەڵات لەسـەر ئـەوە ناکـات، بـەڵکو دەسـەڵات لەسـەر ناکۆکی و جیاوازی دەکات.

بەڵام حەدیـسی مالیـك، ئـەبو عومـەر دەڵێـت: ئـەو حەدیـسێکی پـچراوە، موسلیمی کوری یسار لە عومەری کوری خەتتاب وەرنەگرتووە، لەو حەدیسەدا لـە نێوانیاندا نەعیمی کوری رەبیعە هەیە، وە هەروەها ئەویش لەگەڵ ئـەو ئیـسنادەیە برِو بیانووی پێی هەڵناگرێت ، وە موسلم کوری یشاریش ئەمە دیار نیـە، دەڵێـت : کەوا ئەوە.مەدەنی یە، نەك موسلمی کـوری یـساری بەسری، ئـبن ئـەبی خیثمـة دەڵێت: لەسەر یحیی کوری موعین حەدیسی مالیکم خوێندۆتـەوە ئەمـە لای زیـدی کوری ئەبی ئەنیسەیە، جا بەدەستی خۆی لەسەر موسلم کـوری یـساری نووسـیوە: ((نایناسێت)).

پاشان ئەبو عومەر لە ڕێگای نسائی بۆی گێراوەتەوە: پێیان ڕاگەیاندووم: کەوا محمد کوری وهب گێڕایەتیەوە کە محمد کوری مسلمه بۆمانی گێڕاتەوە و ووتی: ئەبو عبدالرحيم بۆ منی گێراوەتەوە، دەڵێت: زيد کوری ئەبی ئەنیسە بۆمی گێڕایەوە، ئەویش لە عبدالحميد کوری عبدالرحمن، ئەویش لە موسلم کوری یسار، ئەویش لەنەعیم کوری ڕەبیعە.

پوختەی قسە لەو حەدیسە دا کەوا حەدیسێکە ئیسنادەکەی ڕاوەستاو نیە، چونکە موسلیم کوری یسار و نەعیم کوری ربیعە هەموویان ناسراونین بە هەڵگرتنی زانست و زانیاری، و بەڵام ئەو حەدیسە لە پێغەمبەرﷺ پشت ڕاست کراوەتەوە لە زۆر ڕووەوە جێگیر و چەسپاوە بەدرێژی لە حەدیسێکی عومەری کوری خەتتاب باسی دەکات وە کۆمەڵێکیش بەدرێی باسیان دەکات.

حەدیسێکی عبدالله کوری عومەر لە بارەی قەدەر و چارەنووس باسدەکات، و لە کۆتاییەکەیدا دەڵێت، پیاوێك لە مزینە یاخود جهنیە پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کردەوەکە چۆنە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إن أهل الجنة ييسرون لعمل اهل الجنة، وأهل النار ييسرون لعمل أهل ألنار)، واتە: ((بێگومان ئەهلی بەهەشت کار ئاسانی دەکەن بۆ کردەوەی ئەهلی بەهەشت، و ئەهلی ئاگریش کارسانایی دەکەن بۆ کردەوەی ئەهلی ئاگر)).

دەڵێت: ئەوەی مانای ئەو حەدیسەی گێراوەتەوە لە بارەی قەدەر لەلای پێغەمبەرﷺ، عەلی کوری ئەبی تالیب، و ئەبیی کوری کەعب و عبدالله کوری عەباس و ئیبن و عومەرە، و ئەبو هورەیرە و ئەبو سعید و ئەبو سەریحەی غەفاری و عبدالله ی کوری مسعود و عبدالله ی کوری عەمرو وە عمران کوری حصین و عائیشە وە ئەنەسی کوری مالیك و سوراقەی کوری جشم وە ئەبو موسای ئەشعەری

و عیبادەی کوری صامت، وە زۆربەی حەدیسەکانی ئەوانە چەند ڕێگایەکی هەمە جۆر و جیاوازی هەیە پاشان زۆربەیان بە ئیسنا دەکەی لێیان گێراوەتەوە.

بەڵام حەدیسەکەی ئەبی صالح. کە لە ئەبی هوریرە وەریگرتووە، لەبەر ئەوەی بەڵگەیە لەسەر دەرهێنانی نەوەیەك نموونەیان دەکات بە وێنەی مێروولەی وورد، و لەو کاتەدا رووناکایی و تاریکایی تێدابووە، نەك ئەوەی تێدایە کەوا پەروەردگار روحەکانیانی پێش لاشەکانیان دروستکردووە و بەیەك شوێن ملکەچی کردووە و قایل بووە، پاشان هەر روحێك لەو روحانە دەنێردرێت لە کاتی روودانی لاشەکە بۆی، بەڵێ هەر خۆی خوای گەورە هەر لاشەیەك تایبەت دەکات بە روحێك کەوا چارەنووس و قەدەری وایە لەو کاتەدا بۆ ئەو بێت.

ئەوەی لەو حەدیسە ئینکاری دەکرێت ئەوەیە کە دەڵێت: روحی عیسا لەو روحانە بوو کەوا پەیمانی لێ وەرگیرا، ئینجا روحەکەش نێردرا بۆ مەریەم لەوکاتەی کەنارگیری کرد لە خزم و کەس و کاری لە شوێنێکی رۆژهەڵاتی((بیت المقدس)).

جا روحەکە لە دەمیدا چووە ژوورەوە، زانراویشە کەوا روحەی نێردرا بۆ مەریەم روحی مەسیح نیە، بەڵکو روحەکە فووی پێدا کرا جا بە مەسیح حەملی پەیداکرد، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا * قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا * قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا﴾ (مريم: ١٧-١٩)، واتە: (( جا ئێمە جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای، وەکو بەشەرێکی تەواو(خۆی خستە بەرچاوی)(١٧) مەریەم ووتی: بەراستی من پەنا دەگرم بە خوای میهرەبان لە تۆ ئەگەر کەسێکی بە تەقواو لە خواترس بیت(١٨) جوبرەئیل ووتی: (مەترسە) دڵنیا بە من تەنها نێردراوی پەروەردگاری تۆم ، تا منالێکی خاوێنت پێ ببەخشم(١٩)).جا رۆحی مەسیح هەرگیز بەو شێوەیە گفتوگۆ لەگەڵ خودی خۆی ناکات، و لە هەندێ ڕێگاکانی حەدیسی ئەبی جەعفەر

دا هاتووه کەوا روحی مەسیحە کە ئەو قسە دەکات، وە هەر ئەو یشە بۆی رەوانـە دەکات.

لێرەدا چوار پلەو پایە هەیە:

یەکەم: خوای میهرەبان وێنـەو نیگـاری ئـەوانی دەرهێنـاوە جـا بەدبـەخت و کلۆڵەکانی لە دڵخۆشەکانیان جیاکردۆتـەوە و لـە تاقیکردنـەوەکانیا لێیـان خـۆش ببێت.

دووەم: خوای گەورەو دلۆڤان لەو کاتەدا پەڵپ و بیانووی بەسەریاندا چەسپاند و کردنی بە شایەت بە خوایەتیەکەی و فریشتەکانیشی بەسەریانداکرد بەشایەت.

سێیەم: ئا ئەمەیە لێکدانەوەو تەفسیری ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (الأعراف:١٧٢)، واتە: (( یـادی ئـەو کاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتا و پـشتی ئـەوەی ئـادەمی کـۆکردەوە( لـە جیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێوەرگرتن)).

چوارەم: خودای گەورە ئەو روحانەی هەموو چەسپاند و ملکەچی پێکردن پاش دەرهێنانی لە شوێنێکی بە تاڵ و چۆڵ لە دروستکردنەکەی، و لە راسـتیدا هـەموو کاتێکی نـاردنی کۆمـەلێك لێـی دوای کۆمـەلێکی دیکـە بـۆ لاشـەکانیانی نـویێ دەکاتەوە.

ئەوەی پلە و پایەی یەکەمە: ئەوا نیشانەکان بەجۆرێکی تر خـۆی دەردەبرێـت بەرزکراوەتەوە وە رگیراوە.

ئـەوەی پلـە و پایـەی دووەمیـشە: لـە راسـتیدا وەرگرتنـی راویەکانـە لـە لێدەرەوەکان لە ئایەتەکـەدا، وا دەزانـن ئەمـە تەفـسیرەکەیەتی، ئەمـەش ووتـەی کۆمەڵی لێکدەرەوانە لە ئەهلی حەدیس و فەرموودە.

ئەبو ئیسحاق دەڵێت: دروستە خوای گەورە و میهرەبان روحەکان وەك نموونەی مێرووولەی وورد لێبکات کەوا دەریهێناوە بە تێگەیشتن و عەقڵ بۆی بـچێت. هـەر

وەك دەفەرمووێت ﴿قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ﴾ (النمل: ١٨)، واتە: ((مێروولە مێینەیەك(هاواری کردو) ووتی: ئەی مێروولەینە، بچنە ماڵ و کون و کەلەبەرەکانتانەوە)) هەروەها خوای گەورە فەرمانی بە چیاکان و باڵندەکان کرد لەگەڵ داود تەسبیحات بکەن[٢٩٧].

ئیبن ئەنباری دەڵێت: مەزهەب و ڕێبازی خاوەن حەدیسەکە و گەورە زانایانی لەو ئایەتەدا: کەوا خوای گەورە نەوەی ئادەمی لە بڕبڕەی پشتی ئەوو بڕبڕەی پشتی منداڵەکانی ئادەمی دەرهێناوە، وە ئەوان لە وێنەی مێروولەی ووردن، جا پەیمانی لێ وەرگرتن کەوا ئەو دروستکاریانە و نەوەکانیش دروستکراون، ئینجا دانیان پیادانا و قەبوولیان کرد، ئەمەش پاش ئەوەی بەرێی عەقلی خۆیاندا ڕۆیشتن و دانیانپیانابەوەی پیشانیان دان، هەروەك عەقلی دا بە چیاکە کاتێك قسەی کرد، و هەروەك بە ووشترەکەش کرد کاتێ کڕنۆشی برد، وە بەدارخورماکەشی کاتێ داوای لێکرا تاوەکو گوێ ی لێبوو ملی کەچ کرد و بەرێوەبرا.

جرجانی دەڵێت: لە نێوان فەرمودەی پێغەمبەرﷺ: ((إن الله مسح ظهر آدم فاخرج منه ذريته))، واتە: ((بێگومان خودای گەورە دەستی قوردەتی بە پشتی ئادەمدا هێناوە جا لە پیشتیدا نەوەکانی دەرچوواندووە). وە لە نێوان ئایەتەکەدا سوپاس بۆ خودا هیچ جیاوازی و ناکۆکیەك نیە. چونکە پەروەردگاری عز وجل ئەگەر لە پشتی ئادەم ئەوانی وەرگرتبێت ئەوا لە پشتی ئەوانیش نەوەکانی وەرگرتوون، چونکە نەوەی ئادەم هەندێکیان بۆ هەندێکی دیکە دەبنە نەوەی یەکتری، خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ (الأعراف:١٧٢)، واتە: ((نەوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: بە ڕاستی ئێمە لەمە بێئاگابووین!!). واتە: لە بارەی ئەو پەیمانەی لێیانی وەرگرتن، جا کاتێ ئەوەیان ووت فریشتەکان بوون بە شایەت بەسەریانەوە بە وەرگرتنی پەیمانی

---

(٢٩٧) سەیری: سورەتی((سبأ)) ئایەتی (١٠) بکە .

لێیانەوە. و لە مەشدا بەڵگەیە لەسەر ئەو تەفسیرەی کەوا لە ریوایەتەکەدا لەلایەن خوای گەورەوە هاتووە بە فریشتەکانی فەرموە: ئێوە شایەت بن، ئینجا فریشتەکان وتیان: شایەت بووین بە سەریانەوە، دەڵێت: هەندێك زانایان وا دەڵێن کە پەیمانەکە لەوانە لەسەر رۆحەکان وەرگیراییت بە بێ لاشەکان، بێگومان رۆحەکانیشن کەوا عاقل دەبن و تێدەگەن، وە پاداشتی بۆی هەیە و، وە ئیسحاقی کوری راهویە دەڵێت: هەموو زاناکان یەکدەنگن کەوا رۆحەکان پێش لاشەکان بەدەنگ هاتوون و کردنی بە شایەت بەسەریانەوە، جرجانی دەڵێت: بەو فەرموودەیەی خوای میهرەبان بیانوو دەهێنێتەوە ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء﴾ (آل عمران: ١٦٩)، واتە: ((هەرگیز وامەزانن و وا دامەنێن ئەوانەی لە پێناوی خوادا شەهید بوون و کوژران، مردوون، نە خێروانیە، بەڵکو ئەوانە زیندوون)). لە لاشەکانیش گرفتارن و پووکاونەتەوە و لە زەویدا ماتەوە، رۆحەکانیش رزق و رۆزییان پێدەدرێ و دڵخۆش دەبێت، و هەر ئەویشە لەزەت دەبینێت و دڵخۆش و خەمبار دەبێت دانپیادەنێت و ئینکاریش دەکات.

٭٭٭

### (لەبارەی کێشە و گرفت و ناکۆکی لە مانای ئایەتی قورئانی)

ئەوانەی ناکۆکی دەکەن لەگەڵ کەسانی دیکە لەبارەی مانای ئایەتەکە، دەڵێت: مانای ئەو فەرموودەیە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (الأعراف:١٧٢)، واتە: ((دەریهێناوون و دایمەزراندوون پاش ئەوەی ئەوان کەمێ ناوی رون بوون واتە(مەنی پیاو) لە بڕبڕەی پشتی باب و باپیرەیان بەرەو دونیا لەسەر رێکخستنیان لە هەبووندا، وە کردنی بەشایەت بەسەر خۆیانەوە کە وا ئەو خوای ئەوانە بەوەی کەوا لە ئایەتەکانیدا نیشانی داون وە بۆیانی سەلماندوون کەوا ناچاری کردوون بۆ ئەوەی بزانین کەوا ئەو پەروەردگاریانە، لە خوا زیاتر کەسێکی

دیکه دەستکاری ئەمەنی یە، جا کاتێك ئەمەیان زانی و ملکەچیان کرد و داوایـان لێکرا ئەوەی بینیووانه و شایەدیان بۆ داون باوەڕی پێ بهێنن.

هەروەك خوای گـەوره لـه شـوێنیکی دیکـه دەفـەرموویێت: ﴿شَاهِدِينَ عَلَى أَنفُسِهِمْ بِالْكُفْرِ﴾ (التوبة: ١٧)، واته: ((له کاتێکدا خۆیان شـایەتن لەسـەر خۆیـان که بێ باوەڕن)) لێیانی دەوێت به پله و پایەی شایەتی دان بۆ ئەوەی نەڵێت: ئێمـه بێ باوەڕین هەروەك ووتیان.

لەو دەرگایەشدا ڕاگەیاندن و ئاشکرا کردنەکەشی دیسان تێدایە﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّـهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُـوَ﴾ (آل عمـران: ١٨)، واتــه: ((خـوای گـەوره(لەرێگـەی دروسـت کراوانیەوه، که هەمووی نیـشانەی دەسـەڵاتی دەنوێنێـت)) خـۆی شـایەتی داوه و دەریخستووه و سەلماندوویەتی که بەڕاستی جگه لـەو هـیچ خوایـەکی تـر نیـه کـه شایەنی پەرستن بێت). دەیەوێت: ئاگادار بکاتـەوه و دەری بخـات. ڕێـك وەك ئـەوه وایه شایەتی دانی ئەو کەسەی شایەتی دەدات لەلای فـەرمانڕەواو دەسـەڵاتدارەکان ئەمه قسەی ئیبن ئەنباریه.

جرجانی ڕوونکردنەوەیەکی بۆ ئەو قسەیه زیادکردووه دەڵێـت لـەلای یـەکێك هاوەڵەکانی قسەی کردووه: کاتێك خوای گەوره دروستکراوی خۆی دروسـت کـرد و زانیاری خۆی پێدا بـەوەی کـه ئـەو گیانلەبەرێکـه و بـوونی هەیـه و پێـشتربوونی نەبووه، هەروەك خوای گەوره، له شوێنێکی دیکەی قورئاندا دەفەرموویێت: ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ النَّارِ﴾ (الأعراف: ٥٠)، ﴿وَنَادَى أَصْحَابُ الْجَنَّةِ﴾ (الأعراف:٤٤)، ﴿وَنَـادَى أَصْحَابُ الأَعْرَافِ﴾ (الأعـراف:٤٨)، دەڵێت: جا لێکدانەوەی ئەو فەرموودەیە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّـكَ﴾، (الأعـراف:١٧٢). خـوای گـەوره پـشتا و پـشتی نـەوەی ئـادەمی کۆکردەوه. هەروەها دەفەرموویێت ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ﴾، واتـه: ((کردنـی بـه شایەت بەسەر خۆیانەوه))، واته کردنـی بەشـایەت دوای ئـەوەی عـەقڵی پێـدان و تێگەیشتن. وه پاداشت و سزای لەسەر واجب کردن، و هەرکەسێ له دایـك دەبـێ و

دەبێتە هەرزەکار چاکەو تاوان لێك جیا دەکاتەوە، وئـەقڵی بـە زیانبـەخش و سـود وەرگرتندا دەشکێت، لە بەڵێن و بەڵێندان و بەخشین و سزادا تێدەگات وەك ئـەوەی خوای گەورە پەیمانی لێ وەرگرتـووە لـە یـەکتا پەرسـتی و بـەوەی ئاقڵمەنـدبووە و ئەقڵی پێدا دەشکێت. جا هەر کەسێ ئەمەی پێ ڕاگەیەنرا ئەوا پەیمان و بەڵێنی لێ وەرگیراوە.

دروستە کە بووترێت: بێگومان خوای گەورە بەوان ملی کـەچ کـردن و هاتنـە ژێر بار و تەسلیم بوون،هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلّـهِ يَـسْجُدُ مَـن فِـي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾، واتە: (( هەر بۆ زاتی خوای پەروەردگارە ئـەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا بەڕەزامەندی بێت یا بەناچاری کڕنووشی بۆ دەبات)).

دەڵێت: ناڕەزایی دەردەبڕن بەم فەرموودەیەی پێغەمبـەرﷺ: ((رفـع القلـم عن ثلاث: عن الـصبی حتـی یحتلم، وعـن المجنـون حتـی یفیـق، وعـن النـائم حتـی ینتبه))[298].

واتە: ((پێنووس لەسەر سێ جۆر کـەس هەڵـدەگیرێت: لـە منـداڵێك تـاوەکو شەیتانی دەبێت یاخود خەودەبینێت و پێـدەگات، وە لەسـەرخۆش تـاوەکو هۆشـی دێتەوە سەر خـۆی، وە لـە خـەوتوو تـاوەکو بـەئاگا دێتـەوە)). وە خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّـا عَرَضْـنَا الأَمَانَـةَ عَلَـى الـسَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَـالِ فَـأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا﴾ (الأحزاب: ٧٢).

واتـە: ((بێگومـان ئێمـە ئـەم ئەمانەتـەمان (ئەمانـەتی قورئـان) نیـشانی ئاسمانەکانی و زەوی کێوەکاندا، (یاخودپێشنیارمان کرد ئێوە ئەم ئەمانەتـە بگرنـە ئەستۆ)، بەڵام هەموویان دەستیان پێوە ناو ترسان لێی)) پاشان فەرمووی﴿وَحَمَلَهَـا الْإِنسَانُ﴾، واتە: ((کەچی ئادەمیزاد هەڵیگرت و گرتیە ئەستۆی خـۆی)) ئەمانـەت ئا لێرە دا پەیمان و بەڵێنە، جـا قەدەغـەبوونی ئاسمانـەکان و زەوی و کێوەکـان لـە

[298] مسـند أحمد: ١/١٤٠، رة سنن أبي داود: ٤٤٠١.

هەڵگرتنی ئەمانەتەکە لە پێناوی وازهێنانیەتی بۆ عەقڵێك کەوا دەبێت تێبگات و هەستی پێبکات، و هەڵگرتنی ئادەمیزادیش بۆ ئەمانەتەکە کەوا ئەو بوونەوەرەیە عەقڵ و بیر و هۆشی تێدایە.

ووتی: بۆ عەرەبیش مەتەڵێك لە و مانایەدا لەوانە کە دەڵێت:

ضمن القنان لفقعس بشباتها * إنّ القنان لفَقعَس لا يأتلي

لەو بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ* أَوْ تَقُولُواْ إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ﴾(الأعراف: ١٧٢- ١٧٣)، واتە: ((بۆ ئەوەی نەوەکو لە رۆژی قیامەتدا بڵێن: بەراستی ئێمە لە بێئاگابووین!!(١٧٢) یاخود ئەوەك بڵێن: جا ئێمە چی بکەین، بەڕاستی باووباپیرانمان لە پێشدا هاوەڵیان داناوە و ئێمەش نەوەیەك بووین دوای ئەوان هاتین و شوێنیان کەوتین)). بەڵگەش لەسەر ئەو لێکدانەوەیە، چونکە خوای دەزانێت کەوا ئەو پەیمان و وەرگرتنە لەسەریان تاوەکو نەڵێن: وای لەرۆژی قیامە ئێمە لەمە بێئاگا بووین، وە بێئاگایش لێرەدا دەستبەردار نەبووە، لەبەر یەکێك لەم دوو رووانە:

یان دەبێت لە بارەی رۆژی قیامەت بێت، یاخود لە بارەی پەیمان وەرگرتن، جا بەڵام لەبارەی رۆژی قیامەت خوای گەورە لە کتێبەکەیدا باسی نەکردووە کەوا پەیمان و بەڵێنی لێ وەرگرتن بۆ زانینی زیندوو بوونەوە و لێپێچینەوە، و بەڵکو باسی کردووە تەنها بۆ ئەوەی بیزانن، بەڵام وەرگرتنی پەیمان جا منداڵان و کەوتووان ئەو پەیمانەیان لێ وەرگیراوە ناکۆك و جیاوازکاران ووتوویانە،جا ئەوانە پاش ئەوەی پەیمان و بەڵێنان لێوەر گرتن پێیان ڕانەگەیەنرا وا ڕاگەیەندراوێك کەوابیێتەبێئاگاییەك جا قسەی تێدا بکەن و ئینکاری بکەن. جا ئەو بێئاگاییەکەی لەوان دەبێت، و باسی شتێکی کردووە ناشێت نەبێت و ناشبێت مەحاڵیش بێت،

خوای گەورە و میهرەبان دەفەرموویّت: ﴿أَوْ تَقُولُواْ إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ﴾ (الأعراف: ١٧٣).

جا ئەو بیّ باوەڕیش دەسبەردارنابن کەوا وەریانگرتووە بەوەی بە خۆیان لەوان بوون یاخود لە بارو باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە . جا ئەگەر لەباوباپیریانەوە بیّت ئەوا بیّ باوەڕنابن تاوەکو دەگەنە بلوغی و پیّگەیشتن و سەپاندنی جیّگیری و دامەرزاوی بەڵگەی بیانوو لەسەریان، چونکە منداڵ لە بیّ باوەڕان نابیّت، کەسیش تاوانی کەس هەڵناگریّت﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (الأنعام: ١٦٤)، واتە: ((هیچ کەسیّك باری گرانی تاوانی کەسی تر هەڵناگریّت)). هەوەك خوای گەورە لە قورئاندا وای فەرمووە، ئەمەش پیّچەوانەی ئەوەنیە کەوا لە پیّغەمبەر(د.خ) ریوایەتی کراوە ((إن الله مسح ظهر آدم، وأخرج منه ذريتَهُ فأخذ عليهم العهد))، واتە: ((بیّگومان خودای گەورە دەستی قودرەتی بە پشتی ئادەم داهیّنا، و نەوەکانی لەپشتدا دەرچوواند ئینجا پەیمان و بەڵیّنی لیّیان وەرگرت)). ئەمەش ریّك هاو شیّوەیە بە گیّرانەوەیەك کە خوای پەروەردگار دەفەرموویّت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّيْنَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ﴾ (آل عمران: ٨١)، واتە: (( (یادیان بیّە) کاتیّك خوا پەیمانی لەیەکە یەکەی پیّغەمبەران وەرگرت کاتیّك کتیّب و دانایی پیّبەخشین بەوەی کە ئەگەر: لە ئایندە دا پیّغەمبەریّکم بۆ ڕەوانە کردن و بە ڕاستدانەری ئەوەی ئیّوەش بوو، ئەوە دەبیّت باوەڕی پیّ بهیّنن)). جا خودای میهرەبان ئەوەی کرد کەوا لەسەر پیّغەمبەرانی دابەزاند لە کتیّب و دانایی پەیمانیشی لیّوەرگرتن پاش ئەوان لە ئومەتەکانیشیانی وەرگرت، ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەری: ﴿ثُمَّ جَاءكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ﴾(ال عمران:٨١)، واتە: ((لە ئاییندەدا پیّغەمبەریّکم بۆ ڕەوانەکردن و بەڕاستدانەری ئەوەی ئیّوەش بوو، ئەوە دەبیّت باوەری پیّ بهیّنن و

پشتگیری بکەن)). پاشان بە ئوممەتەکانی فـەرموو: ﴿أَأَقْـرَرْتُمْ وَأَخَـذْتُمْ عَلَـى ذَلِكُـمْ إِصْرِي قَالُواْ أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُواْ وَأَنَاْ مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾ (ال عمران:٨١)،

واتە: ((ئایا بڕیارتانداو پەیمانی منتان بەو جۆرە وەرگرت کە پـێم ڕاگەیانـدن؟ ووتیان: بڕیارماندا و (هەروا دەکەین) ئەو سا خواپێی فەرموون: دە بەشایەت بـن و منیش لە گەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان)).

جا خودای بەخشندەی میهرەبـان بـە ئوممەتـەکانی ڕاگەیانـد لەوکتێبـەی کـە دایبەزاندووەتەســـەر پێغەمبـــەرەکانیان بەهانەیـــە کـــە لەســـەریان وەك پـــەیمان لێوەرگرتنیان، وە بڕیاریشی لێوەرگرتن بە زانست و زانین دەربارەیان.

ووتم: هەروەها هاو شێوەکەشی ئەم فەرمودەیەیە: ﴿وَاذْكُرُواْ نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَاقَهُ الَّذِي وَاثَقَكُم بِهِ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ (المائدة: ٧)، واتە: ((یـادی نـازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، هەروەها ئەو پەیمانەش کە پێویستە ئێوە پابەندی بن لە بیرتان نەچێت کەوتووتانە: گوێڕایەڵ و ملکەچ و فەرمانبەردارین)). جـا ئـەو پەیمانەیە کەوا لێ ی وەرگرتن پاش ئەوەی پێغەمبەرەکانی بۆ ڕەوانە کردن بە بـاوەڕ پێ هێنان پێی و پشتگیری کردنیشی. و هاوشـێوەکەش ئـەم فەرمودەیـەی خـوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَلاَ يِنقُضُونَ الْمِيثَـاقَ﴾ (الرعـد: ٢٠)، واتە: ((ئەوکەسانەن وەفا دەکەن و بەئەمەکن لەبەرامبەر ئـەو پەیمانـەوە کـە هەیانـــە لەگـــەڵ خـــوای پـــەروەردگار داو، ئـــەو پەیمانـــەش ناشـــکێن و بـــەلێن هەڵناوەشێننەوە..))، وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ أَعْهَـدْ إِلَـيْكُمْ يَـا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُـدُوا الـشَّيْطَانَ إِنَّـهُ لَكُـمْ عَـدُوٌّ مُّـبِينٌ* وَأَنْ اعْبُـدُونِي هَـذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ (یس: ٦٠- ٦١)، واتە: ((ئەوسا خـوای گـەورە گلـەیی لـە یاخیـەکانی نەوەی ئادەم دەکات و دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم" مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن" چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکراتانە* بەڵکو تەنها مـن بپەرستن کە هەر ئەمەیە ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست))، جا ئەمە پەیمانی ئـەوە

بۆیان لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی، وەك ئەو نموونەیەی خوای گەورە بۆ نەوەی ئیسرائیلی فەرمووە: ﴿وَأَوْفُواْ بِعَهْدِي أُوفِ بِعَهْدِكُمْ﴾ (البقرة: ٤٠)، واتە: ((پەیمانەکەم جێ بەجێ بکەن (کە ئیمان و کردەوەی چاك و باوەڕکردنە بە هەموو پێغەمبەران بەبێ جیاوازی) ئەوسا منیش پەیمانی خۆم بەجێ دەهێنم (کە جێ نشین کردنتانە لە دونیا و، بەهەشتی بەرینە لە قیامەتدا) ))، وە نموونەی ئەمەش: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ﴾ (آل عمران: ١٨٧)، واتە: (( (یاد بێنەرەوە) کاتێك خوا پەیمانی وەرگرت لەوانەی کتێبیان پێ بەخشراوە کە ڕوونی بکەنەوە بۆ خەڵکی و مەرامەکانی باس بکەن و نەیشارنەوە))، هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا﴾ (الأحزاب: ٧)، واتە: (( (بیریان بخەرەوە کە ئێمە) پەیمانمان لە پێغەمبەران وەرگرتووە پەیمانی یەکتاپەرستی، پەیمانی گەیاندنی بانگەوازی خوا، بەتایبەت لەتۆ ئەی محمدﷺ و لە نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسای کوڕی مەریەم، بێگومان پەیمانێکی بەهێزو پتەومان لێ وەرگرتن...))، بەڵێنێك کەوا لەدوای ڕەوانەکردنیان لێیان وەرگرتن هەروەك لە ئومەتەکانیانی وەرگرت لە دوای ئاگادار کردنەوەیان، وە ئەو بەڵێنەش خودای پەروەردگار نەفرەتی لەو کەسە کردووە کەوا پەیمانەکە ناباتە سەر و هەڵیدەوەشێنێتەوە و سزای دەدات بەم فەرموودەیە: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً﴾ (المائدة: ١٣)، واتە: ((جا بەهۆی ئەوەوە کە نەوەی ئیسرائیل بەردەوام پەیمان و بەڵێنەکانیان دەشکان، نەفرەتمان لێکردن و دڵەکانیانمان ڕەق و سەخت و ڕەش کرد)).

جا لەبەر ئەوەی بەڵێنەکانیان شکاند خوای گەورە سزایان دا و ئەوانەی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکان پەیمانیان وەرگرت بەڕاست و دروستی ووتیان کەوا خوای گەورە ئیشارەتی پێداون: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُواْ مَا

آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (البقره: ٦٣)، واته: ((يادی ئەو نیعمەتەش بکەنەوە کاتێك پەیمان لێوەرگرتن (کە پەیڕەوی تەورات بکەن) و کێوی طورمان بە ڕاسەرتانەوە ڕاگرت و پێمان وتن: ئەو بەرنامەیەی پێمانداون بە توندی بیگرن (ئەگینا ئەم چیایە دەدەین بەسەرتاندا): هەمیشەش با لەبیرتان بێت چی تێدایە و چیتان لێدەخوازێت، بۆ ئەوەی لە خواترس و پارێزکاربن)).

وە ڕێکخستنی ئایەتەش لە ڕاستیدا بەڵگەیە لەسەر ئەمە لە چەند ڕوویەکی جۆراوجۆر:

یەکەم: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وإذا أخذ ربك من بنيّ أدم﴾ نەیفەرمووە: ئادەم، وە ئەوەی ئادەمیش تەنها ئادەم نیە بەڵکو جگە لە ئادەمە.

دووەم: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿من ظهورهم﴾ وە نەیفەرمووە: ((ظهر)) واتە پشت، وە ئەمەش خستنە بری هەندێکە لە گشتی، یاخود خستنە بری و لە جێدانانی شمولیە، وە ئەوەش باشترە.

سێیەم: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذريتهم﴾ وە نەیفەرمووە ((ذريته)) واتە نەوەکەی.

چوارەم: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وأشهدهم على أنفسهم﴾ واتە: کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە.

پێنجەم: خوای گەورە هەواڵی داوە کەوا حیکمەت لەو شایەتی دانە هەڵگرتنی بڕو بیانووە لەسەریان تاوەکو نەڵێن: وای لە ڕۆژی قیامەت" ئێمە لەو کارە بێئاگابووین. هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رُّسُلاً مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ (النساء: ١٦٥)، واتە: ((پێغەمبەرانمان (ڕەوانە کردووە) کە موژدە دەرن (بە ئیمانداران) و ترسێنەرن بۆ (یاخیەکان)، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت (لەسەر بێ دینی و یاخی بوونیان) دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون)).

شەشەم: بەمە بەبیریان بهێننەوە ئەگەر نا دەڵێن: وای لە ڕۆژی قیامەت: ﴿إنا كنّا عن هذا غافلين﴾ ئاشكرایە ئەوان بێئاگان لەوەی كەوا هەموویان لەپشتی ئادەم دەرهێنراون و هەمووشیان لـەو كاتـەدا شـایەتیان داوە، جـا ئەمـە كـەس بـەبیری نایەتەوە.

حەوتەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ تَقُولُواْ إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ﴾ (الأعراف: ١٧٣)، جـا لـەو پێناسـەو شـایەتی دانـە باسـی دوو حیكمەت دەكات، یەكەمیان: بۆئـەوەی لێنەگـەڕێن بـێ ئاگـا بـن، وە دووەم: بـۆ ئەوەی لێنەگەڕێن لاسایی كەس بكەنەوە، جا كەسی بێئاگا هەست و شعووری نیە، و لاسایی كەرەوەش شوێنی كەسی لاسایی دەكەوێت.

هەشـتەم: خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿أَفَتُهْلِكُنَـا بِمَـا فَعَـلَ الْمُبْطِلُـونَ﴾ (الأعـراف: ١٧٣)، واتـە: ((ئایـا تـۆ لـەناومان دەبـەیت بـەهۆی ئـەوەی كـە پێشێلكارانی هەق كردوویانە؟))، واتە: ئەگەر بـەنكۆڵی كـردن و هاوبەشـی پەیـدا كردنیان سزادرابان دەیانووت: ئا ئەمەیە، ئەو پەروەردگارەیە لە ڕاسـتیدا لـەناویان دەبات بەهۆی سەرپێچی كردنیان بۆ پێغەمبەرەكـەی و بـە درۆ خـستنەوەیان، جـا ئەگەر لەناوی بردن بەهۆی لاسایی كردنەوەی باووباپیریان لە هاوبەشی پەیداكردنـدا بەپێی هێنانی بەڵگەیەك لەسەریان بە پێغەمبەرەكان ئەوا لەناویان دەبـات بـەهۆی ئەوەی پێشێلكارانی هەق كردوویانە. یاخود لەناویان دەبـات لەگـەڵ بێئاگابوونیـان لەبـەر زانینـی بـێ سـوودی و بـێ كـەڵكی كـەوا لەسـەری بـوون. خـوای گـەورە ڕایگەیانـدووە كـەوا گونـدێك یـان شـارێك بـە زوڵمەكـەیان لـەناو بـەبن ئەگـەر دانیشتووانەكەیان بێئاگابوون، و بەڵكو لـەدوای ئاگاداركردنـەوەو ووریاكردنـەوەیان لەناویان دەبات.

نۆیەم: خوای گەورە هەریـەكێكی لەسـەر خـۆی كردۆتـە شـایەت كـەوا ئـەو پەروەردگار و دروسـتكاریەتی، وە پـەیمانی بەسـەردا كـردوون بـەو شـایەتی دانـە

لەشوێنێکی دیکە دا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾ (الزخرف: ٨٧)، واتە: ((سوێند بە خوا ئەگەر لەو خوا نەناسانە بپرسیت: کێ دروستی کردوون، ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێن ((الله)) کەوابوو بەرەو چی و بەرەو کوێ لە ڕێبازی یەکخواناسی لادەدرێن و شوێنی ناحەق دەکەون؟!))، واتە: جا چۆن لە یەکتا پەرستی لادەدەن پاش ئەو بڕیاردانەی ئەوان کەوا خوای گەورە پەروەردگار و دروستکاریانە، جا ئائەمە ئەو پەیمانەیە کەوا شایەتیان داوە، لەسەر خۆیان بە پشت پێ بەستنەکەی، وە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکانی بەبیریان دەهێنێتەوە: ﴿أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ (إبراهيم: ١٠)، واتە: ((ئایا لە خوای پەروەردگاردا گومان هەیە؟! بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی؟!)). جا لەڕاستیدا خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی ئەو دانپیانانە و زانستەیان بیردەهێنێتەوە و هەرگیز باسی دانپیانانی پێشوویان بۆ ناکات لەبارەی دروستکردنیان و پەیمان و بەڵگەشیان لەسەر دانەمەزرێنێ.

دەیەم: خوای گەورە ئەو ئایەتەی دیاری کردووە، و ئەمەش بەڵگەو مەبەستێکی روون و ئاشکراو پێویستیشە بۆ ناوەڕۆك و ماناکەی بەجۆرێك جیاواز ناکۆك نەبێت لەگەڵ ماناکەیدا: ئەمەش کاروباری ئایەتەکانی خوای بەرز و بەتوانایە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَلِكَ نفَصِّلُ الآيَاتِ﴾ (الأنعام: ٥٥)، واتە: ((هەر بەوشێوەیە کە باسکرا بە درێژی (بەڵگەو نیشانەکان) روون دەکەینەوە)).

ئەو ئایەتانەی کە باسکرا ئەوەیە کەوا لە کێشەکەیدا هەموو جۆرە بوونەوەرەکانی ئاشکرا کردووە وە ئەمەش ئایاتێکی لەپۆپەی زانیاری و دەروونیدان، ئایاتێکن لەناو دەروونی خۆیان و گەورەکانیان و دروستکردنیان وە ئایاتێکن لە شارو شارۆچکەو دێهاتەکاندا کەوا خوای گەورە دەیگێڕێتەوە بەوەی کە دەلالەت لەسەر هەبوون و یەکتاپەرستیەکەی و راستگۆیی پێغەمبەرەکانی

دەکات وە لەسەر گەڕانەوە بۆلای ئەو و ڕۆژی زیندوو بوونەوە، لەهەمووشی ئاشکراتر ئەوەی هەر کەسەو شایەتی داوە لەسەر خۆی کەوا ئەو پەروەردگاری و دروستکاری و بەدیهێنەریەتی، خۆشی پەروەردە کراوو دروستکراوو مەخلوومە و ڕوویداوە پاش ئەوەی کە ئەو نەبووە.

ئەم ئایەتەش فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿وإذا أخذ ربّك من بني آدم من ظهورهم ذريتهم﴾ هاوشێوەو چوون یەکە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: ((كل مولود يولد على الفطرة)) [299]، واتە: (هەر منداڵێك کە لەدایك دەبێت لەسەر خووڕەوشتێکی پاك واتە بە ((موسلمانی)) لەدایك دەبێت))، هاوشێوەیە لەگەڵ ئەم فەرموودەیە: ((فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ* مُنِيبِينَ إِلَيْهِ)) (الروم: ٣٠- ٣١). واتە: ((ئەی ئینسان بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە، ڕوو بکەرە بەرنامەو ئایینی خوا و ئەملاو ئەولا مەکە، خەڵکینە ئێوەش پابەندی ئەو نەخشەیە بن کە خوا ئێوەی لەسەر دروست کردووە (واتە قورئان کەتەلۆك و نەخشەی ژیانی ئادەمیزادەکانە لێی لامەدەن)، هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە هیچ نەخشە دروستکراوێکی خودا نی یە، ئا ئەوەیە دینی ڕاست و دروست بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە نازانن* خەڵکینە ڕوو بکەنە پەروەردگارتان، بەملکەچی بگەڕێتەوە بۆ لای)).

حسن کوڕی يحيى الجرجاني دەڵێت، ئەگەر یەکێك نارەزایی دەربڕی لەبارەی ئەو بابەتە بە حەدیسێك کەوا لە پێغەمبەرﷺ ڕیوایەت کراوە، کەوا فەرموویەتی: ((إن الله مسح ظهر آدم فأخرج منه ذريته وأخذ عليهم العهد ثم ردّهم في ظهره)) لە ڕاستیدا مانای پاشان دەیگەڕێنێتەوە بۆ پشتی ئادەم مانای لەدوای مردنیان دەیگەڕێنێتەوە بۆ ناخی زەوی بۆ بەخاکسپاردنی، چونکە ئەگەر

---

([299]) مسلم: (٢٦٥٨).

مردن دەیاننێرێتەوە بۆ زەوی لەبەر ئەوەی ئادەم لە زەوی دروستکراوە و بۆ ئـەویش دەگەڕێندرێتەوە. جا ئەگەر بۆ زەویش گەڕێندرایەوە مانای وایـە ئـادەم و بۆپـشتی گەڕێندراوەتەوە ئەگەر ئادەم لـەو دروسـتکرابێت وە هەنـدێك شـت دەچـێتەوە نـاو شتەکە، جا ئەگەر چوون بۆ لێکدانەوەی ئەو حەدیسە ڕووی دەردەوەی جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو و لەنێوان ئەوەی لە قورئاندا هـاتووە لـەو مانـاو مەبەسـتە دا تـەنها ئەگەر بیەوێت والێکی بداتەوە وەك ئـەوەی ئێمـە باسـمان کـردووە، چـونکە خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ (الأعـراف: ١٧٢)، وە لەگێڕانەوەی چیرۆکەکەدا باسی ئادەم نەکراوە بەڵکو لێرەدا وەپاڵنراوە بۆ پێناسەکردنی نەوەکەی کەوا ئەوان منداڵەکانیەتی، وە لەو حەدیسـەدا: ((إنـه مـسح ظهر آدم)) جا ناکرێت بەرپەرچ بدرێتەوە ئەوەی لە قورئان و لە حەدیسدا هاتووە بۆ لەسەر ڕێککەوتن تەنها بەو لێکدانەوەیەی کەوا باسمان کردن.

جرجـانی دەڵێـت: منـیش دەڵـێم: ئێمـە تـاوەکو ئـەوەی ئایەتەکـەی لـە پێغەمبەرﷺ ڕیوایەت کردووە، وە ئەوەی زانایان و بیرمەندان لـە سـەلەفی صـالح بۆی چوون و لێکیان داوەتەوە نموونەییترین و باشترینیانە.

لەسەر ئەمەش هەندێك هاوەڵانمان لە ئەهلی سەلەف باسیان کردووە لـەبارەی وەڵامدانەوە لەسەر ئەو بێژەرە لەوانەیە لەبارەی لێکدانەوەی ماناکە بـەبێ سـتەم و ڕق لێ بوونەوەو ئینکاری کردن بێت، ئەمەش دەشێت ئەم فەرموودەیە: ((وإذا أخذ ربُّكَ من بني آدم)) سەرەتای هەواڵ پێدانەکـە بێـت لەلایـەن خـودای میهرەبانـەوە لەبارەی پەیمان وەرگرتن لێیانەوە، وە ئەگەر پێویستی بە وەڵامدانەوەش بێـت ئـەوا وەڵامەکەی لەلایەن پەروەردگارەوەیە ﴿قَـالُوا بَلَـى﴾ وە ئـەم گێڕانـەوەی چـیرۆکەش بەتەواوەتی دەپچڕێت، پاشان خودای گەورە بە هەواڵێکی دیکە دەسـتپێدەکات بـە باسکردنی ئەوانەی دەڵێن: کافرەکان لەرۆژی قیامەتدا دەڵێن: ((شَـهِدْنَا)) بـەمانای شایەتی دەدەین، هەروەك الحطیئة دەڵێت:

شَهِدَ الخطيئة حين يلقى ربَّه ※ أنّ الوليدَ أحق بالعُذرِ

به مانای حطيئة شايەتی دەدات، دەڵێت: ئەی پەروەردگار: شـايەتی دەدەيـن لە ڕۆژی قيامـەتدا ئێوە دەڵێن واتـە ((كافرەكـان)): ﴿إِنَّـا كُنَّـا عَـنْ هَـذَا غَـافِلِينَ﴾ (الأعـراف: ١٧٢)، واتە: لەو كاتەی لە لێپێچينەوەو گفت و گۆو بەرپرسيارەتيان بە كوفرەكەيان، پاشان هەواڵێكی ديكەيان بۆ زياد دەكات و دەفەرموێت ﴿أَوْ تَقُولُـواْ﴾ بەمانای: لەڕاستيدا دەڵێن: چونكە ((أو)) بـەمانای: واوی ڕێكخـستن و دڵنياييـە، وەك ئەوەی خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿وَلَا تُطِعْ مِـنْهُمْ آثِمًـا أَوْ كَفُـورًا﴾ (الإنـسان: ٢٤)، واتە: ((نەكەيت ملكەچ و فەرمانبەرداری تاوانباران و بێباوەڕان بيت))، جـا لێكدانەوەكەی: وە شايەتی دەدەين لە ڕۆژی قيامەتدا دەڵـێن: ﴿إِنَّمَـا أَشْـرَكَ آبَاؤُنَـا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ﴾ (الأعراف: ١٧٣)، واتە: ئەوان هاوبەشيان بـۆ خـوا پەيدا كردوو ئێمەشيان لە منداڵيمانەوە لەسەر ڕێبازەكەيان هەڵگرت لـە هاوبەشـی پەيدا كردن، جا ئێمەش لەسەر ڕێبـازو بەرنامـەی ئەوانـدا ڕۆيـشتين، و پـەيڕەويمان كرد، جا تاوان و گوناح بۆ ئێمە نيە ئەگەر ئێمە بەشوێن ئەواندا كـەوتووين بـەڵكو تاوان گوناح بۆ باووباپيرانمان، ووتيان: ﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَـارِهِم مُّقْتَـدُونَ﴾ (الزخرف: ٢٣)، واتە: ((ئێمە باو و بـاپيرانی خۆمـان بينيـووە پابەنـدی بيروباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەكەين و پەيڕەوی ئەوان دەكەين)). جا ووتەكانيان بەڵگەيە لەسەر ئەمە: ﴿أَفَتُهْلِكُنَـا بِمَـا فَعَـلَ الْمُبْطِلُـونَ﴾ (الأعـراف: ١٧٣)، واتـە: ئێمـەيان لەگـەڵ خۆيانـدا هـەڵگرتووە لەسـەر كـوفر و هاوبەشـی پەيـداكردن، جـا گێڕانـەوەی چـيرۆكی يەكـەم هەواڵێكـە لـەبارەی هـەموو دروستكراوەكان بە وەرگرتنی پەيمان لێيان، وە گێڕانەوەی چيرۆكی دووەم هەواڵەكەی ئەوەيە كە دەڵێت: كافرەكان لە ڕۆژی قيامەت دا لەپاسـاو هێنانـەوە و داواكردنـی لێبووردن دان.

ئەوەی بانگەوازی ناکۆکی و جیاوازی دەکات دەڵێن: کەوا جیاوازی لەوەی نێوان کتێب و هەواڵەکە بەهۆی جیاوازی ووشەو دەربڕینەکانیان کەوا دوو ووتەی تێدایە پێویستە بە هاوشێوەو هاو جووت قەبوولی بکەیت وە تێبپەڕێنی کەوا لێی ئاشکرا بوو بەهۆی جیاوازییەکەی، وە هەروەها ووشەکان ئەگەر لە خودی خۆیدا جیاواز بوو، ئەوا گەڕانەوەکەی بۆ فەرمانێك دەگەڕێتەوە ئەوا پێویست بە جیاوازی ناکات، هەروەك خوای گەورە لەبارەی دروستکردنی ئادەم دەفەرمووێت: جارێك باسدەکات کەوا ئەو لە خۆڵ دروستکراوە[٣٠٠]، وە جارێکی دیکە ئەو لە قوڕێکی ووشك و ڕەشباو و ترشاو دروستکراوە[٣٠١]، وە جارێکی دیکەش دەفەرمووێت لە قوڕێکی پتەو دروستکردووە[٣٠٢]. وەجارێکی تریش لە قوڕێکی ووشك وەك فەخفووری[٣٠٣]، ئینجا ئەم ووشانە لە ووشە و ماناکانی جیاوازن و هەروەها لە حاڵەت و بارە جیاوازەکان کەوا قوڕی ڕەشبا و وەك قوڕی پتەو نیە وە قوڕی پتەویش وەك خۆڵ نیە، کەواتە تەنها و تەنها گەڕانەوە کە هەمووی لە ڕەسەنەکەدایە بۆ یەك گەوهەر و کرۆکە، و ئەویش خۆڵەکەیە، وە لە خۆڵەکەش ئەم حاڵەت و بارانە دروست بوون.

فەرموودەی خوای گەورە ﴿وإذ أخذَ ربُّكَ من بني آدَمَ مِن ظهورِهم ذُرِّيَّتُهم﴾، فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: ((إن الله مسح ظهر آدم فاستخرج منه ذريته)) لە بنچینەدا یەك مانای هەیە تەنها ئەوەیە کە فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ: ((مسح ظهر آدم)) زیادەو خستنە سەرە لە هەواڵەکە لەلای خودای گەورەوە، و خودای گەورە دەستی قودرەتی بە پشتی ئادەمدا و نەوەکەی لێ دەرچوواند دەستی پیا داهێنا بۆ دەرکەوتنی نەوەکانی و دەرهێنانی نەوەکانیان لە پشتی ئەواندا

---

(٣٠٠) سەیری: ئایەتی (٥٩) لە سورەتی ((آل عمران)) بکە.

(٣٠١) سەیری: ئایەتی (٢٨) لە سورەتی ((الحجر)) بکە.

(٣٠٢) سەیری: ئایەتی (١١) لە سورەتی ((الصافات)) بکە.

(٣٠٣) سەیری: ئایەتی (١٤) لە سورەتی ((الرحمن)) بکە.

هەروەك خوای گەورە باسی کردووە، چونکە ئێمە زانیوومانە و فێر بووین کەوا گشت نەوەی ئادەم لە بڕبڕەی پشتیدا نەبوون، بەڵام کاتێك هاوجووتی یەکەم لە بڕبڕەی پشتیدا بوو، پاشان دووەم لە بڕبڕەی پشتیدا یەکەم، پاشان سێ یەم لە بڕبڕەی پشتی دووەم بووە، دروستە کە هەموو ڕەگەزە بگەڕێتەوە بۆ پشتی ئادەم، چونکە ئەوان لقی ئەوون و ئەویش بنچینە و سەرەکیەکەیانە.

هەروەك چۆن دروستە ئەوەی خوای گەورە باسیکردووە: کەوا ئەو نەوەی ئادەمی لە پشتی ئادەم دەرهێناوە دروستیشە کەوا پێغەمبەرﷺ ئەوە باسی کردووە: خوای گەورە لەپشتی ئادەمدا لە پشتی نەوەکانیشی دەرهێناوە، کەواتە لق و ڕەسەن یەك شتە، هەروەها خوای گەورە کاتێك لە هەواڵەکەدا نەوەکەی خستە پاڵ ئادەم لەوانەیە هەواڵەکە لەبارەی نەوەکەو لەبارەی ئادەمەوە بێت.

هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ لَهَا خَاضِعِينَ﴾(الشعراء: ٤)، واتە: ((جا بەردەوام گەردەنیان بۆی ملکەچ و زەلیل دەبێت)) هەوڵەکە لە دیوی دەرەوەی لەبارەی گەردەنەکانە، و باس کردن و پیاهەڵدانەکەش بۆ ناولێنراو هاتووە، وە ئەمەش وەپاڵنراوە هەروەك چۆن ئادەم لەوێدا وە پاڵنرابوو.

***

## (لەبارەی هەندێ قسەی پێشینە و پاشینە لە مانای ئایەتەکە)

جا ئەمە هەندێ قسەی پێشینەیە لەبارەی ئایەتەکە، و لەگەڵ هەموو هەڵسەنگاندن و گرنگی پێدانێك، هەر بەڵگەنیە لەسەر دروستکردنی ڕۆحەکان پێش جەستەکان دروستکردنێکی جێگیر و چەسپاو، لە ڕاستیدا دەلالەت دەکات لەسەر وێنەکانیان و نیشانەکانیان لە وێنەو شێوەی مێروولەی وورد و قسەپێکردنیان پاشان گەڕاندەوەیان بۆ ڕەسەنەکەیان کەوا ئەمەیە دروستی

هەواڵەکە، وە ئەوەی دروستە لە ڕاستیدا جێگیر بوونی قەدەر و چارەنووسی ڕابردوە وە دابەش کردنیانە بۆ بەدبەختی و کامەرانی.

بەڵام بۆ ساخکردنەوەو تێگەیشتنی ئەبی محمد کوڕی حزم لەبارەی ئەم فەرموودەیە: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ﴾ (الأعراف: ١١)، واتە: (سوێند بە خوا ئێمە (باوە گەورەی) ئێوەمان دروستکردو نەخش و نیگاری ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێز و بەفەرمانی خوا)))، جا ئەو دەرکەوتنە گونجاونیە بە ڕووکەشیەکەی بۆ ئامادەکردنی فەرمانەکە بە سوژدەبردن بۆ ئادەم لەسەر دروستکردنمان و وێنەکێشانمان، وە ئاخاتنەکەش بۆ پێکهاتووە گشتیەکەیە لەلاشەو لە ڕۆحدا، و ئەمەش دوا کەوتووە لە دروست کردنی ئادەم دا، وە لەبەر ئەمەش ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ﴾ واتە: ئادەم ﴿ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ﴾ بۆ نەوەکەیەتی، و نموونەی ئەمەش مجاهد دەڵێت: ﴿خَلَقْنَاكُمْ﴾ بە ووشەی دەربڕینێکی گشتیە.

ئەبو عبید لەو ئایەتەدا وتە مجاهدی هەڵبژاردووە لەبارەی ئەم فەرموودەیە: ﴿ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ﴾ وە فەرموودەی خوای گەورە بۆ فریشتەکان: سوژدە بەرن ئەوان پێش دروستکردنی نەوەی ئادەم بووە وە وێنەکێشانیان لە منداڵدانەکاندا، و پاشان پێویستی بە لەسەرەخۆیی و ئامادە کردن هەبوو، جا هەرکەسێ وایزانی و واتێگەیی کە دروستکردن و وێنەکێشان لەو ئایەتەدا بۆ منداڵەکانی ئادەمە لە منداڵدانەکاندا دەبێت ڕەچاوی حوکمی ﴿ثُمَّ﴾ کردبێت لە ئامادەکردن و ڕێکخستندا دەنا ئیلا ووتەی ئەخفەش کاری تێدەکاتن کەوا دەڵێت: ﴿ثُمَّ﴾ ئالێرەدا مانای: واو دەگەیەنێت.

زجاج دەڵێت: ئەمەش هەڵەیە نە خلیل و نە سیبویە بە گونجاوی دانانێن و هەموو ئەوانەی متمانەی بە زانستەکەی هەیە، ئەبو عوبید دەڵێت: مجاهد ئاشکرای

کردووە کاتێك ووتی: خـوای گـەورە وەچـەی ئـادەمی دروسـتکرد و لـە پـیشتیدا وێنەیانی کێشا، پاشان لەدوای ئەمە فەرمانی کرد بە سوژدەبردن، دەڵێت: ئەمـەش لە حەدیسەکەدا دیار و ئاشکرایە، وە ئەو ئەوانی لە پـشتیدا دەرهێنـا لـە وێنـەی مێروولەی وورد.

ووتم: قورئانیش هەندێکیان هەندێکی لێکداوەتەوە، هاوشێوەی ئەم ئایەتـەش خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ (الحج: ٥)، واتە: ((ئـەی خەڵکینـە ئەگـەر ئێـوە گومانتان لە زیندوو بوونەوە هەیە، ئەوە چاك بزانن کە ئێمە سـەرەتا ئێوەمـان لـە خاك و خۆڵ دروستکردووە، لەوەودوا (نـەوەکان) لـە نوتفەیـەك پەیـدا بـوون))، وە خوای گەورە ئاخاوتن لەگەڵ کەسێك دەکـات بـوونی هـەبێت و مەبەسـتیش: بـاوو باپیریانە هەروەك ئەم فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ (البقرة: ٥٥)، واتە: ((یـادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە ووتتان: ئەی موسا هەرگیز باوەڕت پـێ نـاهێنین تـاوەکو بەئاشکرا و بەچاوی خۆمان خوا نەبینین، ئیتر یەکسەر هەورە بروسـکەکە لێـی دان، لەکاتێکـدا کـە تەماشـاتان دەکـرد و بـە دەوروبـەری خۆتانـدا دەتـانڕوانی (بـە سەرسامیەوە بیرتان دەکردەوە))). هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَاحِدٍ﴾ (البقـرة: ٦١)، واتە: ((یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێـك بە موساتان ووت: ئێمە هەرگیز لەسەر یەك جۆر خۆراك ئۆقرە ناگرین و بـە تـەنها جۆرێك خواردەمەنی ڕازی نابین))، هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا﴾ (البقرة: ٧٢)، واتە: ((یاد نیعمەتی ئاشکرابوونی بکوژەکـە بکەنـەوە) چـۆن کاتێك کەسێکتان کوشت و یەکسەر ئاژاوە لە نێوانتانـدا پەیـدابوو)). وە هـەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ﴾ (البقـرة: ٦٣)، واتـە: ((یادی ئەو نیعمەتەش بکەنەوە کاتێك پەیمانمان لێوەرگرتن (کـە پـەیڕەوی تـەورات

بکەن) و کێوی طورمان بە ڕاسەرتانەوە ڕاگرت)) ئەمەش لـە قورئانـدا زۆرە کـەوا خوای گەورە قسەیان لەگەڵدا دەکات و مەبەستیش لێـی: باووباپیریانـە، جـا ئـاوا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ﴾ (الأعـراف: ١١)، واتە: (سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە (باوەگەورەی) ئێوەمـان دروسـت کـرد و پاشـان نـەخش و نیگـاری ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشا)). بەڕاسـتی خوای گەورە لە باسکردنی کـەس و باسکردنی تایبەتـدا لادەدات و دێـت باسـی جۆرەکـە دەکـات وەك دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ۞ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾ (المؤمنون: ١٢- ١٣)، واتە: ((سوێند بە خـوا ئێمـە بەڕاسـتی ئادەمیزادمـان لـە ئاوێتەیەکی پێکهاتوو لە قوڕ بەدیهێناوە۞ لەوەودوا لەجێگایەکی پارێزراو و لـەبار دا (کە منداڵدانی دایکە) لە شێوەی نوتفەیەکی زۆر بچووکدا دامان مەزراندووە))، دروستکراوەکەش لە پێکهاتوویەکی قوڕی ئـادەم دروسـتکراوە، وە دامەزراوەکـەش نوتفەیەکە لە جێگایەکی پارێزراو کەوا نەوەکەیەتی.

وەلاّم دروسـتبوونی ڕۆحـەکان لـەپێش لاشـەکان بـە دوو هـەزار سـاڵ ئەمـە ئیسنادەکەی دروست نیـە ئەمـەش عەتەبـەی کـوڕی سـکین لەباسـەکە دواوە، دار قطني دەڵێت: واز لێهێندراوە یاخود دەست لێ هەڵگیراوە. وە أرطـأة کـوری منـذر دەڵێت: ئیبن عدی ووتوویەتی: هەندێ حەدیسـەکان هەڵەیە .

( لەبارەی کەوا دروستبوونی ڕۆح دواکەوتووە لە درووست بوونی لاشە )

بەلاّم سەلماندن لەسەر ئەوەی درووست بوونی ڕۆحەکان دواکەوتووە لـە درووسـت بوونی لاشـەکانی لەچەند ڕوێکەوەیە: یەکێکیان : درووست بوونی باوکی ئـادەمیزاد وە بنچینەکەیان ئاوابووە، خودای پەروەردگار جوبرئەیلی نارد چـەنگێك خـۆڵی لـە زەوی برد ، پاشان لەگەڵ ئاوێکی ترش و تێکەڵی کردتاکو بووە قوڕ، پاشـان وێنـەو نیگاری کێشا ،پاش ئەوەی وێنەی کێشا لەڕۆحدا فووی پیاکرد جا کاتێك ڕۆحەکـە

چووه ناو لاشەکەوه بووه گۆشت و خوێنێکی زیندوو و قسەکەر ، لە تەفسیری ئەبی مالیك و ئەبی صالح داهاتووه ، لە ئەبی عەباس دەگێڕنەوه ، ئەویش لە مورە ئەویش لە ئیبن مەسعود ، ئەویش لە خەڵکانێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، کاتێك خوای گەورەو میهرەبان لە کارەکەی بووەوه لە درووست کردنی ئەوەی ئەو دەیویست چۆوه سەر عەرش جا ئیبلیسی کردە فریشتەیەك لەسەر ئاسمانی دونیا ، قەبیلەیەك لە فریشتەکان پێیان دەووتن جنۆکە ، لە ڕاستیدا ناویان لێنا جنۆکە ، چوونکە ئەوان دەرگاوانی ئەهلی بەهەشت بوون ، وە ئیبلیسیش لەگەڵ فریشتەیەکی دیکە دەرگاوان بوو ، جا لەناو سینگی شتێك ڕوویداو کاری تێکردو ووتی: خوای گەورە ئەوەی نەبەخشیوەتە من تەنها بۆ گەورەیی و چاکی من نەبێت ، لە دەربڕینێکی دیکەدا ، لەبەر ئەوەی منی بە گەورەترو باشتر داناوە لەسەر فریشتەکان ، کاتێك ئەو گەورەییەو خۆ بەزل زانینەی لە دەروونیدا پەیدابوو خودای گەورە زانیاری لە بارەی ئەمەوە هەبوو ، ئینجا بە فریشتەکانی فەرموو ، ﴿ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً ﴾(البقرة: الآیة/٣٠) واتە:(بەڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێك دابنێم بۆ ئاوەدانی و دینداری)، ووتیان ئەی پەروەردگاری ئێمە بارووگوزەرانی جێنشینەکە لە زەویدا چ دەبێت و لەزەویدا چی دەکەن ، خوای گەورە فەرمووی ئەوەی لێ پەیدا دەبێت و ئەوانە لە زەویدا خراپەکاری دەکەن و حەسادەت و بەخیلی لەناو یەکتریدا دەکەن و هەندێك هەندێکیان دەکوژن ، ووتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾(البقرة: الآیة ٣٠)،

واتە: ﴿فریشتەکان ووتیان ئایە کەسێکی تێدا دەکەیتە جێنشین کە خراپەو تاوانی تێدا بچێنێت و خوێنڕێژی تێدا ئەنجام بدات؟! لەکاتێکدا ئێمە تەسبیحات و سوپاسو ستایشت دەکەین و قەدرو ڕێزی تۆ چاك دەزانین و بەدوورت دەگرین لەو

شتانەی کە شایستەی تۆنین ( لەوەلاَمیاندا) خوا فەرمووی : بێگومان ئەوەی ئێوە نایزانن من دەیزانم ﴾ واتە: لەبارەی کارو مەبەستی ئیبلیسە.

ئینجا خوای گەورە جوبرەئیلی نارد بۆ زەوی بۆ ئەوەی لەوێدا خۆڵ بهێنێت، زەوی ووتی من خۆم لەتۆ بە خوای گەورە دەپارێزم کەوا چنگم لێبدەی، ئینجا جوبرەئیل گەڕایەوەو خۆڵەکەی نەهێنا و ووتی: ئەی پەروەردگار ئەو خۆی بەتۆ پاراست و منیش داوای لێبوردنم لێی کرد ئینجا میکائیلی نارد ، ئەو خۆی لەویش پاراست ، ئینجا خوای گەورە فریشتەی گیان کێشانی نارد ، زەوی خۆی لەویش پاراست ، فریشتەکە ووتی : منیش خۆم لەخوای گەورە دەپارێزم کە بگەڕێمەوە فەمانەکەی زەوی جێ بەجێ نەکرد ، ئینجا لەڕووی زەویدا چنگێك خۆڵی هێناو تێکەڵی کرد ، خۆڵەکەی تەنها لە یەك شوێن نەهێنا ، بەڵکو لە خۆڵێکی سوورو سپی و ڕەشی هێنا ، لەبەر ئەو هۆیەش ئەوەی ئادەم بەڕەنگ و شێوەی جیاواز دەرکەوتوون، جا بەرزی کردەوە بۆ بەردەمی پەروەردگار تاوەکو کردی بە قوڕێکی پەیت و پتەو ، وە پتەویش ئەو شتەیە کەوا بەتوندی یەکتر دەگرێت ، پاشان خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ طِينٍ ۞ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴾ (ص: ٧١، ٧٢ )

واتە : (من دەمەوێت بەشەرێك لە قوڕ درووست بکەم ، جا کاتێك درووستم کرد لەو گیان و روحەی کە من خاوەنی ئەوم ، فووم پێداکردو ژیان و گیانم پێبەخشی ئێوەی فریشتە هەمووتان سوژدەی ڕێزو تەقدیری بە فەرمانی من بۆ بەرن )).

خوای گەورە بەدەستی قودرەتی خۆی درووستی کرد بۆئەوەی ئەندازەی خۆ بەزل زانینی ئیبلیس لەبارەیەدا دەرکەوێت بۆ ئەوەی پێی بڵێت: خۆت بەگەورەتر دادەنێیت لەوەی من بەدەستی خۆم کردوومە وەمن خۆم بەگەورەیی بەسەر ئەودا ناکەم، جا بەشەرێکی درووست کردبوو لاشەیەك لە قوڕ بە درێژایی چل ساڵ ، جا

فریشتەکان بەلایدا تێپەڕین ، کاتێك بینیان لێی ترسان و داچڵەکین و ئەوەی لەهەموویان زیاتر لێی ترسا ئیبلیس بوو ، کاتێ بەلایدا تێدەپەڕی لێدەدا ، لاشەکە دەنگی لێوەهات هەروەك فەخفوری دەنگی لێوەبێت ئەگەر لە قوڕ درووست کرابێت ، جا لەوکاتە خوای گەورە فەرمووی ﴿مِنْ صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ﴾(الرحمن: ١٤)، واتە ((لە قوڕێکی ووشك بوو وەك فەخفوری)).

لەدەمی چووە ژوورەوە وە لە کۆتاییەکەیدا هاتە دەرەوە ، ئینجا بە فریشتەکانی فەرموو : لەمە مەترسن ،خوای گەورە هەر خۆی پایەدارو دەسەڵات دارە و ئەمەش پووت و بێ دەسەڵاتە ، ئەگەر دەسەڵاتی بەسەردا بدەم لەناوی دەبەم ، جا کاتێك ئەو ماوەیە هات کەوا خوای گەورە فوو بە ڕووحەکە دابکات و گیان و ژیانی پێ ببەخشێت بە فریشتەکانی فەرموو : ئەگەر فووم بە ڕۆحەکەدا کردو گیان و ژیانم پێبەخشی ئەوا سوژدەی بۆ بەرن ، کاتێك فووی پیاکرد بە ڕۆحەکەدا رووحەکە لای سەریەوە چووە ژوورەوەو پژمی ، ئینجا فریشتەکان ووتیان بڵێ سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ووتی : سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ، ئینجا خوای گەورە پێی فەرموو: خوای تۆ رەحمت پێ بکات .

کاتێك ڕۆحەکە لە چاوەکانی چووە ژوورەوە سەیری بەروبوومەکانی بەهەشتی کرد، کاتێك لە سکیدا چووە ژوورەوە ئارەزووی خواردنی کرد پێش ئەوەی ڕۆح بگاتە قاچەکانی ، جا هەستایەوە و پەلەی کرد بۆ بەروبوومەکانی بەهەشت ، خوای گەورە لەم کاتەدا فەرمووی ﴿خُلِقَ الْإِنْسَانُ مِنْ عَجَلٍ ﴾ (الأنبياء:٣٧)، واتە: (ئەوەندە ئینسان بەپەلەو تالۆکەیە هەر دەڵێیت، لە پەلەو تالۆکە درووست کراوە)).

یونس کوڕی عبدالأعلی دەڵێت: ئیبن وهب بۆمانی گێڕایەوە ، کەوا ئیبن زەید ووتویەتی : کاتێك خوا ئاگری درووست کرد فریشتەکان زۆر لێی ترسان ، ووتیان:

ئەی پەروەردگاری ئێمە بۆچی ئەو ئاگرەت درووست کردووە ؟ فەرمووی: بۆ ئەوانەی سەرپێچی من دەکەن لەوەی دروستم کردووە .

لەو ڕۆژەدا جگە لە فریشتەکان و زەوی هیچ دروستکراوێکی دیکە نەبوو، بەڵکو لەدوای ئەمە ئادەم درووستکراوە ، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً﴾ (الإنسان:١)، واتە ((بەڕاستی ماوەیەکی زۆرلە ڕۆژگار بەسەر ئادەمیزادا هات کە شتێکی وانەبوو ناو ببرێت))، عومەری کوڕی خەتاب ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا خۆزگەم بەو ڕۆژە پاشان ووتی، وە فریشتەکان ووتیان، ئایە زەمانێك بەسەرمان دادێت تێیدا سەرپێچیت دەکەین؟ هیچ درووست کراوێك نابینین جگە لەمانە فەرمووی، نەخێر من دەمەوێت لە زەویدا درووستکراوێك درووست بکەم، وە تێیدا جێنشینێك دابنێم وە باسی حەدیسەکە دەکات.

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: دەڵێن: خوای گەورە لەهەموو کەس زاناترە ، خوای گەورە ئادەمی درووست کرد پاشان داینا بۆ ماوەی چل ساڵ چاودێری کرد بەر لەوەی فووی پیابکات بە ڕوحەکەدا، تاوەکو بووە قوڕێکی ووشك وەك فەخفوری، وە ئاگریش بەری نەکەوت، خوای گەورە زاناترە جا دەڵێن: کاتێك رۆحەکە کۆتایی هات لەلای سەریەوە چووە ژوورەوە پژمی ووتی سوپاس بۆ خوا.

قورئان و حەدیس و نیشانەکان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا خوای پەروەردگار فووی پیاکردووە بە ڕۆحەکەیدا لەدوای درووستکردنی لاشەکەی ، جا لەو نەفخەیەدا ڕۆحەکە تێیدا ڕوویداوە ، ئەگەرچی ڕۆحەکەی پێش لاشەکەی درووستکراوبووە لەگەڵ کۆی ڕۆحی نەوەکانی کاتێك کە فریشتەکان لەبارەی درووست کردنەکەی سەریان سووڕما ، کاتێك لە درووست کردنی ئاگرەکەش سەریان سوڕماو ووتی : بۆ چ شتێك درووستت کردووە ، ئەمەش ڕۆحەکانی نەوەی ئادەم دەبینێت ئیماندارو کافرو پاك و پیسی تێدایە.

کاتێك ڕۆحی کافرەکان هەموو شوێن کەوتەی ئیبلیس بوون، بەڵکو ڕۆحی کافرەکان پێش کوفرەکەی دروستکراوە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە یاسای کوفری بەسەر سەپاندوون پاش دروست کردن لاشەی ئادەم و ڕۆحەکەی، وە پێش ئەمە کافر نەبووە، جا چۆن دەبێت ڕۆحەکان لەپێشدا کافرو ئیماندار بێت ئەگەر ئەو کاتە کافری نەبێت، وە کوفریش بۆ ڕۆحەکان تووش نایەت تەنها بە ڕازاندنەوەی و هەڵخەڵەتاندنی نەبێت، ڕۆحەکانیش ئەو کاتە کافرە لە ڕاستیدا لەپاش ڕووداوی کوفرەکەی، وا دەڵێن: هەموو ڕۆحەکان ئیماندار بوون پاشان هەڵگەڕانەوە لە دینەکەیان بە هەر هۆکارێك بێت.

لە حەدیسێکی ئەبو هورەیرەدا لەبارەی دروست کردنی گەردوون و زانینی هەواڵ لەبارەی دروستکردنی ڕەگەزەکانی جیهان دروستکردنی ئادەم دواکەوت بۆ ڕۆژی هەینی، وە ئەگەر ڕۆحەکانیش لەپێش لاشەکان دروست کرابوون ئەوا لەکۆی بوونەوەرەکانی جیهان لە شەش ڕۆژدا دروست کران، جا کاتێك هەواڵی دروست کردنەکەی پێنەدان لەو ڕۆژانەدا زانراوە کەوا دروستکردنەکەی لەدوای دروستکردنی ئەوەکەیە، لە ڕاستیدا دروست کردنی ئادەم خۆی لە یەکێك لەناو ئەو شەش ڕۆژانەدا بووە.

ئەگەر ڕۆحیش پێش لاشەی بوونی هەبووە کەوا ئەویش زیندوو و زاناو ئاگادارو توانای قسەکردنی هەبووە وە بیر تیژی و زانینی هەبووە بەم جیهانەدا، هەستی پێکردووە جا بە هەر ڕوویەکەوە بێت.

ئەوەی ناگونجێت کەوا زیندوو و زاناو قسەکەرو زانیار بێت بە خواکەی کەوا ڕۆحەکە لەنێوان کۆمەڵێك ڕۆحدا بووە پاشان دەگوازرێتەوە بۆ ئەو لاشەیە کەوا هیچ هەست بە حاڵەتی خۆی ناکات پێش ئەمە بەهەر ڕوویەك بێت.

هەروەها ئەگەر ڕۆحەکە پێش لاشە بوونی هەبوایە ئەوا زانیارو زیندوو و قسەکەرو عاقڵ دەبوو، جا کاتێك بەلاشە هەڵواسرا پەیوەندی پێوە کردهەموو

ئەمانەی پێوە دیار نەبوو، پاشان هەست و زانست و عەقڵ و قسەکردنی هێواش هێواش بەسەر داهات، جا ئەگەر وابوایە ئەوا دەبووە سەر سوڕهێنەرترین کاروبار کە هەبووە ڕۆحێکی تەواو عاقڵ، لەدواییدا دەگەڕێتەوە بە کەم و کوڕی و لاوازو نەزان، پاشان لەدوای ئەمە ، دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی ، بۆ عەقڵەکەی و هێزەکەی ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لا تَعْلَمُونَ شَيْئاً وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (النحل: ٧٨)، واتە: ((خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن ، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن)).

جا ئەگەر ئەمە قەدەر بێت بۆ ڕۆح پێش دروستکردنی ، لەدواییدا دەرچوبێت بۆ ئەو دونیایە لەسەر ئەو قەردەرەی بۆی نووسراوە، ئێمە ئینکاری کتێب و قەدەرو چارەنووسی ڕابردوو ناکەین بۆی کەلەلایەن خوایەوەیە، هەر چەندە بەڵگە نیشان دەدات لەسەر ئەوەی بەدەستەو کۆمەڵ درووستی کردوون پاشان لە شوێچنێك داینا کە بە زیندوویی و دانایی و قسەکەر، پاشان هەر کاتێك شتێك بۆ لاشەکەی دەردەکەوت، جا خوای گەورە لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، بەڵام هیچ هەواڵێکی وامان لەسەر زمانی پێغەمبەرﷺ پێنەگەیشتووە وەدیارە پێغەمبەرﷺ هەواڵی واشی نەداوە، لە ڕاستیدا لە حەدیسێکی سەحیحدا پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((أن خلق آدم يجمع في بطن أمه أربعين يوماً نطفةً ثم يكون علقة مثل ذلك، ثم يكون مضغة مثل ذلك ، ثم يرسل إليه الملك فينفخ فيه الررح))[٣٠٤]، واتە: (( کاتێك نەوەیەکی ئادەم درووست دەکرێت لە شێوەی نوتفەیەك لە مەنی پیاو بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە سکی دایکی دەمینێتەوە ، پاشان دەبێتە هەڵواسراوێك

(٣٠٤) مسلم : (٢٦٤٣).

، پاشان دەبێتە پارچە گۆشتێك، پاشان فریشتەیەکی بۆ رەوانە دەکرێت لـە رۆحـدا فووی پیادەکرێت)).

جا فریشتە بەتەنها بۆی رەوانە دەکرێت و فووی پیادەکات ، ئەگەر فووی پیاکرد ئەوا دەبێتە هۆکارێك بۆ روودانی رۆح تێیدا، وە نەیفەرمووە: فریـشتە بـە رۆحـەوە بۆی رەوانە دەکرێت و ئینجا دەیخاتە ناو سکی ، لەراستیدا فریشتە بۆی دەکرێـت و بە فووپیاکردنەکەی رۆحەکە تێیدا روودەدات نەك خوای گەورە رۆحەکەی ناردبێـت، کەوا پێش ئەوە بە سـەردەمێکی دوورو درێـژ لەگـەڵ فریـشتە بـوونی هـەبووبێت، جیاوازی بکە لە نێوان فریشتە دەنێرێت بۆی ئینجا فووی پیادەکات بە رۆحەکـەدا، وە لەنێوان ئەوەی کەوا رۆحە دروستکراوەکە دەنێرێت کە لەگەڵ فریشتەکە بەخۆی دامەزراوە.

❋❋❋

## راستی دەروون چی یە ؟

١. ئایا ئەو بەشێکە لە بەشەکانی لاشە.
٢. یاخود نیشانەیەکە لە نیشانەکانی.
٣. یاخود جەستەیەکە نیشینگەیە بۆی تێیدا دانراوە یاخود ئەنها گەوهەرێکە؟
٤. ئایە ئەو رۆحە
٥. یاخود شتی دیکەیە؟
٦. ئایا ئاژاوەگێڕی و لۆمەکار و پڕ لە ئارامی یەك دەروونە ئەو سیفاتانەی تیایە
٧. یاخود ئەمە سێ دەروونە؟

وەڵامەکە: ئەو مەسەلە خەڵکی لەهەموو چین و توێژەکان قسەی تێدا دەکەن ، و قسەو ووشەکانیانی تێدا شێواندووە، زۆر تێیدا کەوتونەتە هەڵەوە و خوای گەورە شوێن کەوتووانی پێغەمبەر ئەهلی سوونەتەکەی هیدایەت داوە لەو کاتەی تێیدا دەکەونە جیاوازی و ناکۆکی، خوای میهرەبانیش ئەوەی بیەوێت ڕێنوێنی دەکات بۆ ڕێبازی ڕاست و درووستی ئیسلام، ئێمە باسی هەندێك لە ووتەی خەڵك دەکەین لەبارەی ئەو بابەتانە و پارمەتی خوا باسی ڕاست و درووستەکەیان دەکەین.

ئەبو حەسەن الأشعري لە ((مقالات)) ەکەی دەڵێت: خەڵکی جیاوازو ناکۆکن لەبارەی ڕۆح و دەروون و ژیاندا، ئایا ڕۆحیش ژیانە یاخوود شتێکی دیکەیە ؟ ئایا ڕۆح لاشەو جەستەیە یاخوود نا؟

نظام دەڵێت: ڕۆح خۆی جەستەیە، وە دەروونیشە، وە پێداگیری دەکات لەوەی کەوا ڕۆح بە فووی زیندووە و نکوڵی ئەوەش دەکات کەوا ژیان و هێز مانای جگە لە زیندوویەکی بە توانا نەبێت.

هەندێکی دیکە دەڵێن ڕۆح نیشانەیە.

هەندێکی دیکە دەڵێن : لەوانە جەعفەر کوڕی حەرب : نازانین ڕۆح گەوهەرە یاخوود نیشانەیە وە پاکانە دەهێنێتەوە لەم بارەیەوە بەو فەرموودەیە ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ (الإسراء:٨٥)، واتە (( پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چیەو چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێکە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە)). و هیچ دەربارەی ڕانەگەیەندراوە ئەو نە گەوهەرە نە نیشانەیە ووتی: وا گومان دەبەم جەعفەر سەلماندوویەتی کەوا ژیان ڕۆح نیە، وە سەلماندویەتی کەوا ژیان نیشانەیەکە.

جبائی بیرو بۆچوونی وابو کە ڕۆح جەستەیە، کەوا ئەو ژیان نیە، ژیانیش نیشانەیە، وە بیانووش بەشێوەزاری زمان دەهێنێتەوە، ڕۆحی ئادەمیزاد دەرچوو، پێداگیری دەکات کەوا ڕۆح نابێت نیشانە بێت لەسەری.

هەندێکی دیکە دەڵێن : ڕۆح شتێك نیە لەوەی زیاتر یەکسان بوونی چوار سرووشتیەکان بێت لەبارەی ووتەکانیان ((إعتدال)) لە دونیادا نەسەلمێنراوە شتێك هەبێت تەنها چوار سرووشتیەکان نەبێت کەوا ئەوانیش گەرمی و ساردی و شێداری و ووشکی یە.

هەندێکی دیکە دەڵێن: ڕۆح خوێنێکی پاك و ڕوون و پووختە لە ژیان و گوزەرانێکی سەخت و خەماوی یەوە گەنین و بۆگەناوی ، هەروەها دەڵێن لە هێزدایە.

هەندێکی دیکە دەڵێن: ژیان گەرمیەکی خۆڕسك و سرووشتی یە ، هەر ئەوانەیووتەکانیانمان باسکرد لەبارەی ڕۆح لە پیاوانی ڕەوشت بەرزن دەی سەلمێنن کەوا ژیان خۆی ڕۆحە.

هەندێکی دیکە دەڵێن: بەڵکو دەروون مانای بوونی سنووری و ڕووکنەکان و درێژی و پانی و قوڵی یە و ئەویش هیچ جیاییەکی نیە لەو جیهانەدا جگە لەخۆی کەوا حوکمی درێژی و پانی و قووڵی بەسەر دا دەدرێت ، و هەر یەکێك لەمانە سیفەتی سنوورو کۆتایی کۆیان دەکاتەوە،

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن ، دەروون باسی لێوە کراوە بەوەی ئەوانەی پێشتر باسمان کردن وەسفیان کردووە لەمانای سنوورو کۆتاییەکان، لەبەر ئەوەی ئەو جیاگەری ناکات جگە لەخۆی وە ناشکرێت وەسف بکرێت بە سیفەتی گیانلەبەر، وە جەریری دەگێڕێتەوە: لە جەعفەری کوڕی موبەشیر: کەوا دەروون گەوهەرێکە بەڵکو ئەو جەستەیە نیە، وە بەجەستەشەوە نیە، بەڵکو ماناکەی لەنێوان گەوهەرو جەستە دایە.

هەندێکی دیکە دەڵێن دەروون مانای ڕۆح ناگەیەنێت ، وە ڕۆحیش ژیان نیە، و ژیانیش لەلای أبو الهذيل نیشانەیە، دەڵێت دەشێت ئادەمیزاد لە حاڵەتی خەودا بێت لەوانەیە دەروون و ڕۆحەکەی بفرێت و بڕوات بەبێ ژیان لەبەرئەم

فەرموودەیەش شایەتی دەدات: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ﴾ (الزمر:٤٢)، واتە:((هەرخوایە کە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا، هەروەها ئەو گیانە کە نەمرد لە خەوەکەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە)).

جەعفەری کوڕی حەرب دەڵێت: دەروون نیشانەیەکە لە نیشانەکان، لەو جەستەیەدا بوونی هەیە، وە یەکێکە لەو ئامێرانەی کە ئادەمیزاد پشتی پێ دەبەستێت لەسەر کردارێك وەك تەندروستی و سەلامەتی و هاوشێوەی ئەوە ئەویش وەسف نەکراوە بە شتێك لە سیفەتەکانی گەوهەرەکان و جەستەکان ئەمەش ئەشعەری قسەی لەسەر کردووە[٣٠٥].

بەشێکی دیکە دەڵێن: دەروون بریتی یە لە هەناسەی ناوەودو دەرەوە بەهەناسەدان و وەرگرتن، ووتیان ڕۆحیش نیشانەیە، وە ئەویش تەنیا ژیانە، بەڵکو دەروون نیە، ئەمە ووتەی قازی ئەبوبەکر کوڕی باقلانیە ئەوانەی شوێن کەوتووی ئەون لە ئەشعەریەکان[٣٠٦].

کۆمەڵەیەکی دیکە دەڵێن: دەروون نە جەستەیەو نە نیشانەشە ، وە دەروونیش لە جێگایەك نیە وە نە درێژی و نەپانی و نەقوڵی و ڕەنگ و نە شتێکی دیکە نیە، وە لە جیهانیشدا نیە، نەدیوی دەرەوەی هەیە وە نە تەنیشتەکان و نەدەریش دەکەوێت ، ئەمەش ووتەی ((مشائین))ەکانە[٣٠٧].

ئەمەیە کە ئەشعەری قسەی لەسەر کردووە لەبارەی أرسطالیس، وا ڕادەگەیەنن کە پەیوەندی ڕۆح بەلاشەوە نە بە سەرەتایەکەیەتی وە نەبە تەنیشتەکانیەتی و نە نیشینگەیە بۆی و بەپێوەلکاندنەوە و نە بەیەك گەیشتنە، بەڵکو تەنها لە ڕاستیدا

(٣٠٥) مقالات الأسلاميين: ٢/٢٧.

(٣٠٦) سەیری : الفصل في الملل: ٥/٧٤ بکە.

(٣٠٧) المشاؤون : لە فەلسەفەی نەرستۆیە ، کەوا تویژەرلە نیشانەکانی دەربهێناوە.

درووست کردن و پێکهێنانە بۆی، ئەم مەزهەبەش بە سنجی و محمد کوڕی نوعمـان ناسراو بە المفید و موعەممەر کوڕی عیباد الغزالی هەڵیبژاردووە، ووتەی ئیبن سیناو شوێن کەوتوانیەتی ، ئەمەش خراپترین مەزهـەب و بـەتاڵترین و دوورترینیانـە لـە ڕاستی.

ئەبو محمد کوڕی حزم دەڵێت[٣٠٨] : بیرو بۆچوونی گشت ئەهلی ئیسلام و ئەوانـەی دان بە ڕۆژی دوایی دادەنێن : کەوا دەروون جەستەیەکی درێژو پان و قووڵـە خـاوەن جێگای تەنێکی لایەنگیرو لەبەر ڕۆیـشتووە بـۆ جەسـتە، ووتـی بەمـەدا دەڵـێن: ووتی: دەروون و ڕۆح دوو ناوی هاوبەش و هاوتان بـۆ یـەك مانـا، وە ماناکەشـیان یەکە.

لە ڕاستیدا ئەبو عبداللەی کوڕی خطیـب مەزهەبـەکانی خـەڵکی لـە دەروونـدا ڕێکخستووە و دەڵێت: ((ئەوەی هەر مرۆڤێك هێمای بۆ دەکات بـە ووتـەی خـۆی: ئێمە یان دەبێت جەستە یاخود نیشانەیەکی کۆڵەگـەو سـتوون بـێن لـە جەسـتەدا یاخود نە جەسـتەیەك و نە نیشانەیەکی کۆڵەکەو ستوون بێن تێیدا)).

بەشی یەکەم: کەوا ئەو جەستەیە، ئەو جەستەیەش یان دەبێت ئەو لاشـەیە بێـت یاخود دەبێت جەستەیەکی هاوبەش بێت بۆ ئەو لاشەیە، یـان دەبێـت لـە دەرەوەی بێت.

بەڵام بەشی دووەم: دەروونی ئـادەمیزاد بریتـی یـە لـەو لاشـەیەو پەیکـەرێکی تایبەتی، ئەمەش کەس نەیووتوە.

بەڵام بەشی یەکـەم : کـەوا ئـادەمیزاد بریتـی یـە لـەو لاشـەیە و پەیکـەرێکی تایبەتی، جا ئەمە ووتەی زۆربەی کۆمـەڵانی خەڵکـە، ئەمـەش لـەلای زۆر ووتـار بێژان و قسە کەران هەڵبژێردراوە.

---

(٣٠٨) الفصل في الملل: ٤/٧٤.

خەڵکی چوار ووتەو ئاخاوتنیان هەیە لە ناونانی ئادەمیزاد دا، ئایە ئەو تەنها ڕۆحێکە؟ یاخود تەنها لاشەیەکە، یاخود هەردوکیانە، یاخود هەر یەکێکە لەوانە؟ وە ئەو ئاخاوتنانەش ئایە تەنها لە دەربڕین و ووشەکەدایە، یاخوود تەنها لە ماناکەدا، یاخود لە هەردوکیاندا، یاخود لە هەریەکێك لەوانە دایە؟ جیاوازی لە نێوانیان تەنها لە دەربڕین و ئاخاوتنەکەیە.

رازی دەڵێت: بەڵام بەشی دووەم، کەوا ئادەمیزاد بریتی یە لە جەستیەیەکی تایبەت بوونی هەیە لەناو ئەو لاشەیە، قسەکەران و توێژەران جیاوازن بەم ووتەیە لە دەست نیشانکردنی ئەم جەستەیە لەسەر چەند ڕوویەکەوە:

یەکەم: ئەو بریتی یە لە تێکەڵاو بوونی هەر چواریان کەوا ئەو لاشەیە لێی لەدایك دەبێت.

دووەم: ئەو خوێنە.

سێیەم: ئەو ڕوحێکی نەرم و نیان و میهرەبانە کەوا لە تەنیشتی چەپ لەلای دڵەوە لەدایك دەبێت ، وە خوێنبەرەکان بۆ هەموو ئەندامەکان پێیدا تێپەڕ دەبێت.

چوارەم: ڕۆحێکە کەوا لە دڵەوە بۆ مێشك بەرز دەبێتەوە ، و خۆی دەگونجێنێت بەشێوەیەکی درووست بۆ قەبولکردنی بیریژی و باڵاهێزی و بیرکردنەوە.

پێنجەم: ئەو بەشێکەو لە دڵ دانابڕێت.

شەشەم: ئەو جەستەیە پێچەوانەیە بە ناخ و ناوەڕۆکێك بۆ ئەو جەستە هەست دارە، و بریتی یە لە جەستەیەکی نورانی و درەوشاوەی بەرزە سووکی زیندوو و بزوێنە بەناو گەوهەری ئەندامەکاندا تێدەپەڕێت وە لە گوڵدا ئاوی لەبەردا دەڕوات، و لە زەیتوندا ڕۆنی لەبەردا دەڕوات وە ئاگریش لە خەڵوزدا، مادام ئەو ئەندامانە درووستە بۆ قەبولکردنی نیشانەیەکی زۆرو زەبەند لەسەری دا لەو جەستەیە ناسکەدا کەواتە ئەو جەستەیە ناسکە ئاڵۆزکاو ماوەتەوە بۆ ئەو ئەندامانە، وە ئەو نیشانانە سوودمەند دەبێت لە هەست و جوولەی ئارەزوو مەندو خۆ ویست.

ئەگەر ئەو ئەندامانەش تێکچوون بەهۆی دەست بەسەرداگرتنی شتی هەمە چەشنەو توندو تیژ لەسەریداو دەربچێت لە قەبولکردنی ئەو نیشانانە ئەوا ڕۆح لەلاشە جیادەبێتەوە و سەربەخۆ دەبێت بۆ جیهانی ڕۆحەکان.

ئەم ووتەیەش کەوا ڕاست و درووستە لەو مەسەلەیەدا، و جگە لەمە هیچیان ڕاست نیە، وە هەموو ووتەو ئاخاوتنەکان جگە لەو بەتاڵە، وە کتێب و سوننەت و یەك دەنگی سەحابەکان بەڵگەیە لەسەری وە عەقڵ و سرووشت و ڕەفتاریش بەڵگەیەتی، و ئێمە بەڵگە لەسەریدا دەهێنینەوە.

**بەڵگەی یەکەم:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ (الزمر:٤٢)، واتە: (( هەر خوایە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا هەروەها ئەو گیانە کە نەمرد لە خەوەکەیدا هەر خوا بۆی دەنێرێتەوە جا ئەو کەسەی کە خوا مردنی دابێت ڕۆحەکەی دەگێرێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ لاشەی، ئەو کەسەش ڕۆژی تەواو نەبووبێتدەینێرێتەوە بۆی تا کاتێکی دیاریکراو ))، جا لەو ئایەتەدا سێ بەڵگە هەیە: هەواڵگەیاندن بە مردنەکەی، وەرگرتنەوەی ڕۆحەکەی، وە ناردنەوەی ڕۆحەکەی .

**بەڵگەی چوارەم:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّالِمُونَ فِي غَمَرَاتِ الْمَوْتِ وَالْمَلَائِكَةُ بَاسِطُو أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوا أَنْفُسَكُمُ الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ﴾ (الأنعام:٩٣)، واتە : (( خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینی چۆن لە ئێش و ئازاری سەرەمەرگدا (گیریان خواردووە) فریشتەکان دەستیان لێدەکەنەوەو لێیان دەدەن (پێیان دەڵێن) ئادەی گیانتان بدەن بەدەستەوە دەی ڕۆحتان دەرکەن ئەمڕۆ لە تۆڵەی (خوانەناسیتاندا) سزاو ئەشکەنجەی ڕیسوایی و شەرمەزاری دەدرێن))، وە هەروەها دەفەرموێت ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾ (الأنعام:٩٤)، واتە: (( لە ڕۆوژی قیامەتدا خوای گەورە ڕوو بە خواناسان دەفەرموێت ، سوێند بە

خوا بێگومان ئێوە بەتەنهاو تاك تاك هاتونەتە لامان هەروەكو یەكەم جار درووستمان كردن)).

وە چوار بەڵگەی تێدایە :

یەكەم: دەست كردنەوەی فریشتەكان لێیان .

دووەم: وەسفكردنی بە دەرهێنان و دەرچوونی ڕۆحەكەیان.

سێیەم: هەواڵ گەیاندن لەبارەی سزادانی لەو ڕۆژەدا.

چوارەم: هەواڵ گەیاندن لەبارەی هاتنەوەی ڕۆحەكە بۆ پەروەردگاری ، جا ئەمە حەوت بەڵگەیە.

**بەڵگەی هەشتەم:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُمْ بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ﴾ (الأنعام:٦٠)، واتە: (( هەر ئەو زاتەیە بەشەو خەوتان لێدەخات و وەدەتان مرێنێت (لەم ساڵانەی دواییدا زاناكان بۆیان دەركەوتووە كە خەو جۆرە مردنێكە) هەروەها دەزانێت لە ڕۆژیشدا چ كارو كردەوەیەك ئەنجام دەدەن ، وە پاشان زیندووتان دەكاتەوە بۆ ئەوەی وادەی دیاری كراو كە (ڕۆژانی تەمەنتانە) تەواو بكرێت و (خەوێكی گەورەتان لێدەكەوێت) لەوەوە دوا گەڕانەوەتان هەر بۆلای ئەو زاتەیە)).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لا يُفَرِّطُونَ﴾(الانعام:٦٠-٦١)، واتە: (( تا ئەو كاتەی مەرگ دێت و یەخەی كەسێكتان دەگرێت ئەو كاتە ئیتر (فریشتە) ڕەوانەكراوەكانمان گیانی دەكێشن ، وە لەكاتێكدا ئەوان لەكارو كردەوەی خۆیان كەم تەرخەمی ناكەن)). ئەمەش سێ بەڵگەی تێدایە:

یەكەم: هەواڵ گەیاندن بە مردنی گیانەكان لە شەودا .

دووەم: گەڕاندنەوەی بۆ لاشەكانیان لە ڕۆژدا.

سێیەم: لەكاتی مردنیدا فریشتە گیانی دەكێشێت. جا ئەمەش بووە دوو بەڵگە:

**بەڵگەی یازدەهەم:** خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ۞ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً ۞ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ۞ وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ (الفجر:٢٧-٣٠) ، واتە (( (شایانی باسە بە ئیمانداری سەرفراز لە سەرەمەرگدا دەوترێت) ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی ۞ بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لەتۆ ڕازیە ۞ وە بچۆرە ڕێزی بەندی چاکە نازدارو بەڕێزەکانمەوە ۞ بچۆرە بەهەشتە خۆش و ڕازاوەکەمەوە)). وە سێ بەڵگەی تیایە:

یەکەم: وەسفی کردووە بە گەڕانەوە

دووەم: وەسفی کردووە بە چوونە ناوەوە.

سێ یەم: وەسفی کردووە بە ڕەزابوون.

سەلەفیەکان جیاوازو ناکۆکن کاتێك دەوترێت، ئایە ئەو کارە لەکاتی مردن یا لەکاتی زیندووبونەوە یاخود لەهەردوو شوێنەکەدا ڕوودەدات؟ لەمەدا سێ ووتەو ئاخاوتن هەیە، لە حەدیسێکی بەرزکراوەدا ڕوایەت کراوە ، کەوا پێغەمبەرﷺ بە ئەبی بەکری سدیقیﷺ فەرمووە: ((أما أن الملك سيقولها لك عند الموت))[٣٠٩]، واتە: (( لەڕاستیدا فریشتە لەکاتی مردندا پێتی دەڵێت)).

زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: موژدەم پێدرا بە بەهەشت لە کاتی مردندا و کاتی کۆبوونەوە و لەکاتی زیندووبوونەوە، ئەبو صالح دەڵێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ﴾ ئەوە لەکاتی مردنە : ﴿فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ۞ وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ ئەوە لە ڕۆژی قیامەتە[٣١٠].

ئەمە بووە چواردە بەڵگە.

---

(٣٠٩) كنز العمال : ٢ / ٤ .

(٣١٠) سەیری تەفسیری القرطبي: ٢ /٥٨ بکە.

**بەڵگەی یازدەهەم**: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( أن الروح إذا قبض تبعه البصر))[٣١١]،واتە: ((بێگومان ئەو کاتەی ڕۆح دەکێشرێت چاوەکان تێی دەڕوانن))، ئەمە دوو بەڵگەی تیایە:

یەکەم: وەسفی دەکات بەوەی کەوا گیانی دەکێشرێت.

دووەم: کەوا چاوەکان دەیبینن.

**بەڵگەی حەڤدەهەم**: ئەوەی نیسائی ریوایەتی کردووە دەڵێت: ئەبو داود بۆمانی گێڕایەوە ، ئەویش لە عەفان : ئەویش لە عیماد، ئەویش لە ئەبی جەعفەر ، ئەویش لە عمارە کوڕی خەزیمە، کەوا باوکی دەڵێت: لە خەودا بینیم وەك ئەوەی لەسەر نێوچەوانی پێغەمبەرﷺ سوژدە دەبەم، لەبارەی ئەمە هەواڵم پێگەیاند جا فەرمووی: ((أن الروح ليلقى الروح))، واتە : ((لە ڕاستیدا ڕۆح بە ڕۆح دەگات))، جا ئاوا لە پێغەمبەرﷺ بەرز کراوەتەوە - کەوا پێغەمبەرﷺ خەبەری داوە کەوا ڕۆحەکان لەخەودا بەیەکتر دەگەن[٣١٢]، پێشتر باسی ئاخاوتنی ئبن و عەباس کراوە، ڕۆحی مردوو و زیندوەکان لەخەودا بەیەکتر دەگەن ، لەنێوان خۆیاندا پرسیار لەیەکتر دەکەن ، جا خوای گەورە ڕۆحی مردووەکان دەگرێتەوە.

**بەڵگەی هەژدەهەم**: پێغەمبەرﷺ لە حەدیسێکی بیلال دا دەفەرموێت: (( إن الله قبض أرواحكم وردها إليكم حين شاء))[٣١٣] ، ئەمەش دوو بەڵگەی تێدایە:

یەکەم: وەسفی کردووە بە گیان کێشان .

دووەم: وەسفی کردووە بە گەڕانەوەی ڕۆحەکە.

---

(٣١١) مسلم : (٩٢٠)، وە مسند أحمد: ٦/٢٩٧.

(٣١٢) مسند احمد: ٥/٢١٥.

(٣١٣) فتح الباري: ١٣/٤٤٧.

**بەڵگەی بیست:** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت : ((نسمة المؤمن طائر يعلق في شجر الجنة))[314] ، ئەمەش دوو بەڵگەی هەیە :

یەکەم: بوەتە باڵندە.

دووەم: خۆی بە درەختی بەهەشت هەڵدەواسێت و لێی دەخوات ، لەسەر جیاوازی لێکدەرەوەکان.

**بەڵگەی بیست و دوو:** پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( أرواح الشهداء في حواصل طير خضر شرح في الجنة حيثُ شاءت ، وتأوى إلى قناديل معلقة بالعرش ، فأطلع اليهم ربك إطلاعة فقال أي شيء تريدون؟)) حەدیسەکە درێژەو واتاکەشی لێکدراوەتەوە ، ئەمەش شەش بەڵگەی تێدایە:

یەکەم: ڕۆحەکە لەناو سکی باڵندە دانراوە.

دووەم: ئەو لە بەهەشتدا پشوو دەدات.

سێیەم: ئەو لە بەروبوومی بەهەشت دەخوات و لە ڕووبارەکانیشی دەخواتەوە.

چوارەم: ئەو لەناو ئەو چراخانە دا نیشتەجێ دەبێت.

پێنجەم: خوای گەورە قسەی لەگەڵدا دەکات و بە قسەی دەهێنێت و وەڵامیشی دەداتەوە.

شەشەم: بێگومان ڕۆحەکە داوای گەڕانەوە دەکات بۆ دونیا، لە ڕاستیدا ئەوەی حەز لە گەڕانەوە دەکات، دەڵێن: ئەمە هەموو سیفەتی باڵندەکەیە نەك سیفەتی ڕۆحەکە، دەڵێن: بەڵکو ڕۆحەکە لەناو سکی باڵندەکە دانراوە، بە مەبەست، لە ڕیوایەتێکی دیکە کەوا ئەبو عومەر پەسەندی دەکات دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( أرواح الشهداء كطير)) ، واتە: ڕۆحی شەهیدەکان وەك باڵندەن))، جا ئەمە پرسیارەکە بەتەواوەتی دووردەخاتەوە.

---

(314) الموطء : 1/240، وە مسند أحمد: 3/456.

**بەڵگەی بیست و نۆ:** لە حەدیسێکی طلحة ی کوڕی عبدالله دەڵێت: ئارەزووم کرد لە دارستانەکەدا بسوڕێمەوە شەوم بەسەرداهات، ئینجا چووم بۆلای گۆڕی عبدالله کوڕی عەمرِ و کوڕی حزام، جا گوێم لە خوێندنی قورئان بوو لەناوگۆڕەکەدا هەرگیز گوێم لەدەنگی واخۆش نەبووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (( ذلك عبدالله ألم تعلم ان الله قبض ارواحهم فجعلها في قناديل من زبرجد و ياقوت، ثم علقها وسط الجنة ، فإذا كانت الیل ردت اليهم أرواحهم ، فلا تزال كذلك حتى اذا طلع الفجر ردت أرواحهم الى أماكنها التي كانت)) [٣١٥]، واتە: (( ئەوە عبداللە یە ئایە نازانیت کە خوا رۆحەکانیانی کێشاوە و لە چراخانێکیان داناوە کەوا لە یاقوت و مرواری درووست کراوە، پاشان لە ناوەڕاستی بەهەشتدا هەڵیواسیوە، جا کاتێك شەو داهات رۆحەکانیان بۆ دەگەڕێنێتەوە، ئاوا دەمێنێتەوە تاوەکو بەیانی دادێت ئینجا رۆحەکان دەگەڕێنێتەوە ئەو شوێنەی کە لەویٚ بووە))، ئەمەش چوار بەڵگەی تێدایە:

یەکەم: رۆحەکە لەناو چراکان دانراوە.

دووەم: گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

سێ یەم: قسە کردنی رۆحەکە وە خوێندنەوەی قورئان لەناو گۆڕدا.

چوارەم: وەسفی کردووە کەوا لە شوێنێك دایە.

**بەڵگەی بیست و سێ:** حەدیسی براو کوڕی عازب، پێشتر بە درێژی باسکراوە، ئەویش بیست بەڵگەی تێدایە:

یەکەم: ئاخاوتن و قسەکردنی فریشتەی گیان کێشان بۆنەفسی خۆی: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ۝ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً﴾(الفجر: ٢٧- ٢٨)، وە ئەم ئاخاوتنە بۆ کەسێکە عەقڵی هەبێت و تێبگات.

---

(٣١٥) سەیری شرح الصدور : ٢٥٨ بکە.

دووەم: ئەی ڕۆحی پڕ لە ئارامی و پاك وەرە دەرەوە بۆ لێخۆش بـوون و ڕەزابـوونی خوای گەورە.

سێ یەم: دێتە دەرەوە هەروەك چۆن دڵۆپە ئاو لە دەمی کوندە دەڕژێت.

چوارەم: لەماوەی چاوتروکانێك ڕۆحەکەی لێ وەردەگرێت.

پێنجەم: تاوەکو فریشتەکان کە بە کفنێك لە بەهەشتدا هێناویانە کنفنی دەکەن.

شەشەم: پاشان ڕۆحەکەی بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان.

حەوتەم: خۆشترین بۆن لە بۆنی میسکی لێدەدرێت.

هەشتەم: جا دەرگای ئاسمانەکانی بۆ دەکرێتەوە.

نۆیەم: بۆ هەر ئاسمانێك دەیبەن فریشتەکان پێشوازی لێ دەکەن تاوەکو دەگاتە ئـەو ئاسمانەی کەوا خوای گەورەی لێ یە.

دەیەم: دەفەرموێت: وەرن: بەندەکەم بگەڕێننەوە بۆ زەوی.

یازدەهەم: جا ڕۆحەکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆ جەستەکەی.

دوازدەهەم: لەبارەی ڕۆحی کـافریش دەفـەرموێت: ڕۆحەکـەی لـە لاشـەکەی جیـا دەبێتەوە، ئینجا ڕای دەکێشێت، جا دەمـارو ماسـولکەکانی هـەمووی دەبڕێـت و پارچە پارچە دەبێت.

سێزدەهەم: ئینجا ڕۆحەکەی بۆگەنترین بۆنی لێدێت کەوا لەسەر زەویدا هەبێت.

چواردەهەم: ئینجا لە ئاسمانەوە ڕۆحەکەی فڕێدەدەنە خوارەوە، وە دەری دەکەن نـزم دەبێتەوە بۆ ناو زەوی.

پازدەهەم: هیچ فریشتەیەك لە فریشتەکان بەلای تێپەڕنابن تەنها دەڵێن: ئەم ڕۆحـە پاکە چی یە؟ ئەی ئەم ڕۆحە پیسە چی یە؟.

شازدەهەم: ئینجا دایدەنیشێنن ، پێی دەڵێن چی دەڵێیت دەربارەی ئەو پیاوە واتـە احمد؟ جا ئەگەر ئەمە بۆ ڕۆحەکە بێـت ئـەوا دیـارو ئاشـکرایە، بـەڵام ئەگـەر بـۆ لاشەکە بێت) ئەو لەدوای گەڕانەوەی ڕۆحەکە لە ئاسمانەوە بۆ لاشەی دەبێت.

حەڤدەھەم: جا ئەو کاتەی فریشتەکان ڕۆحەکە بۆئاسمان بەرز دەکەنەوە دەڵێن: واتــە پەروەردگارا ئەمە فلان بەندەی تۆیە.

هەژدەهەم: بیگەڕێنەوە و نیشانی بدەن کە وا من چیم بۆ ئامــادەکردووە لــە کــارو کردەوەکانی، ئینجا جێگای خۆی دەبینێت لە بەھەشت یاخود لە ئاگر.

نۆزدەھەم: ئەگەر ڕۆحی ئیماندار هاتە دەرەوە ئەوا هــەموو فریــشتەکانی خــوا لــە نێوان ئاسمانەکان و زەویدا ســەلاواتی لەســەر لێــدەدەن، جــا فریــشتەکان ســەلاوات لەسەر ڕۆحەکەی لێ دەدات وە نەوەی ئادەمیش نوێژ لەسەر جەستەکەی دەکات.

بیستەم: ئینجا سەیری جێگای خۆی لەناو ئاگر تاوەکو ڕۆژی قیامەت، وە لاشــەش پارچە پارچە دەبێت و نامێنێت، لە ڕاستیدا ئــەوەی ســەیری هــەردوو جێگایــەکان دەکات هەر ڕۆحەکەیە .



## لە بەڵگەکانی حەدیسی ئەبو موسا

**بەڵگەی پەنجاو چوار:** حەدیسێکی ئەبو موســا: (( گیــانی ئیمانــدار دێتــە دەرەوە کەوا بۆنی خۆشترە لە بۆنی میسك جا ئەو فریشتانەی ئامــادەبوون لــەکاتی گیان کێشانی دەیبەن و فریشتەکانی دیکەش لــە ئاسمانــەکان پێدەکــەنن و دەڵــێن: ئەمە فلانی کوڕی فلانە ئەم کارو کردەوە چــاکانەی ئــەنجام داوە - دەڵــێن : ئــەو و ئێوە بەخێربێن، ئینجا لێیان وەردەگرن و لە دەرگا بەرزی دەکەنــەوە کــەوا کــردەوە چاکەکانی لەوێدا بەرز دەبۆوە، پاشان دەرگای ئاسمانەکانی بۆ دەکرێتەوە و بەڵگــەی پێیە وەك بەڵگەی ڕۆژ تاوەکو دەگاتە بارەگای عەرش، بــەلام ئەگــەر ڕۆحــی کــافر دەرچوو ئەوا ڕۆحەکەی دەبەن، فریشتەکان دەڵێن: وای ئــەوە کێیــە؟ دەڵــێن: ئــەوە فلانی کوڕی فلانە ئــەم کــردەوە خراپانــەی ئــەنجام داوە، دەڵــێن: بــەخێر نەیــەێت، بیگەڕێننەوە، دەگەڕێتەوە بۆ خوارەوەی زەوی )) ئەمەش دە بەڵگەی تێدایە:

یەکەم: دەرچوونی ڕۆحەکەی.

دووەم: خۆشی بۆنەکەی.

سێ یەم: دەرچوونی فریشتەکان لەگەڵ ڕۆحەکە.

چوارەم: سەڵاو کردنی فریشتەکان بۆ ڕۆحەکە.

پێنجەم: وەرگرتنی فریشتەکان بۆ ڕۆحەکە.

شەشەم: بەرزکردنەوەی ڕۆحەکە لەلایەن فریشتەکانەوە.

حەوتەم: ڕووناك بوونی ئاسمانەکان بەهۆی شەوقی ڕۆحەکە.

هەشتەم: گەیشتنی بە عەرش.

نۆیەم: قسەکردن و پرسیارکردنی فریشتەکان ئەوە کێ یە؟.

دەیەم: بیگەڕێننەوە بۆ خوارەوەی زەویەکان.

***

## ( لە بەڵگەی حەدیسی ئەبو هورەیرە )

**بەڵگەی شەست و چوار:** حەدیسێکی ئەبو هورەیرە: (( کاتێك ڕۆحی ئیماندار دەردەچێت دوو فریشتە پێی دەگەن، بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان جا ئەهلی ئاسمان دەڵێت: ڕۆحێکی پاك لەلایەن زەویەوە هاتووە خوای گەورە سەڵاواتت لێدەدات و لەسەر جەستەیەك کەوا ئاوەدانی کردۆتەوە وە ستایشی ئەو بۆنە میسکەش دەکەن، پاشان بۆ لای خوای گەورە بەرزی دەکەنەوە پاشان دەفەرموێت: بیگەڕێننەوە بۆ کۆتایی ڕۆژی زیندووبوونەوەوە)). ئەمەش شەش بەڵگەی تێدایە:

یەکەم: دوو فریشتە پێی دەگەن و هەڵیدەگرن بۆ ئاسمان.

دووەم: بەرزی دەکەنەوە بۆ ئاسمان.

سێ یەم: ڕۆحێکی پاك لە زەویەوە هاتووە.

**چوارەم:** فریشتەکان سەلاواتیان لەسەر لێدەدەن.

**پێنجەم:** خۆشی بۆنەکەی.

**شەشەم:** بەرزکردنەوەی ڕۆحەکە بۆلای پەروەردگار.

***

## ( لەبەڵگەی حەدیسێکی دیکەی ئەبو هورەیرە )

**بەڵگەی حەفتاو یەك:** لە حەدیسێکی ئەبو هورەیرە: (( لەکاتی سەرەمەرگی ئیماندار فریشتەکان لەلای ئامادە دەبن، جا ئەگەر پیاوێکی چاك بێت دەڵێن: وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پاك کەوا لە جەستەیەکی پاك دابوویت، وەرە دەرەوە شایانی سوپاس کردنی وە موژدە بێت بە ڕەحمی خوای گەورە بۆت وە بەڕەیحانەی بەهەشت خوایەك کە تووڕە نییە لێت، بەردەوام ئەو ووتانەی پێ دەوترێت: بۆ ئەوەی نەترسێت تا ڕۆحی دەردەچێت، جا بەرزی دەکەنەوە تا کۆتایی ئاسمان، دەرگای ئاسمانەکانی بۆ دەکرێتەوە و پێی دەڵێن ئەوە کێ یە؟ جا دەڵێن: ئەوە فلانی کوڕی فلانە، فریشتەکان دەڵێن: سەلاو لەو ڕۆحە پاکە کە لەناو جەستەیەکی پاك دابوو فەرموو وەرە ژوورەوە بۆ سوپاسکراوی موژدەت لێ بێت بە ئارامی و بە ڕەیحانەی بەهەشت و بە خوایەك کە وا لێت تووڕە نیە، وە بەردەوام ئەوەی پێ دەوترێت، هەتا دەیگەیننە ئەو ئاسمانەی کە خوای گەورەی لێیە، بەلام ئەگەر پیاوێکی خراپ بوو فریشتەکە دەڵێت وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پیس کەوا لە لاشەیەکی پیس دابوویت، وەرە دەرەوە نەویستراو و بێزاویت و موژدەت لێ بێت بە سزای ئاوی لە کوڵ هاتووی پیسی دۆزەخ ئەمانەی بەردەوام پێ دەوترێت، تاوەکو ڕۆحەکە دێتە دەرەوە جا دەگاتە کۆتایی ئاسمان، پێی دەوترێ: ئەوە کێ یە؟ دەڵێن: فلانی کوڕی فلانە، جا پێی دەوترێ: پێشوازی لێ نەبێت بەڕۆحێکی پیس کەوا

لەناو لاشەیەکی پیسدابوو، بگەڕێوە بە بێزراوی چوونکە دەرگـای ئاسمانـەکانت بـۆ ناکرێتــەوە جـا دەینێرنــەوە بــۆ زەوی، پاشــان دەیبەنــەوە ناوگۆڕەکــەی ))، ئــەم حەدیسەش درووستە، ئەمەش دە بەڵگەی تێدایە:

یەکەم: ڕۆحــە پاکەکــە لــە جەســتەیەکی پاکـدا بــووە ، وە ڕۆحــە پیــسەکەش لــە جەستەیەکی پیسدابووە.

دووەم: ئەی ڕۆحی پاك وەرە دەرەوە شایانی سوپاسکردن و ستایشیت.

سێ یەم: موژدەت لێ بێت بە ڕەحمی خوای گەورەو بە ڕەیحانەی ڕەش.

چوارەم: بەردەوام پێی دەوترێت : ووتــەی خــۆش((بــۆ ئــەوەی نەترسـێت)) تــاوەکو دەیبەنە کۆتایی ئاسمان.

پێنجەم: دەرگای ئاسمانەکانی بۆ دەکرێتەوە.

شەشــەم: پاشــان فریــشتەکان پێــی دەڵـێن، وەرە ژوورەوە بــە سوپاســکراوی و بــە بەختەوەری.

حەوتەم: تاوەکو دەیگەیەننە کۆتایی بۆ ئەو ئاسمانەی کە خوای گەورەی لێ یە.

هەشتەم: وە بە ڕۆحی کافریش دەوترێت : ئەی ڕۆحی پیس بگەڕێوە بە بێزراوی.

نۆیەم: لەبەر ئەوەی دەرگای ئاسمانەکانت بۆ ناکرێتەوە.

دەیەم: جا دەیگەڕێننەوە بۆ زەوی و پاشان دەیبنەوە ناو گۆڕەکەی.

***

## ( لەبارەی ڕۆحەکان کەوا وەك سەربازی وان )

بەڵگەی هەشتاو یـەك: پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێت: (( الأرواح جنـود مجندة فما تعارف منها أئتلف وما تناكر منهـا أختلـف))، واتــە: ((ڕۆحــەکان وەك سەربازی وان ئەوانەی یەکتری دەناسن و ئیماندارن هۆگری یــەکتر دەبــن و ئەوانــەی

ئینکاری یەکتر دەبن لێك لا دەدەن))، جا وەسفی دەکات بـەوەی سـەربازی بـە زۆر گیراون، وە سەربازیش خاوەنی لیستێکە بۆ خۆی وەسفی کردووە بە هۆگری بـوون و ئینکاری کردن، مەحاڵیشە ئەو سەربازییە نیشانە بێت لە ناودوەی جیهان و نـە لـە دەرەوەشیدا نە هەندێکی نە هەموویشی.

**بەڵگەی هەشتاو دوو:** لە حەدیسێکی ئیبن مەسعود کە لـە پێغەمبـەرﷺ دەگێڕێتـەوە: (( ڕۆحەکان بە یەکتر دەگەن و یەکتر بۆن دەکەن وەك چۆن ئەسپ یەکتر بۆن دەکات)) ئەمە پێشتر باس کراوە.

**بەڵگەی هەشتاو سێ:** ئەو نیشانانەی کەوا باسمـان کـرد لـەبارەی درووسـت کردنی ئادەم ، کاتێك ڕۆح بەلای سـەریدا ((کونـە لوتیـدا)) چـووە ژوورەوە ئـادەم پژمی جا ووتی: سوپاس بۆ خوا، جا کاتێك ڕۆحەکە گەیشتە چـاوەکانی بەهەشـتی ڕوانی، کاتێك گەیشتە ناو سکی ئارەزووی خـۆراکی کـرد، جـا هەڵپـەی کـرد بـۆ ڕاکردن پێش ئەوەی ڕۆحەکە بگاتە قاچەکانی، بێگومان ڕۆحەکـە بەنابـەدڵی چـووە ناو لاشەکەی و بەنابەدڵیش دەردەچێت.

**بەڵگەی هەشتاو چوار:** لـە حەدیـسێکی عبداللـەی کـوڕی عـەمر و کەلـە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە: (( لە ڕاستیدا ڕۆحی ئیمانداران بە دووری مـاوەی دوو ڕۆژ بەیەکتر دەگەن، بیّ ئەوەی یەکێك هاوڕێکەی دیتبێت)).

**بەڵگەی هەشتاو پێنج:** ئەو نیشانانەی کەوا خوای گەورە ڕۆحـی بەختـەوەرو بەد بەخت لەیـەکتر جیـا دەکاتـەوە ، لـەو کاتـەدا لـە ڕونـاکی و تاریکـایی لێـك جیادەبنەوە، وە ڕۆحی پێغەمبەرانیش لەناویانـدا وەك چـراو گوڵـە ئەسـتێرە وایـە دەدرەوشێتەوە .

**بەڵگەی هەشتاو شەش:** لە حەدیـسێکی تـەمیم ئەلـداری دا (( بێگومـان ڕۆحی ئیماندار کاتێـك بـەرز دەکرێتـەوە بـۆ لای خـوای گـەورە لـەنێوان هـەردوو دەستەکانیدا سوژدە دەبات، فریشتەکان بە ڕۆحەکە دەگەن و مـوژدەی پـێ دەدەن،

خوای گەورە بە فریشتەی گیان کێشان دەفەرموێت، ڕۆحی بەندەکەم ببەو بڕۆ وە لە شوێنێکی وەها و وەهای دابنێ.

**بەڵگەی هەشتاو حەوت:** ئەو نیشانانەی باسمان کرد لەبارەی سەقامگیری ڕۆحەکان لەدوای مردندا، وە جیاوازی و ناکۆکی خەڵك لەبارەیدا، و لەناو ئەمانەشدا جیاوازی یەکدەنگی پێشینەکان لەسەر ئەوەی کەوا ڕۆحەکان جێگرو سەقامگیرن لەدوای مردن، و لە ڕاستیدا جیاوازو ناکۆکن لە دیاریکردنیدا.

**بەڵگەی هەشتاو هەشت:** لە ڕاستیدا ئەوەی گرنگەو دەبێت بزانرێت کەوا پێغەمبەرﷺ باسیکردووە وە هەواڵیشی گەیاندووە بۆ ئومەتەکەی، کەوا جەستەکانیان لەناو گۆڕەکاندا گەشە دەکات، کاتێك نەفخی صور لێدەدرێت هەموو ڕۆحێك دەگەڕێتەوە بۆ جەستەکەی و دەچێتە ناویەوە جا زەوی بەسەریدا دەبێت و لە گۆڕەکەیدا هەڵدەستێتەوە.

لەبارەی حەدیسی ((صور)) دا: کەوا ئیسرافیلی سەلامی خوای لەسەر بێت داوای ڕۆحەکان دەکات جا هەمووی بۆلای دێن ڕۆحی موسڵمانان ڕووناکەو ئەوانی دیکەش تاریکە، جا گشتیان کۆدەکاتەوە، ئینجا بە صوردا هەڵیاندەواسێت و پاشان فووی پیادەکات، بە فریشتەکە دەڵێت، خوای گەورەو میهرەبان سوێند بە گەورەیی خۆی دەخوات هەر ڕۆحێك بۆ لاشەکەی خۆی دەگەڕێنینەوە، ڕۆحەکان لە صوردا وەك مێش هەنگوین دێتە دەرەوە نێوان زەوی و ئاسمان پڕ دەکات، جا هەر ڕۆحێك بۆ لاشەکەی دەچێت، دەچێتە ناویەوەو خوای گەورەش فەرمان بە زەوی دەکات لەسەریاندا شەق ببات، ئینجا بەخێرایی دەچن بۆلای پەروەردگاریان هەموون بە گەردن کەچی بەرەو بانگەوازەکە مل دەنێن گوێیان لە بانگەوازێك دەبێت لە شوێنێکی نزیك لەو کاتەی کە ئەوان هەڵساونەتەوەو چاوەڕێی فەرمانن.

ئەمەش ئاشکرایە وە پێویستیشە بیزانین کەوا پێغەمبەرﷺ هەواڵی گەیاندووە، کەوا خوای گەورە هیچ ڕۆحێکی دیکە دانامەزرێنێت و درووستی ناکات جگە لە

ڕۆحەکانی خۆیان کە لە دونیا هەیانبووە، بەڵکو ئەو ڕۆحانەیە کە خوا خێرو شەڕی دەست کەوتووە لەو کاتەدا لاشەکانیان سەر لەنوێ درووست دەبنەوە پاشان بۆی دەنێرێتەوە.

**بەڵگەی هەشتاو نۆ:** بێگومان ڕۆح و جەستە لەنێوان دەستەکانی قودرەتی خوای گەورە دەچن بەگژ یەکداو ناکۆکیان تێدەکەوێت لە ڕۆژی قیامەتدا ، علی کوڕی عبدالعزیز دەڵێت: ئەحمەد کوڕی یونس بۆ ئێمەی گێڕایەوە ئەویش لە ئەبوبەکری کوڕی عەیاش، ئەویش لە سەعد بەقاڵ، ئەویش لە عەکرەمە، ئەویش لە ئیبن و عەباس ووتی: بەردەوام کێشەو ناکۆکی لەنێو خەڵك هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا تا ڕۆح و جەستە لەگەڵ یەکتر ناکۆك دەبن، جار ڕۆحەکە دەڵێت، ئەی پەروەردگارا لە ڕاستیدا من ڕۆحێك بووم لەتۆ منت دانا لەناو ئەو جەستەیەدا جا من تاوانم نیە، جەستەکەش دەڵێت: ئەی پەروەردگارا من جەستەیەکم درووستت کردووم وە ئەم ڕۆحە هاتە ناوە من وەك ئاگر جا بەهۆی ئەوەوە من هەڵدەستام و بەهۆی ئەوەوە من دادەنیشتم، و بەهۆی ئەوەو من دەڕۆیشتم، و بەهۆی ئەوەوە دەهاتم، من هیچ تاوانێکم نیە، دەڵێت: خوای گەورە پێ یان دەفەرموێت: من دادوەری دەکەم لەنێوانتانا، هەواڵیان پێدام لەبارەی پیاوێکی کوێرو پیاوێکی پەککەوتە چوونە ناو بیستانێك جا پیاوە پەککەوتەکە بە کوێرەکەی ووت، من بەروبوومێکی خۆش دەبینم، جا ئەگەر قاچم هەبوایە دەچووم لێم دەکردەوە جا کوێرەکە ووتی، من لەسەر شانم هەڵتدەگرم، جا کوێرەکە پەککەوتەکەی هەڵگرت و بەروبوومەکەی لێکردەوەو هەردووکیان خواردیان، ئایە تاوانەکە لەسەر کێیە؟ ووتیان لەسەر هەردووکیانە، جا خوای گەورە فەرمووی: ئەوە بەسەر هەردووکتانم دا سەپاند[٣١٦] .

(٣١٦) شرح الصدور: ٤٢٣.

**بەڵگەی نەوەد:** حەدیسەکان و نیشانەکان بەڵگەن لەسەر سزاو گۆڕو نازو نیعمەکەی تاکو رۆژی زیندوو بوونەوە جا دیارە جەستەش لەناو دەچێت و دەرزێت، بەڵکو سزادان نازو نیعمەتیش بەردەوامن تا رۆژی قیامەت لە راستیدا ئەمە لەسەر رۆح دەسەپێندرێت.

**بەڵگەی نەوەدو یەك:** هەواڵپێدانی پێغەمبەری باوەرپێکارو و راستگۆ ﷺ لە حەدیسە سەحیحەکەیدا لەبارەی شەهیدەکان ئەوان کاتێك پرسیاریان لێ دەکرێت چیتان دەوێت؟ دەڵێن: دەمانەوێت رۆحەکانمان بگەڕێتەوە جەستەکانمان تاوەکو جارێکی دیکە ئەی خودایە لە پێناوتدا بکوژرێین، ئەمە پرسیارکردن و وەڵام دانەوەیە لەخاوەنی کەسێکی زیندوو زانا قسەکەر رازی دەبێت بگەڕێتەوە بۆ دونیاو بچێتەوە ناو جەستەی کەوا لێی دەرچووە ، ئەم رۆحانەش پرسیاریان لێ کراوە کەچی لەبەهەشتدا پشوو دەدات ، لەگەڵ ئەمەش جەستەکان لەناو گۆڕدا پارچە پارچە بوون و نەماون.

**بەڵگەی نەوەدو دوو:** ئەوەی لە سەلمانی فارسی و لە سەحابەکاندا وەرگیراوە، کەوا رۆحی ئیمانداران لە ژیانی بەرزەخدا دەچێتە ئەو شوێنەی بیەوێت، وە رۆحی کافرانیش لە ((سجین)) ئەمە پێشتر باسکراوە.

**بەڵگەی نەوەدو سێ:** لەشەو ڕەوەکەیدا پێغەمبەر ﷺ رۆحەکانی خەڵکی بینی لەلای دەستە راست و چەپی ئادەم بوون، جا بینی لە جێگایەکی تایبەت دانراوە.

**بەڵگەی نەوەدو چوار:** بینینی رۆحی پێغەمبەران لە ئاسمانەکاندا و سەلامیان لێ دەکەن و پێشوازییان لێ دەکەن هەروەك پێغەمبەر ﷺ خەبەری پێمان داوە، وە بەڵام جەستەکانیش لە زەویدان.

**بەڵگەی نەوەدو پێنج:** پێغەمبەر ﷺ بینی رۆحی منداڵان لە چواردەوری ئیبراهیمی خەلیلە عليه السلام.

**بەڵگەی نەوەدو شەش:** پێغەمبەرﷺ بینی ڕۆحی سزادراوان لە بەرزەخدا بەجۆرەها سزایە لە حەدیسێکی سەمرە کەوا بوخاری لــە ســەحیحەکەیدا ریوایــەتی کردووە، کەچی لاشەکانیان لە زەویــدا نــەماون و رزیبــوون لەگــەڵ ئەوەشــدا ڕۆح و گیانەکانی ئەوانی بینی ئەو کارەیان پێ دەکرێت.

**بەڵگەی نەوەد و حەوت:** هەواڵ پێدانی خوای پەروەردگار لەبارەی ئەوانەی لەپێناویدا کوژراون کە ئەوان زیندوون و لەلایەن پەروەردگاریانەوە رزق و ڕۆزیان پێ دەدرێت، وە ئەوان دڵخۆش و موژدە بەخشن بە براکانیان ، لە کاتێکدا ئەمە تەنها بۆ ڕۆحەکانە ، چوونکە لاشەکان لە خۆڵدان چاوەڕێ دەکەن ڕۆحەکانی بۆ بگەڕێتەوە لەڕۆژی زیندوو بوونەوەدا.

**بەڵگەی نەوەدو هەشت:** لە حەدیسێکی ئــیبن و عــەباس پێــشتر باســان کردووە ئێمە دەیگێڕینەوە بۆ ئــەوەی ئاشــکرا بێــت چــەند بەڵگــەی تیایــە لەســەر پوچەڵکردنەوەی ووتەی مولحیدەکان و ئەهلی بیدعە لــەبارەی ڕۆح دا، لــە ڕاســتیدا پێشتر باسی ئیسنادەکەیشمان کردووە ، دەڵێــت: کاتێــك پێغەمبــەرﷺ ڕۆژێــك دانیشتبوو ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَلَوْ تَرَى إِذِ الظَّـالِمُونَ فِـي غَمَـرَاتِ الْمَـوْتِ ﴾ (الأنعام:٩٣)، واتە ((خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینی چــۆن لــە ئــێش و ئــازاری سەرەمەرگدا گیریان خواردووە))، پاشان فەرمووی: ((ســوێند بــەو کەســەی گیــانی محمد ی بەدەستە هیچ ڕۆحێك دونیا جێناهێڵێت تاوەکو جێگای لە بەهەشت یاخوود لە ئاگر دەبینێت کاتێك لەلای بــەڕێز دادەنیــشن لــەو کاتــە پۆلێــك فریــشتە دێــن لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای بــە ڕیــك و پێکــی دادەنیــشن ڕوخــساریان وەك ڕۆژ وایە، جا سەیری ئەوان دەکات و لەو زیاتریش کەسێك نایبینێ کاتێك ئێوە تەماشا دەکەن ئەو سەیرتان دەکات ، لەگەڵ هەر فریــشتەیەك کفــن و ئاوریــشم هەیــە جــا ئەگەر ئەو ئیماندار بێت ئەوا موژدەی بەهەشتی پێدەدەن، دەڵێن، وەرە دەرەوە ئەی ڕۆحی پڕ لە ئارامی بۆ ڕەزابوونی خــوای گــەورەو بەهەشــتەکەی، بەڕاســتی خــوای

گەورە ڕێزو بەخشندەیی بۆتۆ ئامادەکردووە کە بۆتـۆ لـە دونیـاو ئـەوەی تیایـەتی باشترە، جا بەردەوام موژدەی پێدەدەن، جا ئـەوان لەگەڵیـدا زۆر نـەرم و نیـانن وە بەخشندەترن لە دایك بۆ کوڕەکەی، پاشان سەلاوات لە ڕۆحەکەی دەدەن لەژێر هـەر نینۆك و جومگەیەك، جا یەکە یەکە لە ئەندامـەکانی دەمرێـت، هـەروەها ئەنـدام لەدوای ئەندامەکانی سارد دەبێتـەوە، وە زۆر بەشـێنەیی و لەسـەرەخۆن لەگەڵیـدا لەکاتێکدا ئێوە دەبینن سەخت و دژوارە تا دەگاتە قوڕقوڕاگەی، جا هەر فریشتیەك دەستپێشخەری دەکات کامیان ڕۆحی بکێشێت، ئینجـا فریـشتەی گیـان کێـشان ڕۆحی دەکێشێت ))، پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿قُـلْ يَتَوَفَّـاكُمْ مَلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَـى رَبِّكُـمْ تُرْجَعُـونَ﴾ (الـسجدة:١١)، واتـە (( جـا پێیـان بڵـێ فریـشتەی گیـان کێـشان کـە کـاری گیانکێشانتانی پـێ سـپێردراوە دەتانمرێنێت، لەوەودا بۆلای پەروەردگارتان دەبرێنەوە))، جا دوو فریـشتە کفنێکـی سپی دەهێنن پاشان پێی دادەپۆشن، زیاتر لە دایك بۆ کوڕەکەی بۆی بـە پەرۆشـن، پاشان بۆنێکی لێ دەپڕژێنن خۆشتر لە بۆنی میسك، ئینجـا مـوژدەی پـێ دەدەن وە دەڵێن: سلاوت لێ بێت لە بـۆنێکی خـۆش و ڕۆحێکـی پـاك ، ئـەی پـەروەردگارا سلاوت بێت لەسەر ڕۆحێك وە سـەلاوات لەسـەر جەسـتەیەك کـە لێـی دەرچـووە، فەرمووی: (( جا بەرزی دەکەنـەوەو کـەوا بـۆنی خۆشـترە لـە بـۆنی میـسك، جـا سـەلاواتی لەسـەر لێ دەدەن و مـوژدەی پـێ دەدەن، وە دەرگـای ئاسمانـەکانی بـۆ دەکرێتەوە، وە هەر فریشتەیەك لـە هـەر ئاسمانێکـدا سـەلاواتی لەسـەر لێـدەدات تاوەکو دەگاتە نێوان هەردوو دەستەکانی قودرەتی پەروەردگاری بەهێزو بـە توانـا، جا خودای گـەورە دەفـەرموێت: سـلاو لـە ڕۆحێکـی پـاك، بیبـەن بـۆ بەهـشت و جێگاکەی لە بەهەشتدا پێ نیشان بدەن، وەپێشانی بـدەن ئـەمن بـۆ ئـەوم ئامـادە کردووە لە ڕێزلێنان و نازو نیعمەت پاشان بیبەنەوە بۆ زەوی، چـوونکە پـەیمانم داوە

کەوا لەو درووستم کردووە و بۆ ئەویش دەیگەڕێنمەوە، هەر لەویش جارێکی دیکە دیهێنمە دەرەوە)).

**بەڵگەی نەوەد و نۆ:** ئەوەی عبدالرزاق باسی کردووە، کەوا لە موعەمەر گێڕایتیەوە، ئەویش لە زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەویش لە عبدالرحمن کوڕی بیلمانی، ئەویش لە عبداللەی کوڕی عومەر ووتی: کاتێك ئیماندارێك دەمرێت دوو فریشتە بە ڕەیحانەی بەهەشتی بۆ ڕەوانە دەکرێت لەکات گیان کێشانیدا ڕۆحەکەی بە بۆن خۆشترین بۆن کە هیچ کەس بۆنی وای نەکردووە دەردەچێت، جا فریشتەکان لە پێشدا سوژدەی ڕێزی بۆ دەبەن و لە دواوەش سوژدەی بۆ دەبەن، پاشان بانگی میکائیل ﷺ دەکرێت وە پێی دەوترێت: برۆ ئەم ڕۆحە ببەو دایبنێ لەگەڵ ڕۆحی ئیمانداران هەتاکو لە ڕۆژی قیامەت لەبارەی ئەو پرسیارت لێ دەکەم.

بێگومان نیشانەکان لەلایەن سەحابەوە زۆر باس دەکرێت، کەوا ڕۆحی ئیماندار لەکاتی مردنی خەوو مردنی گیان دەرچوون لەنێوان دەستەکانی خوا لە عەرشدا سوژدە دەبات، وە بەڵام لەکاتی پێشوازی و نامادەبوون بۆلای خودای میهرەبان بەباشترین شێوە سەلام دەکات و دەڵێت: اللهم انت السلام ومنك السلام تباركت يا ذا الجلال والإكرام.

***

## ( لەبارەی بەیەك گەیشتنی ڕۆحی مردووەکان و پرسیار لەیەکتر کردنیان )

**بەڵگەی سەد:** ئەوەی لەگشت دانیشتوانی سەر زەوی تێیدا هاوبەشن لە زانست و زانیندا بەیەك گەیشتنی ڕۆحەکانی مردووە وە پرسیار لەیەکتر کردنیانە، وە هەواڵ پێدانیان لەگەڵ یەکتر بەو کاروبارانەی لێیان دابڕاوە، جا بە ئاشکرا دەیبینێت.

**بەڵگەی سەدو یەك.** ڕۆحی خەوتوو لە خەوەکەیدا هەندێ شوێن و نیشانەی تووش دەبێت جا هەندێ جار لەسەر لاشە دەبینرێت، ئەمەش لە کاریگەری ڕۆحە لە ڕۆحێکی دیکە هەروەك قەیرەوانی لە (کتاب البستان) دا باسی کردووە لەهەندێ پێشینەکاندا.

ووتی: دراوسێیەکم هەبوو بەبۆنی خواردنەکەی ئەبو بەکرو عومەری ئەزیەت دەدا، جا کاتێك بۆنی خواردنەکەی زیاتر ئەوانی ئەزیەت دا، ئەو دەهاتە لای من و منیش دەچوومە لای ئەو، ئینجا ڕۆژێك لە ماڵەکەم دەرکەوت و منیش بە خەمباری و دڵتەنگی مامەوە، نووستم و خواردنی ئێوارەم نەخوارد، جا پێغەمبەرمﷺ لە خەودا بینی ، ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا فلان هاوەڵەکانت ئەزیەت دەدات فەرمووی: کێ یە هاوەڵەکانم؟ ووتم: ئەبو بەکرو عومەر، جا فەرمووی: ئەو چەقۆیە بگرەو بیکوژەوە منیش چەقۆیەکەم گرت و بە زەویدا خستم و کوشتمەوە، بینیم پەنجەکانی بە خوێنی ئەو سوور بووە جا منیش چەقۆیەکەم داناو دەستم درێژ کرد بۆ زەوی بۆ ئەوەی بیسڕمەوە، خەبەرم بووەوە وە گوێم لەدەنگی هات و هاوارێك بوو لە دەوروبەری ماڵی دراوسێکەم ، ووتم ئەو هات و هاوارە چی یە: ووتیان : فلان لە ناکاو مردووە، جا کاتێك چوومە ماڵەکەیان و بینیم هێڵی شوێنی کوشتنەکە دیاربوو[٣١٧].

وە لە ((کتاب المنامات)) أبن ئەبی دونیا لە بارەی پیاوێکی گەورەی قوڕەیش دەگێڕێتەوەو دەڵێت، لە شامدا پیاوێکم بینی نیوەی دەم و چاوی ڕەش ببوو کەدای پۆشیبوو جا لەبارەی ئەوە پرسیارم لێیکرد؟ ووتی: پەیمانم داوە هەرکەسێ پرسیارم لەبارەی ئەمەوە لێ بکات ئیلا بۆی دەگێڕمەوە، من زۆر پاشملە قسەم بە عەلی کوڕی ئەبی تالب دەووت، جا شەوێك خەوتم و لە خەومدا یەکێك هاتە لام، پێی ووتم: تۆ خاوەنی ئەم هەموو قسەو زەم کردنەی؟ جا زلەیەکی لەنێوچەوانم داو درزی

---

(٣١٧) المنامات : رقم (٢١٩).

تێکەوت کە هەڵسام لەخەو بینیم دەم چاوم ئاوا ڕەش بووە کە دەیبینیت[318]
مسعدە کە لە هیشامی کوڕی حسان دەیگێڕێتەوە، ئەویش لە واصل مولی ئەبی عەیینە، ئەویش لە موسای کوڕی عوبیدە، ئەویش لە صفیەی کچی شەیبە ووتی: من لەلای عائیشە بووم جا ئافرەتێك هاتە لای دەستی پێچرابوو، ووتی: من نەهاتوومە لات تەنها لەبەر دەستەکەم نەبێت، باوکم پیاوێکی بەخشندەو دڵفراوان بوو، وە لەخەودا بینیم پیاوان دەفرێکی گەورەیان لابوو ئەوەی بۆلایان دەهاتن ئاویان پێدەدا، جا باوکمم بینی ووتم: کوا دایکم؟ ووتی: سەیرکە ، جا سەیرم کرد، کە دایکم بینی هیچی لانەبوو تەنها پارچە پەڕۆیەك نەبێت، جا باوکم ووتی دایکت هەرگیز نەیبەخشیوە تەنها بەو پارچە پەڕۆیەو پارچە بەزێك کە لە مانگایەك کە کوشتبویانەوە جا پارچە بەزەکە توایەوەو نەما، دایکیشی دەیووت، ئاخ خنکام لە تینووان! ووتی: منیش دەفرەکەم وەرگرت و ئاوم دایێ، لەلای سەرمەوە یەکێ بانگی کرد: ئەوە کێ یە ئەو ئافرەتەی ئاودا خوا دەستی ووشك بکات، جا دەستم ئاوای لێهاتووە کە دەیبینیت.

حارس کوڕی ئەسەدالمحاسبی و أصبغ و خەلەفی کوڕی قاسم و کۆمەڵێك لە سەعیدی کوڕی موسەلەمە دەگێڕنەوە و دەڵێن: لەو کاتەی ئافرەتێك لای عائیشە بوو جا ووتی: بەڵێنم داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا هیچ هاوبەشێك بۆ خوا پەیدا ناکەم، و دزی نەکەم و داوێن پیسی نەکەم، وە کوڕەکەم نەکوژم و هیچ بوختان و درۆو دەلەسەیەك لەنێوان دەستەکانم و قاچەکانمدا نەکەم، و سەرپێچی نەکەم لە کاری چاکە کردندا، جا دڵسۆز دەبم بۆ خواکەم وخودای منیش لەگەڵمدا دڵسۆز دەبێت، جا سوێند بەخوا خودای گەورە سزام نادات، لەخەودا فریشتەیەك هاتە لای و ووتی، نەخێر تۆ خۆت بەدیار دەخەیت، و جوانیەکەت ئاشکرا دەکەیت، وە خێرو چاکەکانت دەپچڕێنیت، و دراوسێکەت ئەزیەت دەدەیت، وە لە پیاوەکەت

---

(٣١٨) المنامات: رقم (٢٢١)

یاخی دەبیت، پاشان هەر پێنج پەنجەکانی لەسەر ڕووی دانا، فریشتەکە ووتی: پێنج بە پێنجە وە ئەگەر تۆ زیادت کردایە ئێمەش بۆتۆمان زیاد دەکرد ، جا شوێنەواری پەنجەکانی لەدەم و چاوی دیاربوو.

نافیع ئەگەر قسەی بکردایە بۆنی میسك لەدەمی ئەهات، پێیان ووت: هەر کاتێك دادەنیشیت بۆنی خۆشت لێ دێت؟ ووتی من نە ئەمڕۆ وە نە دوێنێ بۆنم خۆش نەبووە، بەڵام من لەخەودا پێغەمبەرم بینیﷺ ئەو لەدەمی مندا قورئانی دەخوێند، جا لەوکاتەوە ئەم بۆنەخۆشە لە دەمی مندا دێت.

مسعده لە کتێبەکەیدا لە ((الرؤیا) باس دەکات ، لە ڕەبیعی کوڕی روقاش دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دوو پیاو هاتنە لام و لەلام دانیشتن، لە پاشملە غەیبەتێکی پیاوێکیان کرد، جا منیش قسەکانیم پێ تەواو کردن، جا لەدواییدا یەکێکیان هاتەلام و ووتی، لە خەومدا یەکێکی قولە ڕەش هاتە لام بەرازێکی لەتەنیشت بوو هەرگیز گۆشتی لەو قەڵەوترم نەبینیبوو، پێی ووتم: بیخۆ، منیش ووت: گۆشتی بەراز بخۆم؟ جا هەڕەشەی لێکردم، ئینجا گۆشتەکەم خوارد، لەو کاتەوە دەمم گۆڕانی بەسەردا هات، جا تا دوو مانگ بۆنی ناخۆش لە دەمیدا لانەچوو.

عەلائی کوڕی زیاد کاتێکی دیاریکراوی هەبوو بۆ هەڵسانەوە، ئەم شەوە بە خێزانەکەی ووت، من ماوەیەك دەنووم و پشوو دەدەم، ئەگەر ئەو کاتە هات هەڵمسێنن، جا ئەو کارەی نەکرد، جا ووتی لە خەومدا یەکێك هاتە لام و ووتی: ئەی عەلائی کوڕی زیاد هەڵسە لەخەو یادی خوا بکەرەوە خوای گەورەش یادت دەکاتەوە، ئینجا هەندێك مووی لە پێشەوەی سەرم وەرگرت و بردی ئەم مووانە لە پێشەوەی سەرم قیت بوەوە، جا ئەو مووانە لانەچوو تاوەکو مرد، یەحیای کوڕی بسطام دەڵێت: کاتێك شوشتمان ئەو ڕۆژەی مرد ئەو مووانە لە پێشەوەی سەری بە وەستاوی مابوونەوە.

ئیبن ئەبی دونیا لەئەبی حاتەمی رازی دەگێڕێتەوە، ئەویش لە محمد کوڕی عـەلی ووتی: ئێمە لە مەککە لە مزگەوتی پیرۆز دانیشتبووین، پیاوێك هەڵسا نیـوەی دەم و چاوەکەی ڕەش و نیوەکەی دیکەی سپی بوو، ئینجا ووتی: ئەی خەڵکینە عیبرەت لە من وەربگرن من جنێوم بەهەردوو شێخەکە (ئەبی بەکرو عومـەر) دەداو پاشملـە زەمــم دەکـردن، جـا شـەوێك خـەوتم و لـە خەومـدا یـەکێك هاتـە لام، دەسـتی بەرزکردەوەو کێشای بە دەم و چاوما، پێی ووتم: ئەی دووژمنـی خـوا، ئـەی گـومڕا ئایە تۆ جنێو بە ئەبوبەکر و عومەر دەدەیت؟ دەمبینن بەم حاڵەتە ماومەتەوە.

قەیرەوانی دەڵێت: شێخێکی پیاوچاك بۆمانی گێڕایەوە و ووتی: ئەبو حسن المطلبي پێش نوێژی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ بۆ منـی گێڕایەوە، ووتی: لە مەدینە شتێکی سەرسوڕهێنم بینی پیاوێك هەبوو جوێنی بـە ئەبوبـەکرو عومـەر دەدا ڕۆژێـك لـە ڕۆژەکانی پاش نوێژی بەیانی تووشی پیاوێك بوو هـەردوو چـاوی دەرپـەڕیبوو ئـاو دەڕژا بەسەر ڕومەتەکانیدا، ئێمەش پرسیارمان لێکـرد بەسـەرهاتەکەت چـی یـە؟ ووتی: دوێنێ لە خەوما پێغەمبـەرﷺ و عـەلیم بینـی ئەبوبـەکرو عومەریـشی لەگەڵدابوو، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئا ئەمەیـە ئـەوەی جنێومـان پێـدەداو ئەزیەتمان دەدات ، جا پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووم: کـێ فـەرمانی ئـەودی بـەتۆ داوە ئەی باوکی قەیس؟ پێم ووت: عەلی، ئیشارەتم بۆی کرد، جا عەلی لـێم نزیـك بووەوە، پەنجەی شایەتمان و ناوەڕاستی درێژ کرد و بۆ چـاوەکانی هێنـا، پێـی ووتم: ئەگەر درۆ بکەیت خوا چاوەکانت دەربهێنێت، پەنجەکانی خـستە چـاوەکانمەوە، جـا لەخەو هەڵسام خۆم بەو حاڵەتە بینیەوە ئەو دەگریـاو بـە خـەڵکی ڕادەگەیانـد، وە تۆبەو پەشیمانی خۆی ڕادەگەیاند.

قەیرەوانی دەڵێت: شێخێکی پیاو چاك بۆی گێڕامەوە ووتی: پیـاوێکی تێگەیـشتوو بۆ منـی گێڕایەوە ووتی: پیاوێك لای ئێمە بووزۆر بـە ڕۆژوو دەبـوو و دیاریـدەکرد، بەڵام ئەو ڕۆژوو شکاندنی دوا دەخست، جا لەخەودا بینـی وەك ئـەوەی دوو کـەس

وەك ئەوەی ڕەش بن قۆڵیان هەڵگرت و جـل و بـەرگی لەتـەنورێکی گەرمکـەربوو بۆئەوەی لەبەری بکات ، ووتی: بـەدوو کەسـەکەم ووت : لەسـەر چـی یـە ئەمـە؟ ووتیان: لەسـەر پێـچەوانەت بـۆ سـونەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، چـوونکە ئـەو فەرمانی داوە بە پەلە کردنی ڕۆژوو شکاندن وە تۆش دوای دەخەیت، جا وتی: ڕووم ڕەش بوو لەگەڵ بلێسەی ئـاگر، جـا ئـەو دەم و چـاوی خـۆی دادەپۆشـی کەلـەناو خەڵکدا دەڕۆیشت.

سەماکی کوڕی حەرب چاوی لەدەست دابوو جا ئیبراهیم خەلیلی لە خەودا بینـی دەستی بەسەر چاوەکانی هێنا، وە فەرمووی: بڕۆ بۆ سەر ئاوی فـورات، سـێ جـار خۆت لە ئاوەکە هەڵکێشە، جا ئەمەی کردو چاوەکانی چاك بووەوە.

ئیسماعیل ی کوڕی بیلالی حەزرەمی چاوی کوێر ببوو ، لەخەودا هاتنە لای جـا پێیان ووت، بڵێ یا قریب یا مجیب یـا سمیـع الـدعاء، ئـەی بەخشـشی ومیهرەبـان بەوەی دەیەوێت چاوەکانم بۆ بگەڕێنەوە ، جـا لەیـسی کـوڕی سـەعد ووتـی: مـن بینیومە کوێر بووە پاشان چاك بووەتەوە و بینیوویەتی.

ئیبن ئەبی دونیا دەڵێت: ئافرەتێك لە ئەهلی خێـرو چـاکە بەنەخۆشـی سـك ئێـشە لەسەر جێگا کەوتبوو ، لەخەویدا بینی یەکێك پێی دەڵێت : لا إلـه إلا ألله، ئـاوی کولاوو شەربەتی گوڵ بخۆرەوە ، ئافرەتەکە دەڵێت: جـا خواردمـەوەو خـوای گـەورە ئەوەی ئێش و ژان بوو بردیەوە.

ئیبن جەزار دەڵێت: من چارەسەری پیاوێکی ڕاهاتوو خـوو پێـوەگرم دەکـرد، لـەمن جیا بووەوە و دیار نەما، پاشان بینیمەوە ، پرسیاری حاڵەتەکەیم لێ ی کرد، ووتی: لە خەما مرۆڤێکم بینی لە جل و بەرگێکی ناسکدا خۆی بەسەر گۆچانێك دا دابـوو لەسەرم وەستاو ووتی، تۆ پیاوێکی خوو پێوە گری ((المدمن))؟ ووتم: بەڵێ، ووتی: مورەبای گوڵ بە هەنگوین هەیە، چەند ڕۆژێك بەکارم هێنا و چـاك بوومـەوە، جـا پێم ووت: ئەوە جالینووسە.

ڕووداوەکان لەو بابەتەدا زیاتر لەوەی کە باس کراوە، هەندێك لـە خـەڵکی دەڵـێن: کەوا بنچینەی پزیشکی لە خەونەکاندایە، گومـانی تێدانیـە کـەوا زۆر لـە یاسـاو نەریتـەکانی پـشتی بەسـتووە بەخـەو بیـنین هـەروەك هەندێکیـشیانی لـەبارەی تاقیکردنەوەیە، وە هەندێکیشیان لەبارەی پێوەرە، و هەندێکیشیان لەبارەی ئیلـهام بەخشینە، ئەوەی دەیەوێت هەڵوەسـتە لەسـەر ئەمـەدا بکـات بـا سـەیری (تـأريخ الأطباء) و (كتاب البستان للقيرواني) بکات.

***

## (دەربارەی ئەوەی کەوا ڕۆحی ئیماندار لە بەهەشتدایە)

بەڵگەی سەدو دوو: خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ﴾ (الأعـراف: ٤٠)، واتە: (( بێگومان ئەوانەی بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نـەهێناوەو خۆیـان لـە ئاسـتیدا بـە گـەورە داناوە ئەوانە دەروازەکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە)). ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئیمانداران دەرگای ئاسمانیان بۆ دەکرێتەوە ئـەم کردنەوەیـەش کردنەوەیـە بـۆ ڕۆحەکانیان لە کاتی مردندا هەروەك لە حەدیسەکاندا باسمان کردن، کەوا ئاسمان بـۆ ڕۆحی بڕوادار دەکرێتەوە تاوەکوکۆتایی دێت و دەگاتە نێوان دەستـەکانی قـودرەتی خودای گەورە.

بەڵام کافر دەرگاکانی ئاسمان بۆ ڕۆحەکەی ناکرێتەوە ، دەرگاکانی بەهەشـتیش بـۆ جەستەکەی ناکرێتەوە.

بەڵگەی سەدو سێ: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( يا بلال ما دخلت الجنـة إلا سمعت خشختك بين يدي، فبم ذلك؟))، ووتی: شـەوو ڕۆژێـك ڕانـەبردووەو ئـیلا

دەستنوێژم هەڵگرتووەو دوو ڕكعات نوێژم كـردووە ، فـەرمووی: ((بهمـا))، واتـە: ((بە هەردووكیان)) بەمانای: بە دەست نوێژو دوو ڕەكعات نوێژەكەیەوە دیارە كـەوا پێغەمبەرﷺ گوێی لە دەنگـی خشەخـشی نـەعلی بـیلال بـووە لـە بەهەشـتدا بێگومان ئەمە ڕۆحی بیلالە، ئەگەرنا لاشەكەی نەگوازراوەتەوە بۆ بەهەشت.

**بەڵگەی سەدو چوار:** حەدیـسەكان و نیـشانەكان كـەوا لـەبارەی سـەردانی گۆڕستانەكاندا، وە سەلام كردن لەسەر خاوەنەكەی و قسە كردن و گفتوگۆكردنیـان، وە هـەواڵ گەیانـدنیان لـەبارەی زانیـاری بـە سـەردانی كردنیـان، وەڵامدانـەوەی سەلامەكانیان، پێشتر هێنامان بۆ ئەمە كردووە .

**بەڵگەی سەدو پێنج:** سكاڵا كردنی زۆربەی ڕۆحی مردووەكان بۆخزمـەكانیان و كەسـانی دیكـەیان لـەبارەی كاروبـارێكی زیـان بـەخش، جـا دەبیـنین هـەروەك سكاڵایان كردووە.

**بەڵگەی سەدو شەش:** ئەگەر هات و ڕۆح بریتـی بێـت لـە نیـشانەیەك لـە نیشانەكانی لاشە یاخود تەنها كرۆك و گەوهـەرێك بـێ ، نـە بەجەسـتەیەك و نـە حاڵێكە تێیدا، وە ووتەیەك هەبووە دەڵێت: ڕۆحەكـە دەرچـوو ڕۆیـشت و هەسـتاوە هات، وە دانیشت و جـوولا، وە هاتـە ژوورەوەو گەڕایـەوە و هـەموو ئـەو ووتانـە ناڕەوان، چوونكە ئەو سیفەت و خاسیەتانە بەڵگەكان قەدەغـە دەكـات لـە ڕاسـتی نیشانەكان وە بەتاڵ كراوەكان.

**بەڵگەی سەدو حەوت:** لاشە پێكهاتـەو شـوێنە بـۆ ڕاپەڕانـدنی دەروون، ئەگەر هاتنە چوورەوەی لاشەو دەرچـوونی وە گواسـتنەوەی ڕێڕەوێكـی ڕۆیـشتن بـۆ هاتنە ژوورەوەی پێكهاتەكەی، جا ئەگەرچی دەروون نەشیا یاخود توانای نـەبوو بـۆ هاتنە ژوورەوەو دەرچوون و گواستنەوەو جوولەو وەستان، ئەگەر ئەمە لە گـەورەیی هاتنە ژوورەوەی پێكهاتەی ئادەمیزاد بێت بۆئەم جیهانـەو دەرچـوونی لێـی بـەبێ هاتنە ژوورەوەی لاشەكەی بێت، ئەمەش دیارە پووچ و بێ بنەمایە وە پێویستیشە

وابێت، وە هەریەکێك دەزانێت کەوا دەروون ڕۆحەکەیە ئەوا هاتووەو دەرچووەو گوازراوەتەوە و لاشەکە ڕایدەپەڕێنێت و دەیکاتە شوێنکەوتە بۆی لە هاتن و دەرچووندا، جا بنەڕەتیەکە بۆ ڕۆحەکەیەو شوێنکەوتنەکەش بۆ لاشەکەیە، بەڵام لاشەکە بۆ تەماشاکردنە وە ڕۆحیش بۆ عەقڵ و زانستە.

**بەڵگەی سەدو هەشت:** ئەگەر دەروون وابوایە هەروەك دەڵێن: ئەو نیشانەیە کەوا ئادەمیزاد هەر کاتێك سەد هەزار دەروون یا زیاتری دەگۆڕی، ئادەمیزادیش لە ڕاستیدا ئادەمیزادێکە بە ڕۆحەکەی و دەروونەکەی نەك بەلاشەکەی، وە ئادەمیزادیش ئەو ئادەمیزادە دەبوو کەوا پێشتر بە ساتێك وە دواییەکەی بە ساتێك نەدەبوو، ئەمەش جۆرێکە لە سەرسامی و دەردی دەروونی، ئەگەر ڕۆح تەنها پەیوەندیەکەی بەلاشە بەڕێوەبردن بێت نەك بە نیشتەجێ بوون و جێگیر بوون و چوونە ناو بێت ئەوا قەدەغە ناکرێت لەوەی پەیوەندی بپچڕێنێت بەو لاشەیە وە پەیوەندی دەکات بە یەکێکی دیکەوە وە ئەمەش بۆ کەسی عاقڵ و ژیر ڕێی تێناچێت و ناکرێت.

**بەڵگەی سەدو نۆ:** بێگومان هەموو کەسێك سورە لەسەر ئەوەی دەروونی وەصف کراوە بە زانست و بیرۆکەو ڕامان و خۆشەویستی و تووڕەبوون و ڕەزابوون و ڕق هەڵسان و شتی دیکە لەبارەکانی دەروونی، بزانە ئەوەی کەوا باس کراوە ئەوە نیە تەنها نیشانەیەك بێت، لە نیشانەکانی لاشەکەی ویاخود تەنها گەوهەرو کرۆکێك بێت جیابێت لەلاشەکەی نزیکی ئەو نەبێت، وە پێویستی و زەرورەتێك بێت بەوەی کەوا ئەو فام کردن و هەست کردنانە بۆ فەرمانێکە چووبێتە ناو لاشەکەی، هەروەك پێداگیرە بەوەی کەوا ئەگەر ببیستێ و ببینێ و بۆن بکات و تام بکات و هەست بکات و بجولێت و جێگیر بێت جا ئەو کاروبارانە بۆ دامەزراوە زیادکردن و پاڵ خستنێکە بۆ دەروونی خۆی، وە بێگومان کرۆك و گەوهەری دەروونیش ئەوەیە کەوا هەموو ئەوانەی بۆ دامەزراوە.

**بەڵگەی سەدو دە:** دەروون ئەگەرتەنهاو تەنها بێت و پەیوەندیەکەی بە لاشە تەنها پەیوەندیەکی بەڕێوەبردن بێت ، وەك پەیوەندی کەشتیوان بە کەشتیەوە وە ووشترەوانیش بە ووشترەکانی بێت ، ئەوا دەکرێت بەڕێوەبردنی ئەولاشەیە جێبهێڵێت و کاربکات بە بەڕێوەبردنی لاشەیەکی دیکە هەروەك کەشتیەوان و ووشترەوانیش دەتوانن ئەو کارە بکەن، وە لەمەشدا درووست و ڕێپێدانیش دەبێت بە گواستنەوەی دەروونەکان لە لاشەیەك بۆ لاشەکانی دیکە ، وە دەوترێت : دەروون بەلاشەکەیدا یەکانگیربووە جا قەدەغەی دەکات لەسەر گواستنەوەی ، یاخوود ئەو عەشقێکی سرووشتی بۆ لاشەکەی هەیە، تامەزرۆبوون و پەرۆشیەکی خودی هەیە بۆبەڕێوەبردنی ئەو لاشەیە جا لەبەر ئەو هۆیە قەدەغەی گواستنەوەی دەکات.

**بەڵگەی سەدو یازدە:** دەروونی ئادەمیزاد ئەگەر کرۆك و گەوهەرێکی تاك و تەنها بوایە نەهاتبایە ناو جیهان وە نە دەرچوونەکەی، نە پەیوەندی بە جیهان هەبوایە، وە نە لێی جیا بوایە، وە نە دەستی لێ هەڵدەگرێت و نە لە تەنیشتیەتیشی ، ئەوا پێویستە بیزانێت کەوا ئەو بەو سیفەتە بوونی هەیە، چوونکە زانیاری ئادەمیزاد بە دەروون و سیفەتەکانی خۆی لە هەموو زانراوێك ئاشکرا ترە.

**بەڵگەی سەدو دوازدە:** بێگومان ئەو لاشەیە بینراوە کەژاودیە بۆ هەموو خاسیەتەکانی دەروون وە هەستکردنی گشتی و بەشی، وە شوێنگەیە بۆ توانا لەسەر جووڵە خۆ ویستەکان، جا پێویستە بار هەڵگربێت بۆ ئەو هەست کردن و خاسیەتانە ئەویش لاشەیە ئەوەی تێدا نیشتەجێ یە ، یاخود دەبێت شوێنەکەی تەنها گەوهەرو کرۆکێك بێت نە چوونە ناوەوەی جیهان و نە دەرچوونەکەش بێت پێویستەو زەروورەتە بە درۆو ناڕەوا دابنرێت.

**بەڵگەی سەدو سێزدە** دەروون ئەگەر بێ بەش بێت لە جەستەی و لایەنگیری ناتوانێت کردارەکان قەدەغە بکات لەسەر بەرکەوتنی شوێنی کارەکە، چوونکە پشتگیرو لایەنگر نی یە ناهێڵێت ببێتە بەرکەوتوو بۆ پشتگیری و لایەنگرەکە، وە ئەگەر فەرمانەکە وابێت ئەوا کردارەکەی لەسەر ڕێچکەی داهێنان دەبێت و پێویستی نیە بۆ دەستکەوتنی بەرکەوتن و بەیەك گەیشتن لە نێوان بکەرو لە نێوان شوێنی کردارەکە، ئەگەر یەکێك لە ئێمە توانای هەبێت لەسەر جولاندنی لاشەکان بەبێ ئەوەی بەری کەوێت یاخود بەر شتێك بکەوێت ئەوا بەری دەکەوێت و دەستی لێدەدات، جا بێگومان دەروونیش لەلای ئێوە هەروەك توانای هەبووە لەسەر جولاندنی لاشە بەبێ ئەوەی لەنێوان خۆی و لەنێوان ئەوی دیکەدا بەریەککەوتن هەبێت، هەروەها تواناکەی ڕێگری ناکات لەسەر جولاندنی جەستە جگە لەو بەبێ بەریەککەوتن هەبێت بۆ ئەو وە نە کاتێك بەر یەك دەکەوێت، ئەوەش نارەوایە بە ناچاریش، زانراوە کەوا دەروون هێزی تیانیە لەسەر جولاندن تەنها بە مەرجێك کەوا شوێنی جوولەکە بەر یەك بکەوێت یاخود شتێك بەری بکەوێت ، ئەگەر ووترا: دەگونجێت دەرون کاریگەری هەبێت لەسەر جوولاندنی لاشە تایبەتیەکەی بەبێ مەرجی بەریەك کەوتن، کاریگەریشی هەیە لە جولاندنی جگە لەخۆی وە ستێنراوە لەسەر بەدەست هێنانی بەریەك کەوتن لەنێوان لاشەکە وە لەنێوان جەستەکەیدا ، جا وەڵامەکە: بێگومان کاتێك لاشەکە ڕازی بێت بۆ هەڵس و کەوت و دەسەڵاتی دەروون ئەوا ناوەستێتە سەر بەدەستهێنانی بەریەککەوتن لەنێوان دەروون و لە نێوان لاشەدا ، کەوا لەو حالەتەدا پێویست دەبێت هەروەك لە لاشەکانی دیکەشدا دا هەیە ، چوونکە لاشەکان یەکسانن لە قبوولکردنی جوولەدا.

**بەڵگەی سەدو چواردە** کەسایەتیە بیرمەندو ژیرەکان هەموویان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کەوا ئادەمیزاد ئەو زیندەوەرە قسەکەرە نان خۆرە خەوتووە هەستیارە جولێنەرە بە ویست و ئیرادەیەیە ، وە ئەو خاسیەتانەش دوو جۆرن : خاسیەتێك بۆ

لاشەکەیەتی ، وە خاسیەتێکیش بۆ ڕۆح و دەروونە قسە کەرەکەیە ، جا ئەگەر ڕۆح ئەو گەوهەرو کرۆکە تەنیابێت نەیێتە ناو ئەو جیهانە و نەلێشی دەربچێت وە نەپێی بگات و نە لێشی جیابێتەوە، ئەوا ئادەمیزادیش نەدەچێتە جیهان و نە لێشی دەچێتە دەرەوە وە نە پەیوەندی پێوە دەکات و نە لێشی جیا دەبێتەوە، وە یاخود هەندێکی لەو جیهانەدا بێت و هەندێکی دیکەی نەچێتە ناو جیهان و نەلێشی بچێتە دەرەوە، وە هەموو بیرمەندێك دەزانێت وە بەناچاریش کە ئەمە نارەواو قسەی بێ مانایە، بێگومان ئادەمیزاد بە گشتی لاشەو ڕۆحەکەی چوتە ناو جیهانەکە، وە ئەمەش لە نارەوابیدا هاوشێوەی ئەو ووتەیەیە کە دەڵێت: کەوا دەروونەکەی کۆنەو دروستکراو نیە، جا وایان داناو کەوا نیوەی ئادەمیزاددروستکراوەو نیوەکەی دیکەشی دروستکراو نیە.

**بەڵگە سەدو یازدە** بێگومان هەر بیرمەندو عاقڵێك ئەگەر پێیانی ووت: ئادەمیزاد چی یە؟ ئەوا هێما دەکات بۆ ئەو شێوەی لەش و ئەوەی لەسەری دامەزراوە، فەرمانێکی بەبیر دا نایەت جیاوازو پێچەوانە بێت بۆی تەنها نە لەو بوونەوەرەو نە لە دەرەوەی دابێت وە زانیاریش بۆ ئەمە پێویستیە کە نە گومان و نە دوودڵیش قبوڵ ناکات.

**بەڵگەی سەدو شازدە** کەوا بیرمەندو ژیرەکانی هەردوو جیهان دادوەرن بەوەی ووتارەکە ڕووبەڕووی دەبێتەوە بۆ ئەو لاشەیەو ئەوەی تێیدا دامەزراوە تێیدا نیشتەجێ یە، هەروەها پیا هەڵدان و زەم کردن و چاکەو سزاو هاندان بۆ حەزو ئارەزووەوە وە مەترسی ترساندن، ئەگەر پیاوێك ووتی: پێسپێردراو نوێنەرەکەو پیاهەڵدانەکەو زەمکراوەکەو قەدەغەکراوەکەو بێژەرەکەو ئاقڵ و زیرەکە تەنها گەوهەرو کرۆکێکە نە لەو بوونەوەرەدایە وە نە لەدەرەوەی بوونەوەرەکەدایە، وە نە پەیوەندی پێوەیە هەیە، و نە لێشی جیا دەبێتەوە، ئەوا ئاقڵ و بیرمەندەکان بە ئەقڵ و فامی پێدەکەنن وە تەنگی پێ هەڵدەچنن لەسەر درۆکردنەکەی، ئەوەی

بینیت لەسەرەتای دەست پێشخەری و ڕاشکاویەکانی زیرو بیرمەندان بە درۆ خستنەوەی و مایە پووچی ئەوان ئەو ساخبوونەوەو ئاشکرا کردنەش لەسەر بەڵگەی بوونی ئاشکراکان لەسەر تەندروستی هەبوونی شتی مەحاڵ و نەگونجاو وە سەرکەوتن و هاوکاریش لە خواوەیە.



**( لە بارەی وەڵامدانەوە بۆ بەڵگە هێنانی ناکۆك و دژکارەکان )**

ئەگەر وتیان، لە ڕاستیدا باسی بەڵگەکانتان کرد کە هێماو ئاماژەیە لەسەر لاشەکەی و پاراستن و پشتگیریەکەی، وەڵامتان چی یە بۆ بەڵگە هێنانەوەی ناکۆك و دژکارەکان بۆ ئێوە لەم بارەیەوە؟ جا ئەوان بە چ ڕوویەك بەڵگە دەهێننەوە:

**یەکەم:** یەك دەنگی زاناو بیرمەندان لەبارەی ووتەکانیان: ڕۆح و جەستەو دەروون و جەستە، ئەو بەشتێك دایدەنێن جگە لە جەستە جا ئەگەر جەستە بێت ئاوا بۆ ئەو ووتەیە هیچ واتایەك نابێت.

دووەم: ئەمەش بەهێزترینیانە کەوا بیانووی پێ دەهێننەوە: لە ڕاستیدا زانراوو ئاشکرایە کەوا لەناو بونەوەراندا شتێك نیە جگە لەوەی شیاوە بۆ دابەشکردن، وەك خاڵێك و گەوهەرێکی بێ هاوتا، بەڵکو ئەمە واجبێکی بوونەوەرە[319] جا واجب و پێویستە کەوا زانیاری بەو شتە دەبێت شیاوی دابەش بوون نەبێت، پێویستە ئەوەی باسکراو دەبێت لەم زانستە دا وە بریتی یە لە شوێنەکەی خۆی کە ئەمەش شیاوی دابەشبوون نیە، ئەمەش دەروونە، جا ئەگەر جەستە بوایە ئەوا گونجاو دەبوو بۆ دابەش بوون، وە ئەو بەڵگەش دەسەلمێندرێت لەسەر ڕوویەکی دیکە.

(٣١٩) سەیری : تفسیر القرطبي: ٧/٣٢٤ بکە .

سێ یەم: لە ڕاستیدا وێنەو نیگاری ژیری و بیرکردنەوەیەکی تەواو بێ گوومان ڕووت و تەنهایە، تەنهایی و بێ لایەنیەکەش یاخوود بە هۆکاری لێ وەرگرتن دەبێت یاخود بەهۆی وەرگرتنەوەکەیە، و یەکەمیش بەتاڵ و پووچە ، لەبەر ئەوەی ئەو وێنانە لە ڕاستیدا کەسایەتیە باسکراوەکان وەرگیراوە بە کەل و پەلێکی جیاوازو بارودۆخێکی دیاریکراو، وە سەلمێندراوە کەوا بێ لایەنی و تەنهاییەکەی لە ڕاستیدا بەهۆی لێ وەرگرتنیەتی و هێزی عەقڵ و بیرکردنەوەکەش ناونراوە بە دەروون.

**چوارەم:** هێزی ژیرو کارامەیی کاریگەری دەبێت لەسەر کردەوەکانی بێ سنوور، ئەمەش لەسەر هەستدارەکان و بێ کۆتاییەکان بەهێز دەکات، هێزی جەستەییش کاریگەری نابێت لەسەر کردەوە بێ کۆتاییەکان ، چوونکە هێزی جەستەیی دابەش دەبێت بەدابەش بوونی شوێنگەکەی ، جا ئەوەی کاریگەری لەسەر هەندێکیان دەبێت پێویستە کەمتر بێت لەوەی کاریگەری لەسەر هەمووی دەبێت ، ئەوەیشی کاریگەری لەسەر هەمووی دەبێت زیاد دەبێت لەسەر ئەوەی کاریگەری لەسەر هەندێکیان هەیە بە چەند جارەی کۆتاییەکان، وە زیادەش لەسەر کۆتاییەکە بەئەوپەڕی ئەو پەڕی یەکەیە.

پێنجەم: هێزی ژیری و کارامەییش ئەگەر حاڵەتێك بێت لە ئەندامێکی جەستەی ئەوا پێویست دەبوو کەوا هێزی ژیری و ئەقڵی هەمیشە هەستیار بێت بۆ ئەو ئەندامە یاخود هەستیارێکی نەگونجاو بێت بۆی بەتەواوەتی، و هەردووکیانیش بەتاڵ و نارەوان، چوونکە درك پێکردنی هێزی ژیری بۆ ئەو ئەندامە ئەگەر بوونەکەی چاودێر بێت جا ئەمە مەحاڵەو نەشیاوە، ئەگەر وێنەیەکی یەکسان بێت بۆ بوونەکەی ئەمەش دەبێتە حاڵەتێك لە هێزی ژیریداگۆڕراوە بۆ ئەو ئەندامە پێویستە هەردوو وێنە هاوشێوەکە کۆبێتەوە وە ئەمەش مەحاڵە.

**شەشەم:** هەموو کەسێك هەست بەخۆی دەکات ، وە هەست کردن بە شت بریتی یە لە ئامادەبوونی ماهیەت و مەبەستی دڵنیاییە لەلای کەسی زاناو بیرمەند، جا ئەگەر خۆمان ناسی، جا ئەمەش یان دەبێت لە پێناوی ئامادەبوونی ناودارەکانمان بێت، یاخوود لە پێناوی وێنەیەکی یەکسان بۆ ناودارانمان لەناو ناودارەکانماندا، وە بەشی دووەم بەتاڵە وە ئەگەر نا دەبێت هەردوو نموونەکە کۆببنەوە، جا سەلمێندراوە کەوا هیچ مانایەك بۆ زانستەکەمان نیە لە خودی خۆمان تەنها ئامادەبوونی خودی خۆمان نەبێت.

**حەوتەم:** ئەوەی ئەبو بەرکان بەغدادی بیانووی بۆ دەهێنێتەوە وە ئەوەی وەك ئەوە بەتاڵی دەکاتەوە جا دەڵێت: گومان نەکەین کەوا هەریەکێك لە ئێمە بتوانێت خەیاڵ بکات بە دەریایەك لە جیوەو چیایەك لە مرواری، خەیاڵ کردنی چەندەها ڕۆژو مانگ، جا ئەو نیگارە خەیاڵیانە نەبوو و بێبەش نابێت لەبەر ئەوەی هێزی خەیاڵ کردن ئاماژە دەکات بۆ ئەو نیگەرانە وە نێوان هەر نیگارو وێنەیەك لەگەڵ یەکێکی دیکە جیادەکاتەوە، لە ڕاستیدا کاریگەری بوونی ئەو خەیاڵکردنە ئەوا دەبێتە بینەرێکی هەستیار، دیارو ئاشکراشە کەوا پوخت و بێ خەوشی و پاکی و سادەیی ئەمە ناسەلمێنیت، ئێمە بە پێویستی دەزانین کەوا ئەو وێنانە لەبەر چاواندا دیارنیە، جا سەلمێنراوە کەوا لەبیرو زەینەکاندا بوونی هەیە، جا دەڵێن: شوێنی ئەو وێنەیە یاخود جەستە بێت یاخود بارو جۆرێکە لە جەستە، یاخود نە جەستەیە وە نەبارێکە لە جەستە، وە دووبەشی یەکەم بەتاڵو نارەوان چوونکە وێنەی دەریاو چیا وێنەیەکی مەزنە و مێشك و دڵیش جەستەیەکی بچووکە، وە کارتێکردنی گەورە لە بچووکدا مەحاڵە، جا سەڵمێنراوە کەوا شوێنی ئەو وێنە خەیاڵیە نەلە جەستە دایە وە نە لە قەبارەشدایە.

**هەشتەم:** ئەگەر هێزی ژیری و کارامەیی قەبارەی لاوازو بێهێز بوو لە کاتی پیریدا هەمیشەیی یەو بێ هۆ نیە.

نۆیەم: لەڕاستیدا هێزی ژیری دەوڵەمەند لە کردارەکانیدا بۆ لاشـە، دەوڵەمەنـدیش نەدەبوو لە کارەکەیدا بۆ جەسـتە دەبێـت دەوڵەمەنـد بێـت لـە خـودی خۆیـدا بـۆ جەستە، ئاگاداری یەکەم: کەوا هێزی ژیری هەست بە خۆی دەکـات وە مەحاڵیـشە کەوا لەنێوان خۆی و لەنێوانی ئەودا ئەندامێکی ناوەندی بەدەست بهێنێت، وە درك بە هەستیاری خۆی دەکات، ئەم هەست بە خۆکردنەش بە ئەندام و کەرەسـتە نیـە، هەروەها ئەو هەست کردنەش بە جەستە کەوا ئەو ئەندامەکەیەتی و لە نێوان ئـەوو لە نێوان ئەندامەکەی ئەندامێکی دیکە نیە، وە ئاگاداری دووەم لە دوو ڕووەوەیە:

**یەکەمیان:** هێزی قەبارەی وەك بینین و بیستن و خەیاڵکردن و داڵغـە لێـدان ئەگـەر هات و قەبارەی بێـت ئـەو هەسـت کردنـی خۆیـەتی کارەکـەی پێناکرێت، و درك پێکردنەکەشی لەبەر ئەوەی هەست کردنە بۆ خاوەنەکـەیان وە درك پێکـدرنی ئـەو جەستانەش بۆ بارهەڵگرە، ئەگەرچی هێزی ژیری قەبارەیی پۆزشی هێنابێتەوە لـەو سێ کاروبارەدا.

**دووەمیان:** کەوا چاوگەی کردارەکەش دەروونە، ئەگەرچی دەروونیش پەیوەست بووە لە وەستان و دامەزراندنی و بوونی بەجەسـتە ئـەم کردارانـەش بەدەسـت ناهێنێـت تەنها بە بەشداری کردنی جەستە نەبێت ، وە کاتێـك سـەلمێنرا کـەوا هـەر وانیـە، سەلمێنراوە کەوا هێزی ژیری دەوڵەمەندە بۆ جەستە.

**دەیـەم:** هێـزی جەسـتەیی و قـەبارەی مانـدوو و شـەکەت دەبێـت بـە زۆربـوونی کردارەکـان، وە کاریگـەر نابێـت لەسـەر هێـز لـەدوای بـێ هێـزی و لاوازبوونـدا، هۆکارەکەشی دیارو ئاشکرایە، جا هێزی قەبارەی بەهۆی شارەزایی لە کردارەکانـدا کەرەستەکەی تووشی هەڵوەشانەوەو ووشك بوون دەبێت و ئەمەش لاوازی پێویـست دەکات، بـەڵام هێـزی ژیـری ئـەوا لاواز نابێـت بـەهۆی زۆربـوونی کردارەکـان، وە کاریگەرو بەهێز دەبێت لەسـەرهێز لـەدوای لاوازیـدا جـا پێویـست دەکـات کـەوا قەبارەی نەبێت.

**یازده‌یه‌م:** ئێمه کاتێك دادوه‌ریمان کرد به‌وه‌ی که‌وا ڕه‌شی دژ کاره به سپێتی پێویسته له فکرو زه‌یندا ماهیه‌تی ڕه‌شی و سپێتی ده‌ستکه‌وێت، کاره ئاشکراکه‌شی دادوه‌ره به‌وه‌ی کۆبوونه‌وه‌ی ڕه‌ش و سپی و گه‌رمی و ساردی له جه‌سته‌کاندا شتێکی مه‌حاڵه، جا کاتێك ئه‌و کۆبوونه‌وه‌یه به‌ده‌ست هات له هێزی کارامه‌ییدا پێویست به‌هێزێکی قه‌باره‌یی و لاشه‌یی نابێت.

**دوازده‌یه‌م:** ئه‌گه‌ر شوێنی هه‌ستکرده‌کان جه‌سته بێت، هه‌موو جه‌سته‌یه‌کیش دابه‌شکراوه مه‌حاڵیش نیه، قه‌ده‌غه نابێت که‌وا به‌هه‌ندێك به‌شه‌کانی جه‌سته زانست به شت په‌یدا بکات وه به‌هه‌ندێکی دیکه نه‌زانین، له‌و کاته‌دا ناده‌میزاد له‌یه‌ك حاڵه‌تدا زانیارو بیرمه‌نده به شتێك و نه‌زانیشه به شتێکی دیکه.

**سێزده‌یه‌م:** توخمی جه‌سته‌یی و قه‌باره‌یی ئه‌گه‌ر نه‌خش و نیگاری تایبه‌تی به‌ده‌ست هێنا، جا بوونی ئه‌و نه‌خش و نیگارانه تێیدا قه‌ده‌غه ده‌کات له به‌ده‌ست هێنانی نه‌خشی دیکه، به‌ڵام نه‌خش و نیگاری ژیری و کارامه‌یی به دژ کارو پێچه‌وانه‌یه له مه‌دا، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ده‌روونه‌کان ئه‌گه‌ر به‌تاڵ و چۆڵ بێت له گشت زانست و هه‌ست کردنه‌کان، ئه‌وه فێربوونی له‌سه‌ر قورس ده‌بێت، جا ئه‌گه‌ر شتێك فێر بوویت ئه‌وا به‌ده‌ست هێنانی ئه‌و زانستانه دیارو ئاشکرا ده‌بێت له‌سه‌ر ئاسانی ئه‌وی دیکه، نه‌خشه‌و نیگاری قه‌باره‌ی جیا جیایه‌و دژکاره، وه نه‌خش و نیگاری ژیری و کارامه‌ییش هاریکارو پشتگیرو یارمه‌تیده‌ره.

**چوارده‌یه‌م:** ده‌روونیش ئه‌گه‌ر جه‌سته بوایه ئه‌وا ده‌بوو، نێوان ویستی به‌نده‌که له جوڵاندنی پێیه‌که‌ی وه نێوان جوڵاندنی خودی خۆی ماوه‌یه‌کیشه به‌سه‌ر توانای جووله‌ی جه‌سته‌و قورساییه‌که‌ی جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ده‌روون جولێنه‌ره بۆ جه‌سته‌که وه چاککراویشه بۆ جولاندنه‌که‌ی، جا ئه‌گه‌ر جولێنه‌ر بۆ پێیه‌که جه‌سته بوایه، ئه‌و کاته له‌و ئه‌ندامانه به‌ده‌ستی ده‌هێنا یاخود بۆی ده‌هات، ئه‌گه‌ر بۆی بهاتایه ئه‌وا بێگومان پێویستی به ماوه ده‌بوو، ئه‌گه‌ر تێیدا به‌ده‌ستی هاتبایه ئێمه ئه‌گه‌ر ئه‌م

ئەندامەمان بڕی کەوا جوولەی پێدەکردنەوا لە ئەندامەکە شتێکی جولێنەر نەدەمایەوە جا ئەگەر ئەو جولێنەرە تێیدا دەستی کەوتبایە ئەوا شتێك دەمایەوە لەو ئەندامەدا.

پازدەیەم: ئەگەر دەروونیش جەستە بوایە ئەوا دابەش دەبوو، بۆ درووستی کردنەوەی ئەوا هەندێکی دەزانێت هەروەك هەمووی دەزانێت، جا ئادەمیزاد وای لێدەدات بەهەندێك شتی لەدەوری خۆی زانیارو تێگەیشتوو بوایە وە لەهەندێکی دیکەشدا نەزان و بێ ئاگابوایە ، ئەمەش مەحاڵە.

شازدەیەم: ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا پێویست دەبوو کە لاشە بارقورسی بکردایە بە چوونە ناویەوە لەبەر ئەوەی کاروباری جەستەیەکی بەتاڵ ئەگەر بە شتێك پڕبوو وەك دەفرو جەوەندەیەکی بەتاڵ وایە، کارو فەرمانەکەش بەپێچەوانەیە، وە لاشەش لەهەموو کاتێك سووکترە ئەگەر هاتوو دەروونی تێدابێت، وە لەهەموو کاتێکیش قورسترە کاتێك دەروون لێی جیابۆتەوە.

حەڤدەیەم: ئەگەر دەروون ئەم جەستەیە بوایە ئەوا لەسەر خاسیەتی گشت جەستەکان دەبوو کەوا هیچ شتێکی لێ بەتاڵ ناکاتەوە لە سووکی و قورسی و گەرمی و ساردی و نەرمی و زبرو ڕەقی و ڕەشی و سپی و زۆری دیکە لە سیفەتی جەستەکان و جۆرەکانی، وە زانراوە کەوا چۆنیەتیە دەروونیەکان کەوا بریتیە لە کارە چاکەکان و کارە ڕیسواییەکان ئەو چۆنایەتیانەش جەستەیی و قەبارەیی نین جا دەروونیش جەستە نیە.

هەژدەیەم: دەروون ئەگەر جەستە بوایە ئەوا واجب دەبوو کەوا بکەوێتە ژێرهەموو هەستیارەکان یاخود لەژێر هەستێك یان دوو هەست یان زیاتر دەبوو، جا ئێمە جەستەکان وا دەبینین هەروەها تێیدایە درك دەکات بە گشت هەستدارەکان، وە تێیدایە درك دەکات بە زۆربەیان، وە تێیدایە درك دەکات بە یەك هەست یا دوو هەیت، وە دەروونیش بێ تاوان و دوورە لەو هەموو شتانە، ئەم بیانووەش کەوا

جەهمیەکان لەسەر کۆمەڵێك لە مولحیدەکان بیانووی پێدەهێننەوە لەو کاتەی ئینکاری خودای پاك و بێگەردیان کردو وتیان: ئەگەر بوونی هەبوایە ئەوا پێویست بوو درکی بکردایە بە هەستێك لە هەستەکان جا بە دەروون بەرهەڵستکاریانکرد.

**نۆزدەیەم:** ئەگەر دەروون جەستەیە بوایە ئەوا خاوەنی درێژی و پانی و قووڵی و ڕوو و شێوەی دەبوو، وەئەو کەرەستەو کەل و پەل و دووریانە هەڵناستێك تەنها بە ماددەیەك و شوێنێك نەبێت جا ئەگەر ماددەو شوێنەکەی دەروون بێت ئەوا پێویست دەبوو هەردوو دەروونەکە کۆببێتەوە و ئەگەر دەروونیش نەبێت ئەوا دەروون پێکهاتووە لە لاشەو وێنە وە ئەمەش لە جەستەیەك پێك هاتووە لە لاشەو وێنەدایە، جا ئەو کاتە ئادەمیزاد دەبووە دوو ئادەمیزاد.

**بیست:** لە ڕاستیدا لە تایبەتمەندی جەستەدا کەوا قبووڵی کەرت بوون و پارچە پارچە کردن بکات وە پارچەی بچووکیش تێیدا وەك گەورەکە نیە، ئەگەر ڕازی بێت بە کەرت بوون جا هەر پارچەیەك لێی ئەگەر دەروونێك بێت ئەوا پێویست دەبوو بۆ ئادەمیزاد دەروونی زۆری هەبوایە نەك تەنها یەك دەروون، ئەگەر دەروونیش نەبێت ئەوا ئەو هەمووە دەروون نیە، هەروەك ئەگەر بەشێکی ئاوەکە ئاو نەبێت ئەوا گشتیەکەی ئاو نابێت.

**بیست و یەك:** بێگومان جەستە پێویستی بە پشتگیری و سەرپەرشتیارو چاودێری و مانەوەکەی هەیە بۆ دەروون لەبەر ئەوە بەرەو نەمان و پوکانەوە دەچێت کاتێك لێی جیادەبێتەوە جا ئەگەر جەستە بوایە ئەوا پێویستی بە دەروونێکی دیکە دەبوو هەتا دوایی، وە فەرمانەکە بە زنجیرە دەڕۆیشت، ئەوەش مەحاڵە لە ڕاستیدا ئەگەر دەروونەکە جەستە بوایە.

**بیست و دوو:** ئەگەر جەستە بوایە ئەوا پەیوەندی بە جەستەوە دەبوو ئەگەر لەسەر ڕێگای خۆتێخستن بوایە ناچار دەبوو بچێتە ناو جەستەکان، ئەگەر لەسەر ڕێگای

پێوەنووسان و دراوسێیەتی بوایە ئەوا ئادەمیزادێك دەبوو دوو جەستەی بەیەكەوە نووساوو یەكێكیان دەبینی و ئەوی دیكەیان نەی دەبینی.
جا ئەمە هەمووی ئەو ڕوونكردنەوەیەیە كەوا ئەو كۆمەڵە ناڕەوایە لە گومڕاكان و ڕیسواكەران و بێزراوان هێناویانە، وە ئێمەش لەبارەی ئەوەوە وەڵامی هەموویان وەرز بە وەرز دەدەینەوە.

❊❊❊

## ( لەبارەی وەڵامدانەوە لەسەر گومانی دووەم )

بەڵام گومانی دووەم بریتی یە لە بەهێزترین گومانیان كەوا پێی دەگەن، بەسەریدا بەرزدەكەونەوە، وە ئەوەش دامەزراوە لەسەر چوار پێشەكی:
**یەكەم:** لەهەبووندا قەبوڵی دابەشكردن نیە بە ڕوویەك لە ڕووەكان.
**دووەم:** ئەو دەشێت زانیاری پێی هەبێت.
**سێ یەم:** زانیاریەكەی پێیەتی دابەش ناكرێت.
**چوارەم:** پێویستە هەروەها ببێتە شوێنی زانیاریەكە ، ئەگەر جەستە نەبوایە ئەوا دابەش دەبوو، لەو بارەیە بیرمەندو زانایان ناكۆكی و جیاوازیان هەیە دەڵێن: بەڵگەكیان نەهێناوەتەوە لەسەر ئەوەی كە لەبونەوەردا دابەش كردنی هەستی تێدا دابەش ناكرێت وە نە خەیاڵیش بەڵكو داواكان بەدەستی ئێوەیە، ئەمەش ڕاستی تێدانیە، لەڕاستیدا سەلماندوویانە لە واجبی بونەوەردا ئەوەیە بەگوێرەی ڕەسەنایەتیان بەتاڵە لەلای گشت بیرمەندو زانایان لەئەهلی وەرس و بێزارەكان وە كەسانی دیكە لەوانە ئینكاری ماهیەتی خودای گەورەو سیفاتەكانی دەكەن.

دەڵێن: ئەو خاڵەی كەوا پێی ڕووندەكەنەوە ئەوا لە ئاشكراترین و دیارترین ناڕەوای بەڵگەتانە لەبەر ئەوەی دەروون دابەش ناكرێت، ئەمەش حاڵەتێكە لە

جەستەیەکی دابەشکراو دایە، لە ڕاستیدا ڕزگاری بووە لـە دابەشـکراودا کـەوا لـە دابەشکراودا نیە ، پاشـان سـەلمێنراوی گەوهـەرە پـاك و بـێ هاوتایەکـە کۆمەڵـە قسەکەرەکانن، ناکۆکیتان لەگەڵدا دەکەن لەو بنچینەیەدا، وە دەڵێن: گەووهەرەکـە لە جەستەدا تواوەتەوە، بەڵکو ئـەو لـەو پێکهـاتووە، وە ناکرێـت و مـومکین نیـە بەڵگەکەتان تەواو بکرێت تەنها بە دوور خستنەوەی گەوهەرو کرۆکە بێهاوتاکە، جا ئەگەر ووتان: خاڵەکە بریتی یـە لـە کۆتـایی هێڵەکـە وە لەناوچـوونی وونبـوونی، ئەمەش فەرمانێکی هیچ لەبارنەبوونە، ڕوونبونەوەکەتان پێ بەتاڵ دەبێـت، ئەگـەر فەرمانێکی هـەبوون بوایـە ئـەوا لەدابـەش بووندا ڕزگـاری دەبـوو جـا بەڵگەکـە لەهەردوو هەڵسەنگاندن و پێشبینیەکە بەتاڵە.

هەروەها دەڵێن: بۆچی زانست نابێتە حاڵەتێك لە شوێنەکەیدا، نەك لەسەر ڕووی جۆرەکەو کارلێکردنەکە جا ئەگەر خستنە جێی هەر شتێك لە شوێنەکەی دابێت بە گوێرەی خۆی، خستنە جێی گیانلەبەر لە ماڵدا جۆرێکەو خستنە جـێ نیـشانەکەش لە جەستەدا جۆرێکە، وە خستنە جێی هێلێیش لە پەرتوکـدا جۆرێکـە وە خـستنە جێی ڕۆنیش لە کونجیدا جۆرێکە، وە خستنە جێی جەستەش لە نیشانەدا جۆرێکـە، وە خستنە جێی ڕۆحیش لە لاشەدا جۆرێکە وە خستنە جێی زانیـاری و زانـستەکان لە دەرووندا جۆرێکی دیکەیە.

ووتیان: هەروەها یەکگرتنیش بە ئەنجام گەیشتووە، جا ئەگەر گەوهـەرو کـرۆك بوایە ئەوا گەوهەرێکی بێ هاوتا کە دەسـەلمێنراو بەڵگەکـەتان بـەتاڵ و بـێ سـوو دەبوو لەبەر ئەوەی تەواو ناکرێت و تـەنها بـە دوور خـستنەوەی، ئەگـەر نیـشانەو ئەندامێك بێت ئەوا پێویستە شوێنی بۆی هەبێت، شوێنەکەی ئەگەر دابەشـکرابوو، ئەوا دەگونجا بە هەسـتانی دابەشـنەکراوێك بـە دابەشـکراوێك ئەمـەش گەوهـەرو کرۆکەکەیە بەڵگەکەش بێ کەڵك بوو، جا ئەگەر ووتان، یەکگرتن کارو فەرمانێکی نەبوونیە لە دەرەوە هیچ بونێکی نییە، ئەمەش کـەوا بەڵگـەتان پـێ هێناودتـەوە،

بونێکه دابەش ناکرێت وە هەمووش کاروفـەرمانێکی نەبوونیـە لـە دەرەوەدا هـیچ بونێکی نیە ، جا لەبەر ئەوەی واجبی بونەوەرەکە کەوا سـەلماندووتانە فـەرمانێکی نەبوونی و هیچە، بەڵکو بونەوەرەکە ئەستەمە.

ووتیان: هێزی خەیاڵی و بیرکردنەوەی جەستەییە لەلای پێشەواکەتان ئـیبن سـینا جا پێویست دەکات تووشی بەش بەش و پارچە پارچـە بێـت، وە ئەمـەش مەحاڵـە چوونکە ئەگەر دابەشکرا ئەوا هەر یەکێك لە پارچەکان ئەگەر وەك ئـەو بێـت ئـەوا بەشێکی یەکسان دەبێت بۆ هەموان ئەگەر وەك ئەویش نـەبێت ئـەوا نابێتـە ئـەو بەشانە.

وە دیسان خەیاڵ مانای نیە تەنها ئەوە ببێتە هاورێ و ئەوەش ببێتە دوژمـن وە ئەمەش قەبوڵی دابەش بوون ناکرێت.

ووتیان: لە راستیدا بوونەوەر لەلای ئێوە فەرمانێکی زیادەیە لەسـەر ناوەرۆکـەکان، جا ئەگەر پێویستی دابەش بوونی حاڵەکەیە بۆ دابەش بوونی شـوێنەکەی پێویـست دەکات دابەش کردنی ئـەو بوونـەوەرە بـە دابـەش بـوونی شـوێنەکەی بێـت، ئـەم دیمەنەش پێویست ناکات و ناگونجێت لە دانانی بوونی شتێك جگـە لـە نـاوەرۆك و مەبەستەکەی.

ووتیان: دیسان سرووشتی ژماردنەکان مەبەستی جیاوازی تێدایە، جا تێگەیـشتن لە بوونی دە دەییەکان یەك تێگەیشتن و یەك مەبەستی تێدایـە، ئـەو مەبەسـتەش یاخوود تووش بووە بۆ هەر یەکێك لەو یەکەیی یانە، ئەمەش ئەستەمە، یاخود ئەو دابەشکراوە بە دابەش بوونێکی ئەو یەکەییانـە، وە ئەمـەش ئەسـتەمە، چـوونکە تێگەیشتن لە بوونی دەدەیی یەکە قەبوڵی دابەش کردن نیە، بەڵی دەیەکـە قـەبوڵی دابەش کردن دەبێت نەك دەیی یەکان.

ووتیان: هەروەها چۆنایەتیەکان کەوا پەیوەندیان بە چـەندیەکان و برەکـان هەیـە وەك خرِبـوون ونیگارەکـان وە نموونـەی ئەوانـە لـەلای فەیلەسـوفەکان نیـشانەو

ڕووداوێکە بوونی هەیە لە شێوەو وێکچوونی خڕبوونەکە ئەگەر پێشهات بێت یاخود دەبێت بە تەواوی وەستاوو دامەزراو بێت وە یاخوود دەبێت بە هەمووی یەك لە بەشەکان بێت، وە ئەمەش ئەستەمە، وە یاخود ئەو پێشهاتە یاخود ئەو نیشانەیە دابەش بکرێت بە دابەش بوونی بەشەکان، وە هەڵبسێت بەهەموو بەشێك لەبەشەکانی هێڵەکە کە بەشێك لە بەشەکانی ئەو پێشهاتەو نیشانەیە، وە ئەمەش ئەستەمە، لەبەر ئەوەی بەشەکەی ئەگەر خڕ بێت دەشێت بەشی دائیرەکە بازنەیی بێت، ئەگەر خڕیش نەبێت جا لەکاتی کۆبوونەوەی بەشەکان ئەگەر فەرمانێکی زیادە ڕوونەدات پێویست دەکات خڕیەکە بە ئەنجام نەگات، وە ئەگەر فەرمانێکی زیادە ڕوویدا، ئەوە دابەشکراوەکە بووە، دابەشکردنە گەڕاوەتەوە، وە ئەگەر دابەش نەکرا ئەوا حاڵەتەکە دابەش نیە، وە شوێنەکەی دابەش کراوە..

ووتم: ئەمەش بۆ ئەوان گرنگی و بایەخی نیە، جا ئەمەش بۆ ئەوانە کاتێك دەڵێن: وا: دابەش دەبێت بە دابەش بوونی شوێنەکەی بە گوێرەی ئەو وەك هەموو نیشانە وەستاوەکان کەوا بەرەو ڕووی دەبێتەوە لە سپێتی و ڕەشێتی، بەڵام ئەوەی دابەش نابێت وەك درێژی جا مەرجی بەدەست هێنانی کۆبوونەوەی بەشەکانە، وە پەیوەندیش لەسەر مەرجەکە نەبوون و نەمانە بە نەمان و لابردنەکەی.

پشت بەستن لە بێ کەڵك و بەتاڵکردنی ئەو گومانە لەسەر ئەوەی کەوا زانست بەشێوەیەکی گۆڕاو نیە لە دەروونداا، وە بەڵکو ئەوە ڕێژەیەکە وە زیادەختنێکە لە نێوان زانیاری و زانراودا، هەروەك لەبارەی بینیندا دەڵێین: بەهەست و سۆزو کارتێکردنی وێنەیەکی یەکسان نی یە بۆ بینەرلە هێزی بینایی چاودا ، بەڵکو ئەمە ڕێژەیەکە و زیادە خستنە سەرێکە لەنێوان هێزی بینایی و بینراودا.

زۆربەی ئەوانەی گومانیان لا درووست بووە کەوا هێناویانە لەو وەرزددا دامەزراوە لەسەر کارتێکردنی وێنەیەکی دیارو زانراودا لە هێزێکی زانین دا، پاشان

دایانەزراندووە لەسەر ئەمەدا کەوا دابەش بوون و کەرت بوون لە دابەش بووندا دابەش و کەرت ناکرێت مەحاڵ و ئەستەمە.

هەمیسان ئەگەر ئێمە ئەوەمان لە ئێوە وەرگرت ئەوا لەدیارترین بەڵگەیە لەسەر بێسوودی ووتەکەتان، چوونکە ئەو وێنەیە ئەگەر حاڵەتێك بێت لە ناوەڕۆك و گەوهەری دەرونێکی قسەکەر، ئەمە وێنەی بەشێکی بچووکە کە هەموو نیشانە گۆڕاوەکان لەو دەروونە بەشە بچووکە دا بەراوردی دەکات، ئەگەر وای دابنێین ئەو وێنانە لەگەڵ تەواوی ئەو پاشکۆیانە بێت ئەوا وێنەیەکی پاك و بێ هاوتا نابێت، بەڵکو بەراورد کراوە بە پاشکۆکان و نیشانەکان وە ئەمەش گشتی قەدەغە دەکات.

جا ئەگەر ووتتان: مەبەست لە بارودۆخ و بوونیەکەی بە تێکڕاییە ، ئێمە ئەگەر ئەو پاشکۆو پاشبەندانەمان لێی سڕیەوە وە وامان دانا خۆی سەرپاکی شتەکەیە، پێمان ووتن: جا ئەگەر ئەو درووست بوایە نابێت بوترێت: ئەو وێنەیە گۆڕاوە لە توخمێکی جەستەیی تایبەت بە میقدارو بڕێکی دیاریکراو و بەهەموو دیاریکراوێك ، تەنها ئەگەر ئێمەی ئەوەمان لێی سڕیەوە، وە وامان دانا کە خۆی بە پلەو پایەی ئەو وێنەیە بووە کەوا کارەییمان پێ کردووە جا دیاریکراوو بڕیار لەسەر دانیش لە بەرامبەر دیاریکراوو بڕیار لەسەردانەکە وە ڕەهایەکی وەرگیراو کە خۆیەتی ئەمەیە لەبەرامبەر شوێنە ڕەهاکەیەتی، تا ئەمەش پەسەندو گونجاوە کەوا بیرو ئەقلە ڕاست و داد پەروەرە ڕاستەکان شایەتیان بۆی داوە، جا دەرکەوتووە کەوا ئەو گومانە لە خراپ ترین و بێ سوود ترین گومانەکانە.

جا ئەگەر وێنەی زانیاریەکانیان هەژمار کردن، کردیانن بە گشتی و ئێمەش لە شوێنەکەی هەژمارمان کرد ، ئێمەش بە تێکڕای دامان ناوە، ئەگەر بەشێکی دیاری کراویان وەرگرت جا ئەمە شوێنەکەیەتی، جا تێکڕاییش لە بەرامبەر تێکڕاییە، وە بەشیش لە بەرامبەر بەشە.

لەسەر ئەمە دەڵێین : لە زەین و هۆشدا تێکڕایی و گشتی نیە ، بەڵکو لە ڕاستیدا لە زەین و هۆشدا وێنەیەکی دیاریکراو ناسراوو چاپکراو لەسەر تێکڕای تاکەکانی هەیە ، جا ئەگەر بەو ڕەچاو کردن و گرنگی پێدانە بە تێکڕایی ناونرا ، ئەوا لە ووتەو دەربڕینەکاندا مشت و مڕی ناوێت، ئەمەش تێکڕای و بەش بەشە بەهەردوو ڕەچاوکردنەکە.

※※※

## ( لە بارەی کەوا وێنەکانی بیرو ئەقڵ و هۆشی پەتی و بێلایەن نیە )

ووتەکانیان لە دیەنی سێ یەمدا : کەوا دیەنەکانی ئەقڵی تێکڕایی بێ بەشە، بەبێ بەش کردنەکەشی لە ڕاستیدا بەهۆی لێی وەرگرتنەوە ئەویش هێزی ئەقڵیە.

وەڵامەکەشی دەوترێت: چیتان دەوێت بەو وێنە ئەقڵیە گشت یە؟ ئایە دەتانەوێت پێی کەوا زانراوەکەی لە هەمان جیهانەکە بەدەست هێناوە یاخود زانیاریەکەی پێی لە هەمان جیهانە کە بەدەست هاتووە؟.

جا یەکەمین دیارو ئاشکرایە و دووەمینیش ناردنەوەو بەرەو ڕووکردنەوەیە، هەق وایە لەبەر ئەوەی کە هیچ سوودێکی بۆتان نیە ، چوونکە فەرمانی تێکڕایی هاوبەش لە نێوان کەسایەتیە مرۆڤایەتیەکان بریتیە لەو مرۆڤایەتیەی هیچ زانستێکی پێ نییە، مرۆڤایەتیەکەش هیچ بوونێکی نیە لە دەرەوەی گشتی یەکە وە بوونیش لە دەرەوەدا تەنها بۆ دیاریکراوەکانە، زانیاریش شوێنکەوتەی زاراوەکەیە، لەبەر ئەوەی کەوا زانراویش دیاریکراوە، زانیاریش تێیدا دیاریکراوە، بەڵام ئەو وێنەیەکی هاوشێوەو وێکچووە، لەسەر زۆربەی تاکەکان ، لەزەین و هۆشدا نیە وە نە لەدەرەوەیدا وێنەیەك ئێستا دابەشنەکراوە.

لەو بابەتەدا چەند کۆمەڵێك لەبیرمەندان و زانایان تێیدا بەهەڵە داچوون کەوا کەس ژمارەیان نازانێت تەنها خوای گەورە نەبێت، وێنەو دیمەنی تێکڕایی کەوا دەیسەلمێنن و پێداگیری لەسەر دەکەن ئەگەر حاڵەتێکە لە دەروونا لە وێنەیەکی باسکراو بە نیشانەکانی کەسایەتی ، جا ئەو وێنە نەقڵانیە دەستی بە گۆڕانکردن کرد لە گەهەرو کرۆکێك نە لە جەستەیەك وە نە لە قەبارەیەك و شێوەیەك ئەو بێ بەش و پەتی نیە لە نیشانەو تووش هاتووەکان.



## ( لەبارەی ئەوەی کەوا هێزی کرداری کاریگەری دەبێت لەسەر کردارە بێ سنوورەکان )

ووتەکانتان لەبارەی دیمەنی چوارەمدا، کەوا هێزی فیکرو ئەقڵ کارتێکەرە لەسەر کردەوە بێ کۆتاییەکان، وە هیچ شتێك نیە لە هێزی شێوەیی یاخوود قەبارەی وەك ئەمە ، وەڵامەکەی: ئێمە وا وەرینەگرین کەوا ئەو کاریگەری هەیە لەسەر کردارە بێ کۆتاییەکان.

ووتەکانتان: کەوا ئەو کاریگەری هەیە لەسەر هەستیارەکان کەوا کۆتایی نایەت، درك کردن و هەستارەکانیش کارو کردەوەن، دوو پێشەکی و سەرەتایی درۆو دەلەسەن، ئەو درك پێکردن و هەستیارانەی ئەگەرچی پێگەیشتووە، جا ئەگەر لە هەر هەزارێك هەزار پێگەیشتوو هەبێت ئەوا زرنگ و هۆشیارەکانیش هێشتا بێ کۆتایین، ئەمەش هەرگیز لە هۆشیاری و زرنگی کۆتایی نایەت تا ئەو کاتەی ناتوانرێت شتی دیکە بەسەریدا زیاد بکەیت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ (يوسف:٧٦)، واتە: (( وە لەسەر هەموو خاوەن زانست و زانیاریەکەوە زاناو شارەزاتر هەیە ))، تاوەکو زانست و زانیاری کۆتایی دێت وە

دەگات بەو کەسەی کەوا بە شتێك زاناو شارەزایی هەیە، ئەمەش ئەو خودا گەورەیە کە جگە لەو هیچ خوایەکی دیکە نیە و تاك و تەنهایە، ئەمەش لە تایبەتمەندیەکانیەتی کەوا هیچ کەسێك بەشداری لەگەڵ دا ناکات و جگە لە خۆی نەبێت.

جا ئەگەر ووتتان: ئەگەر زانست و هۆشیاریەکەی گەیشتە سنوورێك نەتوانرێت لەسەری زیاد بکرێت، پێویستە شتەکە وەرگەڕێت لە توانینی خودی، ووتمان: ئەمە ڕاستیەکەیە ئەگەر درووست بێت بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا هێزی جەستەیی و قەبارەی کاریگەری هەیە لەسەر کردارەکانی بێ کۆتایی، ئەمەش پێویست بە کەوتن و بێ کەڵك کردنی گومانەکان دەکات.

هەروەها کەوا هێزی خەیاڵکردن و بیرکردنەوە کاریگەری هەیە لەسەر ئامادەکاری خەیاڵکردووەکان وە یادنامەکان تاوەکو بێ کۆتایی، لەگەڵ ئەوەی لەلای ئێوە هێزی قەبارەیی و شێوەی هەیە.

بەڵام درۆی پێشەکی دووەم: کەوا پێگەیین و هەستیاری بەکردار نیە جا پێویست ناکات لەبارەی کۆتایی کردارەکەی ژیری و توانەکەی کۆتایی بهێنێت، لە ڕاستیدا ڕاتانگەیاندووە: بەوەی کەوا گەوهەری ئەقڵی و هۆشی گونجاوە بۆ وێنەیەکی دیارو ئاشکرا نەك ئەوەی فەرمانکەرە بۆی ، یەکەم شتیش لەلای ئێوە بکەرو بە تواناو گونجاو نابێت، وە ڕاتان گەیاندووە بەوەی کەوا جەستەکان و قەبارەکان کردارەکان قەدەغەی دەکات بەوەی کەوا کۆتایی بۆی نیە ، و نادیارو نەناسراوەکانیش قەدەغەی ناکات و کارتێکەرەکانیش کۆتایی نایەت.

❊ ❊ ❊

**( لەبارەی ئەوەی کەوا هێزی ژیری جیانابێتەوە لە ئەندامێکی جەستەیی )**

ووتەکانتان لە دیەمنی پێنجەمدا: ئەگەر هێـزی ژیـری جیـابۆوە لـە ئەنـدامێکی جەستەیی یاخود قەبارەیی کەواتە پێویست دەبێت کەوا هەمیشە هەستیار بێت بـۆ ئەو ئەندامە، یاخود قەدەغە بکرێت لە پێگەیین بۆی، جا ئەمەش وەسـتاوە لەسـەر بنـچینە خراپـەکانیان لـە ڕاسـتیدا تێگەیـشتن یـاخود پێگـەیین بریتـی یـە لـە دەستکەوتنی وێنەیەکی یەکسان بۆ پێگەیشتوو لە هێزێکی پێـشکەوتوودا، پاشـان ئەگەر ئەو بنچینەیەمان لە ئێوە وەرگرت هیچ سوێکتان بۆ نابێـت، لەبـەر ئـەوەی دەستکەوتی ئەو وێنەیە مەرجێك دەبێت بۆ دەست کەوتنی ئیـدراك و پێزانینەکـە، بەڵام ئەگەر ووترا: کەوا درك پێکردن چاودێری دەستکەوتنی ئەو وێنەیەیە جا ئـەوە ناڵێت : هە ئاقڵ، جا بۆ نابێت: کەوا هێـزی ژیـری جیـا بۆتـەوە لـە جەسـتەیەکی تایبەت، پاشان هێزێکی بێژەر بۆی دەست دەکەوێت حاڵەتێکی زیادەیی ناودەنرێـت بە هەست و شعورو پێزانین، جا لەو کاتەدا هێزێکی ژیری دەبێتە هەستیار بـۆ ئـەو ئامرازە یاخود ئەندامە، جا کاتێك ئەو حاڵەتە زیادیەی تێدا نەبێت ئەوا بێگومـان لێی بێ ئاگاو غافڵ دەبێت، جا ئەگـەر ئـەوە ببێـت ئـەوا ئـەو گومانـە یەکـسەر دەکەوێت و نامینێـت، پاشـان دەڵـێین: ئایـە داوادەکـەن ئەگـەر ئێمـە شـتێکمان تێگەیاند جا وێنەیەکی ئامادە لە ئەقڵێکی یەکسان بۆ ئەو کارە شیاوە لە هـەموو ڕویەك و گرنگـی پێـداتێك، یـاخود ئـەو یەکـسانیەی دەسـت ناکـەوێت لەهـەموو ڕوێکەوە؟ یەکەمین ناڵێت : ها ئاقڵ، ئەمەش دیارترینیانە بۆ ئـەو کەسـەی بـڕو بیانووی دەهێنێتەوە بۆ نارەواییەکەی.

هەروەها، تەندرووستی شیکراوەتەوە لە کرۆکی دڵ و دەماخدا، وە دیەمنی تووش بوو شیکراوەتەوە لە هێزی ژیریدا، هەریەکێك لـەو دیەمنانـە شـوێنێکە بـۆ هێـزی ژیری، وە دووەمیش تێیدا تواوەتەوە جا بۆ ئەو بەهاو چاردنووسە بـەش ناکـات لـە جیاوازیدا؟ دیسان ئەگەر ئێمە مەسافەیەکی درێژو دووریەکی درێژکراوەمان بینـی،

ئایە ئەو بینینە ڕاوەدەستێت لەسەر وێنەکێشانی دیەنێکی بێزاودا لە چاوێکی بینەردا یاخود ڕاناوەستێت؟ ئەگەر ڕاوەستا ئەوا پێویستە دوو نموونەکە کۆببێتەوە چوونکە هێزی بینین لەلای ئێوە جەستەیی و قەبارەییە، ئەمەش بریتی یە لە شوێنێك کەوا قەبارەو بڕی هەبێت ، جا ئەگەر قەبارەی بڕەکەو بینینەکەی دەستکەوت ئەوا پێویستە هەردوو نموونەکە کۆبێتەوە ، وە ئەگەر لەوێدا گونجاو بوو ئەوا لە مەسەلەکەی ئێمەدا شتێك نابێت وەك ئەو؟ ئەگەر هەست کردنی شتێك ئەوەستێتە سەر دەستکەوتنی وێنەیەکی بینراو لە بینەردا ئەوا ووتەکەتان بێسوود بوو، چوونکە هەست پێکردنی دڵ و دەماخ دەوەستێتە سەر دەست کەوتنی وێنەیەکی دڵ و دەماخ لە هێزێکی ژێریدا.

***

## ( لەبارەی درك پێکردن و دەرووندا )

ووتەکانتان لە دیەنی شەشەمدا: لە ڕاستیدا هەر یەکێك درك بەخۆی دەکات و خۆی دەناسێت، درك پێکردنیش بریتی یە لە دەستکەوتنی ناوەڕۆکی زانراو لەلای زانادا، وە ئەمەش لە ڕاستیدا ڕاست دەردەچێت ئەگەر هاتوو دەروون دەوڵەمەند بوو لەبارەی شوێنەکە تا کۆتاییەکەی.

جا وەڵامەکەی: ئەمەیان وەستاوە لەسەر بنچینەی ڕابردوو ، وە ئەمەش کەوا زانست بریتی یە لە دەست کەوتنی وێنەیەکی یەکسان بۆ زانین و زانیاری لەهەمان زانادا، وە ئەمەش لەچەند ڕوویەکەوە نارەواو بێ کەڵکە کە باسکراوە لە مەسەلەی زانستدا، هەتاکو ئەگەر ئەوەش وەرگیرا جا وێنە باسکراوەکە مەرجێکە لەبەدەست هێنانی زانستەکە نەك ئەمەیان هەمان زانستە.

هەروەها ئەو گومانەش لەگەڵ بێ هێزی و لاوازی ووتەو دەربڕینەکانی و خراپی پێشەکیەکانی هەڵوەشاوەو پەسەندکراوە، ئێمە ئەگەر بەردێك یاخود پارچە

دارێکمان وەرگرت ووتمان: ئەمە خۆی گەوهەرێکی بەکەڵك و نایابە، خۆی ئامادەو گەورەیە لەلای خۆی، جا پێویستە لەناو بێگیانانەدا لەناو خۆیاندا زانایەك هەبێت. هەروەها گشت گیانلەبەران لەناو خۆیاندا هەست دەکەن، ئەگەرچی بوونی شتەکەش هەست پێکراو بێت بەخۆی پێویست دەکات خۆی ببێتە گەوهەرێکی نایاب و بێ هاوتا، پێویست بوو دەروونی گیانلەبەران بە گشتی گەوهەری نایاب و بێ هاوتا بانایە ، وە ئێوەش لەمەدا ئاوا نالێین.

***

## ( لەبارەی خەیاڵکردن و دەروونندا )

ووتەکانتان لە دیمەنی حەتەمدا: یەکێك لە ئێمە خەیاڵی دەریایەك لە جیوەو چیایەك لە یاقوو ت وە شتی دیکە دەکات، ئەمەش گومانی (ئەبی برکات بەغدادی)یە، گومانێکی زۆر پووچە چوونکە دامەزراوە لەسەر ئەوەی کەوا ئەو خەیاڵاویانە کاروبارێکن بوونیان هەیە، ئەمەش کارتێکراوە لە دەروونێکی بێژەر کارتێکردنی دەروونەکە لە شوێنی خۆی، هەردەم زانراوە کەوا ئەو شتە و خەیاڵانە هیچ ڕاستیەکی لەناو خودی خۆی تێدانیە، لە ڕاستیدا زەین و بیرکردنەوەیە مەزەندەو پێشبینیەکە دەسەپێنێت وە نەك کارتێکراوە لە دەرووندا ،لەبەر ئەوەی زانست دەرەکی دیمەنەکەی کار لە دەروون ناکات، جا چۆن بە خەیاڵێکی نەبوون ئەمە دەکرێت؟ ئەمە پووچەڵکردنەوەیەکەوە قەدەغەی ناکات لە ڕوودانی جیاکردنەوە لە نێوان شتە نەبوونەوە پاڵدەرەکان ، چوونکە هەر ئەقڵە نێوان نەبیستن و نەدیتن و هەستی بۆن نەکردن و شتی دیکە جیادەکاتەوە، پێویست ناکات بەو جیاکردنەوەیە ببێتە شتێکی نەبوون ، بەڵکو جیادەکرێتەوە لەنێوان جۆرەها شتی ئەستەم و نەشیاو کەوا ناکرێت ئێستا بوونی هەبێت پاشان دەڵێین: ئەگەر ئەقڵ ڕێی

تێچوو شێوەکان و تواناکان شی بکرێتەوە لەوانەی تاك و بیٚ هاوتان لەسەر قەبارەی و بڕی و چەندی لەهەموو ڕوێکەوە ، ئایە ڕێی تێناچێت زانستەکە بە شێوەیەکی مەزن و بڕێکی گەورەو لە جەستەیەکی بچووکدا دابنرێت؟ وەهەروەها جا ئەگەر هەڵسەنگاندن نەبوو لە هەموو ڕوێکەوە قەدەغە ناکرێت لە دانانی دیمەن و شێوەیەك لە گەوهەرو کرۆکێکی ڕوون و نایابدا، جا هەڵسەنگاندنێکی گەورە لەسەر بچووك لە پێشترە کەوا قەدەغە نەکرێت لە دانان دیمەنێکی گەورە ، لە شوێنێکی بچووکدا.

هەروەها ئەگەر پێشینەکانتان لە ڕابردووان بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە لەسەر کارتێکردنی وێنەیەکی دانراو لە گەوهەرو کرۆکێکی مەحاڵ و ئەستەم ئەوا چەند دیمەن و ڕووێکی لیٚ باس بکەن.



## ( لە بارەی تەندرووستی و جەستەییدا )

ووتەکانتان لەبارەی دیمەنی هەشتەمدا: ئەگەر تەندرووستی لە جەستەیی دایە ئەوا لەکات و سەردەمی پیریدا لاوازو بیٚ هێز دەبێت ئایا وانیە؟

ڕووی یەکەم: ناکرێت بووترێت: ئەو توانایەی پێویستی پێیەتی لە تەندروستێکی لاشەدا لەتەواوی هێزی ژیریدا بڕو چەندێکی دیاریکراوە، بەڵام تەواوی حاڵەت لاشە لە تەندروستدا ئا ئەمە گرنگ و بایەخدار نیە لە تەواوی حاڵەتی تواناو هێزی ژیریدا، ئەگەر ئەمەش نەگونجا بکرێت دوور نابێت بوترێت: ئەو توانایەی پێویستی پێیەتی ماوەتەوە تا کۆتایی پیری جا ئەقڵ و ژیریەکەش تاکۆتاییەکەی ماوەتەوە.

ڕووی دووەم: کەوا بەساڵاچووەکە لەوانەیە بتوانێت بەردەوام بێت لە هەستیارەکانی ژیریی وئەقڵیدا لەسەر تەندرووستێك کەوا ڕێی تێبچێت هەندێك لە ئەندامانی

بێنێتەوە کەوا خراپ بوون و تێکچوون و گۆڕان تێیدا دوا بکەوێت، جا ئەگەر خراپ بوون و گۆڕان تێیدا کۆتایی هات ئەوا هەست و ئەقڵ و شریریشی خراپ دەبێت و تێك دەچێت.

**ڕووی سێ یەم:** قەدەغە ناکرێت کە هەندێك میزاج و ڕەوشت و ڕەفتار هاوڕاو ڕێکەوت بێت بۆ هەندێك هێزو توانا ، جا لەوانەیە بە میزاج و ڕەفتاری بە سالآچووەکە هاوڕاو ڕێکەوت بێت بۆ هێزو توانایەکی ژیری، لەبەر ئەو هۆکارەش هێزی ژیری کاری تێدەکات.

**ڕووی چوارەم:** ڕەفتارەکە ئەگەر لە ئامانج و مەبەستێکی هێزو توونداێت ئەوا هەموو هێزەکان بەهێز دەکات جا هێزی سێکسی و ئامەزرۆیی وە تووڕەیی زۆر بە هێزو بەتوانا دەبێت وە هێزی ئەو کارتێکردنەش ئەقڵ قەدەغە دەکات لە تەواو بوون، جا ئەگەر پیریەکە تووشی بوو وە بێهێزی و لاوازیەکەش تووشی بوو بەهۆی لاوازی و بێهێزی ئەوا لەو کارتێکردنە بەرهەڵستکارو قەدەغە کارەدا بۆ ئەقڵ بێ هێز دەبێت لە تەواو بوون و پێگەیین دا، هەروەها لە ئەقڵ و ژیریشدا لاوازی بەدیهاتووە، بەڵام کاتێك لە ئەقڵدا لاوازی بەدی دێت ئەوا لە دژە کارەکانیدا لاوازی یەکە بەدی دێت جا کەم کوری و ناتەواوی لەهەردوو لایەنەکەدا سارێژ دەکات وە کەم و کوری و ناتەواوی لە لایەنەکەی دیکە یەکسان تێك دەچێت.

**ڕووی پێنجەم:** کەسی بەسالآچوو زۆر زانست و تاقیکردنەوەی لەبەر کردووە و پاراستویەتی ، وە کاروبارەکانی ڕاهێناوەو کاری لەسەر کردووە، ئەو بارانەش دیاری دەکات لەسەر بوونی فیکرو هۆش و هێزی بینین جا کەم و کوریەکە بەدیدێت بە هۆکاری لاوازی لاشەو کارتێکردنەکە.

**ڕووی شەشەم:** لە ڕاستیدا زۆری کردارەکان بە هۆکاری دەستکەوتی موڵك و دەسەڵاتە قایم و بنج و کوتاوەکان دەبێت جا ئەو زیادە دەستکەوتووە بەو ڕێگایە

دەبێتە کارێکی سەپێنەر بۆ ناتەواویەکی دەستکەوتوو بەهۆی تێکچوون و شـێوانی لاشەکە.

**ڕووی حەوتەم:** لە سەحیحێکدا لە پێغەمبەرﷺ سەلماندوویانە کەوا فەرموویـەتی (( یهرم ابن آدم وتـشب فیـه خـصلتان: الحـرص وطـول الأمـل))[320]، واتـە:(( ئـەو نەوەی ئادەم تێیدا پیر دەبێت و بەساڵدا دەیچوێنێ دوو شـتن : بەدەنگـەوە هـاتن و پشوو درێژی لە ئومێدی و هیواییدا بوون)). وە ڕاستی ڕووداوەکان شایەتن لەسـەر ئەو حەدیسە، لەگەڵ ئەوەی سوور بوون لەسـەر پـەیمان و بـەڵێن و سـەر ڕاستی و درێژایی هیوا خواستن لە بەهێزکردنی جەستەیی و لە سـیفەتە دێرینەکانـە، پاشـان کەوا لاوازی لاشە ئەو دووسیفەتە لاوازی ڕابردووی تێدا واجب نابێ جا بزانـە کـەوا ئەو ناگونجێت لە تێکچوون و شێوانی لاشەو بێهێزیەکەی سـیفەتی لاشەیـشی تێـدا بێهێزو لاواز دەبێت.

**ڕووی هەشتەم:** ئێمە زۆر لە پیرو بە ساڵاچووان دەبینین گەیشتوون بـە تێکـچوون و خەڵەفاوو گێلی و لاوازی ئەقڵدا، بەڵکو ئەوە لە زۆربەیان دایـە، ئـەوەی بەڵگەشـە لەسەری ئەم فەرموودە پیرۆزەیە کەوا خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمِنْكُمْ مَنْ يُـرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُـرِ لِكَيْ لا يَعْلَمَ بَعْـدَ عِلْـمٍ شَـيْئاً ﴾(النحـل:٧٠)، واتـە: (( هەتانـە تەمەنی درێژ دەبێت و دەبرێتەوە بۆ لاوازترین تەمـەن (کەنـەفتی و کەنەفتـەکاری) تاوەکو دەگاتە ڕادەیەك کە دوای ئەو هەموو زانست و زانیاری و تێگەیشتنەی کـە هەیبوو، هەموو شتێکی لەبیردەچێتەوە وە هیچ نازانێت)).

جا کەسی بەساڵاچوو لە لاوترین تەمەنی منـداڵ یـاخوود حاڵـەتی لـەو خـراپتر دەبێت وە بەڵام ئەوەی نەگەیشتە ئـەو ڕادەیـە ئـەوا ئـەو نابرێتـەوە بـۆ لاوازتـرین تەمەنی .

---

(٣٢٠) مسلم : (١٠٤٧) ، ورة مسند أحمد : ١١٥/٣.

ڕووی نۆیەم: هیچ پێویستیەك وبەردەوامیەك نیە لە نێوان هێزی لاشـەیی و هێـزی دەرووندا، وە نە لەنێوان لاوازی لاشەو لاوازی دەرووندا، دەکرێـت پیاوێـك بەلاشـە بەهێز بێت بەڵام دەروونی لاوازەو ترسنۆکەو ڕووخاوە، دەکرێت لەلاشـەدا لاوازبێـت بەڵام لە دەرووندا بەهێز بێت، جا دەبێتە پیـاوێکی ئـازاو جەربـەزە لەسـەر لاوازی لاشەکەشی .

ڕووی دەیەم: ئەگەر لەوەی باستان کرد لێتان وەرگرین بەڵگەی نەبێت لەسەر بـوونی دەروون کەوا گەوهەرو کرۆکێکی دەگمەن و بێهاوتا نە لە ناوەوەی بوونـەوەردابێت و نە لە دەرەوەیدا، وە ئەو نە لەناو لاشەدا بێت و نە لە دەرەوەیـدا، چـوونکە ئەگـەر ئەو لاشەیەکی ڕوونی درەوشاوەی ئاسمـانی و پێـچەوانە بێـت لەگـەڵ جەسـتەکانی زەویدا، ئەوا نەدەگونجا بە شل بوونەوەو توانەوەو گـۆڕان هـەروەك لاشـەکانی زەوی دەگونجێن بۆ کاردانەوە.

❊❊❊

## ( لەبارەی ئەوەی کەوا هێزی ژیری و تەندرووست دەوڵەمەند نیە لە جەستەدا )

وتەکانتان لە دیمەنی نۆیەمدا: کە تەندرووستی باش دەوڵەمەندە لـە کردارەکانیـدا لە جەستەدا، کەچی دەوڵەمەند نیـە لـە جەسـتەدا لـە کردارەکانیـدا کاتێـك لێـی دەوڵەمەند بووە لە خۆیدا تا کۆتاییەکەی.

وەڵامەکەی دەوترێت: پێویست ناکات لە سەلماندنی یاسایەك لە هێـزی جەسـتەییدا سەلماندنی نموونەی ئەو یاسایە لە گشت هێزە جەستەییەکاندا وە لەگەڵتانین جگە لە داوایەکی ڕووت و پێوەرێکی بێسوود.

هەروەها وێنەو نیشانەکانیش پێویستی هەیە بۆ شوێنەکەی ، پێویستیەکەشی بۆ ئەو شوێنە نیە تەنها تەنانەت بۆ خۆی نەبێت.

❊❊❊

## ( دەربارەی کەوا هێزی جەستەیی و قەبارەیی بە زۆربوونی کردارەکان لاواز نابێت )

وتەکانتان لەبارەی دیمەنی دەیەمدا، کەوا هێزی جەستەییە بە زۆربوونی کردارەکان لاوازو بێ هێز دەبێت، وە کاریگەری نابێت لەسەر هێزەکە پاش لاواز بوونی تا کۆتایی، وەلامەکەی: کەوا هێزی خەیاڵی جەستەییە ، پاشان ئەو لەسەر خەیاڵکردنی شتە مەزنەکان لەگەڵ خەیاڵکردنی شتە بێ بایەخەکان بەهێز دەبێت جا دەکرێت کەوا خەیاڵی گڕو بڵێسەیەکی بچوك لە جیاتی ئەوەی خەیاڵی مانگ و ڕۆژ بکەیت.

هەروەها بینێکی باڵا هێز بەرهەڵستی دەکات لە بینینی شتە لاوازەکان، جا لەبەر ئەوە دەڵێین: بیرمەندو زانا مەزنەکان بەرهەڵستی دەکات لە بیرکردنەوەی شتە گونجاوە لاوازەکان جا خەریك بوون لە زانین و ناسینی گەورەیی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان و ناوە پیرۆزەکانی و سیفەت وخەسڵەتەکانی قەدەغەو بەرهەڵستی دەکات لەسەری لەو حاڵەتدا بیرکردنەوە لە سەلماندنی گەوهەرێکی تاك و بێ هاوتا و نایاب و ڕاستیەکەی.

❊❊❊

## ( لەبارەی ووتەكانیان: ڕەشی دژكارە بۆ سپیێتی )

ووتەكانتان لە بارەی دیەنی یازدەهەم: ئێمە ئەگەر بڕیارماندا بەوەی كە ڕەشە پێچەوانەو دژە كارە بۆ سپیێتی واجب دەبێت كەوا لە زەین و فكردا ماهیەتی ڕەشی و سپیێتی پێكەوە دەستكەوێت. زانینەكەشی دادوەرە بەوەی كەوا پێكەوە كۆبوونەوەیان لەجەستەدا ئەستەمە.

وەلامەكەی: لەڕاستیدا ئەوە دامەزراوە لەسەر ئەوەی هەركەسێ هەستی بە شتێك كرد ئەوا لە خودی هەست پێكراوەكەدا وێنەیەكی یەكسان بۆ بەهەست پێكراوەكە بەئەنجام گەیشتووە، وە ئەمەش ناڕەواو بێ كەڵكە، ڕوونكردنەوەكەتان لەسەر درووستیەكەی بەكارتێكردن و هەست جولاندنی وێنەكە لە ئاوێنەدا بێسوود و بەتاڵە، لەبەر ئەوەی ئاوێنە هەرگیز شتێك كاری تێناكات هەروەك كۆمەڵی زانایان و بیرمەندان و فەیلەسوفەكان و كەسانی دیكە وا دەڵێن ، ووشەش بەكارتێكردن و هەست جولاندن لە زۆر ڕووەوە بێسوودو ناڕەوایە.

پاشان دەڵێین: ئەگەر بڵێین: كارتێكراو لە دەروونـدا لەكاتی هەستكردنی ڕەشی و سپیێتی وێنە كێشانیان وە نموونە هێنانەوەیان ڕاستییان تێدا نیـە، جا بـۆ ناشێت ئەنجام گەیاندنی وێنە كێشانی ئەو شتانە لە توخمێكی جەستەییدا.



## ( لەبارەی ئەوەی كەوا جەستە شوێنێك نیە بۆ هەستیارەكان )

ووتەكانتان لە دیەنی دوازەمدا: ئەگەر شوێنی هەستیارەكان جەستە بێت، وە هەموو جەستەیەك دابەشكراوە قەدەغەو بەرهەڵستی ناكات كەوا بەهەندێك بەشەكانی جەستە هەڵسێت كە زانیاری بە بەشێك پەیدا بكات، وە بەشێكی دیكەیشی نەزانین پەیدا بكات، جا ئادەمیزاد لەیەك كاتدا زانا دەبێت بەشێك و نەزانیش دەبێت بەشێكی دیكە.

وەڵامەکەی: لەڕاستیدا ئەو گومانە هەڵدەگەڕێتەوە لەسەر یاساو ڕەفتارەکانتان ، لەبەر ئەوەی تامەزرۆو تووڕەبوون و خەیاڵکردن لەبارەکانی جەستەیی و قەبارەیدایە لەلای ئێوە وە شوێنەکەشی دابەشکراوە.

***

## ( لەبارەی نەخشەدانان و داتاشینی جەستەیی و داتاشینی ژێریدا )

ووتەکانتان لەبارەی دیەنی سێزدەهەمدا: تـوخمی جەستەیی ئەگەر نەخشاندن و داتاشینی تایبەتی تێدا ئەنجام درا ئەوا لە دەستکەوتی نموونەی وەك خـۆی تێدا ڕێگر دەبێت، وە دەروونی مرۆڤایەتیش لە دژی ئەمەیە .

وەڵامەکەی: مەبەستەکەی ئەمە دەبێت پێوەرێکی زۆرباش و تایبەت بێت بەبێ کۆکەرەوە، وە ئەمەش سوودی گومانەکە باشتر نابێت لە دڵنیاییەکە، لەبەر ئەوەی نەخشاندنی ئەقڵ و ژێری بریتییە لە زانیاری و هەستیاریەکان، وە نەخشاندنی جەستەییش بریتی یە لە شوێنەکان و وێنەکان، گومانی تێدانیە کەوا زانیاری پێچەوانەیە بە ڕاستیەکان بۆ وێنەو شێوەکان، پێویست ناکات لە سەلماندنی یاسایەك لە جۆرێك لە جۆرەکانی ناوەڕۆکەکان سەلماندنەکەی پێچەوانەی ئەو جۆرە بێت .

***

## ( لەبارەی ووتەکانیان : ئەگەر هاتوو دەروونیش جەستە بوایە )

ووتەکانتان لە دیەنی چواردەهەمدا: ئەگەر هاتوو دەروون جەستە بوایە ئەوا لە نێوان جوولاندنی جولێنەری پێیەکەی وە لە نێوان ویست و ئیرادەی بۆ جوولانەکە کاتێکە.

وەڵامەکەی: کەوا دەروون لەگەڵ جەستەدا بەتاڵ نابێت لەسێ حاڵەتدا، یـان دەبێـت لە هەموو لایەکی لە دەردوەدا وەك جل و بەرگ و چواردەوری بگرێت، یـان دەبێـت لە جێگایەك بێت وەك دڵ و دەماخ، یان دەبێت کۆلەکە بێت لە هەموو بەشـەکانی جەستەدا، لەسەر هەر بۆچوون و مەزەندەیـەك لـەو مەزەندانـە جوولاندنیـەتی وەك ئەوەی دەتەوێت بیجولێنی دەبێت لەگەڵ ویستی ئەو دابیت بۆیە ئەمەش بەبێ کات و ماوەیەکە، وەك هەست کردنی بینین کاتێك پێی دەگات، و هەست کردنی بیـستن وبۆنکردن و تام کردنیش وە ئەگەر ئەندامەکە پچڕا ئەوا ئەوەی کاریگەرو تێپەڕ بوو بوو بەو ئەندامە ناپچڕێت، ئەگەر دووردرابێت لێی لـە نـاوەو یـاخود لـە دەرەوەدا، بەڵکو تەنها ئەو ئەندامە هەستی نامێنێت کەوا لەو کاتـەدا جیابۆتـەوە ، وەبـەبێ کات و ماوە لێی کەم دەبێتەوە و دەپوکێتەوە، و جیابوونەوەی ئەو ئەندامـەش وەك جیابوونەوەی هەوا دەبێت لەناو زەمزەمەیەك ئەگـەر پـڕ ئـاو بێـت، بـەڵام ئەگـەر دەروون جێگیر بێت لەیەك شـوێندا لـەناو لاشـەدا پێویـست ناکـات کـەوا لەگـەڵ ئەندامە پـچڕاوەکە دەربیخـەیت، وە ئەگـەر هـاتوو چـواردەورە درابـوو بـۆ لاشـە لەدەرەوەدا پێویست ناکات کەوا لە نێوان ویـستو ئیرادەکـەی بـۆ جوولانـدنی وە هەمان جوولاندن کات و ماوەیـەك هـەبێت، بـەڵکو کردارەکـەی لـەو کاتـەدا لـە جوڵاندنی ئەندامەکاندا دەبێت وەك کرداری موغناتیس بێـت لـە ئاسـن دا ئەگـەر پێ‌ئنی نەنووسێت.

❊❊❊

### ( لەبارەی ئەوەی کەوا ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا دابەش دەبوو )

ووتەکانتان لە دیمەنی پازدەهەمدا: ئەگـەر دەروون جەسـتە بوایـە ئـەوا دابـەش دەبوو وەبۆ ڕاسـت کردنەوەیـشی کـەوا هەنـدێکی دەزانیـت و هەنـدێکی زانیـاری

لەبارەیەوە نیە ئەوکاتە ئـادەمیزاد بـە هەنـدێك لـە خـودی خـۆی زانـا دەبێـت و بەهەندێکی خودی خۆیشی نەزان دەبێت.

وەڵامەکەی: کەواتە ئەو گوومانە پێك هاتووە لە دوو پێشەکی: پێکەوە بـوون وە کەلاخـستن یـان دوور خـستنەوە، وەقەدەغـە کـردن و بەرهەڵـستی لەهـەردووکیان یاخوود لە یەکێکیان ڕوودەدات، جا ئێمە ئەمەی وەرناگرین کـەوا ئەگـەر جەسـتە بوایە درووست بـوو هەنـدێکی بیزانیایـە وە هەنـدێکی نەیزانیایـە، لەبـەر ئـەوەی دەروون سادەو ساکارە پێك هاتوو نیە لەو هەموو توخمانە ، نـە لەچـەند بەشـێکی جیاواز، جا کەی هەست بە خودی خۆی دەکات و هەست بە نەزانینی خۆی دەکات، جا ئەمە قەدەغەی پێشەکی پێکەوەبوونە .

بەڵام کەلاخستن و دوورخستنەوە ئەمەش وەرناگرین کەوا درووست نیە هەندێکی لەکاتی بێ ئاگایی بیزانێت لەبارەی هەندێکی دیکەدا، وە باسی ئەوەیان نەکردووە، گومانێك باشترە لە بەڵگەیەك، وە زانراویشە کەوا ئادەمیزاد هەست بەخۆی دەکات لەهەندێك ڕووەوە بەبێ هەموو ئەندامەکانی، خـەڵکیش لەمـەدا جیـاوازن، خـوای گـەورەش دەفـەرموێت : ﴿وَلا تَكُونُـوا كَالَّـذِينَ نَـسُوا اللَّـهَ فَأَنْـسَاهُمْ أَنْفُـسَهُمْ﴾ (الحشر:١٩)، واتە : (( نەکەن وەك ئەو کەسـانە بـن کـە خوایـان فـەرامۆش کـرد شوێنی بەرنامەکەی نەکەوتن ، خواش ئەوانی لەبیرخۆیان بردەوە))، جا ئەوانە نـەك لەهەموو ڕوێکەوە ، خۆیان لەبیر بردەوە. ئەوانـە نـەك لەهـەموو ڕوێکـەوە خۆیـان لەبیر بردۆتەوە ، بەڵکو لەو ڕووەی کە بەرژەوەندی و تەواوکاری و بەختەوەری ئەوی تیایە.

❊❊❊

## ( له بارەی دەروون و جەستەدا )

وتەکەتان لەبارەی دیمەنی شازدەهەمدا : ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا پێویست دەبوو بە چوونە ناوی دەروونا جەستە قورس بوای ، چوونکە لە ڕەوشتی جەستەدا ئەگەر جەستەیەکی دیکەت لەسەری دا زیاد کرد ئەوا قورس دەبێت.

جا ئەو گوومانە لە مەبەستی قورس بوون، وە پێویستی پێ بوونیش قورسترە، نەك هەموو جەستەیەك جەستەیەکی لەسەریدا زیاد بکرێت قورس دەبێت، ئەو دارەی دەیبینی قورسایی هەیە جا ئەگەر جەستەیەکی ئاگرت بەسەریدا زیاد کردئەوا جەستەکە سووك دەبێتەوە، وە ئەو زەرفە قورسایی هەیە، جا ئەگەر جەستەیەکی هەوا چووە ناویەوە سووك دەبێت، ئەمەش یاخود ئەوەتا لە جەستە قورسەکان دەبێت کەوا بە سرووشتی و ڕەفتاری خۆی ناوەندو ناوەڕاستی دەوێت، ئەمەش بێگومان بۆی دەسوڕێت وە بەڵام ئەو جەستانەی کەوا بە سرووشتی خۆی دەسووڕێت بۆ سەرەوە، ئەوا هیچی پێ نیشان نادرێت، بەڵکو کارەکە تێیدا پێچەوانەی ئەو جەستە قورسانەیە ، بەڵکو خستنە سەر جەستەیەکی قورس ئەو سووك دەبێت ، وە هەندێك لەبارەی ئەو مانایەوە دەڵێن:

ثقلت زجاجات أتتنا فُرغاً ❊ حتى إذا مُلِئت بصرف الراح

خَفَت فكادَت أن تطير بِما حَوَت ❊ وكذا الجسومُ تخفّ بالأرواح

❊❊❊

## ( له بارەی گومان بردن کەوا دەروونیش جەستەیە )

وتەکەتان لەبارەی دیمەنی حەڤدەهەمدا: ئەگەر دەروون جەستەبوایە ئەوا لەسەر سیفەتی ئەو جەستانە دا دەبوو کەوا لێی خاڵی نەدەبوو لە سووکی و قورسی و گەرمی و ساردی و شێداری و ووشکی و نەرمی و زبری تا کۆتایی، گومانێکی خراپ و بیانویەکی پووچە ، لەبەر ئەوەی پێویست ناکات جەستەکان لە هەموو

چۆنیەتی و سیفەتەکان هاوبەش بکرێت، لە ڕاستیدا خوای گەورە جیای کردۆتەوە لە نێوان چۆنیەتی و تایبەتمەندی و سرووشتیەکەی، جا تێیدایە بەچاو نابینێت بە دەست لێدەدات، تێیدایە نەدەبینێت و نەدەستیشی لێدەدات، تێیدایە هیچ ڕەنگێکی نییە، و تێیدایە هیچ ڕەنگێك وەك ئەو نیە، وە تێیدایە بەرگەی گەرماو سەرما ناکات، بۆ دەروونیش تایبەتمەندی و چۆنیەتی تایبەت بەوی تێدایە کەوا جەستە تێیدا بەشداری ناکات، وە سووکی و قورسی و گەرمایی و ساردی و وشکی و نەرمی بە گوێرەی دەروونەکەی تێدایە تۆ دەبینی ئادەمیزادێك لەوپەڕی مەبەست و ئامانج گرانیە، کەچی لاشەکەشی لاوازو سیس و نەخۆشە.

یاخود دەبینی خۆی زۆر سووکە کەچی لاشەکەشی قورسە، وە دەروونێك دەبینی نەرم و نیان ڕوو خۆشە وە دەروونێکی دیکە ووشك و دڵڕەقە، وە ئەوەی هەستێکی باشی هەبێت هەندێك دەروون بۆن دەکات بۆنێکی ناخۆش و پیسی لێدێت، بۆنی هەندێکیش خۆشترە لە بۆنی میسك .

پێغەمبەرﷺ کاتێك بە ڕێگایەك دا دەڕۆیشت شوێنەواری ئەو بۆنەی کە لەڕێگاکەدا ماوەتەوە دەیزانی کە ئەو بۆنە هی دەروونێکی پاکە یاخوود هی دەروونێکی پیسە [٣٢١]، وە پێغەمبەرﷺ کەوا ڕاستگۆترین مرۆڤ بووە خەبەری داوە کەوا: (( إن الروح عند المفارقة يوجد لها كأطيب نفخة مسك وجدت على وجه الأرض، أو كأنتن ريح جفية وجدت على وجه الأرض ))، واتە: (( بێگومان ڕۆح لەکاتی جیابوونەوەدا خۆشترین بۆنی لێدێت کەلەسەر ڕووی زەویدا هەیە، یاخوود وەك ناخۆشترین بۆنی بۆگەن کە لەسەر ڕووی زەویدا هەیە))، دەبینی هەڵامەتی زۆر کەس بۆنەکەی ئامادەبووان وەڕس دەکات، زۆر لە خەڵکیش هەست بەو بۆنە دەکات ، وە پێغەمبەرﷺ هەواڵی داوە کەوا: (( بأن أرواح المؤمنين مشرقة

---

(٣٢١) سەیری : مسلم (٢٣٣١) بکە.

وأرواح الكفار سود))، واتە: (( ڕۆحی ئیماندار گەش و درەوشاوەیە وەڕۆحی کـافرو بێ باوەڕانیش ڕەش و تارماییە)).



## ( لەبارەی ئەوەی کەوا ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا لەژێر هەستکارەکان دەوەستا )

ووتەکەتان لـەبارەی دیـەنی هەژدەهەمـدا: ئەگـەر دەروون جەسـتە بوایـە ئـەوا پێویـست دەبوو بکەوتایە ژێر گشت هەستکارەکان یاخود ژێر یەك هەستکار.

جا وەلامەکەی: پێداویستیەکە بەرهەڵست و پتەو دەکات جا ئێوە شتێکتان باس نەکرد لە گورمان باشتر بێت لە بەلگەدا، قەدەغەکردنی نەمانی پێداویستی، لەبـەر ئەوەی ڕۆح هەست بە هەستکارەکان دەکات جـا دەسـتی لێـدەدات و دەیبینێـت و بۆنی بۆنێکی خۆش و بۆنی ناخۆش دەکات هەروەك لـەبارەی دەروونـدا بـە درێـژی باسکرا، بـەلام ئێمـە ئـەوە نـابینین، ئـەو بەلگەیـەش ناکرێـت یـەکێك بـاوەڕ بـە پێغەمبەران بکات کەوا پێویستی پێی بێت، جا فریشتەجەستەیەکە ناکەوێتـە ژێـر هەستێك لە هەستیارەکانمان ، وە جنۆکەو شەیتانەکانیش جەسـتەی نـەرم و نیـانن ناکەوێتە ژێر هەستێك لە هەستیارەکانمان، وە تێدایە هەست بە زۆربەیان دەکـات ، تێشیدایە درك بە یەك هەستیش ناکات.

هەروەها هەر ڕۆحیشە درك پێکراوە بۆ درك پێکردنی ئەو هەستیارانە بـە هۆکـاری ئامرازەکانی، جا دەروونیش بریتی یە لەهەستێکی درك پێکراو جا ئەگـەر هەسـت پێکراو نەبێت، جا جەستەو نیشانەکانیش هەستدارن و دەروونیش هەستی پێدەکات ، ئەمەش گونجاوە بۆ نیشانە یەك لە دوای یەکـەکانی لـە چـاکەو خراپەکانـدا وەك قەوبولکردنی تاوانەکان بۆ نیشانە یەك لەدوا یەکەکانی بەسەریدا.



**(لەبارەی ئەوەی کەوا ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا دووریەکانی دەبوو)**

ووتەکانتان لە دیمەنی نۆزدەهەمدا: ئەگەر دەروون جەستە بووایە ئـەوا درێـژی و پـانی و قـووڵی و شـێوەو پـانی دەبـوو، و ئـەو کـەل و پـەل و پێداویـستیانەش هەڵناستێت تەنها بە توخمێك نەبێت.

وەڵامەکەی: ئێمە دەڵـێین: ووتـەکانتان لـەبارەی ئـەوەی کـەوا پێداویـستیەکان هەڵناستێت تەنها بە توخمێك نەبێت، ووتـان: چـی دەبێـت، دەروونـیش تـوخمێکی تێدایە کە لێی درووست بووەو گۆڕاوە بۆ سەر شـێوەیەکی دیـاریکراو و وێنەیـەکی دیاریکراو.

ووتەکانتان: تووخمەکەی ئەگەر دەروونێـك بێـت ئـەوا پێویـست دەبـوو هـەردوو دەروونەکە کۆبوونایەتەوە، و ئەگەر دەروونیش نەبێت ئەوا پێکهاتوو دەبوو لەلاشەو وێنە.

ووتمان: توخمەکەی دەروونێك نیە هەروەك کەوا تـووخمی ئـادەمیزاد ئـادەمیزاد نیە، وە توخمی جنۆکەش جنۆکەنیە، وە توخمی گیانلەبەریش گیانلەبەر نیە.

ووتەکانتان: دەشێت بوونی دەروون پێك هاتووبێت لەلاشەو وێنـە، پێـشەکیەکی درۆزنانەیەو لەڕاستیدا دەکرێت بـوونی دەروون درووسـتکراو بێـت لـە توخمێـك وە وێنەیەکی دیاری کراوی هەیـە، وە هـەموو پێکـەوە ئـاوا دەڵـێین، وە لەسـەر ئـەو نارەوایی و بێسوودەی ئەو گومانەش باسی چاکەیەکتان نەکردووە باشـتر بێـت لـەو بیانووە بووختان کردنە یاخود لێك دابڕان و جیابوونەوەیە.

❊❊❊

## ( لەبارەی ئەوەی لەتایبەتمەندیەکانی جەستە کەوا دابەش بوون پەسەند دەکات )

ووتەکانتان لەبارەی دیمەنی بیستەمدا: کەوا تایبەتمەندی جەستە ئەوەیە کە دابەش بوون و کەرت بوون قبوولّ دەکات، بەشی بچووکیش لێی وەك گەورەکە نیە، جا ئەگەر قایل بێت بە دابەش بوون، وە هەر بەشێکیش لێی ئەگەر دەروونێك بێت ئەوا دەشیا بۆ ئادەمیزادێك چەند دەروونێکی هەبێت، ئەگەر دەروونیش نەبێت، ئەو هەمووە نابێتە دەروون.

وەلاّمەکەی: ئەگەر ویستتان هەر جەستەیەك لەدەرەوەدا پەسەندی دابەش بوون بکات جا دەرخستنەکەش درۆی کردووە کەوا ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکان قبولّی ئەو شتە ناکەن، ناشگونجێت کەوا هەر جەستەیەك دابەش بوون و لەت لەت بوونی ڕاست دەربچێت لە دەرەوەدا، بەلاّم لەسەر وتەی نکوّلّی کردنی گەوهەرو کرۆکێکی بێهاوتا جا دەرکەوتووە، بەلاّم لەسەر ووتەیەکی سەلمێنراوەکانیدا، کەوا لەلای ئەوان ناوەڕۆك و گەوهەرێکی لایەنگیر هەیە پەسەندکردنی دابەشکردنەکان بە ڕاست نازانێت، وەرمانگرت کەوا دابەشکردن قەبوولّ دەکات جا شتێك لەوەدا پێویست دەبێت؟

وتەکانتان: ئەگەر هاتوو هەر بەشێك لەو بەشانە دەروونێك بێت پێویست دەکات دەروونێکی زۆر لە ئادەمیزاددا کۆببێتەوە.

ووتمان: لە ڕاستیدا ئەوە پێویست دەکات ئەگەر بە کردار دەروون دابەش ببێت بۆ دەروونێکی زۆر، وەئەمەش ئەستەمە.

ووتتان: ئەگەر هەر بەشێك دەروونێك نەبێت ئەوا گشتیەکە دەروونێك نابێت، سەرەتایەکی درۆو دەلەسەو هەلّوەشاوەیە، جا چەند ناوەڕۆکێك یاسای بۆ سەلمێندراوە لەکاتی کۆبوونەوەی بەشەکانی، جا ئەو یاسایە وەك ناوەڕۆك و مەبەستی مالّ و ئادەمیزاد و خانەوادەو تێکەلاّوی یە.

## ( لەبارەی پێویستی لاشە بۆ دەروون )

ووتەکانتان لەبارەی دیمەنی بیست و یەك : بێگومان جەستە پێویستی هەیە لە دامەزراوی و مانەوەی ە پاراستنی تاکو دەروونێکی دیکە وە پێویستی بەڕیزو یەك لە دوای یەك هەیە.

وەڵامەکەی: ئەو کەوا ناچارنابێت لە پێویستی لاشە بۆ دەروونێك بیپارێزێت، پێویستی دەروون بۆ دەروونێك کەوا بیپارێزێت ، ئایا ئەمەش تەنها بە داوایەکی درۆو دەلەسە پاڵپشت بە پێوەرێك کەوا بێسودیەکەی ئاشکرا بێت ، لەبەر ئەوەی هەموو جەستەیەك نابێتە دەرونێك بیپارێزێت وەك بەستەکانی کانزاکان و جەستەی هەواو ئاوو ئاگرو خۆڵ و جەستەی گشت بێ گیانەکان.

جا ئەگەر ووتتان: ئەوانە بێژەرێکی زیندوونین بە پێچەوانەی دەروون کەوا زیندەوەرێکی بێژەرە.

ووتمان: لەوکاتەدا بەڵگەکە ئاوا دەمێنێتەوە واتە: هەموو جەستەیەکی زیندوو و قسەکەر پێویستی بە دەرونێك هەیە هەستێت بە پاراستن و دامەزراندنی ئەمەش داوایەکی ڕووت و تەنهایە وە ئەمەش درۆو دەلەسەیە لەبەر ئەوەی جنۆکەو فریشتەکانیش زیندوون و قسەکەرن و پێویستیان بە دەروونی دیکە نییە هەستێت بە دامەزراندنیان.

جا ئەگەر ووتتان، قسەکانمان لەگەڵ ئێوەیە لەبارەی جنۆکەو فریشتەکان لەبەر ئەوەی ئەوان لایەنگرنین بە جەستەکانیان.

ووتمان: قسەکردن لەگەڵ ئەو کەسەیە کەوا باوەڕی بە خواو فریشتەکانی و قورئانەکەی و پێغەمبەرەکانی هەبێت، بەڵام ئەوەی کوفر بەمە دەکات قسەکردن لەگەڵیدا لەبارەی دەروون وون و لەکیس چووە، لە ڕاستیشدا ئەو کوفری کردووە بە بەدی هێنەری دەروونەکان و داهێنەری و فریشتەکانی وە ئەوەی لە پێغەمبەرەکان

هاتووە، وازی هێناوە لەوەی بەڵگەی لەسەر لە کارە ئاشکراکان لەگەڵ بەڵگەی ئیماندا، جا لەبەر ئەوەی شوێنەوارە بەناوبانگەکان لە جیهاندا لە کاریگەریەکانی فریشتەکان و جنۆکەکان لەسەر ڕووخسەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان ناکرێت نکۆڵی لێبکرێت، ئێستا بەخۆی بوونی هەیە، ئەوا هێزی مرۆڤایەتی توانای بەسەریدا نیە.



**( لەبارەی گەیاندنی دەروون بە جەستەدا )**

ووتەکانتان لە بارەی دیمەنی بیستەمدا : ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا پەیوەندی دەکرد بەلاشەوە ئەگەر لەسەر ڕێگای خۆ تێخستن بێت ئەوا پێویست بوو خۆی بخستایەتە جەستەکان، وە ئەگەر لەسەر ڕێگای پێوە لکاندن و نزیکی بێت ئەوا بۆ یەك ئادەمیزاد دوو جەستەی پێکەوە لکاو دەبوو یەکێکیان دەیبینی وە ئەوەی تریان نەیدەبینی.

وەڵامەکەی لەچەند ڕوویەکەوەیە:

یەکێکیان: خۆی بخاتە جەستەکان: ئەستەمە کەوا خۆی بخاتە ناو دوو جەستەی چڕو توند یەکێکیان لەوی تریان چڕتر بێت بە جۆرێك شوێنەکەیان یەك شوێن بێت.

دووەم: ئەوە نارەوایە بە زۆر شێوە، لەوانە تێچوونی ئاو لە چیلکە دارو هەوردا، وە چوونە ناوەوەی ئاگر لە ئاسندا، وە چوونی خۆراك بە هەموو بەشەکانی لاشەدا، وەچوونی جنۆکە لەو کەسانەی پەرکەم یاخوود نەخۆشی فێی هەیە، جا ڕۆح بەو نەرم و نیانیەی خۆی ئالۆزکاوی لاشە لێی قەدەغە ناکات و دەچێتە هەموو بەشەکانی .



**لەگەڵ ئەوەش ئایا دەروون و ڕۆح یەك شتە یاخود دوو شتی جیاوازن؟**

خەڵکی لەمەدا جیاوازو ناکۆکن .

جا هەیە دەڵێت: ناونراوەکانیان یەکە، وە ئەوانەش زانایانی ئاینیین.

هەیە دەڵێت: ئەوان دوو شتی جیاوازن، وە ئێمەش بە یارمەتی خوای گەورە نهێنی ئەو مەسەلەیە ئاشکرا دەکەین، جا دەڵێین، دەروون ڕوو دەکاتە کارو بارەکان.

یەکێکیان: ڕۆحە، جوهری دەڵێت: دەروون ڕۆحە، دەوترێ: دەروونی دەرچوو، ئەبو خراش دەڵێت:

نجا سالماً والنفس منه بشدقة ❊ ولم يَنجُ إلا جِفنُ سيفٍ ومئزرُ

دەروونیش خوێنە، دەوترێ : پرسیاری لە خۆی کرد وە لە حەدیسێکدا هاتووە: (( ما لا نفس له سائله لا ينجس الماء إذا مات فيه))،

واتە : ((هەر گیانلەبەرێك ئەگەر لەناو ئاو بمرێت و خوێنی لەبەر نەڕوات ئەوە ئاوەکە پیس ناکات)).

دەروون : جەستەیە، شاعیر دەڵێت:

نُبِّئتُ أن أبي تميم أدخلوا ❊ أبنائهم تامورَ نفس المُنذرِ

دەروون چاوە، دەوترێ : فلان دەروونی تووش بووە، واتە: چاو.

ووتم: وانیە وەك ووتراوە، بەڵکو دەروون لێرەدا ڕۆحە، بە نیسبەت خستنە بەری بۆ چاو فراوان دەبێت، لەبەر ئەوەی بەهۆی چاوێکی تووش بوودوە دەبێت، وە ئەوەی پێکاوەو تووش بووە لە ڕاستیدا دەروونێکی پەست و خەمبارە وەك پێشتر باسکراوە.

ووتم: دەروونیش لە قورئاندا لە خودی خۆیەوە بە تێکڕایی دەردەچێت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَسَلِّمُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ ﴾(النور:٦١)، واتە : (( سەلام لە خۆتان و سەلام لە یەکتر بکەن))، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ

تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَنْ نَفْسِهَا ﴾(النحل:١١١)، واته: (( رۆژێك دێت كه هه‌موو كه‌س خه‌می خۆیه‌تی به‌رگری له‌خۆی ده‌كات )).

هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت : ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ﴾(المدثر:٣٨)، واته: ((چوونكه له قیامه‌تدا هه‌موو كه‌س بارمته‌ی ده‌ستپێشكه‌ری خۆیه‌تی (كرده‌وه‌كانی دێنه‌وه ڕێی)). ته‌نها به‌سه‌ر ڕۆحدا تێپه‌ڕ ده‌بێت وه‌ك خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ﴾(الفجر:٢٧)، واته: ((ئه‌ی خاوه‌ن دڵ و ده‌روونی پڕ له ئارامی))، دیسان خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿أَخْرِجُوا أَنْفُسَكُمُ﴾ (الأنعام:٩٣)، واته : ((ئاده‌ی گیانتان بده‌ن به ده‌سته‌وه))، هه‌روه‌ها خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێت: ﴿وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى﴾(النازعات:٤٠)، واته: (ئه‌وه‌ی جڵه‌وی نه‌فسی گرتبێته‌وه له‌هه‌موو هه‌واو هه‌وه‌س و ئاره‌زوویه‌كی نادرووست...))، دیسان خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾(یوسف:٥٣)، واته: ((به‌ڕاستی نه‌فس (ئه‌گه‌ر به نووری خواناسی ئاوه‌دان نه‌بێت) زۆر فه‌رمانده‌ره به گوناهو هه‌ڵه‌و تاوان)).

به‌ڵام ڕۆح نه به‌ته‌نهاو نه‌له‌گه‌ڵ نه‌فسیش به‌سه‌ر لاشه‌دا تێپه‌ڕ نابێت ، به‌ڵكو ڕۆح به‌سه‌ر ئه‌و قورئانه‌دا تێپه‌ڕ ده‌بێت كه‌وا خوای گه‌وره به سروش بۆ پێغه‌مبه‌ری ناردووه ﷺ، له‌م باریه‌وه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِنْ أَمْرِنَا ﴾(الشوری:٥٢)، واته: (( ئه‌ی محمد ئا به‌و شێوه‌یه‌ی كه ووتمان ئێمه قورئانمان بۆ ڕه‌وانه كردیت له‌لایه‌ن خۆمانه‌وه)).

ئه‌ركی سرووشیش ئه‌وه‌یه كه‌وا خوای گه‌وره خۆی ناردوویه‌تی بۆ نێردراوه‌كانی وه پێغه‌مبه‌ره‌كانی ، خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنْذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾(غافر:١٥)، واته: (( ئه‌و زاته وه‌حی نیگا به‌فه‌رمانی خۆی ده‌نێرێت بۆ هه‌ركام له به‌نده‌كانی كه بیه‌وێت (قورئان ڕۆحه، چوونكه ژیان به‌خشه به عه‌قڵ و دڵ و ده‌روون)، بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵكی بترسێنێت له

ڕۆژی بەیەکگەیشتنەوە))، هەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يُنَـزِّلُ الْمَلائِكَـةَ بِـالرُّوحِ مِـنْ أَمْـرِهِ عَلَـى مَـنْ يَـشَاءُ مِـنْ عِبَـادِهِ أَنْ أَنْـذِرُوا أَنَّـهُ لا إِلَـهَ إِلَّـا أَنَـا فَاتَّقُونِ﴾(النحل:٢)، واتە: (( پەروەردگار خۆی فریشتەکان بـە ڕەحمـەت و ژیانـەوە (کـەوەحی ئاسمانـە) دەنێرێـت بـۆ هـەر کـەس کـە بیـەوێت لـە بەنـدەکانی (کـە پێغەمبەرانن)، فـەرمانیان پـێ دەدات کـە: خـەڵکی بێـدار بکەنـەوە لـەوەی کـە بەڕاستی جگە لەمن خوایەکی دیکە نیە ، لەبەر ئـەوە لـە خەشـم و قیـنم خۆتـان بپارێزن(چونکە لەو کەسانە خۆش نابم کە غەیری من دەپەرستن).

ئەمەش ناونراوە ڕۆح کاتێك ژیانێکی بەسوود دەبەخشێت، چوونکە ژیـان بـەبێ ئەو هەرگیز سوودی بۆ خاوەنەکەی نابێت ، بەڵکو ژیانی گیانلەبـەری چـوارپێ لـەو باشترە و ئاکامەکەی خۆ بەدەستەوە دانە.

ناویش نراوە ڕۆح: ڕۆحێـك: لەبـەر ئـەوەی ژیـانی جەسـتەی تێدایـە، هـەروەها ناونراوە (الريح) واتە: شنەبا کاتێك ژیانی تێدا دەسـت دەکـەوێت، وە بـۆ ئەمـەش لەسەر ڕۆحەکان کۆدەبێتەوە، شاعیر دەڵێت:

إذا ذَهَبَت الأرواح من نحوِ أرضكم * وجدتُ لِمَسراهَا على كبدي بَردَا

ڕۆح و ڕەیحان و حەوانەوەی تێدایە، جا ناونراوە دەروون، ڕۆحێك بۆ دەستکەوتنی ژیانێـك تێیـدا، نـاونراوە (الـنفس) دەروون یـاخوود لەبـەر شـتێکی گرانبـەهایـە (النفيس) لەبەر گرانبەهاکی و گەورەییەکـەی ئـەو نـاوەی لێنـراوە، یـاخود لەبـەر دەرخستنی شتەکەیە کاتێك دەردەچـێت جـا لەبـەر زۆر چـوونە دەرەوەی و هاتنـە ژوورەوەی لەلاشەدا ناونراوە (النفس) دەروون، وە لەوێدا دەروون لە جولاندنە، لەبەر ئەوەی بەندەیەك کە خەوت ڕۆحەکـەی لێ دەردەچـێت ، جـا ئەگـەر بەئاگاهاتـەوە ڕۆحەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، وە ئەگەر مردیش ئەوا بەیەکجاری ڕۆحەکەی دەردەچـێت ، جا ئەگەر بەخاکیش سپێردرا ڕۆحەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، کاتێـك پرسـیاری لێکـرا دەردەچێت، وئەگەر زیندووش بۆوە ئەوا ڕۆحەکەی بۆ دەگەڕێتەوە.

جیاوازی نێوان دەروون و ڕۆح جیاوازی لە سیفەتەکانە نەك لە خودی ئەوان، لە ڕاستیدا خوێنیش ناونراوە: دەروون، لەبەر ئەوەی دەرچوونی خوێن کەوا مردنی لەگەڵدا دەبێت دەشێت دەروونەکەش دەربچێت ، ژیانیش تەواو نابێت تەنیا بە ئەو نەبێت، هەروەك ژیان بەردەوام نابێت تەنها بە دەروون نەبێت، جا لەم بارەیەوە شاعیر دەڵێت:

تَسيلُ على حَد الظُباتِ نفوسنا * وليست على غير الظباتِ تَسيلُ

وە دەوترێت: گیانی سپارد، گیانی دەرچوو، گیانی جیابووەوە، هەروەك دەوترێت: ڕۆحی دەرچوو، وە ڕۆحی جیابووەوە، بەڵام مردنی هەڵەشەیی یەکجارە و لەوانەیە درێژە بکێشێت، و ئەم هەڵەشەو هەڵچوونەش بە زۆریی و بە خێراییە، جا خوای پەروەردگار هەر خۆی درێژەی پێدەدات و پاڵی پێوەدەنێت لەکاتی مردندا.

***

## ( لەبارەی ووتەکانیان: ڕۆح دەروون نیە )

کۆمەڵێکی دیکە لە خاوەنی حەدیس، وە بیرمەندو زانایانی ئایین و ئەهلی تەسەوف دەڵێن، ڕۆح دەروون نیە بەڵکو شتێکی دیکەیە، مقاتل کوڕی سلێمان، دەڵێت: ئادەمیزاد وژیان و ڕۆح و دەروونی هەیە، جا کاتێك نووست دەروونی دەردەچێت کەوا ئەقڵی بەشتەکاندا دەشکێت بەڵام لە جەستە جیانابێتەوە، بەڵام پەتێکی ڕاکێشاو دەردەچێت کە شەوق و ڕووناکی هەبێت، جا خەونەکە بەو دەروونە دەبینێت کەوا لێی دەرچووەو ژیان و ڕۆحەکەش لە جەستەدا دەمێنێتەوە، جا هەر بەو گنگڵ دەدات و ئەم دیو و ئەو دیو دەکات و هەناسە دەدات، کاتێك جووڵا ڕۆحەکەی بۆ دەگەڕێتەوە وە خێراتر لە چاو تروکانێك، ئەگەر خوای گەورە

ویستی لەسەر بێت ئەوا لە خەوەکەیدا دەیرێنێت و ئەو دەروونە دەگرێت کە لێی دەرچووە.

هەروەها دەڵێت : کاتێك دەخەویت دەروونەکەی دەردەچێت و بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە ، جا ئەگەر خەونی بینی بۆی دەگەڕێتەوە ، هەواڵ دەداتە ڕۆحەکەو، ڕۆحەکەش هەواڵی پێدەدات ، جا ئەو دەزانێت کەوا ئەو چی و چی بینیوە.

ئەبو عبداللەی کوڕی مەند دەڵێت: لەبارەی زانیاری ڕۆح و دەرووندا جیاوازی و ناکۆکی پەیدابووە، جا هەندێك لەوان دەڵێن: دەروون قوڕێکی ئاگرینیە، و ڕۆحیش نورێکی ڕوحانیە.

هەندێکی دیکەیان دەڵێن: ڕۆح خودایی و ئاینزانی یە، وە دەروونیش: ڕەوشت و خووی ئادەمیزادە، و درووستکراویش بە ئەو تاقیدەکرێتەوە.

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن: ئەوانە ئەهلی فەرموودەو حەدیسن: کەوا ڕۆح دەروون نیە، وە دەروونیش ڕۆح نیە، دامەزراوی و وەستانی دەروون بە ڕۆحە و دەروونیش دیمەنی بەندەیە، ئارەزوو و خۆشەویستی و دڵتێچوون و کارەسات و وەیشوومەی تێدا کۆدەبێتەوە، وە ڕۆحیش داوا دەکات بۆ دوارۆژ و کاریگەری تێدەکات، هەواو هەوەسیش بەدوای دەرووندا دەکەوێت، وشەیتانیش بەدوای دەروون و هەواو هەوەسدا دەکەوێت، و سامان و داراییش بەدوای عەقڵ و ڕۆحدا دەکەوێت، خوای گەورەش بە سرووش و نیگای خۆی و یارمەتی دان و پشتگیری خۆی درێژیان دەکاتەوە.

هەندێکی دیکە دەڵێن: ڕۆحەکان لەلایەن کارو فەرمانی پەروەردگارەوەیە، ڕاستی وزانینی لە بوونەوەرو بۆ درووستکراوەکەی دەشارێتەوە .

هەندێکی دیکەیان دەڵێن: ڕۆحەکان نورێکە لە نورەکانی خوای گەورە، وە ژیانیش لە ژیانی خودای گەورە دایە .

پاشان له ڕۆحەکاندا جیاوازی و ناکۆك بوون، ئایه به مردنی لاشەکان و دەروونەکان ڕۆحەکانیش دەمریت یاخود نامریت؟

جا کۆمەڵێك دەڵێن: ڕۆحەکان نامرن و تاقیش ناکرێنەوە.

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن: ڕۆحەکان لەسەر شێوەی بوونەوەرەکەیە، دەست و قاچ و چاوو بیستن و بینین و زمانی هەیە .

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێن: بۆ بڕوادار سێ ڕۆح هەیە، وە بۆ دوو ڕوو و کافرەکانیش یەك ڕۆح هەیە.

هەندێکی دیکەیان دەڵێن: بۆ پێغەمبەران و ڕاستگۆیانیش پێنج ڕۆح هەیە .

هەندێکی دیکەیان دەڵێن: ڕۆحەکان ڕۆحانین لە پیاوچاکان و خواناسان درووست بووە جا کاتێك دەرچوو دەگەڕێتەوە بۆ لای خواناسەکان.

ووتم: بەڵام ئەم ڕۆحەی کەوا دەمریت و دەردەچێت ئەوا یەك ڕۆحە ئەویش دەروونە.

بەڵام ئەوەی خوای گەورە پشتگیری ئەکات لەبەندە باوەڕدارەکانی لەڕۆحێك ئەوا ڕۆحێکی دیکەیە بێجگە ئەو ڕۆحە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ ﴾(المجادلة:٢٢)، واته: (( ئەوانە خوا ئیمان و باوەڕی لەدڵیاندا چەسپاندووەو جێگیری کردوەو لە بەهرەو میهرەبانی تایبەتی خۆی، بەهێزو گیانێکی تایبەتی لەلایەن خۆیەوە (مەبەست قورئان وئیمانە) پشتگیری کردوون و یارمەتی داون))، هەروەها ئەو ڕۆحەی کەوا پێی پشتگیری کراوە ڕۆحی مەسیحی کوڕی مەریەمە ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدْتُكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ ﴾(المائدة:١١٠)، واته: (( خوا فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم یادی ئەو نازو نیعمەتەی من بکەرەوە کە ڕژاندم بەسەر خۆت و دایکتدا، کاتێك من بەهۆی جوبرەئیلی پیرۆزەوە پشتیوانیم لێکردیت))، هەروەها ئەو ڕۆحەی کەوا دەهاوێت بەسەر ئەو بەندانەی کە ئەو دەیەوێت ئەوا ئەو ڕۆحە نیە کە لە لاشەدایە.

بەڵام ئەو هێزو توانایەی کە لە لاشەدایە ئەویش دیسان پێی دەڵێن: ڕۆحەکان، جـا دەوترێت: گیانی بینەر، گیانی بیسەر، و گیانی بۆنکەر، جا ئەو ڕۆحانەش هێزێکی دانراون لەلەشدا دەمرێت بە مردنی لاشەکان، ئەوەش ئەو ڕۆحە نیە کـە بـە مـردن لاشەکە ئەو نامرێت و تاقیشناکرێتەوە هەروەك ڕۆحەکان تاقیدەکرێنەوە.

بۆ زانست و زانین ڕۆحێك هەیە، وە بۆ چاکە کردن و دڵسۆزی ڕۆحێك هەیەو بـۆ خۆشەویستی و پێ سپاردن ڕۆحێك هەیە، و بۆ پشت بەستن وڕاست گـۆیی ڕۆحێـك هەیە و خەڵکیش جیاوازن لەو ڕۆحانەدا بـە جیاوازیـەکی زۆر جـا هەرکەسـێ ئـەو ڕۆحانەی بەسەردا زاڵ بوو ئەوا دەبێتە بەندەیەکی ڕۆحانی، لەوانەشیان ئەوەی وونی کردبێت و فەرامۆشی کردبێت یاخود زۆربەیان دەبێتە خـاکێکی تاریـك و نووتـەك، وە خوای گەورەش پشتیوان و یارمەتیدەرە.



## لەم بارەیەوە: ئایە دەروون یەکێکە یاخوود سێ شتە ؟

لەڕاستیدا زۆر لە خەڵکی لە قسەدا کەوتوونەتە ناو ئەوەی کەوا بۆ نەوەی ئـادەم سێ دەروون هەیە: دەروونێك پڕ لە ئارامی یە، دەروونێك سەرزەنشت کارو لۆمـەی خۆی دەکـات، دەروونێکـیش نیـشانەی گونـاهو ئاژاوەگێڕیـە. وە هەیـە ئەمـەی بەسەردا زاڵ دەبێت، و هەشیانە یـەکێکی دیکـەی بەسـەریدا زاڵ دەبێـت، وە بـڕو بیـانوو دەهێننـەوە لەسـەر ئەمـە بـەم فەرموودەیـە پـیرۆزە: ﴿يَـا أَيَّتُهَـا الـنَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ﴾(الفجر:٢٧)، واتە: (( ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لـە ئـارامی ))، وە بەو فەرموودەیەی خـوای گـەورە: ﴿لا أُقْـسِمُ بِيَـوْمِ الْقِيَامَـةِ۝ وَلا أُقْـسِمُ بِـالنَّفْسِ اللَّوَّامَـةِ﴾ (القيامة:١-٢)، واتە: (( سوێند دەخـۆم بـە ڕۆژی قیامـەت، وە سـوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو وە نەفسی ڕەخنە لەخۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات))، بەو

فەرموودەیـــەی خـــوای گـــەورە کـــە دەفـــەرموێت: ﴿إِنَّ الـــنَّفْسَ لأَمَّـــارَةٌ بِالسُّوءِ﴾(یوسف:٥٣)، واتە: (( بەڕاستی نەفس زۆر فەرماندەرە بە گوناهو هەڵـەو تاوان))، ڕاستیەکەی ئەوەیە کەوا یەك دەروونە بەڵام سیفەتیان هەیە، وا دادەنرێت هەر سیفەتێك ناوێکی هەبێت ناونراوە پـڕ لـە ئـارامی بـەو پێیـەی پڕلـەئارامی و ئاسوودەیەکەی بۆ خوای خۆیەتی بە بەندایەتی و خۆشەویستی و ملکەچی بـۆ ئـەو وە پشت بەستن و ترسان و پاڕانەوەشی هەر بۆ ئەوە ، جـا ناونـانی خۆشەویـستی و ترسان و پاڕانەوە لێی ئەوا بینینی خۆشەویستی بـۆ یـەکێکی دیکـە جگـە لەئـەو دەپچڕێت وە ترسان و پاڕانەوە لێی دەست هەڵدەگرێت بـە خۆشەویـستی کەسـێکی دیکە بێجگە لـە خـوای پـەروەردگار، بـە یادکردنەوەشـی یـادی کەسـێکی دیکـە ناکاتەوە بێجگە لـەو ، هـەتاکو شـەوق و گەیـشتن و دانیشتن و بیـنین و جووڵـەو گوێگرتن و تینوویەتیشی هەر بە یارمەتی و پشتیوانی ئەو دەبێت، وە دڵە ڕاکردوو و هەڵاتووەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆلای خـودای میهرەبـان، جـا ئـەو ئـارامی و ئاسوودەییەی لەدەروون و دڵ و جوومگـەکانی و تواناکـانی لـە ئاشـکراو پـەنهانی دەبینێـت ، جـاڕۆحی ڕادەکێـشرێت بـۆلای خـودای گـەورە وە پێـستی و دڵـی و جومگەکانی نەرم دەبێت بۆ خزمەتکردن و نزیك بوونەوە لە پـەروەردگار، ناکرێـت دڵ ئارامی وئاسوودەیی بەدەست بێت تەنها بە خوداو یادکردنەوەی ئەو نەبێت، ئەو فەرموودەیـەی کـە خـوای گـەورە دایبەزانـدووە بۆسـەر پێغەمبـەرەکانی وەك دەفـەرموێت: ﴿الَّـذِينَ آمَنُـوا وَتَطْمَـئِنُّ قُلُـوبُهُمْ بِـذِكْرِ اللَّـهِ أَلا بِـذِكْرِ اللَّـهِ تَطْمَـئِنُّ الْقُلُوبُ﴾(الرعد:٢٨)، واتە : ((ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوەو دڵ و دەروونیـان ئـارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خـودای پـەروەردگار، ئاگـاداربن دڵـەکان هـەر بـە قورئـان و یـادی خـواو (پابەنـد بـوون بـە ئاینەکەیـەوە) خۆشـنود دەبـن و دەحەوێنەوە))، جـا دڵـو دەروونـی ئـارام و جـێگیر بـوونی بـەلابردنی شـێواوی و پەشۆکاوی و شپرزەیی لێی، وە ئەمەش نایەتەدی تەنها بە خوداو یادکردنەوەی ئەو

نەبێت، وە ڕاستی دڵ و ئارامیەکەش کەوا دەروون پێی ئارام دەبێت ئەوا لە دەرگای ناسینی ناوە جوانەکانی و سیفاتەکانی خوای گەورە ئارام دەبێت ، وە پیاهەڵدان و باسکردنی تەواوی و بێ کەم و کوڕی و تاکو خەبەردانی کەوا لەلایەن دەروونیەوە خەبەری پێدەدات، هەواڵی پێبدات لەبارەی پێغەمبەرەکانی جا بەقەبوڵکردن و ڕازیکدرن پێی دەگات ، وەتەسلیم بوون و ملکەچی، وە دڵ فراوانیش بۆ ئەو بێت، وە شادومانی دڵیش هەر بەیادی پەروەردگارە، لەبەر ئەوەی ناسنێك لە ناسینەکانی خودای پاك و بێچگەردبۆ بەندی خۆی لەسەر زووبانی پێغەمبەرەکەیەتی جا هێشتاو بەردەوام دڵ لە گەورەترین پەشۆکاوی و شپرزەیی دایە لەو دەرگایەدا تاوەکو ئیمان بە ناوە جوانەکانی خوای گەورە و سیفەتەکانی و یەك تا پەرستی و بەرزبوونەوەی بۆ سەر عەرشی خۆی تێکەڵ دەبێت، جا ئەمە یەکەمین پلەکانی دڵ و دەروون ئارامیە، پاشان بەردەوام کاریگەری دەبێت هەرکاتێك گوێی لەئایەتێك بێت کەوا باس لە سیفەتێك لە سیفەتەکانی خوای گەورە بکات، ئەوە کارو فەرمانەش کۆتایی نیە، ئەو ئارامی و ئاسودیەش بنچینەیەکە لە بنچینەکانی ئیمان ، کەوا بناخەکەی لەسەر دامەزراوە، پاشان ئاسوودە دەبێت بۆ خەبەر پێدانی لەکاتی دوای مردندا لە کاروبارەکانی بەرزەخدا، ئەوەی لەدوای ئەودا لەبارەکانی قیامەتدا ، هەتاکو وەك ئەوەی بە ئاشکرا هەمووی ببینێت و ئەمەش ڕاستیەکی دڵنیایە کەوا خوای گەورە وەسفی بە ئەهلی ئیمان نەکردووە کەوا دەفەرموویێت: ﴿ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾(البقرة:٤)، واتە: (( دڵنیابن کە ڕۆژی دوایی هەر پێش دێت و قیامەت هەر بەرپا دەبێت))، ئیمان بە ڕۆژی دوایی بەدەست نایەت تاوەکو دڵ ئارام و ئاسوودە دەبێت بەوەی خوای گەورە هەواڵی پێداوە بۆ ئەو کاروبارانەی کەوا دێت و هیچ گومانی تێدانیە ، ، جا ئەوە ئیماندارێکی ڕاستەقینەیە کەوا ئیمانی بەڕۆژی دوایی هەیە هەروەك لە حەدیسێکی حاریسەدا هاتووە: ( بوومە ئیماندار، جا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((ان لکل حق حقيقة فما حقيقة ايانك؟))، واتە: ((

بۆ هەموو مافێك ڕاستیەك هەیە جا ڕاستی ئیمانەکەی تۆ چی یە؟))، حارسە ووتی: دەروونم لە دونیاو ئەوەی تیایەتی وەرس بووە وە لەبەرچاوم کەوتووە ، وەك ئەوە وام کە من سەیری عەرشی خوای خۆم دەکەم لە جێگایەکی زۆر بەرز وە بۆ خەڵکی بەهەشت کەوا سەردانی یەکتر دەکەن وە خەڵکی دۆزەخیش تێیدا ئازار دەچێژن، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی((عبدٌ نور الله قلبهُ))، واتە: (( بەندەیەك خوای گەورە دڵی ڕووناك کردۆتەوە)).

٭٭٭

## ( لەبارەی ئاسوودەیی دەروون وئیماندا )

دڵنیایی و ئاسوودەیی بۆ ناوەکانی خوای گەورە و سیفەتەکانی دوو جۆرە: دڵنیایی بۆ باوەڕ بوون پێی و، سەلماندنی و بیروباوەڕبوون پێی، و ئارامی و دڵنیاییش دەبێت لەشوێنەواری بەندایەتی ڕەنگ بداتەوە، وەك نموونەی دڵنیاییەکەی بۆ قەدرو ئیسپات بوونیشی، و باوەڕ بوونیش پێی دڵنیاییە کە پێویست دەکات بۆ شوێنە بە تواناکان کەوا فەرمان بە بەندە ناکات بە ناچارکردنی، و تواناشی نیە لەسەر پێکدرنی کارەکە، جا سەلاواتی بۆ دەنێرێت، پێی ڕازی دەبێت، وە نەلێی تووڕە دەبێت و نە گلەیی لێ دەکرێت و نەئیمانەکەی شپرزەو تووشی شڵەژان دەبێت، و دڵگران نابێت لەسەر ئەوەی لە دەستی چووە، دڵخۆشیش نابێت بەوەی بۆی هاتووە، چوونکە کارەسات و ودیشوومەکەی تێیدا چاوەڕوانکراوە پێش ئەوەی کەوا بگاتە لای و پێش ئەوەی درووست بکرێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الأَرْضِ وَلا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ۝ لِكَيْلا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾(الحديد:٢٢-٢٣)

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَمَنْ يُؤْمِنْ بِاللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُ ﴾(التغابن:١١)، واتە: (( بە فەرمانی خوا نەبێت هیچ خۆشی و ناخۆشیەك پێشنەهاتووە ، جائەوەی باوەڕی تەواو بهێنێت، خوا دڵی ڕێنوێنی دەکات بۆلای خۆی))، یەکێك لە پێشینەکان دەڵێت: ئەو بەندەیەیە کەوا تووشی کارەساتێك دەبێت و دەزانێت کەوا ئەوە لەلایەن خواوەیە جا ڕازی دەبێت و سەلاوات لێ دەدات، جا ئەوە دڵنیاییەکە تا یاساکانی سیفەتەکان و پێویستیەکانی وە شوێنەوارەکانی لە جیهاندا، بەڵام ئارامی و دڵنیایی چاکەکردن ئەو ئارامییە تا فەرمان و کارەکانی گوێڕایەڵی و دڵسۆزی و ئامۆژگاری، جا لەسەر کارو فەرمانەکەیدا ویست و ئارەزوو و لاسایی کردنەوەیەك پێشکەش ناکات، گومانێك جێگیر ناکات بەرهەڵستکاری هەواڵەی بێت و نە ئارەزوویەك بەرهەڵستکاری فەرمانەکەی بێت.

نیشانەکانی ئەو دڵنیاییەش کەوا دڵنیاو ئاسوودە دەبێت لە پەشۆکاوی تاوان و بێزاریش بێت تاکاتی تەوبە کردنو شیرینی خۆشیەکەی و ئەمەشی لەسەر سووك دەبێت بەوەی کەوا دەزانێت کە لەزەت و شیرینی و خۆشیەکەی لەسەرکەوتن لەتۆبەکردنەکەدایە، وکەسیش ئەمە نازانێت تەنها ئەوەی تامی ئەو دوو فەرمانەی کردبێت، بۆ هەموو ئارەزوویەك سەرخۆشیەك هەیە زیاد دەبێت لەسەر سەرخۆشی بادەو عەرەق هەروەها تووڕە بوونیش سەرخۆشیەکی تێدایە گەورەترە لەسەرخۆشی شەراب و مەی خواردنەوە ، بۆ ئەمەش دەبینیت کەسی عاشق و تووڕە ئەم کارە دەکەن، کەوا کەسی مەیخۆر کارەکە دەکات.

***

**( لەبارەی مانای دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی و ئاسودەیی )**

ئالێرەدا نموونەیەکی نەرم و نیان و بەخشندە هەیە پێویستە ئاگاداری بیت لەسەری وەبۆی ئاگادار بیتەوەوە سەرکەوتنیش بەدەست ئەو کەسەیە کەوا تەنگەژەی سەرکەوتن و یارمەتی بەدەستیەتی، هەر خودای پاك و بێگەردیشە بۆ هەموو ئەندامێك لەئەندامەکانی ئادەمیزاد تەواوی داناوە جا هەر کاتێك یەکێك لەو ئەندامانەی نەبوو ئەوا هەست بە پەشۆکاوی و شپرزەیی دەکات بەهۆی ناتەواوی ئەندامەکانی کەوا بۆی داناوە، وەك نمونەی تەواوی چاو لە بینیندا تەواوی گوێ لە گوێگرتندا، وە تەواوی زمان لەقسەکردندا، جا ئەگەر ئەو ئەندامانەنەمان کەوا هێزێکە بۆتەواوی ئادەمیزاد ئەوا هەست بە ئێش و ئازارو کەم و کورِی دەکات بەهۆی لەدەست چوونی ئەو ئەندامانە.

وە تەواوی دڵ و نیعمەت و دڵخۆشی و لەزەت و کەیف خۆشی لەناسینی خوای گەورە دایە وەوویستی خۆشەویستی و مل کەچی بۆ ئەوو ڕەزا بوون لەسەری و شەوق و خۆشەویستی وهۆگری بۆ ئەوە، جا ئەگەر ئەوەی لەدەستدا ئەوا توونـدترین سزاو شپرزەییە لەچاوێکدا کەوا ڕووناکی بینینی لەدەستداوە، وە لە زمانێکدا کەوا هێزە قسەکردن و تامکردنی لەدەستداوە، ئیبن و عەباس دەڵێت: ئارامی و ئاسوودەیەکی باوەڕپێکراو ، قەتادە دەڵێت: ئەو ئیماندارەیە دڵ و دەروونی ئارامی گرتووە، تا ئەو کاتەی وەعدو بەڵێنی خوا دەگاتە جێ، و حەسەن دەڵێت: باوەڕ پێکردن بەوەی خوای گەورە فەرموویەتی، وە موجاهد دەڵێن: ئەو دەروونەیە کەوا دڵنیایە کە خوای گەورە پەروەردگاریەتی، وە هەروەها دەڵێت: ئەو ددڵ و دەروونەیە کەوا دڵنیایە بە گەیشتنی بە خودای خۆی، جا قسەیپێشینەکان لە دڵ و دەروون و ئارامی و ئاسوودەییدا لەسەر ئەو دوو بنچینەیەدا دەسوورێتەوە، دلارامی و ئاسوودەیی زانست و ئیمان، و ئاسودەیی و دڵنیایی ویستن و ئیرادەو کارکردن.

## ( لەبارەی درووست بوون و پێکهاتنی دڵنیایی و ئاسوودەیی )

ئەگەر ئارام و ئاسوودە بوویت لەگومان بۆ دڵنیایی و یەقینی، و لە نەزانین بۆ زانین و زانیاری، وە لە بێ ئاگایی بۆ یادکردنەوەی خوا، لە خیانەتەوە بۆ تەوبەکردن، و لە ڕیایی و سووخۆریەوە بۆ دڵسۆزی، ولە درۆکردن بۆ ڕاست گۆیی، وە لە بێتوانایی و پێ نەکراندا بۆ ڕەوشت بەرزی و زیرەکی، لەهێزو دەسەلات و لەخۆبایی بووندا بۆ زەلیلی ملکەچی، لە لووت بەرزی و گومراییدا بۆ بێفیزی و ڕۆح سووکی، لەکەمتەرخەمی و گوێ پێنەدانـدا بۆ کـارو کـردەوە ئەوکاتـە ڕۆح دەست دەکات بە ئارامی و ئاسوودەیی، بناخەی هەموو ئەوانە و سەرچاوەکان لە بێداربوونەوەو لەخەوهەڵسانە، جا ئەمەش یەکەمین کلیلی خێرو بەرەکەتـە، لەبەر ئەوەی کەسی بێئاگا لە بری خۆ ئامادەکردن بۆ گەیشتن بە خوای خۆی و ئازوقەیەك دابنێ بۆ ڕۆژی گەڕانەوەی بە پلەو پایەی نووستوو وایە، بەڵکو حاڵی لەو خراپتریشە، لەبەر ئەوەی کەسی عاقڵ و بیرمەند پەیان و بەڵێنی خوای گەورە دەزانێت وە ئەوەی پێویستیەتی لە فەرمانەکانی خوای گەورە وە مەبەست و یاساکانی لە مافەکاندا، بەڵام ڕێگری دەکات لە ڕاستی هەستکردنەکە، جا بە کەمتەرخەمی لێی دادەنیشێت بەوەی دڵی دەیەوێت ئەمەش بێئاگاییەکەیتی کەوا لیچی پاڵکەوتووە جا خەوتن و پاڵکەوتنەکەی درێژە دەکێشێت جا نەرم و هێواش و بەردەوام بۆئارەزووەکانی شەیتان دەمێنێتەوە جا مانەوەکەی بەسەریدا توونـد دەبێت، ئینجا خەریك دەبێت بە شەهوەت و ئامەزرۆو حەزە زۆر بە لێشاوەکانی وەداب و نەریتەکان بەسەریدا زاڵ دەبێت تێکەڵ دەبێت بەو خەڵکانەی بەدوای شتی پڕو پووچ دەکەون.

جا کەی ڕێبازو بەرنامەی ئەو بێئاگاییە لەدڵیدا ئاشکرابوو بە تووڕەبونێك لە تووڕەبوونەکانی هەق لە دڵیدا ئەوکاتە وەڵامی دەدرێتەوە لە ئامۆژگاریەکانی خوای

گـەورە لـە دڵـی بەندەئیمانداره‌کـەی، یـاخود بڕیـارو تێکۆشـانێك لەسـەری شوێنەوارەکەی بیرو فیکرەی پشتی پێ ببەستێ لە شوێنی بەرامبەر، جا لە بڕیاری دیاریکردنـەوەی بـدات و هـاواری گـەورەیی خـوا بکـات بـەجۆرێك کۆشـکەکانی بەهەشتی بۆ ڕووناك بکرێتەوە، جا شاعیر دەڵێت:

ألا يا نَفس ويحَك ساعديني * بسعي منك في ظُلم الليالي
لعَلَك في القيامةِ أن تفوزي * بطيب العَيش في تلك العلالي

جا ئەو فیکرو بیرو هۆشە نورێـك دەجولێنێـت لـە ڕووناکیـەکەیـدا ئـەوەی بـۆی دروستکراوە ئەوەی دەیگاتێ لەڕەحمەتی خوای گەورە لـە کـاتی مردنـدا تـاوەکو دەچێتە ناو گۆڕ دەبینێت، وە خێرایی لەناوچوونی دونیاو نـەبوونی وەفـاو دڵـسۆزی بۆئەوانەی لەسەری دروستکراوە دەبینێت بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَنْ تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَى عَلَى مَا فَرَّطْتُ فِي جَنْبِ اللَّهِ﴾(الزمر:٥٦)، واتـە: (( نـەوەکو یەکێك بڵێت ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆئەو هەموو لادان و نادرووستیانەی کە کـردم ، لە فەرمان و بەرنامەی خـوادا، بێگومـان لـەو کەسـانەش بـووم کـە بـە دیـن و بەرنامەی خوام دەکرد))، ئەو تەمەنە کەمەی کە ماوە وە هـیچ نـرخ و بایـەخێکی نیە هەست بەوە دەکات ئەوەی لەدەست چووە و پێشوازی لێدەکات، دواڕۆژێـك کـە ئەوەی پێشکەشی کردووە لەساتەو خەم و خەفەت و ناخۆشی.

پاشان وورد دەبێتەوە لە نووری ئەو بە ئاگاهاتنەوەیە وە دەسـت بـەجێ و خێـرا نیعمەتی خوای خۆی بەسەریدا لە کاتی جێگیربوونی لە ڕەحمی دایکیدا تاوەکو ئـەو کاتەی، ئەمـەش تێیدا ئەم دیوو ئەو دیو دەکات بەئاشکراو بە نهێنی بە شـەوو بـە ڕۆژ، لەخەبەربوونەوەو لە خەوتندا بە نهێنی و بە ئاشکرا، ئەگـەر کۆشـش بکـەیت بەئامارکردنیجۆرەکانی ناتوانیت.

پاشان لەژێر ڕۆشنایی ئەو نوورەدا دەبینیت ئەو کەوا نا ئومێد بووە لە دڵتەنگی و خەم وخەفەت و ئامارەکانی، نەیتوانیوە مافی خۆی بەتەواوی جێ بەجێ بکات.

پاشان لەژێر تیشکی ئەو هەڵسانەوەو بەئاگاهاتنەوەیەدا ئەگەر ئەو کردەوەی ئادەمیزادو جنۆکەی بکردایە لەکاری چاکەدا ئەوا گاڵتەی پێدەهات، بەنیسبەت ئەوەی لە تەنیشت خوای مەزن دابێت ئەوەی مافی ئەوە لە شکۆمەندی و مەزنی و باڵادەستی خودای میهرەبان ئەمەش ئەگەر کارو کردەوەکانیشی بۆئەو بێت، جا چۆن دەبێت وەئەمەش تەنها بریتیە لە چاکەو مینەت و بەخشندەیی خوای گەورە بۆ ئەو بەجۆرێك کارەکانی بۆ ئاسان بکات و دروستی بکات؟ و ئەگەر کارو کردەوەکانیشی بۆ ئەو نەبێت ولەبەر ئەوەی بۆی بکات و درووستی بکات؟ خاوەنەکەی لە دەروونی خۆیدا ببینیێ، تاوەکوە چاوێك دەیبینیێ، یارمەتیدانی و پشتیوانی خوای گەورەی تیچدایە لە گەورەیی و مننەت و بەخشندەیی بەسەریدا.

پاشان لەو نوورەدا ئەو بێ ئاگاییەی بۆ دەدرەوشێتەوە درەوشانەوەیك کەوا لە ڕووناکیەکەی عەیب و لەنگی دەروونی و لەکیس چوونی بەهەدەرچوو کردەوەکەی ببینێت، ئەوەی پیچشتر کردویەتی لە تاوان و خراپەکاری و پێشێل کردنی پیرۆزیەکان و وازهێنان و دەست هەڵگرتن لە زۆربەی مافەکان و واجبەکاندا، جا ئەگەر چووە پاڵ ئەوەی بۆ دیتنی نیعمەتەکانی خوای گەورە بەسەیدا و پشتگیری کردنی دەبینی مافی ئەو کەسەی نیعمەتی پێکراوە لە نیعمەت و فەرمانەکانیدا چاکەیەکی بەرامبەر نەکردووە کەوا سەری پێ بەرز بکاتەوە، جا دڵی ئارام دەبێت وە دڵ و دەروونی تێك دەشکێت وئەندامەکانی لەشی ملکەچ دەبێت وەسەری شۆڕ دەبێت بەرامبەر خوای گەورە لە بینینی نیعمەت و پێداچوونەوەی گوناهەکانی و ئەنگ وشوورەیی دەروونی وەبەهەدەر چوونی کردەوەکانی ( أبوء لك بنعمتك علي وأبوء لك ذنبي ، فأغفر لي ، فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت))[٣٢٢]، واتە: (( خۆم پەنا دەگرم بە تۆو بە نیعمەتەکانت لەسەرمدا، وەخۆم پەنادەگرم بەتۆ لە تاوانەکانم جا لێم خۆش ببە، لەبەر ئەوەی کەس لە تاوانەکانم خۆش نابێت تەنها زاتی تۆ

---

(٣٢٢) مسند أحمد: ٤/١٢٢ ، ومسند ابن ماجة(٣٧٨٢).

نەبێت)). جا بۆ دەروونی خۆی چاکەیەك نابینێ بۆیە بۆ ئەمە دوو کـارو فـەرمانی مەزن پێویست دەکات:

**یەکەم:** زۆر یادی ئەو بکەرەوە کەوا خوای گەورە منەتی بەسەرداکردەووە.

**دووەم:** یەکەم تەماشاکردنی ئەو خواپەرستیەی دەکەیت لەوەی خوای گەورە منەتی لەسەرت کردووە بەمانای وا سـەیری خـۆت مەکـە تاعـەت و عیبـادەتێکی زۆرت کردووە بەرامبەر ئەوەی خوای گەورە منەتی لەسەرکردووی.

❊❊❊

## (لەبارەی تۆبەکردن و پەشیمانی و لێپرسینەوەدا)

پاشان وورد دەبێتەوە لە ڕوونـاکی ئـەو تیـشکە درەوشـاوەیە ئـەوەی پێویـستی لەخەو ڕابوونەکەی دەکات لەبەرنامەی بـێ ئاگاییەکـەی لـە تۆبـەو پەشـیمانی و لێپرسینەوەو چاودێری کردندا، وە پەرۆشـی و خۆنەویـستی بـۆ خـوای خـۆی کـەوا پەرۆشیەکەی کاریگەری لەسەری هەبێت، لەسەر بەختو چارەنووسی لـە ڕەزابـوون و نزیك بوونەوەی و بەخشندەیی و دڵ فراوانی لێی لە فرۆشتنی بە نرخێکـی کـەم لـە جیهان و مەنزلگایەك بە خێرایی لەناو دەچێت.

جا ئەمە هەمووی لە کاریگەریـەکانی لەخـەو ڕابـوون و پێداویـستیەکانیەتی، ئەمەش یەکەمین شوێن و هەواری دڵ و دەروونی پڕ لە ئارام و دڵنیایە کەوا کـۆچ و کۆچباری بۆلای پەروەردگارو جیهانی دوارۆژی لێ دامەزراوە.

❊❊❊

**( لەبارەی دڵ و دەروونی لۆمەکار )**

بەڵام سەرزەنشتکراو ئەوەیە کە خوای گەورە سوێندی پێخواردووە وەك دەفەرموویت: ﴿ وَلا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ﴾(القيامة:٢) واتە: ((وە سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو و نەفسی رەخنە لەخۆ گر کە لۆمەی خۆی دەکات))، لەبارەیەوە ناکۆك و جیاوازن، کۆمەڵێك دەڵێت: ئەو دەروونە کەوا لەسەر یەك بار جێگیر نابێت، ئەو وتەی دەربڕینەیان لە لۆمە لەیەکتر کردن وەرگرتووە ، ئەوەش ڕاڕایی و دووبارەبوونەوەیە، ئەمەش لە گەورەترین نیشانەکانی خوای گەورەیە، لەبەر ئەوەی ئەو دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی دەگۆڕێت و ڕەنگ دەگۆڕێت لەیەك کاتژمێردا لەگەڵ ئەوەی لە ڕۆژ و مانگ و ساڵێك و تەمەنێکدا ڕەنگەکانی دەگۆڕێت، جا یادی خوا دەکاتەوەو بێ ئاگاش دەبێت و ڕەزای دەبێت و بەرهەڵست کاریش دەبێت، وە هێمن و لەسەر خۆ دەبێت وە ڕووی هەڵدەماڵێت، پەشیمان دەبێتەوەو تۆبە دەکات سەرپێچش دەکات و دڵی ڕەق دەبێت، خۆشەویستی دەکات و تووڕەش دەبێت ، دڵی خۆش دەبێت و شادومان دەبێت و خەمناك و دڵتەنگیش دەبێت وە ڕازی دەبێت و بە ڕق و کینەو تووڕەش دەبێت، ملکەچ دەبێت و سەرپێچ و یاخیش دەبێت لەخواترس دەبێت و گومڕاو تاوانباریش دەبێت، بۆ زۆر زۆر لەو حاڵەتانەو ڕەنگانە ، جا ئەمەش هەموو کاتێك ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت.

کۆمەڵێك دەڵێت: وتەو دەربڕینەکە لە لۆمە وەرگیراوە، پاشان لەمەدا جیاوازبوون و تیپێکی دیکە وتی: ئەوە دەروونی ئیماندارە، ئەمە تەنها لە سیفەتەکانیەتی، حەسەن بەصری دەڵێت: پیاوی ئیماندار هیچ نابینێت تەنها لۆمەی خۆی دەکات و دەڵێت: چیم لەوە دەوێت؟ بۆچی ئەمەم کرد؟ شتێکی دیکەم بکردایە لەمە باشتر بوو.

هەندێکی دیکە دەڵێت: ئەوە دەروونی ئیماندارە کەوتۆتە ناو گوناهو تاوان ، پاشان لۆمەی لەسەر دەکرێت، جا ئەو لۆمەو سەرزەنشتکردنە لە باوەڕەوەیە

بەپێچەوانەی کەسی تاوانبار، کەوا ئەو لەسەر کردنی تاوان لۆمەی خۆی ناکات ، بەڵکو لۆمەی ئەو دەکات کەوا لەدەستی چووە .

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێت ، بەڵی ئەو لۆمەکردنە بۆ دووجۆر کەسن: بێگومان هەموو کەسێك لۆمەی خۆی دەکات ئەگەر هاتوو چاکە بێت یا خراپە کردن بێت، جا کەسی دڵخۆش لۆمەی خۆی دەکات لەسەر ئەنجامدانی سەرپێچیکردنی خوای گەورە و وازهێنان لە یەکتاپەرستی، و کەسی ماندوو و گوناهکاریش لۆمەی خۆی ناکات تەنها لەسەر لەدەست چوونی بەخت و شانس و ئارەزووەکانی.

کۆمەڵێکی دیکە دەڵێت: ئەوە لۆمەی ڕۆژی قیامەتە ، لەبەر ئەوەی هەموو کەس لۆمەی نەفسی خۆی دەکات ئەگەر هاتوو خراپ بوو لەسەر خراپەکردنەکەی، ئەگەر چاکەکردنیش بوو لەسەر کەم تەرخەمیەکەی.

ئەو ووتانە هەموویان ڕاستن، و هیچ بەربەرج دانەوەیەك لە نێوانیاندا نیە ، لەبەر ئەوەی دەروون بەو هەموانە وەسفکراوە، لەبەر ئەوەشە بە لۆمە کردن ناونراوە بەڵام لۆمەکردنیش دوو جۆری هەیە:

لۆمەکردنێك لۆمە کراوە: ئەمەش دەروونی نەزانێکی ستەمکارە کەوا خواو فریشتەکانی لۆمەیان دەکات.

لۆمە کردنێك کەوا لۆمەکراو نیە: بریتیە لەو دەروونەی کەوا بەردەوام لۆمەی خاوەنەکەی دەکات لەسەر کەمتەرخەمیەکەی لەبارەی ملکەچی و گوێڕایەڵی خوای گەورە لەگەڵ ماندووبوون و تێکۆشانیشی، جا ئەو دەروونە لۆمەکراو نیە.

❊❊❊

**( لەبارەی دڵو دەروونی نیشانەی گوناهو تاوان )**

بەڵام دەرونی فەرماندەر بە گوناهوو تاوان دەروونێکی زەمکراوە، لەبەر ئەوەی کەوا فەرمان دەکات بەهەموو خراپەیەك[٣٢٣]، وە نەمەش لە سرووشتی دەروونەکەیە تەنها ئەوەی خوای گەورە یارمەتیدەریەتی و جێگری دەکات و چاودێری دەکات جا کێ هەیە لە شەڕی دەروونی دەربازی بێت تەنها بە پشتیوانی خوا نەبێت، هەروەك خوای گەورە لە بارەی خێزانی عەزیزی میسر دەدوێت و دەفەرموێت: ﴿ وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾(يوسف:٥٣)، واتە: (( "دەشێت یوسف یان ژنەکەی عەزیزی میسر وتبیەتی" منیش نەفسی خۆم بەری ناکەم چوونکە بەڕاستی نەفس (ئەگەر بەنووری خواناسی ئاوەدان نەبێت ) زۆر فەرماندەر بە گوناهو تاوان، مەگەر نەفسێك کە پەروەردگارم میهرەبانی پێکردبێت ، بەڕاستی پەروەردگارم لێخۆشبوو و میهرەبانە ))، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَى مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ أَبَداً ﴾(النور:٢١)، واتە: (( ئەگەر فەزل و میهرەبانی خوای گەورە نەبوایە لەسەرتان ئەوا هەرگیز کەستان پاك و پووختەو ڕزگار نەدەبوون لەدەست بووختان چیەکان یاخوود بەتەوبە پاك نەدەبوونەوە))، وە هەروەها خوای گەورە لەبارەی ڕێزدارترین درووستکراوی خۆی وە خۆشەویسترینیان بۆی دەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَا أَنْ ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدْتَ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً﴾(الإسراء:٧٤)، واتە: ((خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پایەدارو دامەزراو نەکردایە، ئەوا بەڕاستی نزیك بوویت "بەمەزەندەی خۆت بۆ بەرژەوەندی بانگەوازەکەت" کەمێك بەلایاندا مەیل بکەیت و بەدڵی ئەوان بکەیت!!)).

---

(٣٢٣) سەیری : تفسير القرطبي : ٩/٢١٠ بکە .

پێغەمبەرﷺ لە ووتاردنی پێویستدا ئەمەی فێرکردن: ((الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهدِ الله فلا مضل له، ومن يضلله فلا هادي له))[٣٢٤].

شەرو ئاژاوە مت وشاراوەیە لە دەروونـدا، جا هەر کەسێك خوای گەورە پشتیوانی بێت و بیپارێزێت رزگاری دەبێت لەم شەڕەدا، جا لەخوای گەورە دەپاڕێنەوە کەوا پەنامان بدات لەشەڕو ئاژاوەکانی دەروونمان وە لە خراپەکانی کارو کردەوەمان.

جا خوای گەورەو میهرەبان ئادەمیزاد بەو دوو دەروونە تاقیدەکاتەوە ، دەروونی فەرماندەر بە گوناهو تاوان وە دەروونی لۆمەکراو هەروەك ڕێزی لێناوە بە ئارامی و ئاسوودەیی جا ئەمە یەك دەروونە دەبێتە نیشانەی گوناهو تاوان ، پاشان لۆمەکراو، پاشان پڕ لە ئارامی، بریتی یە لە مەبەستی تەواوی و چاکسازی، وە دەروونی ئارام بەخش پشتگیری ئەکات بەسەربازی زۆر کە فریشتەن جا فریشتەی دادەنێت بە هاوڕێو هۆگری کارو کردەوەکانی لەپێش جوان و خۆشەویست دەکات ، لەبارەی خراپەکاریش کارو کردەوەکانی لێ قەدەغە دەکات و وەلێ کەمتەرخەم دەکات و بەناشرینترین دیمەن پیشانی دەدات، و درێژەی پێدەدات بەوەی فێری کردووە لە قورئان و یادکردنەوەکان و کارە چاکەکان و لەهەموو دەورویەرێك کارو خێری بەردەوامی پشتیوان و سەرکەوتنی پێ دەگات، و هەرکاتێك بە ڕەزابوون و سوپاسگوزاری و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی پێگەیشت ئەوا زیاتر تەقواو ترسانی بۆ دێت لەسەر شەڕ کردن لەگەڵ ئەو دەروونە گوناهکارە، جا لەو سەربازانەش بریتیە لە فەرمانڕەوای سەربازەکان و فریشتەکانی: ئیمان و دڵنیاییە، سوپای ئیسلام هەمووی لەژێر ئالاکەی دەبێت و سەیری دەکات، پاشان فەرماندەی ئەو سوپایەو سەرتاپای سەربازەکانی شوعبەکانی ئیمانە کەوا هەڵواسراوە بە

(٣٢٤) سنن إبن ماجة : (١٨٩٢).

ئەندامەکان لەسەر جیاوازی جۆرەکانی وەك نوێژو زەکات و ڕۆژوو حەج و جیهادو فەرمانکردن بە چاکە، وە ئامۆژگاری بوونەوەرو چاکە کردن لەگەڵیاندا بەهەموو جۆرەکانی چاکەکردن و شوعبەکانی شاراوەش کەوا هەڵواسراوە بەدڵ وەك دڵسۆزی و پشت بەستن بە خواو ملکەچی و تۆبەکردن و چاودێری و سەبرو ئارام و میهرەبانی و ڕۆح سووکی و جێگیری و دڵنیایی، وە پڕکردنی دڵ لە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی وە گەورەو بەرز ڕاگرتنی فەرمانەکانی خوای گەورەو میهرەبان و مافەکانی و پەرۆشی و خۆنەویستی بۆ خواوە لە پێناوی خوا و ئازایەتی و لێبوردن و ڕاستگۆیی شەقەت و بەزەیی وە خاوەنی هەموو ئەمانە دڵسۆزی و ڕاستگۆیە چاکەسی ڕاستگۆو دڵسۆز ماندوو نابێت ، لە ڕاستیدا لەسەر بەرنامەو ڕێبازی ڕاست و درووست وەستاوەو لەسەری دەڕوات و لێی ڕاکشاوە وە ماندوو نابێت هەرکەسێك ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لێ قەدەغە بکرێت، لە ڕاستیدا ڕێگا لەسەر پچڕاوە، وە شەیتانەکان لە خشتەیان بردووە لە زەویدا سەرسام ماوەتەوە، جا هەر چی بیەوێت دەیکات، هەر کەسێکیشس بیەوێت وازی لێدەهێنێت... بەگشتی ئەوەی بۆ خوا بێت و لە پێناوی خودا بێت ئەوا ئەو لە سەربازەکانی دەروونی پڕ لە ئارامیە.

بەڵام دەروونی فەرماندەر بە گوناهو هەڵەو تاوان ئەوا شەیتان دەبێتە هاوڕێ و هۆگری کەوا لەبۆی دێت، کەوا ئەو ئامادەی دەکات و هیواو ئاواتیەتی، کەسی خراپەکار دەخاتە ناویەوە وە فەرمانی پێدەکات بە خراپە و بۆی دەڕازێنێتەوە، لە هیواو ئاواتیدا بۆ درێژ دەکاتەوە وە پیشانی خراپەکارەکە دەدات بەشێوەیەکی جوان بۆی ڕێك دەخات، وە بۆی درێژە پێدەدات ، لە هیواو ئاواتی درۆو ئارەزوو و حەزی لەناوبەر، بە هیواو ئارەزووەکانی خۆی پشتگیری دەکات و بە ویست و ئیرادەی خۆی دەیخاتە ناو هەموو تاوان و گوناهێك ، جا هەر کەسێك داوای یارمەتی و پشتگیری لەسەر دەروونەکان بێت بە شتێك ئەوا ڕای گەیاندووە، لەداوای

یارمەتیکردن لە هیواو ئارەزووەکان و ویستی شەیتان بۆی، بێگومان برایەکانی لـە شەیتانی ئادەمیزاد ئەوەی دەزانـن و داوای یارمـەتی لەسـەر ئـەو وێنـە قەدەغـە کراوانە لەوان ناکەن بە شتێك لە هیواو ئاوات و ویستی ئەوان ڕاگەیانـدرابێت، جـا ئەگەر وێنەیەك مانـدوو و شـەکەتی کـردن داوای کۆشـش و مانـدووبوونی خۆیـان دەکەن لەوەی پێیان خۆشەیە ئارەزوویانە، پاشان داوا دەکەن بە کۆشـش و مانـدوو بوونی ئەوان کەوا دەستی کەوتووە جـا بـەو وێنەیـە ڕاوی دەکـەن ، ئینجـا ئەگـەر دەروون دەرگـای هـەواو هەوەسـی بـۆ کردنـەوە لێـی دەچـنە ژوورەوە، بـەناوی دا دەگەڕێن و خراپی دەکەن، ئینجا پیسی دەکەن و خراپی دەکـەن و هێرشـی دەکەنـە سەری و جنێوی پێدەدەن، ئەو کارە دەکەن کەوا دووژمن لە وولاتـی دووژمنەکـەی دەیکات ئەگەر فەرمانڕەوایی بکات، جا نیشانەکانی ئیمان و قورئان و یادی خوداو نوێژی تێـدا وێـران دەکـەن، و مزگەوتـەکان دەڕوخێـنن و پەرسـتگای دیانـەکان و کەنیـسـەکان و مەیخانـەکان و ماڵـە سـۆزانیەکان درووسـت دەکـەن و ئـاوەدانی دەکەنـەوە، وە دەیگوازنـەوە، لـە عیبـادەتکردنی خـوای گـەورە بـۆ عیبـادەتی خراپەکاری و تاوان و کەسی ستەمکارو بتەکان، و لەسەربەرزی ملکـەچ کـردن بـۆ زەلیلی تاوان و گوناهکردن، وە لە گـوێ گرتنـی یـادی خـوا بـۆ گـوێگرتنی یـادی شەیتان و لەخۆ ئامادەکردن بۆ گەیشتن بە پـەروەردگاری هـەردوو جیهـان بـۆ خـۆ ئامادەکردن بۆ گەیشتن بە برای شەیتانەکان.

مەبەستیش کەوا فریشتە هـاوەڵ و هـاوڕێی دەروونـی پـڕ لـە ئـارامی یـە، وە شەیتانیش هاوەڵ و هاوڕێی دەرووني فەرماندەر بە گوناهو هەڵـەو تاوانـە، وە أبـو أصوص ڕیوایەتی کردووە لە عطاء کوڕی صائب، ئەویش لـە مـوڕڕە، ئـەویش لـە عبدالله ووتی : پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( ان للشيطان لمة بأبن أدم وللملك لمة ، فأما لمة الشيطان فإيعاد بالـشر وتكـذيب بـالحق ، وأمـا لمـة الملـك فأيعـاد بـالخير وتصديق بالحق، فمن وجد ذلك فليعلم أنـه مـن الله وليحمـد الله، ومـن وجـد الآخـر

فليتعوذ بالله مـن الـشيطان الـرجيم))، واتـه: (( لـه ڕاسـتيدا بـۆ شـەيتان بـەڵاو كارەساتێك هەيە بۆ نەوەی ئـادەم و بـۆ فريـشتەكانيش كارەسـاتێك هەيـە، بـەڵاو كارەساتی شەيتان هەڕەشەيە لە شەڕو فيتنەو درۆكـردن بـە هـەق و ڕاسـت، بـەڵام كارەساتی فريشتە هەڕەشە بۆ خێركردن و باوەڕ كردن بە هـەق و ڕاسـتی جـا هـەر كەسێك ئەوەی بۆ دەركەوت با بزانێت ئەوا لەلايـەن خوداوەيـە بـا سوپاسـگوزاری خودای ميهرەبان بكات، ئەويشی ئەوەی ديكەی بـۆ دەركـەوت بـا پـەنابگرێت بـە خوای گەورە لە شەيتانی نەفرەت لێكراو)).

پاشـان پێغەمبـەرﷺ ئـەم فـەرمودەی خوێنـدەوە: ﴿الـشَّيْطَانُ يَعِـدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُمْ بِالْفَحْشَاءِ ﴾(سورة البقرة: من الآية ٢٦٨)[٣٢٥]، واتـه:((شـەيتان بـەڵێنی هەژاری و نەداريتان پێدەدات (دەتانترسێنێت بە هەژاری) و فەرمانتان پـێ دەكـات بە گوناهو تاوان و خراپەو نەبەخشين )). عەمر ڕيوايەتی كردووە، لـە عـەتا كـوڕی صائب، وە عەمريش ئەوەی تێدا زياد كردووەو دەڵێـت: گوێمـان لـەو حەديـسەبوو كەوا دەيفەرموو: ئەگەر يەكێك لە ئێوە هەستی بە لۆمەو كارەساتێك كرد لەلايـەن فريشتەكانەوە بـا سوپاسـگوزاری خـوای گـەورەی لەسـەر بكـات و داوای چـاكەو بەخشينی لێ بكات ، ئەگەر هەستی كرد لـە بـەڵاو كارەسـاتی شـەيتانە بـا دوای تۆبەو پەشيمان بوونەوە لە خوا بكات و پەنابگرێت لە خوای گەورە لە شەيتان.

❊❊❊

## ( لەبارەی دەروونی پڕ لە ئارامی )

دەروون و فريشتەو سەربەرزەكانی لە باوەڕەوەن پێويستيان پێی هەيە لە دەروونی پـڕ لـە ئـارامی و ئاسـوودەيی و يـەكتا پەرسـتی و چـاكە كـردن و گوێڕايـەڵی و بەخشندەيی و لەخوا ترسان و ئارامگرتن و پشت بەستن بە خوای گـەورە وە تۆبـەو

---

(٣٢٥) فيض القدير: ٢/٤٩٩.

پەشیمانی و ملکەچی و ڕەزابوون لەسەر فەرمانی خوا و دەست هەڵگرتن لە هیـواو ئـارەزوو و خـۆ ئامـادەکردن بـۆ مـردن و ئـەوەی دوایـی دێـت، و شـەیتان و سەربازەکانیشی لە کوفرو بێبـاوەڕین و پێویـستیان بـە دەروون هەیـە دژی ئـەوانی دیکە لە تاوان و گوناهو هەڵە ، و خوای گەورەو میهەربانیش شـەیتان زاڵ دەکـات بەسەر هەر شتێك کە بۆ ئەو نیە، ئەو دەروونە گوناهکارەکە دەکاتە نوێنەری خۆی دەسەلاتی پێدەدا لەسەر ئەو کارە ستەمەی کە دەیکات ، پێویـست دەکـات کـەوا کردارەکان لە دەروونی پڕ لە ئارامی وەربگیرێت وە بیکاتە هێزێك بۆی، ئینجا ئەوە پێداگیری شتێکە لەسەر دەربازبوونی کارو کردەوەکان بەتەواوەتی و دەبێتە بەخت و چارەنووسی ، جا قورسترین شـت لەسـەر دەروونـی ئـارام و ئاسـوودە ڕزگـاربوونی کردەوەکانە لە شەیتان و وە تاوان و کوناهو هەقە گەڕانەوە بۆ لای خوا، وعبداللـه ی کوڕی عمر دەڵێت : ئەگەر بزانم کەوا خوای گـەورە تـەنها یـەك سـووژدە لـەمن وەردەگرێ و قبوڵی دەکات ، ئەوا خۆشەویست ترین شت لەلای مـن مـردن دەبـوو ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾(المائـدة:٢٧) واتـە: (( خـوای گـەورە تـەنها لـە پارێزکاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت)).



## ( لەبارەی وەستانی گوناهو تاوان لە بەرامبەر ئاسوودەیی )

بەڕاستی گوناهو هەڵەو تاوان لە ڕووبەڕووبونەوەی ئـارامی و ئاسـوودەیی دایـە، جا هەر کاتێك ئەو خێرو خۆشی و چاکەی بۆ هات ئەویش هاوشێوەی ئـەو گونـاهو شەڕو تاوانی بۆدێت بەوەی ڕووبەڕووی ببێتەوە تاوەکو لەسەری خراپ دەکـات، جـا ئەگەر ئەو ئیمان و یەکتاپەرستی بۆهات ئەویش بـۆ زڕانـدن و سـوککردنی ئیمـان گومان و دووڕوویی بۆدێت، ئەوەی لە یەکتا پەرستی دا هەیـە سـووکی دەکـات وە ناوی دەزڕێنێت بە هاوبەشی پەیداکردن و بە خۆشەویستی جگە لە خوای گـەورە وە

ترسان و پاڕانەوە شی بۆی پێشکەش بکات لەسەر خۆشەویستی و ترس و پاڕانەوە لە خوای گەورە ، ئەمەش حاڵی زۆرترین ئەو بوونەوەرەیە وە تێڕوانینەکان و بیروڕاکانی پیاوانی زاناو ووتەکانیان لەسەر سروش و وەحی، لەگومانی گومڕای بۆدێت بەوەی قەدەغەی دەکات لە تەواوی بەدواداچوون و دادوەری سوننەت و بێئاگایی و کەمتەرخەمی بۆ تێڕوانین و بۆچوونەکانی پیاوانی زاناو بیرمەند، جا جەنگ لە نێوان ئەو دوو دەروونە بەرپا دەبێت، وە سەرکەوتووش ئەوەیە کە خوای گەورە سەری بخات ، ئەگەر ئەمە بە دڵسۆزی و ڕاست گۆیی و پشت بەستن و ملکەچی و چاودێری هات ئەوەی دیکە هات لەدژی ئەوانی دیکە ئەوا لەزۆر لە دڵەکاندا دەری دەهێنێت و سوێند بە خوا دەخوات کەوا هیچ مەبەستێکی دیکەی نیە تەنها چاکە کردن و پشتیوانی نەبێت و خوای گەورەش دەزانێت کە ئەو درۆ دەکات، هیچ مەبەستێکی نیە تەنها جەخت و چارەنووسی و شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووەکانی ، ئینجا بەند دەبێت لەو جیهانەدا، لە جیهانی بەرزەخیشدا کە تێیدا لەو جیهانەدا تەنگترە، ڕۆژی دواییش لە هەردووکیان تەنگترە .

لەسەیری کارو فەرمانی کەوا ئەقڵ و دڵ فریودەدات دەچێتە ناو پیرۆزترین شتەکان وە باشترینیان و گەورە دەکات ئینجا لە وێنەو دیمەنێکی زەمکراو دەیهێنێتە دەرەوە ، وە زۆربەی بوونەوەرەکان کەوا ئەقڵیان منداڵانەیەو خەونیشیان منداڵانەیە نەگەیشتونەتە ڕادەی لەشیر بڕینەوەی یەکەم لەبارە سوودو قازانجەکان و شتە باوەکان، باشتر لەوە لەبارەی پێگەیینی منداڵ واتە گەیشتن بە تەمەنی هەرزەکاری کەوا ئەقڵی باڵق بوو جیای دەکاتەوە لەنێوان خێرو چاکەی چاکەکەران کەوا کاری تێدەکات، وە شەڕی فیتنەکاران کەوا لێی دوور دەکەوێتەوە، جا وێنەیەکی پیشان دەدرێت و سەیری دەکات تەنها یەك تا پەرستیە کەوا لە وێنەی ڕۆژو مانگ گەشاوەترە لەبارەی وێنەیەکی خراپی زەمکراوی داشکێنراو وە هەرسکردنی کەسە بەرزو گەورەکان دەیخەنە ماڵەکانیانتا پلەو پایەی بەندایەتیەکی پاك و بێگەرد

وکەساسو زەلیل و نەدار کەوا هیچ تواناو ئیرادەو شەفاعەتێکی لانیە تەنها پاش مۆڵەت دان لەلایەن خودای گەورەوە، جا پیشانی دەروونە لە خشتەبەرو جادوو بازەکە دەدەن ئەو چارەنووسە بەمەبەستی کەمردنەوەیان و دابەزاندنی تواناکانیان وە جیاکردنەوەیان لە دەست گورت و هەژارەکان جا دەروونیان دوور دەخاتەوە لە بێ بەش کردنی یەکتاپەرستی بە بە توندترین دوورخستنەوە، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ﴾(ص:٥)، واتە: (("هەروەها دەیانووت : ئایا پێتان سەیر نیە" هەموو خواکانی کردووە بە یەك خوا ، بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر سەیرو سەمەرەیە!!)). وە دڵ و دەروونی ئەو دووڕووانەی سوێند بە خوا دەخۆن: ﴿إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا إِحْسَاناً وَتَوْفِيقاً ۞ أُولَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾(النساء:٦٢-٦٣)، واتە: (( لەو کارەماندا مەبەستمان تەنها چاکەکاری و ڕێکخستن و ئاشتی بوو ئا ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێت چی لە دڵ و دەروونیاندا حەشاردراوە)).



## ( لەبارەی وێناکردنی دیمەنێکی دڵسۆزی )

وێنەیەکی دڵسۆزی پیشان دەدەن لەناو وێنەیەك لێ دووردەکەوێتەوە ئەوە دەرچوونەش لەبارەی یاسای شێوەو چۆنیەتی بژێوی و ڕووخۆشی و لاواندنەوەو زمان لووسی و دوو ڕوو بیە کەوا تێهەڵکێش و خۆتێخستنی باری خاوەنەکەی تێدایە وە ڕەوت و گوزەرانیەتی لەناو خەڵکدا، کەی کارو کردەوەکانی دڵسۆزی دەبێت لەکاتێکدا هیچ شتێکی بۆکەس نەکردووە کەوا ئەوان و خۆی دووربخاتەوە وە ڕقی لێیان دەبێتەوە وە ئەویش ڕقی لێ دەبنەوە دژایەتی دەکەن و دژایەتیان دەکات ، وەلەسەر ئەمە دەمێنێتەوە ، ئەوانیش لەسەر ئەم حاڵەتە دەمێننەوە جا لێی دوور

دەکەوێتەوەو بەتووندترین دوور کەوتنەوە، مەبەستەکەشی کە ڕزگـاری بێـت لـەو چارەنووسەی کەوا دەبێتە کردەوەکانی کەوا هیچ پەیوەندی پێیانەوە نیـە وە گـشت کردەوەکانی بۆ غەیری خوایە.



**( لە بارەی وێناکردنی وێنەیەك ڕاستگۆییت لەگەڵ خوای گەورە )**

وێنەیەکی پیشان دەدرێت ڕاستگۆیی لەگەڵ خوای گـەورە و تێکۆشـانێکە بـۆ ئـەو کەسەی لە دینەکەی دەردەچێت و فەرمانی پێدەکات لەقاڵبی وەسـتان و ڕووبـەڕوو بوونەوە بۆ دژایـەتی بوونـەوەو نەزیـەت دانیـان و شـەڕکردن لەگەڵیانـدا، وە ئـەو دەروونی خۆی دەردەخات و تووشی بەڵاوکارەسـاتی دەکـات لـە کاتێکـدا بـۆ ئـەو ناگونجێت ، و دەبێتە مەبەشت و نامانجێك بۆ تیری پیلان گێڕان و ئابڕووبـەران ، وە نموونەی ئەوە لەگومانێك کەوا دەروونی خەڵەتێنەر و جادوو بـازو خـەیاڵاوی کـەوا خەیاڵ پڵاوی دەکات دایدەمزرێنێت، ڕاستی خەبات و تێکۆشانیـشی لـە وێنەیـەك پیشان دەدرێت کەوا تێیدا دەروون دەکوژێت و ئافرەت مارە دەکات و دەست دەنێت بەسەر منداڵانی یەتیم و بێ سەرپەرشتیار و ماڵ و سامان دابەش دەکـات، ڕاسـتی زەکات و سەدەقەو خێرو چاکەی پێ نیشان دەدرێت، لە وێنەیەکـدا جیـاوازی مـاڵ وسامان و کەم و کوڕی و دەست هەڵگرتن لێی وە پێداویستیەکانی بـۆ خـەڵکی وە یەکسان بوونی بۆ هەژارو نەدارەکان، ڕاستی سەلماندنی سیفەتەکانی تەواوی و بـێ کەم و کوڕی لەبارەی خوای گـەورە لـە وێنەیەکـدا پیـشانی دەدرێـت لەوێنەیـەکی هاوشێوەو لێکچوودا جا لە باوەرش پێکردن ڕا دەکات و لەوانی دیکەش ڕادەکـات، ڕاست پەککەوتن و لەکار کەوتن و بی چ باوەرشی و لەڕی لادان تێیدا لەوێنەیەکـدا داوێن پاکی و ڕێزلێنان و گەورەیی پیـشان دەدرێـت. سـەیرتریش لـەوە کـەوا ئـەو

ئەوەی خواو پێغەمبەری خۆش دەوێت لە سیفەت و ڕەوشت و کردارەکانـدا بـەوەی ڕق و کینەشی لێی هەیە، وە لەسەر بەنـدەدا یـەکێك لـەو دوو فەرمانەکـە لەبـەر دەکات بـەوی دیکـەدا ، لـەوە ڕزگـاری نابێـت تـەنها خـاوەنی چـاو کراوەکـان و هۆشیارەکان ، لەبەر ئەوەش کردارەکان لە ویست و ئیرادەکان دەردەچـێت وەلەسـەر بەشە سەرەکیەکان ئاشکرا دەبێت لەسەر دەروونـی فەرمانـدەر بـەگوناهو تـاوان وە دەروونی پڕ لە ئارامی و ئاسوودەیی جا هەردوو کردارەکـە لـە بـێ کـەڵکی و بـێ سوودیدا بەدیاردەکـەوێت وە ئاشـکرادەبێت وە لـە دیـوی دەرەە دەرخـستنەکەشدا گوماناوی دەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا نمونەی زۆر هەیە لەوانە نەوازشت و ڕوو خۆشی و زمان لووسـی و مەرایی کردنە، جا یەکەمیان لە دڵنیایی و ئارامیەوە دووەمیـشیان لـە تـاوان و گوناهە، وە ملکەچی ئیمان و سەرشـۆڕی دووڕوویـی و شـکۆداری دەروون و لـووت بەرزی و خۆ بەزل زانین و ناکۆکی و ڕشقەبەرایەتی، بێ فیزی و ڕووح سـووکی و بـە بێ ئابڕوویی و سەرشۆڕی ، هێزیش لە کارو فەرمیانی خودایە، بەرزیش لە زەویـدا ، بەرزی و گەورەییش بۆ خوای گەورەو میهرەبانە وە ڕق و کینەش هەر بۆ ئەوە خۆ بـەزل زانـین ببـۆ دەروون و ڕق و کینــەش بـۆ ئــەوە، بەخـشندەیی و بـەفیڕۆدان، شکۆمەندی و گەورەیی وە پاراسـتن و خـۆ بەگـەورە دانـان، ئازایـەتی و نەترسـان، بوێری و ترسنۆکی، ئابووری و ڕەزیلی، وریایی و خۆپاراسـتن و گومـان خراپـی، دووربینی گومان، ئامۆژگاری و غەیبەت کردن ، دیاری و بەرتیل، وەسـەبرو ئـارام گرتن وە دلڕەقی، پیـاوەتی سەرشـۆڕی و زەلیلـی، دەروون پـاکی و هـەرزەکاری، و بێئاگـایی، بـڕواو دڵنیـایی و نـەفامی و سـاویلکەیی، هیـواو ئـاوات و ویـست و داخوازی، قسەکردن و باسکردن بە نیعمەتەکانی خواو شانازی پێکردنی، دڵخۆشـی و دەروون خۆشی ، دەروون ناسکی وە پەژارەیی و پەشـۆکاوی، تووڕەبـوون و ڕق و کینەو دڵپیسی، بەربەرەکانێ وە بەخیلی، خۆش ویـستنی فـەرمانڕەوایی و خـۆش

ویستنی پێش نوێژی و بانگەوازکردن بۆلای خوا، خۆشەویستی بۆ خوای گەورە خۆشەویستی لەگەڵ خوای گەورە، متمانە پێکردن وە لەتوانا دانەبوون، خۆ پاراستن دوودڵی و ڕاڕایی، و ئیلهامی فریشتە ئیلهامی شەیتان، و حەوسەڵەو پەلەنەکردن و دواخستن، ئابووری‌و کەمتەرخەمی، کۆشش کردن و ڕاڤەکردن و زیادە ڕۆیی، ئامۆژگاری و ڕاوێژ کردن و سەرزەنشت و سەرکۆنەکردن، دەستپێشخەری پەلە کرد ، دەستبەجێ دەست و بردکردن لەخەبەر پێدان لەکاتی پێویستی و سکالاکردندا.

شتێکی دیکە هەیە کەوا دیەن و وێنەکەی دەبێتە یەك، ئەمەش دابەشکراوە بۆ ستایش کراو و زەمکراو، وەك شادومانی و خەمباری، پەشیمانی وە تووڕەبوون، پەرۆشی و جوامێری و لەخۆبایی بوون و خۆپەسەندی چاوچنۆکی و تەماعکاری وە خۆجوانکردن و دان بەخۆداگرتن، ملکەچی و ڕێزگرتن وە نەگریس و حەسوودی، بەختیاری و خۆشگوزەرانی وە توانایی و لەدەست هاتن، دلگیربوون و ناخ هەلکێشان وە چلێسی و دەسەت نوقاندن، ناکۆکی و بەربەرەکانێ وە دەرخستنی نیعمەتەکان، هاوپەیمانی و کەساسی و نەداری، قسە نەکردن و بێدەنگی وە گوێ بەدونیا نەدان و خواپەرستی، تەقواو ترسان لە خوا، وە وازلێهێنان و دەست لێهەلگرتن، دوورە پەرێزی و گۆشەگیری وە سەربەرزی و داوێن پاکی، دەمارگیری و پەرۆشی و غەیبەت کردن وە لە حەدیسێکدا هاتووە: (( إن من الغيرة ما يحبها الله ومنها ما يكرهه ))، واتە: (( بێگومان لە ناو پەرۆشی و توونـدو تیژیدا هەیە خوا خۆشی ناوێت وە لەناویشدایە خوا ڕقی لێی نیە )).

ئەو پەرۆشەی کەوا خوای گەورە خۆشی دەوێت پەرۆشەکە لە گوماندایە وەئەوەی کەوا ڕقی لێیەتی پەرۆشیەکە لە گوماندا نیە: ((وإن من الخيلاء ما يحبه الله ومنها ما يكرهه فالتي يحب الخيلاء في الحرب ))[٣٢٦]، واتە: (( وە لەناو خۆپەسەندیدا تێیدایە خوا خۆشی دەوێت وە تێیدایە خوا ڕقی لێیەتی وە ئەوەی خۆ پەسەندی

---

(٣٢٦) مسند أحمد : ٥/٤٤٤ ، وە سنن أبي داود (٢٦٥٩).

خۆش دەوێت لەشەڕو جەنگدابێت) وە هەروەها لە لە سەحیحەکەدا هاتووە: ((لا حسد إلا في اثنتين: رجل اتاه الله مالاً وسلطة على هلكته في الحق، ورجلٌ أتاهُ الله الحكمة فهو يقضي بها ويعلمها))[٣٢٧]، واتە: (( حەسوودی و بەخیلی درووست نیە تەنها لە دووشت نەبێت، پیاوێك خوا ماڵ و سامانی داوەتێ وە دەسەڵاتی پێداوە لەسەر لەناوبردنی لەکاری هەقدا، وە پیاوێکیش خوای گەورە ژیری و دانایی داوەتێ جا ئەو زانستەی فێری خەڵکی دەکات))، وە لە سەحیحێکی دیکەدا هاتووە : (( إن الله رفيق يحب الرفق ، ويعطي على الرفق ما لايعطي على العنف))[٣٢٨]، واتە: (( خوای گەورە نەرم و نیان و میهرەبانە وە میهرەبانیشی خۆش دەوێت ، ئەوەی لەسەر میهرەبان و نەرم و نیانیدا دەبەخشێت لەسەر توندو تیژیدا نایبەخشێت ))، وە هەروەها دەفەرموێت: (( من أعطى حظه من الرفق فقد اعطي حظه من الخير ))[٣٢٩]، واتە: (( هەرکەسێك بەخت و چارەنووسی لە میهرەبانیدابێت ئەوا بەخت و چارەنووسیشی لە خێردا دەبێت)).

جا میهرەبانی و نەرم و نیانی شتێکە و کەمتەرخەمی و تەمەڵی شتێکی دیکەیە ، لەبەر ئەوەی تەمەڵی بار گرانیەکە بۆ بەرژەوەندیەکەی لەکاتی کردنیدا ، جا وازی لێدەهێنێت ، بەڵام نەرم و نیانی و میهرەبانی ڕووخۆش دەبێت لەکاتی ئەنجامدانی بە گوێرەی درێژەپێدانی کارەکە.

هەروەها نەوازشت و ڕووخۆشی سیفەتی پیاهەڵدان و مەدحکردنە و زمان لووسی و دوو ڕوویی سیفەتی زەم کردنە، جیاوازی نێوانیشیان: کەوا کەسی ڕوو خۆش و میهرەبان هەموو کات بەخشندەو دڵسۆزی دەگەیەنێت بەخاوەنەکەی تاوەکو هەق لێی دەردەچێت یاخود بەڕووی ناڕەواکەو دووڕووەکە دەدرێتەوە، کەسی زمان

(٣٢٧) مسلم : (٨١٦) .

(٣٢٨) سنن أبي داود (٤٨٠٧).

(٣٢٩) الترمذي (٢٠١٣) ، ومسند أحمد: ١٥٩/٦.

لووسیش خۆی لەپێش چاوی بەخشندە دەکات تاوەکو لەسەر نارەواکەی جێگیر دەبێت و بڕیاری لەسەر دەدرێت و لەسەر هەواو هەوەسی ئەودا بەجێ دەهێڵدرێت ، جا بەخشندەیی و میهرەبانی بۆ خاوەن ئیمانە، و زمان لووسی و دوو ڕوویش بۆ خاوەن دوو ڕووەکانە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ (النحل:٩٨)، واتە: (( ئینجا کاتێك قورئانت خوێندو دەورت کردەوە ئەوا پەنابگرەبە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو ))، وە دەفەرموێت: ﴿وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(الأعراف:٢٠٠)، واتە: (( ئەگەر وەسوەسەیەك لە لای شەیتانەوە بۆت پێشهات و ویستی لە خشتەت بەرێت و تووشی هەڵەت بکات جانەوا تۆ پەنابگرە بەخواو پشت بەو ببەستە چوونکە ئەو زاتە بیسەرو زانایە ))، وە دەفەرموێت: ﴿وَقُلْ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ۞وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾(المؤمنون:٩٧-٩٨)، واتە: (( بڵێ پەروەردگارا من پەنادەگرم بە تۆ لەهەموو خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەی شەیتانەکان ، پەنا دەگرم بە تۆ ئەی پەروەردگارم کە شەیتانەکان بەدەوەرمدا کۆببنەوەو سەرم لێ بشێوێنن))، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ۞مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ ۞ وَمِنْ شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۞ وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ۞وَمِنْ شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ﴾(الفلق:١-٥)، واتە: (( پەنادەگرم بەو پەروەردگارەی کە بەرە بەیان پێش دەهێنێت، لەشەڕو خراپەی هەرچی کە درووستی کردووە لە پەری و ئادەمیزادو مارو مێروو، لەشەڕو خراپەی شەو کاتێك کە دادێت و دونیا تاریك دەبێت وە دەبێت بە شەوەزەنگ، لەشەڕو خراپەی ئەو کەسانەی کەوا جادووکەرن پەت و دەزوو گرێ دەدەن و فووی پیادەکەن "کە بەفێڵ و جادوو نێوان خەڵکی تێك دەدەن ، لەشەڕو خراپەی حەسودو بەخیل کاتێك حەسوودی و بەخیلی دەبات))، جا ئەمە پەنا گرتنە لە شەڕی دەروون ، وە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ۞ مَلِكِ

النَّاسِ۞ إِلَهِ النَّاسِ۞ مِنْ شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ۞ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ۞ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴾(الناس:١-٦)، واته: (( بلّى پەنادەگرم بە پەروەردگاری خەڵكی ، بە پادشای خەڵكی، بە خوای خەڵكی ، لەشەڕو خراپەی ئەوەی كە وەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ دەخاتە دەخاتە دڵەوە كە (خەناسە)، بریتیە لەوەی كە وەسوەسە فڕێ دەداتە سینەو دڵی و دەروونی خەڵكیەوە ، لە پەری و خەڵكی ، لە جنۆكەو ئادەمیزاد(ئەوانەیان كە شەیتان سیفەتن))، وە ئەمەش پەناگرتنە لە هاوڕێ و خاوەنەكەی و خراپترین هاوڕێ و برادەر جا خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەرەكەی و شوێن كەوتووەكانی دەكات لە پەناگرتنە بە پەروەردگاریەتیەكەی بەتەواوی لەو دوو بوونەوەرە كارو كردەوە گەورانە لەشەڕو فەسادا ، دڵیش لە نێوان ئەو دوو دوژمنە كەوا هێشتاو بەردەوام لەدەرگای دەگات و تووشی دەبێت ، وە یەكەمین شت كەوا دەچێتە ناو دۆزەخ لە دەروونی فەرماندەر بە گوناهو تاوان لە هەواو هەوەسەوەیە و ئەویش شوێنی دەكەوێت لە خۆشەویستی و چلێسی و تەماعكاری و داواكردن و تووڕەبووندا وە شوێنی دەكەوێت لەكەسی خۆ بە زل زان و حەسوودی و بەخیلی و ستەمكردن و دەست بەسەراگرتن.



**( لەبارەی جیاوازی نێوان ملكەچی ئیمان و ملكەچی دووڕوویی )**

جیاوازی نێوان ملكەچی ئیمان و ملكەچی دوو ڕوویی و دوو زمانی كەوا ملكەچی ئیمان بری تیە لە ملكەچی دڵ بۆ خودا بە گەورەیی و شكۆمەندی و ڕێزو شكۆداری و شەرم و ئابڕوو، جا دڵەی دەشكێنێت بۆ خوا شكاندنێك پڕبێت لە تۆرس و شەرم و خۆشەویستی و حەیاو ئابڕوو بردن و شایەتی دان لەسەر

نیعمەتەکانی خوای گەورە، ئەو دڵە ملکەچ دەبێت و هیچ چارەش نی یە ، ئینجا ئەندامەکان شوێنی دەکەون، بەڵام ملکەچی دوو ڕوویی لەسەر ئەندامەکانی لەش دەبێتە دەستکارو پێسپاردن وە دڵیش ملکەچ نابێ .

هەندێك لە سەحابەکان دەڵێن: پەروەردگار پەنا دەگرم بە تۆ لە ملکەچی دوو ڕووەکان، پێیان ووت: ملکەچی دوو ڕووەکان چیە؟ ووتی: کەوا دەبینیت جەستە ملکەچە ، کەچی دڵەکەیان ملکەچ نیە.

جا کەسی ملکەچ بۆ خودا بەندەیەکە ئاگری هەواو هەوەسی کوژاندۆتەوە، دووکەڵەکەشی لە سینەدا جێگیر بووە، ئینجا سینگی والا دەبێت و نووری گەورەیی تێدا دەتریسکێتەو ئینجا هەواو ئارەزووەکانی دەروونی دەمرێت و بۆ ترس و ڕێزو شکۆداری کەوا حاشای لێکردووەو پێی تەنگەنەفەس بووە، ئەندامەکانی لەشیشی دادەمرکێتەوە، وە دڵیش ڕێزدار دەبێت، دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی و ئاسوودەیی دەبێت بۆ خواو، یادکردنەوەی بە دڵنیایەك کەوا لەلایەن خوای خۆیەوە لەسەریدا دابەزیووە، وە دەبێتە شوێنی خۆحەشاردان بۆی، شاردنەوەی دڵنیایی، لەبەر ئەوەی شاردنەوە لە زەویدا دڵنیا نابێت چوونکە ئاو تێیدا کۆدەبێتەوە جا هەروەها دڵی شاردراوەش ملکەچ و دڵنیایە وەك پارچە دڵنیاییەکە لە زەویدا کەوا ئاوا پێیدا دەڕوات لێی سەقامگیر دەبێت، نیشانەکانیشی کەوا لە نێوان ڕەحمەت و بەزەیی خواکەی بەڕێز و شکۆداری بۆ ئەو وە بە زەلیلی و ملکەچی و تێکشکاندنی فیزو لووت بەرزی لە نێوان ڕەحمەتی خوا سوژدە دەبات و سەری خۆی بەرز ناکاتەوە وەکو دەیگاتێ، بەڵام دڵی خۆ بەزل زان و گەورە بە گەورەیی و فیز لێدانی خۆی دەلەرێتەوەو پێی زیاد دەکات ، جا ئەمە وەك پارچە گردێك وایە لە زەویدا ئاوی تێدا جێگیر نابێت، ئا ئەوەیە ملکەچی ئیمان.

بەڵام سەرشۆڕی و ملکەچی دوو ڕوو بریتی یە لـە حاڵـەتێك لـەبارەی ڕواڵـەتی جێنـشینكردنی ئەندامـەكان بەدەسـت كـردو زمـان لووسـی و مامـە حەمـەیی، دەروونیشی لە ناوەوەدا گەنجێكی ناسكە خاوەنی هەواو هەوەش و ویست و ئیرادەیە ، جا ئەوە لە دەرەوەیـەدا دەكـات ، مـاری چـەم و زۆنگاوەكـان و شـێر دارسـتانە هەڵنیشتووە ، لەنێوان لایەكانی چاوەڕێی نێچیرێك دەكات.



## ( لەبارەی پاراستن و چاككردنی دەروون لە پیسی و ڕیسواییەكان )

بەڵام شەرەف و پایەبەرزی دەروون ، بریتی یە لە چاككردن و پاراستنی لە پیسی و ڕەزیلی و تەماعكاری كەوا گەردنی پیاوان دەبڕێت، لەبەر ئـەوەی درووسـت بـووەو پێك هاتووە لەنێوان دوو كارو فەرماندا ، خۆ بەدڵ بوون وە گاڵتە كردن بەكەسـانی دیكە ، جا لەدایك دەبێت و گەشە دەكات لە نێوان ئەو دوو لووت بەرزی و خۆ بـە زلزانینە ، وە یەكەمیان لەدایك دەبێت و گەشە دەكـات لـە نێـوان دوو بوونـەوەری بەخشندەو میهرەبان ، پایە بەرزكردنی دەروون و ڕێزلێنان و گـەورەكردنی خـاوەن و سەرپەرشتیارەكەی كەوا دەبێتـە بەندەیـەكی سـووك و خـراپ وە بەهـەدەر چـووی ڕیسواو بێ بایەخ ، لەدایك دەبێت و گەشە دەكات لـەنێوان ئـەو دوو بوونـەوەرەدا شـكۆمەندی دەروون و چـاككردن و پاراسـتنی، بنـچینەی ئـەوە هـەمووی ئامادەكردنی دەروونە وە ڕەخساندنیەتی وە پـشتگیری كردنـی بـۆی ، جـا ئەگـەر ئامادەیی و پشتگیری كردنەكەی وون كرد ئەوا هەموو سودو خێرەكەی وونكردووە.



**( لە بارەی جیاوازی نێوان لووت بەرزی وە ڕەقە بەرایەتی )**

ئەمەش جیاوازی نێوان لووت بەرزی و دەمارگیری وە ناکۆکی و ڕەقەبەرایەتیە، جا لووت بەرزی لە شیربڕینەوەی دەروونە بۆ شیر خواردنی لۆمــەو سەرزەنــشتکردن لــە مەمکێك کە خۆراوگەی پیسیەکان و ڕەزیل و چاوچنۆکەکان و ڕیــسواکانە، ئەگــەر شێوەکەی بە لێشاوو زۆر بێت و خەڵکیش بە پەرۆشەوە هەڵپــەی بــۆ دەکــات، جــا بەڕاستی بۆ ئەوان لە شیر بڕینەوەیەکە لەگەڵیدا جگەرەکانیان پارچە پارچــە دەبێــت خەم و خەفەت و ئاخ هەڵکێشانە ئەو لەشــیر بڕینەوەیــە هــەر دەبێــت، جــا ئەگــەر ویستت پەلە بکەو تۆش ستایش کراوو شایانی سوپاسکردنی، ئەگەر ویستت دوای بخە وە تۆش بەکرێگیراو نیت، بە پێچەوانەی ڕقەبەرایەتی و بێ کــەڵکی کــەوا ئــەو تووندو تیژو زبرە لەناو دەرووندا، وە دڵ ڕەقیشە لەناو دڵدا، وتووندو ووشکیشە لــە ڕەفتاردا ، بوونەوەرێکی لێ پەیدا دەبێت پێی دەوترێت : ڕق بەرو ناکۆك و دڵڕەق.



**( لە بارەی جیاوازی نێوان بێئابڕوویی و ڕۆح سووکی )**

جیاوازی لەنێوان ڕۆح سووکیو بێفیــزیو ریــسوایی بێئــابرووی کــەوا ڕۆح ســووکی لەدایك دەبێت وگەشەدەکان.لەنێوان زانینی دەربارەی خوای پاكو بێگەردو ناســینی نــاوە جوانــەکانی و ســیفەتەکانی باســکردنو پیاهەڵــدانی شــکۆمەندیو مــەزنیو خۆشەویستی بەرزیو شکۆداری، لەبارەی ناسینی دەروونی خۆیو عەیبو شووردەیی کردارەکانیو کارەساتەکانی، لەنێوان هەموونەوانە بوونەوەرێکە کــەوا ڕۆح ســووك بێ فیزە، ئەمەش بەتێك شکاندنی ئارەزووەکانی دڵی بۆ خوای گــەورە، دابەزانــدنی باڵی زەلیلیو ملکەچیو ڕەحمەتو بەزەیی بۆ پەرستنی ئەوە ئــەو نابینێــت کــەوا لەکەس باشتربێتو لەکەســیش هــەقتربێت بــەڵکو وادەبینێــت کەچــاکەی خــەڵکی

لەسەریەتی، مافەکانی ئەوان پێش خۆی، ئەمەش بوونەوەرو دروستکراوێکە لەراستیدا خوای گەورە لەو کەسانەی دادەنێت کەوا خۆشی دەوێتو ڕێزی لێ دەنێتو لەخۆی نزیك دەخاتەوە.

بەڵام بێ ئابرویی و ڕیسوایی ، بریتییە لە پیسی و سووکی و نامەردی وە دەروونی خۆی بەخت دەکات وە سووك و ڕیسوای دەکات بۆ مەبەست و مەرامی دەستکەوتنی حەزو هەواو هەوەس و ئارەزووەکانی وەك خۆ بەهیچ دانەنان و خۆ نزم کردنەوە بۆ دەست کەوتنی بەخت و هەواو هەوەسەکانی ، جا ئەمە هەمووی نزمی و کەساسی و سووکیە نەك بێفیزی و ڕۆح سووکی، خوای میهرەبانیش مرۆڤی ڕۆح سووك و بێفیزی خۆش دەوێت ، وە ڕقیشی دەبێتەوە لە خۆسووککردن و شەرمەزاری وە لە سەحیحێکدا هاتووە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (( وأوحى أليَ أن تواضعوا حتى لا يفخر أحد على احد ولا يبغي أحد على أحد))[330] ، واتە: ((سرووش و نیگام بۆ هاتووە کەوا بێ فیزو بێ دەعیە بن لەناو یەکتردا تاوەکو کەس شانازی لەسەر کەس نەکات وە کەسیش ستەم لەسەر کەس نەکات)).

ڕۆح سووکی و بێ فیزی ستایش کراویش لەسەر دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: بێفیزی بەندە لە کاتی بەجێگەیاندنی فەرمانی خوا بە نموونە، لەکاتی دوور خستنەوە لە تاوان و نەکردنی، لەبەر ئەوەی دەروون بۆ داخوازی و داواکاری پێشوو سستی و خاوە خاوە دەکات لە بەجێگەیاندنی فەرمانەکانیدا جا لێرەدا جۆرێك لە نەویستن و نەفس بەرزی و بەلەسەبوون دەست پێدەکات و ڕادەکات لە بەندایەتی کردن، لەکاتی نەکردن و دوورخستنەوەی دەیسەلمێنێت بۆ داواکردنی بەسەردا زاڵ بوون بەوەی لێی قەدەغەکراوە.

جۆری دووەم: بێفیزی و خۆ بە بچووك دانانی بۆ مەزنی خوای گەورەو شکۆدارو ملکەچی کردن بۆ شکۆمەندی و گەورەیی و بەزل زانینی، جا هەرکاتێك دەروونی

---

(٣٣٠) مسلم : (٢٨٦٥) ، وە سنن أبي داود(٤٨٩٥).

بەرز بووەوە بۆ یادی خوای گەورە وە تاك و تەنهای بکات بۆ ئەمە وە زۆر تووڕەو توند بێت لەسەر ئەوەی ململانێ بکات، جا دەروونی بۆ ئەو تەوازوع و بێ فیزی و بێ دەعیەیە دەبێت، وە دڵی تێك دەشكێت بۆ مەزنی و گەورەیی خوای میهرەبان ، دەروونی ئارام بێت بۆ شان و شەوكەتی، وە دڵی دابمرکێتەوە بۆ دەسەڵات و فەرمانڕەوایی خوای گەورە، جا ئەمەیە مەبەستی ڕۆح سووكی و بێفیزی .

***

## ( لەبارەی تواناو هێز لەکارو فەرمانی خوا )

هەروەها هێزو توانین لە کارو فەرمانی خوا بریتییە لە ڕێزو گەورەیی بۆ ئەو، گەورەو بەرز ڕاگرتنی فەرمانەکانی و مافەکانی تاوەکو خوای گەورە دایدەمەزرێنێت، وە بەرزی و گەورەییش لە زەویدا بریتی یە لە گەورەو بەرزکردنی دەروونی خۆی، داخوازی تاك و تەنهایی خۆی بۆ دەسەڵاتداری، تێپەڕ کردنی ووشەکان ، ئەگەر ڕێزگرتن بێت لە فەرمانی خوا یاخود ئیهانە کردن بێت، بەڵکو لەگەڵ بەرهەڵستی کردن لە فەرمانی خواو مافەکانی و ڕەزابوونی لە داواوکردن و داخوازییەکی لەخۆیایی بوونەوە ئەوا ئاگاداری ئەمە نەبووە ، بەهەدەری دەبات و لەسەر دەسکەوتە گەروەییەکەی دەیمرێنێت.

هەروەها پەرۆشی بۆ خوداو پەرۆشی بۆ دەروون، جا یەکەمیان کاریگەری دەبێت لەبەرز ڕاگرتنی فەرمان و فەرمانڕەوایەکە، دووەمیشیان کاریگەری دەبێت لەسەر گەورەکردنی دەروون و تووڕە بوون لەو شانسەی لەدەستی چووە ، جا پەرۆشی بۆ خوا کەوا دڵەکەی دەپارێزێت لە گەورەکردنی مافەکانی، ئەگەر تووڕەبوو لە ڕاەستیدا لە پێناوی نوورێك تووڕە دەبێت ئەو سوڵتان و دەسەڵاتەش کەوا خستویەتیە دڵیەوە ، پێغەمبەرﷺ ئەگەر تووڕە ببوایە کولمەکانی سوور

هەڵدەگەڕا، وە لەنێو چەوانیدا ئارەقە دەهاتە خوارەوە تووڕەبوونی پێوەدیار بـوو وە لە تووڕەبونەکەی هیچی نەدەکرد تاوەکو تۆڵەی بـۆ خـوا دەکـردەوە زەیـدی کـوڕی ئەسلەم ڕوایەتی کردووە لە باوکیەوە: کەوا موسـای کـوڕی عمـران ئەگـەر تـووڕە ببوایە ئاگری لە کڵاوەکەی سەری بەردەدا، ئەمەش پێچەوانەی پەرۆشیە بۆ دەروون چوونکە ئەوە گەرمیەکە لە دەروونیدا دەیوروژێنێـت بـۆ. لەدەسـت چـوونی هـەواو هەوەسەکەی یاخود داواکاریەکەی ، لەبەر ئـەوەی فیتنـەو ئـاژاوە لـە دەروونداپـە، فیتنەش ئاگرو بڵێسەکەیە و دەروونیش تێوە دەگڵێت بە ئاگری شەهوەت و ئـارەزوو و تووڕەیی، لە ڕاستیدا هـەردووکیان دوو گـەرمین دەردەچـن لەسـەر بەشـەکاندا : گەرمیەك لەلایەن دەروونی پڕ لە ئارامی نیشانەکەشی بەرز ڕاگرتنی مافی خوایە ، وە گەرمیەکیش لەلایەن دەروونی فەرماندەر بە گوناهو تاوان نیـشانەکەش هەسـت کردنە بە هەدەر چوونی هەواو نەفس و ئارەزوو .

***

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان بەخشندەیی و بەفیڕۆدان )

جیاوازی نێوان بەخشندەیی و دەست بـڵاوی کـەوا. مرۆڤـی بەخـشندەی دانایـە بـە بەخشینەکەی لەشوێنی خۆی دادەنێت؛ کەسی دەست بڵاویش بـە فـیڕۆدەرو دەسـت بایە ، هەندێ جار بە ڕێکەوت بەخشینەکەی لە شـوێنی خـۆی دادەنێـت، زۆربـەی جارانیش ڕێکەوت نابێت ، لێکدانەوەی ئەمەش کەوا خوای گەورە بە دانایی خـۆی لە ماڵ و ساماندا حەقی دەداتـێ، ئەمـەش دوو جـۆرە: مافـەکانی بەجێهێنـەری ئەرك و مافەکانی دووەم.

مافەکانی بەجێهێنەری ئەرك : وەك زەکات و خەرجیـەکانی پێویـست لەسـەر ئـەو کەسەی خەرجیەکەی بۆ پێویست دەبێت.

مافەکانی دووەم: وەك مافی میوان وە پاداشت کردنی کەسی ڕێی ڕاستی گرتـووەو ئەوەی ئابڕووی خۆی پێ پاراستووە، وە نموونەی ئەمانە:

ئینسانی بەخشندە مەبەستی وایە بە ماڵ و سامانی خۆی ئەو مافانە جێ بە جـێ بکات لەسەر شێوەیەکی تەواوو چاك خۆی پێی باش بێت، ڕەزامەندن و ئاواتە خواز بێت لە دونیـاو دوارِۆژدا خێـرو پاداشـت و چـاکەی دەسـت کـەوێت، ئەمـەش بـە لێبـوردەیی دڵ دەردەچـێت، سـەخاوەتی دەروون، فراوانـی سـینە، بەپێـچەوانەی ئینسانی دەستبلاّو ، لەبەر ئەوەی دەستی والاّ کردووە بـە مـاڵ و سـامانەکەی بـۆ هەواو هەوەس و ئارەزووەکانی کوێرانەو بەبێ حیساب نە لەسەر گرنگی پێدان و نـە چاودێری کردنی بەرژەوەندیەکەی .

یەکەمیان وەك ئەوە وایە بە تۆو کردنی لە زەویدا وەمەبەستی زیاتر سـەوز بێـت و پێبگات جا ئەمە دانانرێت بە دەستبلاّوبە فیڕۆدەر.

دووەمیشیان وەك ئەوە وایـە تـۆو بکـات لـە زەویـەکی سـوێرو زەویـەکی ڕەق ، و لەکاتی تۆو کردن و چاندنیدا زۆر تۆوی بکات و دەنکەکان لەسەر یەك بکەون، ئەو شوێنەی تۆوەکەی کردووە بەهەدەرو بەفیڕۆ چووە، ئەو شوێنەش دەنکەکان لەسـەر یەك کەوتوون پێویستە بکێڵدرێت بۆ ئەوەی ئەوەی ماوەتەوە سوودی لێوەربگرێـت، خوای گەورەو میهرەبانیش زۆر بەخشندەو میهرەبانە.

***

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان ترسان لەخواو خۆ بە گەورە زانین )

جیاوازی نێوان لە خوا ترسان و خۆ بەگەورە زانین: کەوا ترسان لەخوا نیشانەیەکە لە نیشانەکانی پڕ بوونی دڵ لە گەورەیی و شکۆمەندی خوای گـەورەو خۆشەویـستی و شکۆداری، جا ئەگەر دڵ بەو شتە پڕ بێت ئەوا نووری تێدا دەردەکەوێت، ئـارامی و

بەختەوەری تێدا دادەبەزێت، وە بەرگی هەیبەت و شکۆیی لەبەر دەکات، جار رووخساری شیرنینی و شکۆمەندی دەپۆشێت، ئینجا دڵەکان خۆشەویستی و رێزگرتنی تیا کۆدەبێتەوە، جا سۆزو بەزەیی روودەکاتە دڵ و جگەرەکان، وە چاوەکانی پێ رۆشن دەبێتەوە، دڵەکانی پێ هۆگر دەبێت، جا ووتارەکەی نوورە وە چوونەناودوەی نوورە و دەرچوونی نوورە کارو کردەوەی نوورە.

بەڵام گەورەیی و خۆبەزل زانین نیشانەیەکە لە نیشانەکانی لەخۆبایی بوون و لووت بەرزی لە دڵێکدا کە پڕاوپڕە لە نەزانین و ستەمکاری، بەندایەتی لێی کۆچی کردووە، بێزارن و رق و قینی لێ دابەزیوە، جا بەتیلەی چاو سەیری خەڵکی دەکات، وە لەناویاندا بە کەش و فش خۆی بادەدات، مامەڵەکردنی لەگەڵیاندا مامەڵەکردنێکی خۆپەسەندی و تەن پەروەری یە نەك خۆنەویستی و کەسان ویستی وە نە بە ویژدان و دادپەروەری، کە دێت و دەچێت بەخۆی دەنازێت، کە دەگات بەخەڵکی بەسەلام کردن دەست پێ ناکات، کە وەڵامی خەڵکیش دەداتەوە وا دەزانێت چاکە لەگەڵیاندا دەکات، وە ماف بۆ هیچ کەسێك نابینێت، وە تەماشا دەکات حەقی بەسەر خەڵکەوەیە، وا سەیر ناکات خەڵکیش چاکەیان بەسەر یەوە هەیە ، وە لەلایەن خوای گەورەوە هیچ بی زیاد ناکرێت تەنها دوور کەوتنەوە نەبێت، وە لەلایەن خەڵکیشەوە تەنها بە بچووك دانان و رق و کینەوە سەیر دەکرێت.



## ( لەبارەی جیاوازی نێوان پاراستن و چاککردنەوە وە خۆ بەزلزانین و لووت بەرزی )

جیاوازی نێوان چاککردن و خۆپاراستن وە خۆبەزلزانین و لووت بەرزی: کەوا خۆپارێزەر بۆ دەروونی خۆی وە ئەوە وایە پیاوێك جل و بەرگێکی نوێی لەبەر کردبێت پاك و سپی و خاوەنی نرخ و بەها بێت، پێی دەچێتە ناو پیاوی دەسەڵاتدارو ئەوانەی لەخوار ئەوانیش دان، جا ئەو لە پیسی و تەپ و تۆزو رەفتاری ناشرین و جۆرەها نیشانەکان دەپارێزێت جا هەر لەسەر سپێتی و پاکیەکەی دەمینێتەوە، وە نایەڵێت چڵك و پیسی بەر جل و بەرگەکەی بکەوێت، وە ئەگەر شتێك لەوانە تووشی هات بە زووترین کات هەڵیدەکەنێت و لای دەبات و شوێنەوارەکەشی دەسڕێتەوە، وە ئەمەش خۆ پارێزەر بۆ دڵەکەی و دینەکەی دەبینێت دوور دەکەوێتەوە لە هەر گوناهو تاوانێك ، جا ئەگەر لە دڵیدا رەفتارێکی ناشرین هەبێت ئەوا گەورەترە لەوەی لەکەیەکی پیس لە جل و بەرگە سپیە خاوێنەکەی داهەبێت، بەڵام لەسەر چاوەکاندا تارماییەك هەیە هەست بەو رەفتارانە ناکات ، جا سەیر دەکەیت کەوا لەو شوێنانەی گومانی پیس بوونی لێ دەکرێت رادەکات وە خۆی دەپارێزێت لە بوونەوەر، لە تێکەڵ بوونیان لەگەڵیاندا دوور دەکەوێتەوە لەترسی ئەوەی تووشی دڵ دەبێت تووشی جل و بەرگەکەشی دەبێت لەو کاتەی ئەوەی تێکەڵی پێستە خۆشکەران و قەسابەکان و چێشتلێنەرەکان دەبێت.

❊❊❊

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان ئازایەتی و جوامێری وە جوورئەت و نەترسان )

جیاوازی لە نێوان ئازایەتی و نەترسان: ئازایەتی و جوامێری لە دڵەوەیە، ئەمەش جێگیروونی وە سەقامگیری لەکاتی مەترسیەو بوونەوەرێکە لەدایك بووە لە سەبرو ئارامی و گومان باشی، لەبەر ئەوەی لەکاتێکا گومانی سەرکەوتن دێتەدی و

یارمەتی سەبرگرتنیش دەدات، هەروەك كەوا ترسنۆكیش لەدایك دەبێت لەگومان خراپی و سەبر نەگرتن، جا گومانی سەركەوتن ناكات، وە یارمەتی سەبرگرتنیش نادات، بنچینەی ترسنۆكی لەبەد گومانی و وەسوەسەی دەروون بە خراپی یە، ئەویش لە سیەكانەوە دادەمەزرێت، جا ئەگەر گومانەكە خراپ بووبێت و دەروونیش بە خراپە وەسوەسەی كرد ئەو كاتەسیەكان فووی پیادەكرێت و پڕ دەبێت ئینجا لە جێگای خۆی دڵتەنگ دەبێت، جا تووشی زەلزەلەو شپرزەیی دەبێت و بۆ بێزار كردنی سیەكەو لەسەریدا تەنگ دەبێت، بۆ ئەمەش لە حەدیسێكدا هاتووە ، كەوا عەمرو كوڕی عاص گێڕایتیەوە ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە پێغەمبەرﷺ كەوا دەفەرموێت: (( شر ما في المرء جبن خالع وشح هالع))[٣٣١]، واتە: (( شەڕێك كەوا تووشی مرۆڤ دەبێت ترسنۆكێكی دەركراو وە ڕەزیلێكی شڵە ژاوو تۆقیوە))، ترسنۆكی بە دەركراو ناوی لێنراوە، لەبەر ئەوەی دڵ لە شوێنی خۆی لادەبات بۆ هەڵاوسانی سیەكان.

بەڵام جورئەت و نەترسان بریتی یە لەجەربەزەی هۆكارە كەشی كەمی گوێپێدان و گرنگیدان وە سەیرنەكردن لەئاكامەكەی، بەڵكو دەروون پێشدەكەوێت بەبێ بایەخدان بە بابەتی جەربەزەییەكە.

***

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان بڕیاردان وە ترسنۆكی )

بەڵام جیاوازی نێوان ورەو بڕیاردان و ترسنۆكی ، جا كەسی بڕیاردەر هیمەت و ئیرادەو عەقڵی تێدا كۆدەبێتەوە ، پێوەری كاروبارەكانیشی هەندێك بۆ هەندێكی ، وە بۆهەریەك لەمانە گۆشەیەكی ئامادەكردووە، وتەو دەربڕینی بڕیاردانیش بەڵگە

---
(٣٣١) سند أحمد : ١/٣٢٠ ، سنن أبي داود(٢٥١١).

نییە لەسەر هێزو تواناو یەکدەنگی، لەوانە بڕیاردانی ڕای خۆت کەوا کاروباری ڕای ئەوی تیا کۆدەبێتەوە، وە خێری چاکەکاران و شەڕی بەدکارانی تێدا دەزانێت، لەشوێنی کشانەوەو نەکردنی کارەکە دەکشێتەوەو ڕاو عەقڵی خۆی بەکاردێنێت نەك ترسنۆکی و نە لاوازیش:

العاجز الرأي مضياع لفرصته ❊ حتى إذا فات أمر عاتَب القَدَراً

❊❊❊

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان پاشکەوت و ڕەزیلی )

بەڵام جیاوازی نێوان ماڵداری و پاشەکەوت وە ڕەزیلی: پاشەکەوت کردن بوونەوەرێکی ستایشکراوو سوپاسکراوە لەنێ‌ان دوو بوونەوەر لەدایك دەبێت ، دادو دانایی و ژیری ، جا لەدادپەوەریدا یەکسانی دەکات لەبارەی نەکردن و تێکۆشاندا ، لەداناییشدا هەریەکەو لە شوێنی خۆی دادەنیشێت بە گوێرەی ئەوەی بۆی دەگونجێت ، ئینجا لەنێوان هەردووکیاندا ماڵداری و پاشەکەوت و ئابووری لەدایك دەبێت و گەشەدەکات ، وەئەمەش ناوەڕاستێکە لەنێوان هەردووبەشی زەمکراوەکە ، هەوەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَحْسُوراً﴾(الإسراء:٢٩)، واتە: (( نەکەیت ئەوەندە دەست نوقاو بیت وەك ئەوەی دەستی بەکۆت و زنجیر بە گەردنیدا هەڵواسرابێت، هەروەها ئەوەندەش دەست بڵاو مەبە "هیچت بەدەستەوە نەمێنێت" بەهەناسە ساردی و نائومێدی بۆی دانیشیت ))، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنْفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَاماً﴾(الفرقان:٦٧)، واتە: (( وە ئەوانەی ماڵ و سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەکەن، نەزیادە ڕۆیی تێدا دەکەن وبەزایەی دەدەن، نە دەست نوقاوو ڕەزیلیشن، بەڵکو لەنێواندان "مام

ناوەندین و لەشتی بەسوودا بەکاری دەهێنن"))، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا ﴾(الأعراف:٣١)، واتە: (( بخۆن وبخۆنەوە "لەنازو نیعمەتەکان"بەڵام زیادەڕۆیی مەکەن)).

بەڵام ڕەزیلی بوونەوەرێکی زەمکراوە لەبەد گومانی و دەروون لاوازی لەدایك دەبێت و پەیدا دەبێت، درێژی دەکاتەوە شەیتانیش بەڵێنی پێداوە کە تاوەکو دەبێتە کەسێکی ڕاهاتوو لەسەر شێواوی و شپرزەیی، کەسی شپرزەو ئارام لە بەربراویش زۆر پێداگیرە لەسەر شت و لەسەر کاری نالەبار، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْإِنْسَانَ خُلِقَ هَلُوعاً۝ إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعاً ۝ وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعاً﴾(المعارج٢١:٢٠)، واتە: (( بەڕاستی ئینسان بە شپرزەیی و تەنگەتاوی دروستکراون ، کاتێك ناخۆشی تووش دەبێت بێزارو دەم بەهاوارە، کاتێك خێرو بەرەکەتی تووش بوو دەستی دەنوقێنێت و قەدەغەی دەکات)).

***

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان پاراستن و ئاگادارکردنەوە وە بەد گومانی )

جیاوازی نێوان خۆپاراستن و ئاگاداربوون وە بەدگومانی: کەسی خۆپارێز وەك ئەو پیاوە وایە بە ماڵ و سامان و سواریەکەی بەسەفەر دەردەچێت، جا ئەویش بەهەموو هێزو توانایەوە خۆی دەپارێزێت لەهەر ڕێگریەك، وە لەهەر شوێنێك کە بزانێت شەڕو خراپەی تێدایە، هەروەها ئەمەش دەبێتە ئاگاداربوونەوەو خۆ ئامادەکردن، بردنی هەموو هۆکارێك کەوا لە بەدکاران خۆی ڕزگار بکات، جا کەسی خۆپارێز وەك چەکدارێکی زرێپۆش وایە کەوا خۆی ئامادەو تەیار دەکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دووژمنەکەی، وە هەموو ئامادەکاریەکانی ئامادەکردووە،

ئەمەش بۆ ڕێخۆشکردنێکە بۆ دەربازبوون و شەڕ کردنی دووژمنەکەی کەوا گومانی خراپی لێی هەیە.

بەڵام بەد گوومانی بریتیە لە پڕ بوونی دڵی بە گومانی بەدو پیس بەرمبەر خەڵکی هەتاکو لەسەر زمان و ئەندامەکانی لەشیشی پڕاو پڕدەبێت لەبەد گومانی ، تێگەیشتن لەگەڵیدا مەحاڵە تەنها بەدوای کەم و کوڕی و عەیب و عارو تانە لێدان و ڕق و کینەدەگەڕێت، ڕقی لە خەڵکیەو خەڵکیش ڕقی لێیانە، نەفرەت لە خەڵکی دەکات و خەڵکیش نەفرەتی لێدەکەن ، خۆ لەخەڵاکی دەپارێزێت و خەڵکیش خۆی لێ دەپارێزن ، جا یەکەمیان : لەگەڵیاندا تێکەڵ دەبێت و خۆشیان لێ دەپارێزێت، دووەمیشیان ، خۆیان لێ بەدوور دەگرێت و ئەزیەت و ئازاریان پێ دەگەیەنێت، یەکەمیان: دەچێتە ناویان بە ئامۆژگاری و چاکەکردن لەگەڵ ئەوەش خۆی دەپارێزێت ، و دووەمیان بە غەش و فرۆفێڵ و ڕق و کینە لە دەرەوەیاندایە.



**( لەبارەی جیاوازی نێوان سوارچاکی و دووربینی وە بۆچوون و گوماندا )**

جیاوازی لەنێوان دووربینی و گوماندا: کەسی گومانی هەڵە دەکات و ئامانجەکەش دەپێکێت ، ئەمەش لەگەڵ تاریکایی و ڕووناکی و پاکی و خاوێنی و پیسی دڵدا دەبێت، بۆ ئەمەش خوای گەورە فەرمانی داوە دوورکەوتنەوەیەکی زۆر لەو کارە ناڕەوایە وە هەواڵی داوە کەوا هەندێك گومان تاوان و گوناهە .

بەڵام جوامێری وووردبینی هەموو سەناو سوپاس و مەدح کردنە بۆ خاوەنەکەی لەبارەی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾(الحِجْر:٧٥)، واتە: (( بێگومان ئا لەو بەسەرهاتە دا بەڵگەو نیشانەی زۆرهەیە بۆ کەسانێك کە پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن ))، ئیبن و عەباس و ئەوانی دیکە دەڵێن: واتە: بۆ

کەسانێ تێـڕوانین و سوارچـاك و دووربـین ، هـەروەها خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُمْ بِسِيمَاهُمْ ﴾(البقـرة:٢٧٣)، واتـە: ((ئەوانەی نایانناسێت، ئەو هەژارانە ئەوەندە کەسایەتی خۆیـان ڕادەگـرن و نـەفس بەرزن ، وا دەزانن دەوڵەمەندن تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ (یا ئەی ئیماندار) بـەدەنگ و ڕوخسارو سیمایاندا دەیانناسیت )) ، هەروەها خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلَـوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُمْ بِسِيمَاهُمْ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَـوْلِ ﴾(محمـد:٣٠)، واتـە: (( خۆ ئەگـەر بمانویـستایە ئەوانـەمان پێـشان دەدایـت ، ئـەو کاتـە بـە ڕواڵـەت دەتناسـینەوە ، سـوێند بـەخوا لـە شـێوازو نـاوەڕۆکی قـسەو گوفتاریانـدا دەییانناسینەوە)).

جا نەفس بەرزی و سوارچاکی دڵسۆز بۆ دڵێکە پاك و خاوێن و پوخت بکرێتەوە لـە پیسیەکان وە نزیك بێتەوە لە خوای گەورە، ئەو بە نووری خوا سەیر دەکات کەوا لە دڵیدا داینەوە وە لـە ترمزیـەوە کـە لـە ئـەبی سـعید دەگێڕێتـەوە دەڵێـت: کـەوا پێغەمبەرﷺ فەرموویە: (( أتقوا فراسة المؤمن فإنه ينظـر بنـورالله))[٣٣٢]، واتـە: (( لە نەفس بەرزو سوارچاکێکی ئیماندار بترسن کەوا ئـەو بـە نـووری خـوا سـەیر دەکات))، بێگومان پێغەمبەرﷺ لە نوێژدا سەحابەکانی لەدواوەی خۆی دەبینی هەروەك لە پێشەوە دەیانبینی، بە ئاشکرا بەیت المقدسی دەبینی لەکاتێکا ئەو لـە مەککە بوو[٣٣٣]، وە کۆشکەکانی شام و دەرگاکان و دەروازەکـانی سـەنعاو هێـزو توانـاو گۆڕەپانـەکانی کیـسرای دەبینـی لەکاتێکـدا ئـەو لـە مەدینـە خەنـدەقی لێدەدا[٣٣٤] ، نەجاشی لە حەبەشە بینی کاتێك مرد ئەولە مەدینە بوو ، جا چـووە مزگەوت و نوێژی لەسەر کرد[٣٣٥].

---

(٣٣٢) الترمذي : (٣١٢٧).

(٣٣٣) سەیری مسلم: (١٧٠ بكه.

(٣٣٤) مسند أحمد : ٣٠٤/٤.

(٣٣٥) مسلم: (٩٥١).

ئیمامی عومەریش ساریەی لە نەهاوەندی خاکی فارس بینی خۆی و سەربازەکانی موسڵمانان کەوانەوان شەڕیان لەگەڵ دوژمنەکانیان دەکرد ، جا بانگی کرد(یا سارية الجبل)،واتە: (ئەی ساریە بڕۆ سەر چیاکە).

خوای گەورە هەواڵی داوە کەوا بەندەکەی لێی نزیك بێتەوە ئەوا خۆشەویستی بۆی زیاد دەکات جا ئەگەر خۆشەویست لە نزیك بیستنی و بینینی وە دەستەکانی وە پێیەکانی ، جا بە نوورو خۆشەویستی خوا دەبیستێت و دەبینێت و دێت و دەچێت، دڵی وەك ئاوێنەی ڕوونی لێ دێت وێنە ڕاستیەکانی لەسەر دەردەکەوێت، ئەگەر بەندەیەك بە نوورو خۆشەویستی خوا سەیری کردئەوا ئەو کارو فەرمانە دەبینێت کەزاتی پەروەردگاری ئەو لەسەریەتی ، ئەگەر بە نوورو خۆشەویستی خوا گوێبیست بوو ئەوا گوێی بیست ئەو دەبێت کەوا زاتی ئەو لەسەریەتی، ئەمەش لە زانینی شتە غەیب و پەنهانەکان نیە، بەڵکو غەیب و شتی شاراوەو پەنهان زان ئەوکەسەیە کەوا هەقی پەڕاندۆتە ناو دڵێکی نزیك و موژدە پێدراو بە نووری خۆی خەریك نەکراوە بە داتاشینی شتە پڕوپووچ و نا ڕەواو خەیاڵاوی و وەسوەسەکان کەوا قەدەغەی دەکات، لە دەستکەوتنی وێنە ڕاستەقینەکان بەچاوی بینینی بە گوێرەی ئەو نوورە.

دەڵێت: شافعی و محمد کوڕی حەسەن لە مزگەوتی کەعبەی پیرۆز دانیشتبوون پیاوێك هاتە ژوورەوە جا محمد ووتی: وا تێدەگەم کە ئەو دارتاش بێت: جا شافعی ووتی: من واتێدەگەم ئەو ئاسنگەر بێت، جا پرسیاریان لە پیاوەکە کرد ووتی : من پێشتر ئاسنگەر بووم وە من ئەمڕۆ دارتاشی دەکەم.

ئەبو حەسەنی بۆشنچی و حەسەن حەداد چوونە لای قاسم مناوی گەڕاندیانەوە، جا لە ڕێگایاندا سێوێکیان کڕی بۆ هەریەك لەوان بە نیو درهەم لەکاتێکدا پارەکەیان نەدا لەبیر خۆیان بردەوە، کاتێك چوونەوە لای ئەبی قاسم ووتی: ئەوستەمەچی یە؟ ئینجا هەردووکیان چوونە دەرەوە، ووتیان: نەمانزانی! لەوانەیە ئەوە لەبەر نرخی

سێوەکە بێت جا پارە سێوەکەیان داو دوایی گەڕانەوە بۆ لای ئەبو قاسم چاوی لەسەر دانان و ووتی: دەکرێت ئادەمیزاد بەو خێراییە لە ستەم بێتە دەرەوە؟ لەبارەی کاروبارەکانتان هەواڵم بدەنێ جا بەو باسە هەواڵیان دایێ، ووتی: بەڵێ هەریەکە لە ئێوە پشتی بە هاوڕێکەی دەبەست لەپێدانی پارەکە ، پیاوێکی شەرمن لەنێو ئێوەدا لەدادوەریدابوو.

لە نێوان ئەبی زەکەریاو نێوان ئافرەتێك کێشەیەك هەبوو پێش تۆبەکردنی ئەبی زەکەریای النخشبی، ڕۆژێك لەسەر سەری ئەبی عوسمانی حیری ڕاوەستابوو، ئەو بیری لە کاروباری ئافرەتەکە دەکردەوە، جا ئەبی عوسمان سەری بۆلای ئەبی زەکەریا بەرزکردەوەو ووتی: ئایە تۆ شەرم ناکەیت.

شای کرمانی لێکدەرەوەیەکی باش بوو لە لێکدانەوەدا هەڵەی نەدەکرد ودەیووت: هەر کەسێك چاوی بنوقێنی لە حەرام، دەروونی خۆی بگرێت لە هەواو هەوەس و ئارەزووەکان، شتە شاراوەکانی هەمیشە بە چاودێری ئاوەدان بکاتەوە وە شت دیارو ئاشکراکانیشی بە شوێن کەوتن سوونەت ئاوەدان بکاتەوە خۆی ڕابێنێت لەسەر خواردنی حەلال ئەوا لێکدانەوەو دووربینیەکەی هەڵە ناکات.

گەنجێك هاوڕێیەتی جونەیدی دەکرد قسەی دەکرد لەسەر بیرو ئەندێشەکان جا ووتی: ئای ئەوەبوو دەربارەی تۆ لای من باسی کرد؟ جا پێی ووت: باوەڕ دەکەم شتێك بێت ، ئینجا جونەید پێی ووت: باوەڕت وایە.

گەنجەکە ووتی: باوەڕ دەکەی ئەوەو ئەوە بێت ، جونەید ووتی: نەخێر، گەنجەکە ووتی: دووەم جاریش باوەڕم وایە.

ووتی: باوەڕ دەکەیت.

گەنجەکە ووتی: باوەڕ دەکەم ئەوەو ئەوە بێت، جا جونەید ووتی: نەخێر، ووتی: جا بۆ سێ یەم باوەڕم وایە ووتی: باوەڕ بکەم گەنجەکە ووتی: ئەو شتە ئەوەو ئەوەیە، ووتی نەخێر.

ئینجا گەنجەکە ووتی: ئەمە جێی سەرسوڕمانە وە تۆ پیاوێکی ڕاستگۆی، وە من دڵی خۆم دەناسم، جا جونەید ووتی: لە یەکەم و دووەم و سێ یەم دا ڕاستت ووت، بەڵام ویستم تاقیت بکەمەوە ئایە دڵت دەگۆڕێت.

ئەبو سەعیدی خەراز ووتی: چوومە مزگەوتی کەعبەی پیرۆز، کەسێکی فەقیر دوو پارچە پەڕۆی لەسەری دابوو داوای شتێکی دەکرد ئینجا منیش لەخۆم پرسی، نموونەی ئەو جۆرە کەسە ماندوویی شەکەتی و بارگرانین لەسەر خەڵکی، جا سەیرێکی منی کردو ووتی: ﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنْفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ ﴾ (البقرة:٢٣٥)، واتە: (( چاکیش بزانن بەڕاستی خوا دەزانێت بەوەی کە لە دڵ و دەروونتاندا هەیە ، کەواتە خۆتان بپارێزن "لە قەدەغەکراوەکانی خوا")) ، ووتی: تۆبەو ئیسغفارم کرد لە ڕازو نهێنیەکەم ، بانگەوازکەرێك بانگی کردم و ووتی، ﴿وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ ﴾(الشورى:٢٥)، واتە: ((خوا ئەو زاتەیە کە پەشیمانی و تەوبە لە بەندەکانی وەردەگرێت)).

ئیبراهیم خواص ووتی: لە مزگەوت بووم گەنجێکی بۆن خۆش و ڕووخسار شیرین پۆشاك لەبەرێکی باش هات، بەهاوڕێکانم ووت: وا تێدەگەم ئەو کوڕە جوولەکە بێت جا هەموویان ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، جا من چوومە دەرەوەو گەنجەکەش چووە دەرەوە، پاشان گەڕایەوە لای هاوڕێکان جا ووتی: ئاخ لەوەی شێخ دەربارەی من ووتی؟ جا تەریقیان کردەوە، ئەویش سوور بوو لەسەر ئەوەی هاوڕێکان قسەیان بۆ بکات، ئەوانیش ووتیان: شێخ ووتی: تۆ جوولەکەی، ئینجا گەنجەکە دەستی منی گرتو موسڵمان بوو ، ووتم : هۆکارەکەی چی بوو؟ گەنجەکە ووتی: لە کتێبی ئێمە خوێندوومەتەوە کەوا پیاوی ڕاستگۆ لە لێکدانەوەو ڕاڤەکردندا هەڵە ناکات.

***

## ( له بارەی جیاوازی نێوان ئامۆژگاری وه غەیبەت کردن )

جیاوازی له نێوان ئا مۆژگـاری وه غـەیبـەت کـردن : ئامۆژگـاری مەبەسـت لێـی ئاگادارکردنەوەی موسڵمانه له شتی بیدعەو داهێنـراو یـاخود فیتنـه یـا غـەش و فێڵکردن یان خراپه کار، جا بێنـەوه یـادی خـۆت ئـەوه تیایـەتی ئەگـەر ڕاوێـژی پێکردیت و ڕێنمایی کردی له هاوڕێیـەتی لەگەڵیـدا وه مامەڵـەکردن لەگەڵیـدا وه پەیوەندی کردن پێیـەوه، هـەروەك پێغەمبـەرﷺ فەرموویـەتی: فاتیمـەی کـچی قەیس ڕاوێژی پێکرد لەبارەی مارەکردنی معاویـەوه ئـەبی جـەهم جـا فـەرمووی: ((أما معاوية فصعلوك ، وأما أبو جهم فلا يضع عصاه عـن عاتقـه))[٣٣٦]، واتـە: ((لەبارەی معاويه ئەوا کەسێکی فەقیرو هەژارو نەداره)، وه بەڵام ئەبو جـەهم ئـەوا داری سەرشانی دانانێت)).

هەندێك له هاوڕێکانی دەڵێن بۆ ئـەو کەسـەی سـەفەری لەگەڵـدا دەکـات: ئەگـەر دابەزی له وڵاتی هۆزەکەی ئەوا ئاگاداری بکەوه.

جا ئەگەر غـەیبـەت و پاشمله ڕوویـدا لەسـەر ڕووی ئامۆژگـاری کـردن بـۆ خـواو پێغەمبەرەکەی وه بـۆ بەنـده موسـڵمانەکانی ئـا ئـەوه نزیـك بوونەوەیـه بـۆ لای پەروەردگار له تەواوی کاره چاکەکان ، ئەگەر ئەمه ڕوویدا لەسەر ڕووی زەمکردنی براکەت، لەباربردنی شەرەف و ناموسی ، وه خواردنی گۆشتی ئـەو بێـت ، ئەمـه دەردێکی کوشندەیه و ئاگری چاکەکانه کەوا دەیخوات هـەروەك ئـاگر دارو چـیلکه دەخوات.



(٣٣٦) مسلم : (١٤٨٠) ، وه سنن أبي داود (٢٢٨٤).

( لەبارەی جیاوازی نێوان دیاری و بەرتیل )

جیاوازی لە نێوان دیاری و بەرتیل لە وێنەدا لەیەك دەچێت: مەبەستیش: كەسی بەرتیلدەر مەبەستی وایە بەرتیل بكات بە ناڕەوا كردنی حە قو ڕاستی یاخوود بەدەست هێنانی شتی بێ كەڵك و بێ سوود و ناڕەوا ، جا ئەو بەرتیل دەرە نەفرەت لێكراوە لەسەر زوبانی پێغەمبەرﷺ [٣٣٧]، لەبەر ئەوەی بەرتیل دەدات بۆ پاڵنانی ستەم لە دەروونی خۆی و بەرتیل خۆریش بەتەنها خۆی تایبەت كراوە بە نەفرەت لێكراو .

بەڵام دیاری و خەڵات پێشكەشكراو جا مەبەستەكەی بانگهێشت كردنی ڕەحم و بەزەیی و زانست و چاكەكاریە ، لەبەر ئەوەی مەبەستی دیاری پێشكەش كردن بریتی یە لە بریتی دانان ، بێگومان قازانجیش بریتی یە لە زۆربوون.



( لە بارەی جیاوازی نێوان ئارامگرتن وە دڵرەقی )

لەبارەی جیاوازی نێوان سەبرو ئارام وە دڵڕەقی و توندو تیژی: كە سەبر داهێنراوێكی دەستكەوتیە كە بەندە تێیدا درووست دەبێت، بریتیە لە بەند كردنی دەروون لە ترس و دڵە ڕاوكێ و شپرزەیی و دادو بێ دادی جا دەروون بەند دەكرێت لە ڕق هەڵساندن و زەمانێك دەربارەی سكاڵاكردن و ئەندامەكان لەكاتێكدا ناكرێت كاری باش بكەن، و بریتی یە لە جێگیر بوون و سەقامگیر بوونی دڵ لەسەر یاساكان قەزاو قەدەر و شەرعیەكان.

بەڵام دڵڕەقی و بێ بەزەیی لەدڵدا ووشك و ووردو خاش دەكات قەدەغەی دەكات لەكارو كاردانەوە وە ڕق ئەستووری و توندو تیژیەكە بەرهەڵست و قەدەغەی

---

[٣٣٧] سنن أبي داود: (٣٥٨٠).

دەكات لە هەست پێكردن لە هەست و ئێش و ژانـەكان، وە هەسـتیش ناكـات بـە دڵڕەقی و بێ بەزەییەكەی نەبۆ سەبر گرتنەكەی وە نەبۆ ئەگەری ڕووداوەكان.

ناسینەوە و ساخكردنەوەی ئەمە كەوا دڵ سێ جۆرە:

دڵێكی ڕەق و بێبەزەیی[٣٣٨]: ئەمە دڵێكـی ڕەق و توونـدو تیـژە وەكـو دەسـتێكی ووشك و برنگ و ڕەق وایە،

دڵێكی شل و تواوە: ئەمەش دڵێكی زۆر ناسكە.

جا یەكەمیان: كارو كاردانەوە ناكات بە شێوەو پلەو پایەی بەر ، وە دووەمیـشیان: بە شێوەو پلەو پایەی ئاو، هەردووكیشیان ناتـەواوە ، درووسـت تـرین دڵ دڵێكـی ناسكە پووخت و بێگەردو توووند ، ئەوە حەق لـەناو ناحەقـدا دەبینێـت بـە ڕوون و پاكیەكانی وە پێشوازی لێدەكات و هەستی پێدەكات بە ناسـكی خـۆی، وە دەشـی پارێزێـت ، و شـەڕ لـە گـەڵ دووژمنەكـەی دەكـات بـە ڕق و پتەویەكـەی، وە لـە ((أثـر))دا هـاتووە:(( القلـوب آنيـة الله في أرضـه ، فأحبهـا اليـه أرقهـا وأصـلبها وأصـفاها))[٣٣٩]، واتــە: (( دڵــەكان دەفــری خودایــە لــە زەویەكەیــدا، جــا خۆشەویـستترینیان لای ئـەو ناسـكترینیانەو توونترینیانـە وە سـاف و بێگـەرد ترینیانە)). ئەمەش دڵێكی شووشەییە، لەبەر ئەوەی شووشە هەر سێ سیفەتەكانی تێداكۆدەبێتەوە وە بێزراوترین دڵیش لەلای پەروەردگار دڵی ڕە قو بێ بە بەزەییە ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ مِنْ ذِكْرِ اللَّـهِ أُولَئِـكَ فِـي ضَـلَالٍ مُبِينٍ﴾(الزمر:٢٢)، واتە: (( جا هاوارو وەیل بۆ ئەوانـەی دڵیـان ڕەقـە لـە ئاسـتی قورئان و یادی خوا ))، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ثُـمَّ قَـسَتْ قُلُـوبُكُمْ مِـنْ بَعْـدِ ذَلِـكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ﴾(البقرة:٧٤)، واتە: (( پاشـان لـەوەو دوا دڵـەكانتان ڕەق بووە هەروەك بەرد بـەڵكو ڕەقتریـش ))، دیـسان خـوای گـەورە دەفـەرموێت:

---

(٣٣٨) الترمزي:(٢٤١١).

(٣٣٩) سميري : كشف الخفاء : ٢/٢٧٤ بكه .

﴿لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ﴾(الحج:٥٣)، واته: (( خوا گەورە بۆیە ئەو دەسەلاتی داوە بە شەیتان تا ئەو خەتەرەو خەیاڵەو وەسەوەسەیەی شەیتان فڕێی دەداتە نێو ئاواتی پێغەمبەرانەوە ببێتە هۆی سزاو تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی ل دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی دوو ڕوویی و ناپاکی هەیە و بۆ ئەوانیش کە بەرامبەر ئایینی خوا دڵڕەقن ))، جا یادی ئەو دوو دڵە لادارە بکەوە لە یەکسانیدا ، ئەوەیان بەهۆی نەخۆشیەکەی ، وە ئەوەشیان بەهۆی دڵڕەقیەکەی، شەیتانیش فیتننەو ئاژاوەی فڕێداوەت خاوەنی ئەو دوو دڵە ، وە ڕەحمەتیش بۆ خاوەن دڵی سێ یەم وە ئەمەش ئەو دڵە ساف و ڕۆشنەیە کەوا فڕێدانی شەیتان وە فڕێدانی ڕێنمایی کارو چاکە لایان خوای گەورەو میهرەبان جیا دەکاتەوە بەهۆی سافی و ڕوونی دڵەکە، پێشوازی لەهەق دەکات بە هۆی ملکەچی و ناسکیەکەی، شەڕی کارە ناڕەواکانیش دەکات بەهۆی پتەوی و توونـدی و هێزەکەی ، لەبارەی ئەمەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾(الحج:٥٤)، واته: (( بۆ ئەوەش ئەوانەی زانست و زانیاریان پێ بەخشراوە دڵنیابن و بزانن کە بێگومان ئەو قورئانە حەقیقەت و ڕاستەو لەلایەن پەروەردگاری تۆوە ئەی محمدﷺ ڕەوانەکراوە ، ئینجا بڕوا پتەوی پێدەهێنن و دڵەکانیشیان دەبێت بۆ خوا ، بێگومان خوا هیدایەتدەری ئەوانەیە کەوا باوەڕیان هێناوە بۆ ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و درووست.

***

## ( لەبارەی جیاوازی لێبوردنو زەلیلی و سەرشۆڕی )

جیاوازی نێوان لێبوردن و زەلیلی: کە لێبوردن وازهێنان لە مافی خۆتە بە خۆشی و بەخشندەیی و پیاوەتی، لەگەڵ توانابێت لەسەر وەرگرتنەوەو تۆڵەسەندنەوەی ، بە پێچەوانەی زەلیلی هەست و کاریگەریەکە واز لێدەهێنێت نارەزو دەکات لە چاکەکاری و بەرز ڕاگرتنی ئەخلاق و ڕەووشت ، جا ئەگەر خاوەنەکەی تۆڵەسندنەوە واز لێبێنێت لەبەر بێ توانایی وە لەبەر ترسان و لەبەر شکاندنی دڵ و دەروون ، جا ئەو کەسێکی زەمکراوە سوپاسکراونیە، وە لەوانەیە ئەوەی تۆڵەی بەحەق دەکاتەوە حاڵەتی لەو باشتر دەبێت ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ﴾(الشورى:٣٩)، واتە: ((هەروەها ئەوانەی دەستدرێژیان کرایە سەر دەستەوەستان ناوەستن بەرگری لەخۆیان دەکەن )).

خوای گەورە مەدح و ستایشی ئەوانە دەکات بە هێزو تواناکانیان لەسەر سەرکەوتنیان بۆ دڵ و دەروونیان و لێوەرگرتنەوەیان و هەتا ئەگەر ئەو توانادار بوون لەسەر دەست درێژی کردن سەریان ، وە لەتواناياندایە ئەوەی لایانە وەری گرنەوە کەچی دەینێرن بۆلای کەسێکی شەریف و گەورە بۆ لێخۆش بوون و لێبووردنی ، جا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾(الشورى:٤٠)، واتە: (( جا تۆڵەی هەر تاوانێك بە ئەندازەی ئەو تاوانایە بێ زیادو کەم ، ئەو کەسە لێخۆشبوونی هەبێت وە چاوپۆشی و چاکسازی بکات ، ئەوا پاداشتی لای خودایە ، بەڕاستی خوا ستەمکاران خۆش ناوێت)).

جا باسی ئەو سێ پلەو پایە و ڕێزو شکۆیە دەکرێت : دادوەری و ئاشکراکردن و ڕێگەپێدان ، چاکەو پیاوەتی و چاوپۆشی لێکردن ، ستەمکاری و بێبەریکردن.

جا ئەی گەر ووتیان: چۆن مەدح و ستایش دەکات لەسەر سەرکەوتن و لێبوردن وە ئەوانەە هەردووکیان پێچەوانەی یەکترن؟

ووتیان: مەدح و ستایشیان نەکردوو، لەسەر وەرگرتنەوەو تۆڵـە سـەندنەوە، بـەڵکو مەدح و ستایشی ئەوان دەکەن لەسەر سەرکەوتنیان بەوەی کـە ئـەو توانـاو هێـزی هەیە لەسەر وەرگرتنەوەی مافەکانیان، جـا ئـەوە ئـەو سـەرکەوتنەیە جـا کاتێـك توانیان چاوپۆشی لێبکەن وو لێیان خۆش بن، هەندێك لە سەلەفیەکان دەلـێن لـەو ئایەتەدا نایانەوێت و پێیان ناخۆشە سەرشـۆڕبن و ئابڕوویـان بـچێت ، جـا ئەگـەر توانیان لێبوردە بن مەدح و ستایشیان دەکەن لەسەر لێبوردەیی پاشان هێزو توانا ، نەك لەسەر لێبوردنێك زەلیلی و پێنەکران و ئابڕووچوون وی بـەدوادابێت، ئەمـەش ئەو تەواوکاریەیە کە خوای گـەورە زاتـی خـۆی لـەو ئایەتـە پـیرۆزەدا وا مـەتح و ستایشی خۆی پێکـردووە: ﴿ فَـإِنَّ اللَّـهَ كَـانَ عَفُـوّاً قَـدِيراً ﴾(النسـاء:١٤٩)، واتـە: ((بێگومان خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشـبوو و بەدەسەلاتیـشە)) ، ﴿ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾ (سورة البقرة: من الآية ٢١٨)، واتە: (( بەڕاسـتی خـوا زۆر لێخۆشـبوو و دلۆڤانە ))، لەحەدیسێکی بەناوبانگدا: هەڵگرانی عەرشی خوا چوار فریـشتەن دوو فریشتە دەڵێن : سبحانك اللهم ربنا وبحمدك لك الحمد على عفـوك بعـد قـدرتك، وە بۆیە لەم بارەیەوەش مەسیح سەلاَت و سەلامی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت: ﴿إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾(المائدة:١١٨)، واتە: (( جا ئەگەر ئەشکەنجەیان بدەیت (لەسەر لادان و تاوان ) ئـەوە بەڕاسـتی بەنـدەی خۆتن و ئەگەر لێشیان خۆش بیت ، ئەوە بەڕاستی خـۆت خوایـەکی بـاڵا دەسـت و دانایت و دەزانیت کێ شایستەی لێخۆشبوونە))، بە مانـای : ئەگـەر لێیـان خـۆش ببیت ئەوا لە ئەوپەڕی عیزەت و تواناییدا لێخۆشبوویت ، وە دانـاییش بریتیـە لـە تەواوی زانیاری ، جا لێیان خۆش بوویت پاش ئەوەی زانیاریت هەبوو کـەوا چـییان کردووە و توانایی تۆ تێیان گەیشتووە وە تۆڵە سـەندنەوەش دیـارو دەرخـستنەکەی عیزەت و توانایە وە ناوەڕۆك و ناواخنەکەشی زەلیلـی یـە، خـوای گـەورەش لـە

لێخۆشبووندا هیچی زیاد نەکردووە تەنها عیزەت و شکۆمەندی نەبێت، هیچ کەسێك نی یە کەوا تۆڵەی لە پێناوی خۆیدا کردبێتەوە تەنها شەرمەزار بووە، لەبەر ئەمە پێغەمبەرﷺ هەرگیز تۆڵەی لە پێناوی خۆیدا نەکردۆتەوە[٣٤٠].

خوای گەورە لە فەرمودەیەکدا ئەوان هەڵدەسەنگێنێت: ﴿ هُمْ يَنْتَصِرُونَ﴾(الشوری:٣٩)، واتە: (( دەستەوەستان ناوەستن وە بەرگری لە خۆیان دەکەن ))، چۆن لێیان تێدەگەیت لەکاتێکدا نەوان لە هێزوتواناداان، وە مەبەستیش کەوا لێبوردن لە ڕەوشتەکانی دەروونی پڕ لە ئارامی یە، زەلیلیش لە ڕەوشتەکانی دەروونەکانی گوناهبارو تاوانبارە، خاڵی مەسەلەکەش کەوا تۆڵە سەندنەوە شتێکەو سەرکەوتن و بەرگری لەوخۆکردنیش شتێکی دیکەیە، جا بەرگری کردنیش ئەوەیە کە بەرگری حەق و مافی خوا بکەیت وە لە پێناوی ئەویشدا بیت .

جا ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر ئەوا لە پێناوی خوای گەورە بەرگری لە خۆی دەکات لە دەستدرێژکارەکەدا کەوا خوای گەورە عیزەت و خۆنەویستی پێ بەخشیوە، لەسەر ئەو گەورەیی و شکۆمەندییەی کە مافی دەخوات و دڵگیری دەکات، غیرەت و پەرۆشی بۆ بەندەیەکی پەیوەندکراو بۆ خودای باڵا دەست و دلۆڤان کەوا زەلیل دەکرێت، ئەوا بە دەست درێژ کارەکە دەڵێت، من بەندەو کۆیلەی کەسێکم کەوا بەندەی خۆی زەلیل ناکات، وە حەزیش ناکات کەس زەلیلی بکات.

نموونەی ئەمەش ئەوەیە کەوا پیاوێك هاتەلای ئەبوبەکری صدیق پێی ووت: هەڵمگرە سوێند بە خوا من لەتۆو لە کوڕەکەت سوار چاك ترم، لە کاتێکدا موغیرە کوڕی شوعبە لەلای بوو، جا مووغیرە توونر بە قۆڵی گرت و مستێکی لە لووتی پیاوەکە دا، جا خوێن لە لووتی ڕژا، ئینجا کەس و کاری پیاوەکە هاتنە لای ئەبوبەکر ووتیان: تۆڵەمان بسێنەوە لە موغیرە، جا ئەبوبەکر فەرمووی: من تۆڵە

---

(٣٤٠) مسلم : (٢٣٢٧).

دەسێنم لەو کەسەی قەدەغە بەربەست دەبن لە شکاندنی پیرۆزەکانی خوای گـەورە؟ نەك تۆڵە سەندن لە پێناوی ئەودا.

ئەبوبەکر بینی ئەو بەرگریە لەلایەن مـوغیرەوە بـۆ عیـزەت و شـکۆمەندی خـوای گەورە کەوا خەلیفەی پێغەمبەرﷺ بەرزی ڕاگرتـووە بـۆ ئـەوەی ئـەو عیـزەت و شکۆمەندی یە لە چاکی خەلافەتیەکەی و دامەزراندنی ئاینەکەی بێتە دی، جا ئەو وازی لەی تۆڵە سەندنەوەی خۆی هێنا بۆ ئەوەی جورئـەت و تواناکـەی لـە پێنـاوی عیزەتی خـواو دەسـەڵاتەکەی بـەکاربهێنێت کـەوا پێغەمبەرەکـە و ئایینەکـەی وە جێنشینەکەی پێی بە غیرەت و سەربەرز بوونە، جا ئەمە بابەتێکە و نموونەی لووت بەرزی بۆ دەروونی تاوانبارو گوناح بابەتێکی دیکەیە.

*** 

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان دڵپاکی و گەمژەیی )

جیاوازی نێوان دڵپاکی و گەمژەیی و بێئاگایی کـەوا هێمنـایی دڵ و دڵپـاکی لـە نەویستنی ئیرادەی دەبێت لەدوای زانینی، دڵی لە ئـیرادەو نیـەت و مەبەسـتەکەی سەلامەت دەبێت نەك لە زانینی وە زانیاری پێی، ئەمەش بە پێچەوانەی گەمژەیی و بێ ئاگاییە لەبەر ئەوەی ئەمە نەزانینێکەو کەمی زانیاری یە لەسـەری، ئەمـەش حەمدو ستایش ناکرێت ، لەبەر ئەوەی ئەمە کەم و کوڕی هەیـە ، بـەڵکو حەمـدو سوپاسی ئەم خەڵکە دەکرێت کەوا خەڵکی لێـی سـەلامەتن ، و تـەواویش ئەوەیـە کەوا دڵ زانیار بێت لە باسی شـەڕو خراپـە سـەلامەت و گونجـاوو تـەواو بێـت لـە ئیرادەکەی ، عومـەری کـوڕی خـەتابﷺ دەڵێـت: مـن دەسـتبڕو فێڵبـاز نـیم و دەستبڕو فێڵبازیش ناخەڵەتێنێت، عومەر زۆر لەوە ئاقڵمەند تر بـووە لـەوەی کـەوا هەڵبخەڵەتێت ، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لا يَنْفَـعُ مَـالٌ وَلا بَنُـونَ۞ إِلَّـا

مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾(الشعراء٨٩:٨٨)، واتە: (( ئەو رۆژەی نە ماڵ سوود دەبەخشێت و (فریای ئادەمیزاد دەکەوێت)، نە منداڵ و نەوە ، مەگەر کەسێك بە دڵ و دەروونی پاك و بێگەردو پڕ لە ئیمان، بە خزمەت پەروەردگار گەیشتبێت))، جا ئەمەیە پاك و بێگەردە لە هەموو کارەساتەکان کەوا دڵە نەخۆشەکان تووش بوو بە نەخۆشە گوماناویەکان کەوا دەکات شوێن کەوتەی گومان بکەوێت، نەخۆشی ئارەزوو و شەهوەتیش کەوا دڵ تامەزرۆ دەکات بەدوای هەواو هەوەسی دەروون بکەوێت ، جا دڵی پاك و بێگەردیش کەوا سەلامەت و پاکە لەم شتەو لەو شتانەن.

***

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان دڵنیایی و بێ ئاگایی )

جیاوازی نێوان دڵنیایی و بێ ئاگایی، دڵنیایی وەستانێکە پشت دەبەستێت بە بەڵگەو نیشانەکان و فەرمانەکان دڵ تێیدا جێگیر دەبێت، جا هەر کاتێك ئەو نیشانانە بەهێز بێت ئەوا ئەو بەڵگەیە بەهێز دەبێت وە قایم دەبێت و ڕەگی دادەکوتێت وە بەتایبەتی لەسەر زۆری تاقیکردنەوەو ڕاستگۆیی لە لێکدانەوەو دەربڕیندا وەك ئەوەی بەڵگەو باوەڕپێکردنەکان بێت، دڵیش پەیوەستە بەو کەسەی متمانەی پێبکات و پشتی پێ ببەستێت، وە نیەت و مەبەستی پاش بێت پێیەوە.

بەڵام کەسی بێئاگا وەك یەکێکی لەخۆبایی وایە کەوا دەروونی و شەیتانەکەی و ئارەزوو و هیواو ئاواتەکەی فریوی داوە هەروەها هەوەسە سەرنەکەوتوو و درۆزنەکەی بە خودای خۆی تاوەکو دەروونی شوین هەواو هەوەسەکەی دەکەوێت، کەسی لەخۆباییش دڵنیاییت پێ دەدات بەوز کەسەی کەوا خۆی باوەڕی پێی نیە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئاً وَوَجَدَ اللَّهَ عِنْدَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾(النور:٣٩)، واتە: ((ئەوانەی کە ڕێبازی کوفریان گرتۆتە بەر

کردەوەکانیان وەك تراویلکەو سەرابێك وایە لە بیابانێکدا بریسکە بداتەوە کەسێکی تینوو وابزیانێت ئاوە (بەتالووکە بۆی بچێت )، هەر کاتێك گەیشتە لای دەبینێت هیچ نیە ، ئەوسا (کاتێك بۆخۆی دەزانێت ژیانی کۆتایی یە و قیامەت بەرپابووە) خواش ئامادەیە لەلایدا بەگوێرەی کردەوەی موحاسەبەی دەکات وە لێی دەپرسێتەوە، وە خواش بەخێرایی لێپرسینەوە ئەنجام دەدات ))، وە خوای گەورە لەبارەی ئەوانەی‌لەخۆبایین و خەڵکی فریو دەدەن دەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً۝ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً﴾(الكهف١٠٤:١٠٣)، واتە: (( ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئایە هەواڵی ئەو کەسەتان بدەمێ کە لە کاروکردەوەیاندا زۆر زەرە مەندو خەسارەت مەندن؟!، (ئەوانە) ئەو کەسانەن کە هەوڵ و کۆششیان لە ژیانی دونیادا، بە زایە و بە هەدەر چووە بەمەرجێك وایان دەزانی کە بەڕاستی کاری چاك دەکەن و کردەوەی ڕەوا ئەنجام دەدەن))، وە ئەوانە ئەگەر بەرگ و سەرپۆشەکەیان لەسەر لاچێت و بەدیار کەوێت ئەوا ڕاستی کاروبارەکانیان دەسەلمێندرێ و دەزانرێت کەوا ئەوانە لەسەر هیچ شتێك نەبوون: ﴿وَبَدَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾(الزمر:٤٧) واتە: (( ئەوەی هەیانە هەمووی دەبەخشن لەپێناو ڕزگاری خۆیاندا کاتێك دەبینن کە سزاو ئازاری دۆزەخ زۆر سەختەو لەلایەن خواوە سزاو ئازارو ئەشکەنجەی وایان بۆ دەردەکەوێت کە هەرگیز بەتەمای نەبوون )).

لەحەدیسێکی ناسراودا: (( إذا رأيت الله سبحانه يزيدك من بعمه وأنت مقيم على معصيته فأحذره فإنما هو إستدراج بستدرجك به))[٣٤١]، واتە: (( ئەگەر بینیت خوای پاك و بێگەرد لە نیعمەتی خۆی بەسەرت دادەڕێژێت و بۆت زیاد دەکات ، وە تۆش بەردەوامیت لەسەر تاوان و گوناح و سەرپێچی ئەوا ئاگاداربە و لێی بترسە ، لە ڕاستیدا ئەوا نزیك خستنەوەیە، کە لە سزاو ئازاری دۆزەخ نزیکت

(٣٤١) مسند أحمد : ١٠٤/٤.

دەكاتــەوە))، ئەمــەش لــە قورئانــدا شــايەتی لەســەر دراوە وەك خــوای گــەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ﴾(الأنعام:٤٤)، واتـە: (( ئینجـا كاتێـك ئـەو ڕێبـازو بەرنامـەی كـە یادیـان خرابـۆوە فەرامۆشـیان كـرد ئێمـەش دەروازەكانی هەموو شتێكمان بۆ والاّكردنەوەو (نازو نیعمـەتمان بەسـەردا ڕژانـدن) هەتا كاتێك دڵخۆش و شادومان بوون بەوەی كە پێیان درا، ئیتر لە ناكاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەدان و ڕیـسوا كـرد ئینجـا ئـەوان بـێ ئومێـد بـوون و بەغـەم و پەژاریەیـەكی زۆرەوە تیاچـوون))، وە ئەمــەش گــەورەترین بــێ ئاگاییــە كــەوا دەبێتنیعمەتیخوا بەسەرتا دەبارێت و تۆش بەردەوامیت لەسەر كاری خراپەو تـاوان ، جا شەیتانیش بریكارە بە هەڵخەڵەتاندن، وە سرووشتی دەروونـیش نیـشانەیە بـە لەخۆبایی بوون و فریودان، جا ئەگەر بیرو ڕاو ستەمكارو شـەیتانی لـەخۆبایی و دەروونی دوو ڕوو كۆبێتەوە ئەوا هیچ جیاوازیەك نابێت، جـا شـەیتانەكان كەسـانی لەخۆبایی فریو دەدەن و تـەماعیان دەداتـێ لەبـەردەوامیان لەسـەر ئـەوەی خـوای گەورە ڕقو كینەیان بەرامبەر زاید دەبێت و لێیان توورە دەبێت، لەم بارەیەوە خوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّى جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾(الحدید:١٤)، واتە: (( هیواو ئاواتی بێ جێ سـەری لێتێـك دابـوون، هـەتا ویستی خوا یەخەی پێگرتن و كۆتایی بە ژیانیان هات، شەیتانیش غـەراو گـومڕای كردبوون بە میهرەبانی خواو لە ڕێبازەكەی وێڵی كردبـوون ))، وە هـەروەها خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ﴾(فاطر:٥)، واتە: (( ئەی خەڵكینە دڵنیابن بەڵێنی خوا ڕاسـت و دروستە (قیامەت بەرپا دەكات و لەهەموو كەس دەپرسێتەوە ) كەوابوو ژیـانی ئەم دونیایە سـەرتان لێ نەشـێوێنێت و شـەیتان نەتانخەڵـەتێنێت بـەناوی ڕەحـم و بەزەیی خواوە (گوایە هەرچی بكـەن خـوا بەبەزەییـە ولێتـان خـۆش دەبێـت))، وە

گەورەترین خەڵکانێك کە فریو درابن بەوەی کە خوای گەورە بە ڕەحمەتی خۆی نیعمەتی پێداوە دەڵێت: ئەوە هی منە: واتە: من خاوەنی ئەو شتەم و هەر خۆم شایەنی ئەو شتەم لەهەموو کەس موستەحەق ترم بەو شتە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً﴾(الكهف:٣٦)، واتە: (( واشنازانم قیامەت بەرپادەبێت))، جا ئەوانە لەگەڵ ئەوەش خوای گەورە نیعمەتیان بەسەردا ڕژاندووە کوفر بەخوای گەورە دەکەن و لە خۆبایی بونیان زیاتر دەبێت جا خوای گەورە لە زمانی ئەوانەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَئِنْ رُجِعْتُ إِلَى رَبِّي إِنَّ لِي عِنْدَهُ لَلْحُسْنَى﴾(فصلت:٥٠)، واتە: (( ئەگەر بمگێڕنەوە بۆلای پەروەردگارم ئەوا دلچنیام کە خۆشی و نازو نیعمەتم لای ئەوا بۆ ئامادەیە ))، بە مانای: بەهەشت و ڕێزلێنان جا بەم حاڵە لەخۆبایی دەبێت بە خودای گەورەو میهرەبان، جا بە شەیتان هەڵدەخەڵەتێت بەو پەیمان و هیواو ئاواتانەی پێیدابوو ، تاوەکو لە دواجاردا بە هیلاك دەچێت.



( لەبارەی جیاوازی نێوان تکاو پاڕانەوە وە هیواو ئاوات )

جیاوازی نێوان تکاو پاڕانەوە وە هیواو ئاوات تکاو پاڕانەوە لەگەڵ تێکۆشانی ڕەنج و سەرفکردنی هێزو ووزە لەبەدەست هێنانی بە هۆکاری سەرکەوتن و بردنەوەدا، وە هیواو ئاواتیش ڕازو گلەیی دەروونە بۆ دەستکەوتنی ئەو شتە ، لەگەڵ یەکخستنی ئەو هۆکارانەی بۆی گەیەنەرە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ اللَّهِ﴾(البقرة:٢١٨)، واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کۆچ و جیهاد و تێکۆشانیان کردووە لە پێناو ڕێبازی خوادا، ئا ئەوانە بە هیواو بەتەمای ڕەحمەت

و میهرەبانی خوای پەروەردگارن))، جا خوای پاك و بێگەردبەرماڵی تکاو پاڕانـەوە دەنوشتێنێتەوە تەنها بۆ ئەوانە نەبێت، وە فریـودراوانیش دەڵـێن : ئـەو کەسـانەی فەرمانەکانی خوایان پشت گوێ خستووە و ئەو شتانەی قەدەغەی کردوون ئـەنجامی دەدەن و شوێن ئەوانە دەکەون کەوا خوا لێیان توورەیـە ، وە دوور دەکەونـەوە لـەو شتانەی خوای گەورە لێیان ڕازییە ، ئا ئەوانە بەهیواو تەمای ڕەحمەت و میهرەبانی خوای پەروەردگارن، ئەمەش شتێکی تازە بابەت و زیاد نیە لە فریودان و لەخۆبایی بوونی دەروون و شەیتانیش لەوانەو بۆ ئەوانە ، جـا هیـواو ئـاوات و پاڕانـەوە بـۆ بەندەیەکـە کـەوا دڵـی پڕبووبێـت لـە بـاوەڕبوون بـەخواو ڕۆژی دوایـی، لـەنێوان چاوەکانیدا دەرکەوتووە کەوا خوای گەورە لە کەرامەت و بەهەشـتی خـۆی بـەڵێنی پێداوە دڵیش فراوان و چەماوەتەوە بۆ پەرۆشی و تامەزرۆیی بۆلای ئەو.

نیشانەی تکاو پاڕانەوەی درووستیش ئەوەیە کەوا کەسی تکاکار دەترسێت لـەوەی بەهەشتی لەدەست بچێت و شانس و بـەختی تێـدا بـە فیڕۆبـدات بـە وازهێنانێـك دەترسێت لەوەی ئەو لەنێوان چوونەژوورەوەیدا بگۆڕێت، جا نموونـەی ئەمـەش وەك نموونەی پیاوێکە ئافرەتێکی بەڕێز لـە پلـەو پایـەکی شـەریفدا لـە خانەوادەیەکـدا مارەبکات ، جا کاتێك کـاتی مـارەکردن و کۆبوونـەوەی کەسـایەتیە بـەڕێزەکان و گەورە پیاوان لەخەڵکەکە هات و ئامادەبوونی پیاوان لـەو ئێوارەیـەدا، بـۆ ئـەوەی ئافرەتەکـەو پیـاوە گـەورەکان ببینێـت، جـا دەسـتی کـرد بـە خـۆ ئامـادکردن و ڕازاندنەوەو جوانکردنی خۆی، وە دەستی کرد بە ڕێکخـستنی قـژی، خـۆی خـاوێن کردو خۆی بۆنخۆش کرد، و جوانترین جل و بەرگی لەبەر کرد، و ڕۆیـشت بـۆ مـاڵی ئافرەتەکە وە لە ڕێگادا خۆی دەپاراست لە هـەموو پیـسی و لەکەیـەك وەیـاخوود شتێکی پیس تووشی بێت تاوەك خۆی دەپاراست لە تۆزو خـۆڵ و دووکـەڵیش، جـا کاتێك گەیشتە بەردەرگای ماڵەکە خاوەنی ماڵ بەخێرهاتنی لێکرد، وە لەبەردەرگا فەرشی ڕاخـست تـاوەکو ژووری پێـشوازی، چـاوی تێـبڕی، لـە هـەموو ڕوێکـەوە

ئافرەتەکە مەبەستی ڕێزگرتنی بوو جا ئەگەر لەدوای ئەم هەموو ڕازاندنەوە و جوانکردنە، لەسەر زبڵدان و گوفەك دانیشتابایە، و لەگەڵیدا تلاوتلی بکردایە و دەستی پیاهێنابایە، وە جل وبەرگو لاشەی پیس و چڵکن بوایە ، ئەو پیس و چڵکنیەی لە قژو ڕوخسارو جل وبەرگیشی بوایە، جا بەم حاڵەتە بچووبا بەر دەرگای ئەو ماڵە بەمەبەستی ئەو بەڵێنەی پێیانی دابوو بۆ مارەکردن، ئەو کاتە ئەوەی بەر دەرگاکە دەستی دەکرد بە لێدانی و دەرکردنی وە لەسەری دەیقیژاند و لەدەرگاکەی دووری دەخستەوە، جا ئەوکاتە پیاوەکە بە سەرسامی و ڕیسوایی و دەرکراوی دەگەڕایەوە.

جا یەکەمیان حاڵی تکاکارە، و ئەمەشیان حاڵی هیواو ئاواتە، ئەگەر دەتەوێت وەکو حاڵی ئەو دوو پیاوەبیست لەهەموو خەڵکێك جیاوازن وە راسپاردەو مامەڵەکردنیان لەهەمووکەس گەورەترو باشترە ، مافی هیچ کەسێك لەلای ئەودا وون نابێت ، لە پشتی پەردە مامەڵەی خەڵك دەکات و هیچ کەسێك نابینێت، و کەرەستەکانی و ماڵ و سامانەکانی و بازرگانیەکانی و تێکەڵاویەکەی بە ئاشکرایی دیارە لە ماڵەکەیدا بۆ مەڵە کاران، جا دوو پیاو دێنەلای ، یەکێکیان بە ڕاستگۆیی و ئەمانەتەوە ئامۆژگاری مامەڵەی لەگەڵدا دەکات وە هیچ غەش و فێڵ و خیانەتی بەسەردا تاقی ناکاتەوە، جا ئەگەر چووە لای باشترین کەرەستەو شت و مەك و خۆشەویستی بۆ هەڵدەبژێرێت لە باشترین جۆری درووست کردن و چاکی و مەحکەمی کەرەستەکە کەوا ناوەڕۆکی لە دەرەوەیدا باشتر بێت.

بەڵام پیاوەکەی دیکە ئەگەر چوویە لای ، بەخێراترین کەرەستەو شت و مەك تاقی دەکاتەوە کە دەربازی نابێت لەغەش و فرت و فێڵ، و باوەڕی بەو کارەی خۆی نیەو بەوەی وەرگێڕەکە پێی ووتوە لەنێوان خۆی و ناوبژیکەرەکە وە لەنێوان درووستکارو بازرگانەکان ، بەڵکو بەهەواو هەوەسی خۆی کاردەکات و مامەڵەی لەگەڵدا دەکات ئەگەر لەبەرچاوی وون بێت، هیچ کاتێك ڕێز لە خاوەن کەرەستەو شت و مەکەکە

ناگرێت تەنها ئەگەر لەبەر چاوی بێت، وەئاگای لە شتە خراپەکانی بێت، بەپێی توانا تاوان و خیانەت لە خاوەن کارەکە دەکات، جا کاتێك بەسەر ئەو کارە تێدەپەڕێت.

پاشان دەڵێت: کەوا خاوەن ماڵ و سامانەکە لەمڕۆدا بۆ کرێکارو مامەڵە کارانی دەری دەخات تاوەکو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات و مافەکانیان بداتێ ، جا هەردوو پیاوەکە لەبەردەستیدا ڕادەوەستن وە هەر کرێکارەو بەوەی مافی خۆیەتی لێی وەردەگرێت ، جا ئەو دوو نموونەی سەرەوە لە ڕاستیدا هاوشێوەن لەگەڵ یەکتر.

جا هەموو تکا کارو ئاواتەخوازێك دەترسێت لەوەی تکای کردوەو بۆی ئاواتە خواز بووە لەدەستی بچێت ، هەموو ترساوێکیش تکاو ئاوات خوازی ئەمن و ئاسایشی خۆیەتی کەوا لێی ترساوە جا لەبەر ئەمەش هەردوو ناوەکە بە نۆرەو دەستاو دەست لە سەری دەکەوێت ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا لَكُمْ لا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَاراً﴾(نوح:١٣)، واتە: ((ئەوە چیتانە ئێوەقەدری خوا نازانن، بۆڕێزی بۆ دانانێن و لێی ناترسن))، لە تەفسیرو لێکدانەوەکەیدا دەڵێن: لە گەورەیی و دەسەڵاتی خوا ناترسن ، وە پێشتر باسکرا کەوا خوای گەورە تکا کردن دەپێچێتەوەو وەری ناگرێت تەنها لەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو لە پێناوی خواوە کۆچیان کردووەو خەبات و تێکۆشانیان کردووە ، پێغەمبەریشﷺ ئیمانی لێکداوەتەوە بەوەی کەوا چەند هۆبەو شوعبەیەکە وەکارو کردەوەی ئاشکراو نهێنی وە پەنهانی تێدایە وە کۆچیشی بەوە لێکداوەتەوە کە دەست هەڵگرێت لەوەی خوای گەورە قەدەغەی کردووە ، خەبات و تێکۆشانیش بەوەی تێکۆشان و جیهادی دەروون بکەیت لە پێناوی خوادا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((المهاجر من هاجر ما نهى الله عنه))[٣٤٢] ((المجاهد من جاهد نفسه في ذات الله))[٣٤٣]، مەبەستیش لێی کەوا خوای پاك و بێگەرد

(٣٤٢) سنن أبي داود (٢٤٨١).

(٣٤٣) الترمذي : (١٦٢١).

خاوەنی تکاکارو ئاواتە خوازی داناوە لەو کەسانەی باوەڕدارن و کۆچ دەکەن و خەباتیش دەکەن وە ئەوانەیشی جگە لەوانە دەرهێناوە لەو ئومەتەدا.

بەڵام ئارەزوو مەندیش بریتی یە لە سەرو پۆیەی ماڵ و داراییەکی موفلیس و نابووت کەوا دەریانهێناوە لە قاڵبی تکاکردو و هیواو ئاوات وە ئەمەش ئارەزووی ئەوانە، وە ئەمەش دەرهاتووە لە دڵێك کە بریتی یە لەم کارەو تەنگی پێ هەڵچنیوە، وە دەروونیش دوو دڵ و ڕا ڕا دەکات و لە دووکەڵ و تارماییەکەیدا ستەمی پێدەکات ، جا ئەمەش دڵەکەی لە شەهوەت و ئارەزووەکان بەکار دەهێنێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ وَلا يَجِدْ لَهُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيّاً وَلا نَصِيراً﴾(النساء:١٢٣)، واتە: (("پاداشت و ڕێزو نرخ" نە بە ئارەزووی ئێوەیە نە بە ئارەزووی خاوەنی کتێبە ، ئەوەی خراپەو گوناهێك بکات ، ئەوە بەهۆیەوە سزا دەدرێت وە هیچ کەس و هیچ هێزێکی دیکەی دەست ناکەوێت جگە لە خوا پشتگیری بکات و یارمەتی بدات)).

جا ئەگەر بەندەیەك وازی هێنا لە ڕاسپاردەی ماف و یارمەتیدانی پشتگیریەکەی ئەوا خوای گەورەش واز دەهێنێت لە ڕاسپاردەو یارمەتیدانی و پشتگیریەکەی ، جگە لە خوای گەورەش هیچ پشت و پەناو یارمەتیدەرێك نادۆزێتەوە .

❊❊❊

## ( لە بارەی جیاوازی نێوان قسەکردن لە نازو نیعمەتەکانی خوا وە شانازی پێکردنی )

جیاوازی لە نێوان قسەکردن و باسکردنی نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە وە شانازی پێکردنی : لە ڕاستیدا قسەکردن لەسەر نازو نیعمەتەکان ڕاستی و هەواڵ

گەیاندنێکە لەبارەی سیفەتەکانی سەرپەرشتیارەکەی وە پوختی و پاکی و چاکی و بەخشندەیی وە چاکەکردن و بەخشینەکەیەتی، بریتیە لە سوپاس و ستایش کردن لەسەری بە ئاشکرا کردنی وە قسە لێکردنی بۆ ئەو سوپاسگوزاری بکات، و بڵاوی بکاتەوە بۆ هەموو ئەو شتانەی کەوا یارمەتی داوە، مەبەستەکەشی لەمەدا دەرخستنی سیفەتەکانی خوای گەورەیە وە مەدح وستایش و سوپاسگوزاریە لەسەریدا.

بەڵام شانازی کردن بە نیعمەتەکان بریتیە لە دەستدرێژی پێکردن بۆ سەر خەڵکیو وانیشانیان بدات کەوا ئەو لەوان گەورەترو خۆشەویسترە، جا سواری سەر ملیان بێت و دڵەکانیان دوور بخاتەوە بۆ ئەوەی بەلای خۆی خواریان بکاتەوە و خۆ گەورەکردن و خزمەت پێکردنیان، نوعمانی کوڕی بەشیر دەڵێت: بۆ شەیتان چەندەها نوێژکەری هاوبەش بۆ خوا پەیداکەرو تەڵەو داو هەیە ، کەوا لەژێر نوێژ کردن و تەڵە دانانەوەکەیاندا زۆرداری و ستەم بە نیعمەتەکانی خوا دەکەن ، خۆیان بە گەورەتر دادەنێن لەسەر بەندەکانی خوا[٣٤٤].

***

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان شادمانی دڵ وە شادمانی دەروون )

جیاوازی لە نێوان خۆشی وشادمانی دڵ وە خۆشی و شادمانی دەروون دیارو ئاشکرایە، لەبەر ئەوەی دڵخۆشی و شادومانی بە خواو ناسینی و، خۆشەویستی بۆی و خۆشەویستی بۆ قورئانەکەی لە دڵەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَفْرَحُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ﴾(الرعد:٣٦)، واتە: (( دەستەیەك لەوانەی کە کتێبی ئاسمانیمان پێ بەخشیون (شوێن کەوتەی حەق و ڕاستین) دڵخۆش و

(٣٤٤) فيض القدير : (٢/٤٩٩).

شادومان دەبن بەو قورئانەی کە بۆتۆ دابەزێندراوە))، جا ئەگەر ئەوانەی خاوەنی کتێبن دڵخۆش بن بە سرووش و وەحیەکە، ئەوا شادوومانی ئەو سرووش و وەحیە، وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا مَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُمْ مَنْ يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيمَاناً فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾(التوبة:١٢٤)، واتە: ((کاتێکیش سورەتێك لە قورئان دابەزێنرا، هەندێك لە ( دوو ڕووەکان بە گاڵتە پێکردنەوە) دەڵێن: کێتان ئەم سورەتە باوەڕی زیاد کردووە؟! جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێنابوو ئەوەندەی دیکە ئیمان و باوەڕی پتەوتر کردن، ئەوانیش مژدە بەیەکتری دەدەن (دەربارەی سەرکەوتن و خۆشی هەردوو جیهان) ))، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ﴾(يونس:٥٨)، واتە: (( ئەی محمدﷺ بە ئیمانداران بڵێ: با دڵشادو شادومان بن بە فەزل و بەخشش و ڕەحمەتی خوایی (کە قورئان و بەرنامەی خوایە)، کەوا بوو با هەر بەوە دڵخۆش بن، هەر ئەمەش چاکترە بۆیان لەهەموو ئەو شتانەی کە خەڵك خەریکن کۆی دەکەنەوەو کەڵەکەی دەکەن )).

ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت : فەزڵ و بەخششی خوای گەورە قورئانە ، ڕەحمەتەکەشی ئەوەیە کەوا بتانگێڕێت بە خاوەنی ئەو فەزڵە[٣٤٥] وە هیلالی کوڕی یەساف دەڵێت : فەزڵ و چاکەی خواوە ڕەحمەت و بەزەییەکەی ئیسلامە کەوا خوای گەورە کردویەتیە بەخشش و خەڵات بۆ ئەو، ئەو قورئانەی فێری هەموو شتێکی کردوون ئەمە بۆ ئێوە خێری زیاترە لەو زێڕو زیوەی کەوا کۆی دەکەنەوە.

وە ئیبنو عەباس و حەسەن و قەتادەو تەواوی لێکدەرەوان دەڵێن : فەزڵو بەخششی خوای گەورە ئیسلامە وە ڕەحمەت و بەزەییەکەشی قورئانە .

جا ئەمە شادومانی دڵەو ئەمەش لە ئیمانەوەیە و بەندەش لەسەری هۆشی دێتەوە بەرو دەگەڕێتەوە ، لەبەر ئەوەی دڵخۆشیەکەی پێی بەڵگەیە لەسەر ڕەزابوونی ،

---

(٣٤٥) سەیری : تفسیر القرطبي ، ٣٥٣/٨ بکە .

بەڵکوو بریتیە لە سـروودی ڕەزابـوونیش ، وە دڵخۆشـی و شـادومانیەکەش بەمـە بەپێی توانای خۆشەویستیەکەیەتی ، لەبەر ئـەوەی شـادومانی لەڕاسـتیدا دەبێتـە سەرکەوتن بۆ خۆشەویستت وە لەسەر توانای خۆشە ویستەکەی دڵخۆش دەبێـت بـە دەستکەوتنی ، جا دڵخۆشی و شادومانی بەخواو نـاوە جوانـەکانیو سـیفەتەکانی پێغەمبەرەکەیو سوننەت و ڕێبازەکەی وە قورئانەکەی کەوا پوخت و پاك و ئیمانـە وە هاوڕێی گیانی بە گیانی ئەوە .

جا دڵخۆشی و شادومانی دڵ و کەیف خۆشی بە خوای گـەورە، نـاوە جوانـەکانیو سیفەتەکانی و قورئانەکەیو پێغەمبەرەکەی، گەیشتن پێی باشـترە لـەوەی ئـەوەی پێیدراوە ، بەڵکو ئـەوە گـەورەیی پێدانەکەیـەتی ، وە دڵخۆشـی و شـادومانی لـە دوارۆژدا بە خوای گەورە و گەیشتن پێی بە گوێرەی دڵخۆشیەکەی خۆشەویستیەکەی لە دونیادا ، وە شادومانی گەیشتن بە خۆشەویستەکەی ئەوا دەوەستێتە سەر هێـزو توانای خۆشەیـستی و لاوازی و بێهێزیەکـەی ، جـا ئەمـەش کاروبـاری شـادمانی دڵخۆشی دڵە.

خۆشیەکی دیکەی هەیە ئەویش بریتی یـە لـەوەی خـوای گـەورە مینـەتی لەسـەر کردووە بەوەی پێی بەخشیوە لە مامەڵە کردنی و دڵسۆزی بۆی وە پشت بەسـتن بـە سەریدا و باوەڕ پێکردنی وە ترسانی لێی و تکاو پاڕانەوە بـۆی ، هـەرکاتێك ئـەوە بەدی هات ئەوا خۆشی و شادومانیەکە بەهێزتر دەبێت ، ئینجـا خۆشـیەکی دیکـە ڕووی تێدەکات ئەویش ئەوەیە کەوا تەوبەو لێخۆش بوونی زانی ئەوا دڵخۆشـیەکەی زۆرتر دەبێت لەسەر لەزەتی تاوان ویاخیبوونەکەی .

نهێنی ئەو شادومانیەش لە ڕاسـتیدا لـەزانینی نهێنـی خۆشەویـستی و شـادمانی خوای گەورە دەزانێـت بەتۆبـەکردنی بەندەکـەی زۆرتـرین و تونـدترین دڵخۆشـیە، پێغەمبەر لەم بارەیەوە نموونەیەك دەهێنێتـەوە لـە دونیـادا لـەم جـۆرە دڵخۆشـترو گەورەترینە ، ئەویش دڵخۆشـی و شـادمانی پیاوێکـە کـە بـە سـواریەکەی دێتـە

دەرەوە، سەفەر دەکات کەوا خواردن و خواردنەوەکەشی لەسەر سواریەکە دانـاوە ، جا لە خاکێکی ووشك و برنگ و پڕ لە کارەسات لێـی وون دەبێـت ، زۆر هـەوڵ و کۆشش دەکات بۆ دۆزینەوەی بەڵام نایدۆزێتەوە خەمبارو نائومێد دەبێت لێی ، جا دادەنیـشێت و چـاوەڕێی مـردن دەکـات تـاوەکو بـەیانی دادێـت و لـە ڕووناکیـدا سوارەکەی دەبینێت ، کـەوا جڵـەوی ئەسـپەکەی بـەدارێك بەوسـتراوەتەوە لەبـەر توندی خۆشی و شادومانیەکەی دەڵێـت : ئـەی خوداوەنـدە تـۆ بەنـدەی منیـت و منیش خوای تۆم ، لەبەر تووندە تاوی شادومانیـەکەی هەڵـە دەکـات ، جـا خـوای گەورە دڵخۆش دەبێت بە تەوبە کردنی بەندەکـە لەبـەر سـەفەرکردن و دۆزینـەوەی سواری و کەل و پەلەکەی [٣٤٦] .

*** 

## ( لەبارەی دڵخۆشی و شادومانیە گەورەکە )

ئالێرەدا گەورەترین خۆشی و شادومانی لەهەر هەموویان وایە ، ئەمەش بریتی یـە لە خۆشی و شادومانیەکەی لە کاتی دابڕانی لە دونیاو گەیشتن بـۆلای پـەروەردگار لەو کاتەی فریشتەی بۆ دەنێرێت وە موژدەی پـێ دەدەن بـە گەیـشتنی بـە خـوای گەورەو میهرەبان ، جا فریشتەی گیان کێـشان پێـی دەڵێـت : ئـەی ڕۆحـی پـاك و بێگەرد وەرە دەرەوە کەوا لە جەسـتەیەکی پـاك دابوویـت ، موژدەبێـت لـەتۆ بـە ڕۆحێك و ڕەیحانەی بەهەشت وە خوایەك کەوا لێت تووڕشە نیە ، وەرە دەرەوە کـەوا خوای گـەورە لـەتۆ ڕازیـە : ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ۞ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً ۞ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي ۞ وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ (سـورة الفجـر٢٧ : ٣٠) ، جـا

---

(٣٤٦) مسلم: (٢٧٤٤).

ئەگەر لەنێوان دەستی تۆبەکار هیچ شتێك نەبێت تەنها ئەو دڵخۆشی و شـادومانیە نەبێت ئەوا عەقڵ و بیرو فەرمانی دەکرد بە ووروژاندنی جا ئەمە چـۆنەو لەدوایـدا جۆرەها شادی و دڵخۆشی ڕووی تێدەکات لەوانە فریشتەکانی نێوان زەوی و ئاسمـان لەسەر ڕۆحی ئەودا ، لەوانە کردنەوەی دەرگای ئاسمانەکان بۆ ئەو ، وە فریشتەکانی ئاسمان سەڵاواتی لەسەر لێدەدەن جا فریشتەکان لەو ئاسمان بۆ ئـەو ئاسمـان لەیـەکتر وەری دەگرن و سەڵاوەتی لەسـەر لێدەدەن بەم جۆرە تا ئاسمانی حەوتەم ، جـا ئەمـە چۆن خۆشیەکەی پێوانە دەکرێت لەکاتێکدا مۆڵەتی پێدراوە بۆلای پـەروەردگاری و پـشتگیری و یارمەتیـدەری و خۆشەویـستەکەی ، جـا لـەنێوان زاتـی موبـارەکی دەستەکانی پەروەردگار دەوەستێت و مۆڵەتی پێدەدرێت بە کڕنۆش بردن جا کڕنۆش بۆ خوای گەورە دەبات، پاشان لەلایەن پەروەردگارەوە فەرمان دەردەچێت: کتێـب و کردەوەکانی لە (علیین)( بنووسـن، پاشـان دەیبـەن بەهەشـتی پێنیـشان دەدەن، و شوێنی خۆی لەبەهەشتدا دەبینێت بەوەی کەوا خوای گـەورە پـەیمانی پێـدابوو، بـە هاوڕێو خزم و کەس و کاری دەگات و جا مـوژدەی پێـدەدەن و دڵخـۆش دەبـن بـە هاتنی جا ئەویش دڵخۆش دەبێت پێیان کەوا پێش کەس و کارەکەی کەوتووە ، جـا لەباشترین حاڵ و شێوە دەیبینن، ئەمە هەمووی پێش دەربازبوونە گەورەکەیە ڕۆژی کۆبوونەوەی جەستەکانە، بەدانیشتنی لەژێر سێبەری عەرشدا، لە حـەوزی کەوسـەر دەخواتەوەو کتێب و کردەوەکانی بە دەستی ڕاستە وەردەگرێتـەوە، تـای تـەرازووی قورس دەبێت و ڕووخساری سپی دەبێت، وە نوورو ڕووناکیـەکی تـەواوی دەدرێتـێ لەکاتێکا خەڵکی لە تاریکاییدا وان وەبەبێ کۆسپ و تەگەرە پردی دۆزەخ دەبڕێـت، کۆتایی دێت بە دەرگای بەهەشت ، جا لەوکاتەدا لێی نزیك دەبێتەوە، بەدەرگەوانی بەهەشت دەگات و بەخێرهاتنی دەکات و سەلامی لێدەکات و موژدەی پێدەدات وە پێشی دەکەوێت و دەیبات بۆ شوێنەکەی و کۆشکەکانی و خێزانـەکانی و تـەخت و شوێنی پاڵدانەوەی.

لەپاش ئەمە خۆشیەکی دیکە ناکرێت پێوانەبکرێت، لێی تێناپەرێت بە فەوتان و نەمان ئەو خۆشیانە هەمووی لەلایەتی، لە ڕاستیدا ئەمە بۆ خاوەن سوڵتەو ڕێبازە باوەڕ پێکراوان و ڕاستگۆیان دەبێت بە بینینی ڕوخساری پیرۆزی پەروەردگاریان کە لەسەرووی هەموویانەوەیە سەلامی خوایان لەسەر بێت :

وليست هذه الفرحات إلا ❊ لذي الترحات في دار الرزايا

فشّمرْ ما استطعت الساق واجهد ❊ لعلك ان تفوز بذي العطايا

وصم عن لذةٍ حشيت بلاءً ❊ للذات خلصن من البلايا

ودع امنية ان لم تنلها ❊ تعذب أو تنل كانت منايا

ولا تستبط وعداً من رسولٍ ❊ أتى بالحق من رب البرايا

فهذا الوعدُ أدنى من نعيمٍ ❊ مضى بالأمس لو وفقت رآيا

❊❊❊

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان دڵنەرمی و پەشۆکاوی و شپرزەیی )

جیاوازی لە نێوان دڵنەرمی وە پەشۆکاوی و شپرزەیی: پەشۆکاوی و شپرزەیی لاوازیەکە لە دەروندا و ترسێکە لە دڵدا، کەوا توندی تەماعی و چلێسی و چاوچنۆکی ڕایدەکێشێت، لەلاوازی ئیمان بەقەدەرو چارەنووس دەستپێدەکات، ئەگەر نا کەی زانراوە کەوا چارەنووس بوونەوەرێکە وە پێویست بوو شپرزەییەکە ماناو مەبەستێکی پوختی هەبێت و جارێکی دیکە تووش بێت: ﴿مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ۝ لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ ﴾(الحديد:٢٢-٢٣)، واتە: (( هیچ بەڵاو ڕووداوێك لە زەویدا بۆتان پێشنەهاتووە کە لە لوح المحفوظ دا تۆمار نەکرابێت، وەپێش ئەوەی ڕووداوەکە پێش بێت ئەو کارەش بۆ

خوا زۆر ئاسانە، ئەمەش بۆ ئەوەی کەخەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لـە کیـستان چـووە بەوەش دڵخۆش و غەرا مەبن کە پێمان بەخشیون )).

ئەمەش پێچەوانە نابێت لەگەڵ دڵنـەرمی، لەبـەر ئـەوەی چـاڵاکوانە لـە سـیفەتی بەزەییدا ئەوەش کەوا تەواو دەبێ کەم و کوڕی یە ، وە خوای گەورەو میهرەبـانیش بێگومـان بـەزەیی بـەو بەندانـەی دادێتـەوە کـەوا بـەزەیین لەگـەڵ خەڵکیـدا، وە پێغەمبەرﷺ لەهەموو کەس دڵـی نـەرمتر بـووەو وە دوورترینیـشیان بـووە لـە شێواوی و شپرزەییدا، جا دڵنەرمی میهرەبانی و بەزەییە، وە دڵە ڕاوکێش نەخۆشی و لاوازیە .

ئەنەس دەڵێت : پێغەمبەرﷺ بەزەییترین کەس بووە بۆ کەس و کاری[٣٤٧] .

خوای گەورەش ئەگەر بیەوێت ڕەحم بە بەندەیەکی بکات ئەوا میهرەبانی و ڕەحمەت و بەزەیی لەدڵیدا جێگیر دەکات، ئەگەر بیەوێت سزای بدات ڕەحمەت و میهرەبانی لە دڵیدا لادەبات وە دەیانگۆڕێت بـە دڵڕەقـی و توونـدو تیـژی - لەحەدیـسێکدا هاتووە: ((لا تنزع الرحمة إلا من شقي)) [٣٤٨]، واتە : (( ڕەحمەت و بەزەیی لە دڵی کەسـێکدا لاناچـێت تـەنها لـە دڵـی کەسـانی خاکەسـارو تاوانبـار نـەبێت)) لـە حەدیسێکی دیکـەدا هـاتووە: (( مـن لا یَـرحَم لا یُـرحَم ))[٣٤٩]، واتـە: (( ئـەوەی بەزەیی و ڕەحمەتی نەبێت ئەوا ڕەحمەت و بەزەیی پێدا نابێتەوە ))، لە حەدیـسێکی دیکـەدا هـاتووە (( ارحمـوا مـن في الأرض یـرحمکم مـن في الـسماء)) [٣٥٠]، واتە:((ڕەحم و بەزەییتان بێتەوە بەوەی لەسـەر زەویدایـە ئـەوا ڕەحـم و بـەزەییتان پێدەکات ئەوەی لەئاسماندایە ))، لە حەدیسێکی دیکەدا هاتووە: ((أهل الجنة ثلاث : ذو سلطان مقسط ومتصدق، ورجل رحیم رقیـق القلـب بکـل ذي قربـى ومـسلم ،

---

(٣٤٧) مسلم (٢٣١٦).

(٣٤٨)مسند أحمد : ٢/٣٠١، وە سنن أبي داود (٤٩٤٢).

(٣٤٩) مسلم : (٢٣١٨).

(٣٥٠) مسند أحمد : ٢/١٦٠، والترمذي : (١٩٢٤).

وعفيف متعفف ذو عيال))[٣٥١]، واته: (( ئـەهلی بەهەشـت سـێ جـۆرە کەسـن : خاوەن دەسەلاتدارێکی دادپەروەرو پیاو چاك و بەخشندە بێت ، وپیاوێکی بەزەیی و دڵ نەرم بێت بە هەم و حزم و کەس و کارو موسڵمانێك ، وە پیـاوێکی دەسـتپاك و داوێن پاك کەوا داوێن پاك و دەست پاك و خـاوەن مـاڵ و منـداڵ بێـت ))، ئـەبی بەکری صدیق دەڵێت : بێگومان فەزل و بەخششی ئوممەت بـەوەی بـە ڕەحمـەتێکی گشتیدا لە دڵێـدابووە زیادەیـە لەسـەر ڕاسـتگۆیەتی و دڵـسۆزیەتی، بـۆ ئەمـەش شوێنەوارو نیشانەی لەهەموو پێشەکیەکانی دیـارو ئاشـکرایە هـەتاکو لـە دیـل و گیزراوەکانی ڕۆژی بـەدردا دەردەکـەوێت[٣٥٢]، و ئـەم کـارو فەرمانـە سـەقامگیرو چەسپاوە لەسـەر ئەوەی هێمای پێکراوە، پێغەمبـەریش ﷺ لـەم بارەیـەوە نموونـە دێنێتەوە بە عیساو ئیبراهیم[٣٥٣].

خوای پەروەردگاریش خۆی بەزەیی و بەخشندەو میهرەبانە، وەنزکترین بوونـەوەریش لای ئەو گەورەترینیانە کەبەخشندەیی و میهرەبانی، هەروەك دووترینیـان لێـی ئـەو کەسەیە کە بەپێچەوانەی ئەو سیفەتانە وەسف کراوە.

❊❊❊

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان شەیدایی وە ڕق و قینە )

جیاوازی لە نێوان سۆزو شەیدایی وە پەشم و ڕق و قینە: سـۆزو شـەیدایی هەسـت کردنە بەئێش و ژان وە پێزانینی وە بزاوتن و جوڵاندنی نەرێنی و نکـۆڵی کـردن لـە بەرزکردنەوەیدا جا ئەمەش تەواوکاریە، وە بەڵام ڕق و کینەو ڕقابەری وشـاردنەوەی

---

(٣٥١) مسلم (٢٨٦٥)، و مسند احمد : ٢/٤٢.

(٣٥٢) مسلم : (١٧٦٣).

(٣٥٣) مسند أحمد : ٣/٢٤٣.

شەڕو خراپەیە و لەهەموو کاتێکدا پێشبینی دەکرێت ڕووبدات جا هەرکەسێك ئەمەی لێ ڕووبدات ئەوا لە دڵیدا هیچ نیشانەو شوێنەوارێك لاناچێت.
جیاوازیەکی دیکە کەوا سۆزو شەیدایی و خۆشەویستی تۆ بەخشش و میهرەبانی لەو بەدەست دەهێنێت، ڕق و کینەش ئەوا خەڵات و بەخشش بەدەست دەهێنێت، جا کەسی میهەربان هیچ ئەزیەت و ئازارێکت پێناگەیەنێت، کەسی ڕق و کینەش چاوەڕوانی و پێشبینی هەموو شتێکی لێ دەکرێت.

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان پێشبڕکێ و بەخیلی و حەسادەت )

جیاوازی لەنێوان بەرەکانێ و پێشبڕکێ وە حەسادەت و بەخیلی: کەوا پێشبڕکێ دەستپێشخەریەکە بۆ تەواوکاری و جوانکاری کەوا ئەوەی لەبەرامبەر تۆ دەیبینیت جا پێشبڕکێی لەگەڵدا دەکەیت تاوەك دەیگەیتێ یاخود پێشی دەکەویت جا ئەمەش لە شکۆمەندی دەروون و بەرزی هیمەت و توانایەو گەورەی توانینە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَفِي ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ﴾(المطففين:٢٦)، واتە: ((جا لەپێناوی ئەوەدا با پێشبڕکێ کەران پێشبڕکێ بکەن ))، وە لە بنچینەشدا لەسەر شتی بەنرخ و گران بەها دەکرێت کە پەیوەستە بە دەروونەکان بە داواکردن و ئارەزوو کردن ، جا لەوکاتەدا دوو دەروون پێشبڕکێی یەکتر دەکەن وە لەوانەیە دڵخۆش بیت ئەگەر تێیدا بەشداریت کرد هەروەك هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەچاکەو کاری خێردا پێشبڕکێیان دەکرد، هەندێکیان دڵخۆش دەبوون بە بەشداری کردنی هەندێکیان لە هاوەڵەکانیان، بەڵکو لەگەڵ پێشبڕکێ کردنیان لەگەڵیەکتردا دڵ و دەروونیان لەگەڵ یەکتر پووخت و خاوێن دەبوو، ئەمەش جۆرێکە لە پێشبڕکێ ، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ﴾(البقرة:١٤٨)، واتە:(( دەی ئێوەی موسڵمان پێشبڕکێ بکەن لە چاکەکاندا))، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿سَابِقُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ

﴾(الحديد:٢١)، واته: (( پێشبڕكێ بكەن بۆ بەدەست هێنـانی لێخۆشـبوون لەلایـەن پەروەردگارتانەوە بەدەست هێنانی ئەو بەهەشتەی کـە پانتاییەکـەی وەك پانتـایی ئاسمان و زەویە)).

عومەری کوڕی خەتاب پێشبڕکێی لەگەڵ ئەبوبەکر دەکرد هیچ کات سـەرکەوتوو نەدەبوو لە پێشبڕکێ کردنیدا ، جا کاتێك زانی پێشەوایەتی وەرگرت عومـەر پێـی ووت : سوێند بـەخوا هـەرگیز لـە هـیچ شـتێکدا پێـشت ناکـەوم[٣٥٤]، دەڵێـت : سوێندبەخوا هـەرکاتێك پێـشبڕکێم لـە خێـرو چـاکەدا لەگەڵـدا کردبێـت ، تـەنها بینیومە تۆ لەم کارە پێشم کەوتویت[٣٥٥].

هەردوو پێشبڕکێکەرەکان وەك دوو بەندەن لە نێوان دەسـتی پـیرۆزی گەورەکـەیانن کەوا یارمەتی یەکتر دەدەن و پێشبڕکێی یەکتریش دەکەن لە قایل بوون وڕەزا بوونی خوای گەورە وە پێشبڕکێ دەکەن بۆ سەلماندنی خۆشەویستیان بـۆ پـەروەردگاریان ، جا گەورەکەیان کە پەروەردگارە سەری سوڕدەمێنێ لەو کارەی دەیکـەن و هانایـان دەدات لەسەریدا ، وە هەریەکە ئەوی دیکەی خۆش دەوێت و هـانی دەدات لەسـەر ڕەزابوونی گەورەکەی کە پەروەردگارە.

بەخیلیش بوونەوەرێك و دەروونێکی زەمکراوە وەکەسێکی سـوکی کـەوتووە ، وە هیچ پێداگیری و هانـدانێکی نیـە بـۆ خێـرو چـاکە ، هـەموو کـات حەسـادەت و بەخیلیەکەی لەوەدایە کەوا یەکێك خێرو چاکەیەك بەدەست دەهێنێت وە سـتایش و سوپاسگوزاری دەکرێت بەبێ ئەو سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، ئاواتە خـوازە ئـەو دەسکەوتەی لە کیس بچێت بۆ ئەوەی تاوەکو لەگەڵیدا یەکـسان نـەبێت، هـەروەك خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَدُّوا لَـوْ تَكْفُـرُونَ كَمَـا كَفَـرُوا فَتَكُونُـونَ سَوَاءً﴾(النساء:٨٩)، واته: (( "ئەو دوو ڕووانە" ئاواتە خوازن کە ئێوەش بێ باوەڕ

(٣٥٤) سنن أبي داود :(١٦٧٨).

(٣٥٥) مسند احمد : ٢٦/١.

بن وەك خۆیان کە بیّ باوەڕ بوون ئەو کاتە (هـەردوولاتان) یەکسان دەبـن لـە بـیّ باوەڕیدا))، هەروەها خوای گەورە دەفەرمویّت: ﴿ (وَدَّ كَـثِيرٌ مِـنْ أَهْـلِ الْكِتَـابِ لَـوْ يَرُدُّونَكُمْ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَداً مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُـمُ الْحَقُّ ﴾(البقرة:١٠٩)، واتە: (( زۆریّك لە خاوەن کتیّبەکان ئاواتەخوازن لەبەر حەسـوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکریّت بتانگیّڕنەوە ریّزی بـیّ بـاوەڕان ئەمـەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستیتان بەتەواوی بۆ ڕوون بۆتەوە ))، جـا ئینـسانی بـەخیلیش دوژمنی نازو نیعمەتە ئاواتە خوازە لەناو بچیّت هەروەك ئەو لەدەستی دەرچوو.



## ( لەبارەی جیاوازی نیّوان خۆشەویستی دەسەلاّت وە خۆشەویستی پیّشەوایەتی )

جیاوازی لـە نیّـوان خۆشەویـستی دەسـەلاّتداری و خۆشەویـستی پیّـشەوایەتی بـۆ بانگەوازی کردن بۆلای پەروەردگار بریـی تیـە لـە جیـاوازی نیّـوان گـەورەو بـەرز ڕاگرتنی دەروون و کۆشش کردن لەچارەنووسیدا، لەبەرئەوەی دلّسۆز بوون بۆ خـوای بەرزو بەتوانا و خۆشەویستی بۆی پیّویستە گویّرایەلّی بکریّت و ملکەچی نەکـەیت، ووتەو فەرمایشتی خوای گەورە، لەسەرووی هەموو شـتیّکەوە بیّـت، وە ئـاینییش هەمووی بۆ خوای گەورە بیّت وە پیّویستەبەندەکان فەرمان بە چاکەو دوورخستنەوە لە خراپەو تاوان ئەنجام بدەن، وە بۆ ئەمەش خوای گەورە بەندەکانی خـۆی ئەوانـەی تایبەتی کردوون بۆ دەروونی خۆی وە لە دابەزاندنی قورئانەکەیدا سوپاسی کـردوون و پیای هەلّداون، باشترین پاداشتیان دەداتەوە ئەوەی پیّیان دەگات و وە بە باشترین کارو کردەوەی چاك وەسفیان دەکات ، پاشـان دەفـەرمویّت: ﴿وَالَّـذِينَ يَقُولُـونَ رَبَّنَـا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُـرَّةَ أَعْـيُنٍ وَاجْعَلْنَـا لِلْمُـتَّقِينَ إِمَامـاً﴾(الفرقـان:٧٤)،

واتە: ((ئەوانەش کە دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران ونەوەکانمان کەسانێکمان پـێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕوونامی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمانکە بـە پێـشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان)).

جا پرسیاریان لێ بکەن کەوا بەرچاویان ڕوون دەبێتەوە بە گوێڕایەڵی هاوسەرەکانیان شادمان وناسك بێت بە شوێن کەوتنی لەخوا ترساوان لەسەرگوێڕایەڵی و بەندایـەتی کردنی ، لەبەر ئەوەی پێشەواو ئەوانەی لە دواوەیدان هاوکاری یەکتر بۆ گوێڕایـەڵی و خواپەرستی بێگومان پرسیاری لێ بکەن، لەوەی چاوەڕێی چی لـە خـوا ترسـاوان دەکەن تەنها لەسەر ڕەزابـوونی خـواو ملکەچـی ئەودایـە ، وە ئەمـەش بانگـەواز کردنیانە بۆلای پەروەردگار، بە پێشەوایەتی لەئاییندا کەوا بنچینەکەی سەبرو ئارام گرتن و دڵنیایە، هەروەك خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَـا مِـنْهُمْ أَئِمَّـةً يَهْـدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾(الـسجدة:٢٤)، واتە: (( پاشـان کە نـەوەی ئیسرائیل خۆگری و ئارامیان کردە پیـشەیان کردمـانن بەپێـشەواو دەسـەڵات پـێ بەخشین ، ئەوکاتە دڵنیایی و بڕوایەکی تەواو هەبوو بە ئایەتەکانی ئێمە)).

❊❊❊

## ( لەبـارەی جیاوازی نێوان خۆشەویستی لە پێنـاوی خوا و خۆشەویستی لەگەڵ خودا )

جیاوازی لە نێوان خۆشەویـستی لـە پێنـاوی خـوا وە خۆشەویـستی لەگـەڵ خـوا، ئەمەش لە گرنگترین جیاوازیەکانە هـەموو کەسـێك پێویـستی پێیـەتی ، بـەڵکو پێویست و ناچارە بۆ جیاوازی کردنی نێوان ئـەم و ئـەو دا ، جـا خۆشەویـستی لـە پێناوی خوا بریتی یە لـە تـەواوی ئیمـان و خۆشەویـستیش لەگـەڵ خـوداو بریتیـە لەدەست نیشان کردنی هاوبەشی دانانە بۆ خوای گەورە وە جیـاوازی لـە نێوانیـان :

کەوا خۆشەویستن لە خۆشەویستیدا شوێن کەوتنە بۆ خۆشەویستی خوا ، جا ئەگەر شتێکی خۆش ویست کەوا خوای گەورەو پیاو چاکەکانی خۆشیان دەوێت ئەوا ئەو خۆشەویستیەبۆ ئەوە لەوانە وەك پێغەمبەرەکان و نێردراوەکانی و فریشتەکانی وە پیاو چاکەکانی خۆش دەوێت و لەبەر ئەوەی خوای گەورە خۆشیان دەوێت، ڕقیشی لەو شتانە دەبێتەوە کەوا خوای گەورە ڕقی لێیانە.

ئەمەش بە پێچەوانەی خۆشەویستی لەگەڵ خوایە جا ئەمەش دوو جۆرە: جۆرێك لەبنچینەی یەکتا پەرستیدا تانەو تەشەر دەکات، ئەمەش شیرك و هاوبەشی پەیدا کردنە جۆرێکی دیکە باس لە تەواوی و دڵسۆزی و خۆشەویستی خوا دەکات، وە ئەمەش لەئاینی ئیسلام دەرناچێت.

جۆری یەکەم : وەك خۆشەویستی کافرەکان بۆ بتەکانیان و گەورەکانیان ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ﴾(البقرة:١٦٥)، واتە: (( لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایەندا" هەندێك کەس هەیە لە جیاتی ئەوەی خوای پەرست بێت شتانی تر دەتاشێت بۆ خۆی و خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆڵکەو تولە ڕێگایانە و خۆشی دەوێن وەکو چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت )). وە ئەو کافرانە بت و خوایەکانیان و سەنەمەکانیان خۆش دەوێت لەگەڵ خوا هەروەك خوایان خۆش دەوێت ، جا ئەو خۆشەویستیە بریتی یە لە هاوبەشی دانان بۆ خودا کەوا خوای گەورە لێیان خۆش نابێت.

ئیمانیش تەواو نابێت تەنها بە دوژمنایەتی کردنی ئەوبتانەو ڕق لێبوونەوەیان بە خۆیان و خاوەنەکانیان و دوژمنایەتی کردنیان و شەڕکردن لەگەڵیاندا، وەبۆئەمەش خوای گەورە گشت پەیامبەرەکانی ناردووە، وەهەموو کتێبەکانی دابەزاندووە، ئاگری دۆزەخیشی بۆ خاوەن ئەو هاوبەش پەیداکردنانە درووست کردووە،

بەهەشتیشی دروست کردووە بۆ ئەوانەی شەڕ دەکەن لەگەڵ خاوەنی ئەو بتانە و لـە پێناوی ئەودا دژایەتیان دەکات و بۆ ڕەزابوونی پەروەردگاری خۆی.

جۆری دووەم: خۆشەویستی بۆ ئەو شتەی کـەوا خـوای گـەورە ڕازاندوویەتیـەوە بـۆ دەروونەکان لە ئافرەت و منداڵ و زێـڕو زیـو و ئەسـپ سـواری و نـازو نیعمـەت و کشتوکاڵ، جا خۆشی دەوێت بە خۆشەویستنێکی ئارەزوو مەندانە وەك خۆشەویـستی کەسی برسی بۆ خواردەمەنی، و کەسی تینوو بۆ ئاو، جا ئەم خۆشەویستیەش سـێ جۆرە : جا خۆشەویسترینیان بۆ خوا ئەو کەسەیە بەو کارە پێی بگـات ، وەپـشت و پەنای بێت لەسەر ڕەزابوون و گوێڕایەڵی و ملکەچی بـۆ زاتـی خـوا وەسـتانیش و سوپاسگوزاری لەسەری بکات جا ئەمەش لە بەشـەکانی خۆشەویـستیەبە گەیـشتن پێی و لەزەت و خۆشەویستی پێیەوە دەبینێت، ئەمەش حاڵی تەواوترین بوونەوەرە کەوا ئافرەتی لـەلای خۆشەویـست کـردووە [٣٥٦]. کـارو کـردەوەی باشیـشی لـەلا خۆشەویست کردووەو خۆشەویستیشی بۆ ئەو دووانە یارمەتیدەرێکـە بـۆی لەسـەر خۆشەویستی خوا، گەیاندنی پەیامەکەی هەڵـسان بـە جـێ بـەجێ کردنـی کـارو فەرمانـەکانی، وە لـە ڕاسـتیدا خۆشەویـستی بـۆ هیـواو ئـاوات وئارەزووەکـانی کارنەکاتە سەر خۆشەویستی خواو ڕەزابوونی.

یەکەمیان: خۆشەیستی پێشینەکانە.

دووەمیان: خۆشەویستی مەبەست و ئامانجەکانە.

سێ یەمیان: خۆشەویستی ستەمکارانە.

***

(٣٥٦) مسند أحمد : ١٠٨/٣.

( لەبارەی جیاوازی نێوان پشت بەستن وە نەکردن دا )

جیاوازی لە نێوان پشت بەخواوە نەکردن و ئەنجام نەدان: کەوا پشت بەستن بەخوا کردەوەی دڵە وە بەندایەتی کردنە بۆ خوای گەورە متمانەو باوەڕیشی لەسەر پەروەردگارە وەبڕوای پێیەتی و پەنا بۆ ئەو دەبات، و دەسەڵاتی تەواو بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، ڕازیە بەوەی پێویستیەتی وەزانینی کەوا خوای گەورە پشت و پەنایەتی هەڵبژێریت بەبەندەی خۆی ئەگەر دەسەڵاتی پێدا، لەگەڵ هەڵسانی بە جێبەجێ کردنی هۆکارەکان کەوا پێی سپێردراوە، کۆشش دەکات بۆ بەدەستهێنانی پێغەمبەریشﷺ گەورەترین کەس بووە کەوا پشتی بە خوا بەستووە، بۆ ئومەتەکەی خۆی زرێ وقەڵغانی لەبەر کردووە [٣٥٧]بەڵکولەڕۆژی ئوحود دا لە نێوان دوو قەڵغاندا دەرکەوتووە[٣٥٨]، وە سێ جار لە ئەشکەوتدا خۆی شاردۆتەوە[٣٥٩] ئەو بۆ هۆکارێك پشتی بە خوا بەستووە نەك لەسەر هۆکارێك.

بەڵام نەکردن و ئەنجام نەدان بریتی یە لە یەك خستنی هەردوو فەرمانەکە یاخود یەکێکیان، یان هۆکارەکە یەك دەخات لەبەر ئەنجام نەدان و نەکردنی، وا دادەنێت کەوا ئەو پشت بەستنە، سوێندبەخوا ئەمە سستی و کەم تەرخەمیە، یان کەوا هەڵدەستێت بە هۆکارێك بۆی بڕوانێت متمانەی لەسەر بێت لەبارەی هۆکارە غافڵ و بێ خەبەر بێت ، دڵی بەتەواوی پەیوەست نەبێت پێیەوە بەجۆرێك دڵی لەگەڵ خوادا بێت و لاشەکەشی لەگەڵ هۆکارەکەش دابێت جا ئەمە پشت بەستنەکەی سستی و کەم تەرخەمیە و کەم تەرخەمی و نەکردنەکەشی پشت بەستنە.

ئەمەش بابەتێکە خەڵکی تێیدا دابەش بووە بەدوو بەش وەبەشێکی ناوەڕاستیش:

---

(٣٥٧) السيرة النبوية : ٦٧/٣ ، مسند أحمد : ٢٥١/٣..

(٣٥٨) مسند أحمد : ٤٤٩/٣ ، و ابن ماجة (٢٨٠٦).

(٣٥٩) فتح الباري : ٢٧٢/١٠.

بەشی یەکەم: هۆکارەکانی لەکار خستووە پاراستنێکە لەسەر تەوەکول و پشت بەستن.

بەشی دووەم: متمانەو پشت بەستنەکەی لەکار خستووە پاراستنێکە لەسەر هۆکارەکە.

بەشی ناوەڕاست: زانراوە کەوا ڕاستی پشت بەستنە کە تەواو نابێت تەنها بە هەڵسان بە هۆکارەکە، جا پشت بەستن لەسەر خوای گەورە لەهەمان هۆکارە.

بەڵام لەبارەی لەکارخستنی هۆکارەکە وا دابنێیت کەوا پشتی بەستووە جا ئەوە لەخۆبایی یە هەڵخەڵەتاوە ئاواتە خوازە، وەك ئەو کەسەی مارەکردن و خۆشەویستی وپیاوەتی لەکاربخات، و پشت ببەستێت لەبەدەست هێنانی منداڵ، وە زەوی کێڵان و تۆ کردن پشت گوێ بخات و پشت ببەستێت لە بەدەست هێنانی کشتوکاڵ و چاندن وە خواردن و خواردنەوە لەکار بخات و پشت گوێی بخات وە پشت ببەستێت و متمانەی هەبێت لە دەستکەوتنی تێری و ئاودێری .

ئەگەر هەموو ئەمانەت لێ وون بێت وشاراوە بێت جا تۆ لە کوێت زانیوە کەوا ئەمانە وەکو بەخشش قەدەری تۆ بێت بەبێ کۆشش و بەبێ ماندوو بوون؟

جا لەچەند شتێکا تۆ کۆششت کردووە وە هەوڵت بۆ داوە کەچی ئەم شتە بۆ یەکێکی دیکە جگە لەتۆ، وە ئایە چەند شتێکیش کەکەسێکی دیکە هەوڵی بۆداوە وە کۆششی کردووە کەچی ڕزق و ئازووقەکە بۆتۆ بووە.

جا ئەگەر ئەمەت بە ئاشکرا بینی جا چۆن زانیوتە کەوا ڕزق و ڕۆزی تۆ هەموو بە هەوڵ و کۆششی دیکە بووە؟ وە هەروەها ئەمەیەکە دەروون بۆتۆی هێناوە پێویستە دەری بکەیت لەهەموو هۆکارەکاندا لەگەڵ هۆکارەکانیدا تاوەکو لە هۆیەکانی چوونە بەهەشت و ڕزگاربوون لە ئاگردا، ئایە متمانەو پشت بەستن لەسەر تەوەکول یەکی خستووە یان لەگەڵ تەوەکول هەڵسو کەوتی پێدەکات؟

بەڵکو زەوی چۆڵ نابێت لەپشت بەستوویەك کەوا دەروونی ئارام بێت بۆ خوای گەورە وە دڵیشی پڕ بێت لە متمانە پێی و تکاو پاڕانەوە لێیی و نیەت پاکی بۆ ئەوە لەگەڵ ئەوەش دڵی تەنگ بووە لەبارەی دەست پێکردنی هەندێك هۆکار، دڵی ئارام و جێگیر دەبێت بۆ پەروەدگار وە لێی دڵنیا دەبێت، باوەڕی پێیەتی، ئەمەش لە بەهێزترین هۆکارەکانی دەستکەوتنی ڕزق وڕۆزی ئەو بووە، جا هۆیەکە پەك ناخات ، لە ڕاستیدا ڕەغبەت و ئارەزووی لە هۆیەك بۆ هۆیەکی بەهێزتر لەو دەچێت ، جا پشت بەستن و متمانە لەلای ئەو لە باوەڕترین هۆکارەکانە ، جا خەریك بوونی دڵی بەخوای گەورەو سەقامگیری بۆ لای ئەو وە ملکەچی بۆ ئەوخۆشەویستترە لە خەریك بوونی بە هۆکارێك قەدەغەی بکات لەو کارەدا یاخوود لە تەواو کردنی ، جا دڵی فراوان نابێت بۆ فەرمان و کردەوە ، جا یەکێکیان بەرهەڵستی ئەوی دیکەیان دەکات.



## ( لەبارەی جیاوازی نێوان پارێزی وە وەسوەسە )

جیاوازی لە نێوان پارێزی وەسوەسە: پارێزی و خۆپاراستن لێکدانەوەو هەڵسەنگاندن و زیادە ڕۆییە لە شوێنێکی ووتنی سوونەت دا کەوا پێغەمبەرﷺ و هاوەڵەکانی لەسەر ئەو ڕێبازە بوون بەبێ زیادە ڕۆیی و لە ڕاو دەرچوون و کەمتەرخەمی و گوێ پێ نەدان ، جا ئەمە ئەو خۆپارێزیەیە کەوا خواو پێغەمبەرەکەی لێی ڕازین .

بەڵام وەسوەسەو دوو دڵی و گومان ئەمە دۆزینەوەو داهێنانێکە کەوا سوونەتی پێنەهاتووە و پێغەمبەری خواشﷺ و هیچ لە هاوەڵەکانی ئەم کارەیان نەکردووە وا دادەنێت کەوا بەو کارە دەگات بە دەستکەوتنی پرۆژەکە، وا دەزانێت خوا پارێزی دەکات و لەکاتی دەستنوێژ هەڵگرتندا ئەندامەکانی زیاتر لە سێ جار

دەشوات ، ئاو زیادلە ڕادەی خۆی سەرف دەکات و بەفیڕۆی دەدات لـەکاتی دەسـت نوێژو خۆشوستندا، لەکاتی دامەزراندنی نوێژەکەی بەدەنگی بەرز زیاتر لـە جارێـك وتەکان دووبارە دەکاتەوە وە جل و بەرگی دەشوات و هێشتا دڵنیا نیە لـەوەی لـە پیسیەکە پاك بۆتەوە ، جا لە ڕێنماییەکانی پێغەمبەریشﷺ دوریایی و پـارێزی هەبوو، بەڵام نەك پێـچەوانەی سـوننەت بێـت و لـە سـنووری پـارێزی و ووریـایی دەربچێت.



## ( لەبارەی جیاوازی نێوان سرووشتی خوایی وە هەڵدانی شەیتان )

جیاوازی نێوان سرووشتی خوایی وە هەڵدانی شەیتان لەچەند ڕوویەکەوەیە:

لەوانــە ئەگــەر ڕێکــەوت بــوو خــوای گــەورە بــۆ ڕەزا نــەبوونی ئــەو، ئــەوەی پێغەمبەرەکەی لەگەڵ خۆی هێناویەتی ، جا ئەوە لە خواوەیە، وە ئەوەی دیکە کـە ڕێکەوت نەبێت بۆ ڕەزابوونی خوای گەورە ئەوا لە هەڵدانی شـەیتانەوەیە لەوانـەش ئەوەی بێتەبەر لە سەوداسەری و بەختیاری لەسەر خوای گەورە و ڕووکردنە لای ئەو وە تۆبەکردن لە زاتی ئەو ئا ئەمە لە سرووشتی و هەڵدانی خوداوەیە، وە ئەوەیـشی بێتە بەر لە دژی و پێچەوانەی ئەمە ئەوا لە هەڵدانی شەیتانەوەیە.

لەوانەش ئەوەی ببێتە هۆگری و ڕووخۆشی و نوورێك لە دڵدا وەببێتە هـۆی فـراوان بوون لەناو سینەدا ئەمە لە سرووشـتی خودایـیـە، وەئەوەیـشی ببیـێتـە هـۆی دژی ئەمانە ئەوە لەشەیتانەوەیە.

لەوانەش کەوا ببێتە هۆی سەقامگیری و دڵنیایی و لە ناو دڵ و سـینەدا ئـەوا لـە خوداوەیە ، و ئەویشی ببێتە هـۆی شـێواوی و بێـزاری و شـپرزەیی ئـا ئەمــە لـە شەیتانەوەیە .

جا سرووشتی خوایی لە دڵە پاك و سازگارو پوختەكاندا زیاد دەكات كەوا بە نووری خوا رووناك بۆتەوە، جا بۆ خوایش گەیاندن هەیە، وە لە نێوان خۆی و خوای گـەورە رووداوو هۆیەك هەیە وە گونجاوە لەبەر ئەوەی دڵێكی پاك و خاوێنە جا دڵێكی پاك و گونجاوی وەك ئەو نەبێت دراوسێی نابێت، بەڵام دڵێكی تاریك كەوا تاریك و رەش بووە بە دووكەڵی هەواو هەوەس و ئارەزوو و گومانەكان ، جـا هەڵـدانی شـەیتان و بەڵاو كارەساتەكەی پێی گەورەترە لەبەڵاو كارەساتەكەی خوای گەورە .

* * *

## ( لە بارەی جیاوازی نێوان پاشەكەوت و ئابووری و كەمتەرخەمی )

جیاوازی نێوان پاشكەوت و كەمتەرخەمی: كەوا پاشكەوت كردن بریتیە لە ناوەندو ناوەڕاستی نێوان هەردوو بەشی زیادە ڕۆیی و كـەم تەرخـەمی و دەسـت گرتنـەوە، ئـەو دوو بەشـانەش دژی ئـەوانن ئەمانـەش: كـەم تەرخـەمی و زیادەڕۆییـە، جـا مەبەستەكەش وەرگرتنی ناوەڕاستەكەیە بە دادوەری لە نێوان هەردوو بەشەكە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنْفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَاماً﴾(الفرقـان:٦٧)، واتە: (( هەروەها بەندەكانی خوا ئەوانەن كە : كاتێك ماڵ و سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەكەن نەزیادە ڕۆیی تێـدا دەكـەن و بەزایـەی دەدەن نەدەست نوقاوو ڕەزیلن ، بەڵكو لەو نێوانەدان (مام ناوەندین و لەشتی بە سـوود دا بەكاری دێنن) )).

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ﴾(الإسـراء:٢٩)، واتە: (( نەكەیت ئەوەندە دەست نوقاوبیت وەك ئەوەی كە دەستی بە كۆت و زنجیر بەگەردنیدا هەڵواسرابێت، هـەروەها ئەوەنـدەش دەسـت بڵاو مەبـە "هیـچت بەدەسـتەوەنەمینێت")), وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿وَكُلُوا

وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا ﴾(الأعراف:٣١)، واته: (( بخۆن و بخۆنەوە لە نازو نیعمەتەکان بەڵام زیادەڕۆیی مەکەن )).

ئاینییش هەمووی لە نێوەندی ئەو دوو شتە دایە ، بەڵکو ئیسلامیش مەبەست و ئامانجێکە لە نێوان بێزاری و وەرسیدا، وە سوننەتیش نیازو مەبەستێکە لەنێوان بیدعەو داهێنراودا ، ئاینی خواش لە نێوان زیادەر ڕۆیی و دەست نوقاوو ووشکیدایە.



## ( لەجیاوازی نێوان ئامۆژگاری وە سەرزەنشت کردن )

جیاوازی نێوان ئامۆژگاری و سەرزەنشتکردن: ئامۆژگاری چاکەکردنێکە بۆ ئەو کەسەی بەشێوەی بەزەیی ئامۆژگاری دەکات و شەفەقەت و پەرۆشی بۆیەتی جا ئەمەش چاککردنێکی پوخت و پاراوە لە ڕەحمەت و نەرم و نیانی دەردەچێت ، مەبەستی ئامۆژگاری کارەکەش تێیدا ڕەزابوونی خوایەو چاکە کردنە بۆ بوونەوەریەکەی ، جا نەرم و نیانی لە تێکۆشان و خەبات کردنەکەیدا ئەوپەڕی میهرەبانیە.

بەڵام کەسی سەرزەنشتکەر بریتیە لە پیاوێك مەبەست و ئامانجەکەی هێماو ڕوونکردنەوەو ڕیسوا کردن و زەم کردن بێت لەسەر زەنشت کردن و جنێو پێدانی لە شێوەی ئامۆژگاری کردنیدا .

لە جیاوازی نێوان کەسی ئامۆژگارو سەرزەنشتکار ، ئەوا کەسی ئامۆژگار دوژمنایەتیت ناکات ئەگەر ئامۆژگاریەکەت لێ وەرنەگرت وە دەڵێت من کرێ وپاداشتەکەم لەسەر خوایە ئەگەر وەری بگریت یاخود وەری نەگریت وەبە ئاشکرا

شتەکانت پێ دەڵێت و باس و عەیبەکانت ناکات و ئاشکرای ناکات : وەکەسی سەرزەنشتکاریش پێچەوانەو دژی ئەمەیە.



**( لەبارەی جیاوازی نێوان دەستپێشخەری وە پەلەکردن )**

جیاوازی لەنێوان دەست پێشخەری و پەلەکردن: کەوا دەستپێشخەری بەدوای گەڕانی فرسەتێکە لەکاتی خۆی ، وە وازی لێ ناهێنێت هەتا ئەگەر داواکاریەکەشی بەسەرچوو بێت ، جا ئەو داوای کاروبارەکان ناکات لە کاتی بەسەرچوونی وە نە پێش هاتنی کاتەکەی ،بەڵکو لەو کاتەی کە کاتەکەی ئامادە دەبێت ئەوا دەست پێشخەری دەکات ، وە پەلاماری دەداتێ وەك هێرش کردنی شێر بۆسەر نێچیرەکەی ، جا ئەمەش هاوشێوەی ئەو کەسەیە کە دەست پێشخەری بکات بۆ دەست کەوتنی بەروبوومەکەی لە کاتی پێشگەیشتنی و هەستکردنی.

پەلەکردنیش داواکردنی شتێکە پێش هاتنی کاتەکەی ، ئەمەش لەبەر توندی و زۆری تامەزرۆبوونی شتەکەیە بۆ دەستکەوتنی وەك ئەوەی کەسێك بەروبومێك بسەنێت پێش پێگەیشتنی ، جا دەست پێشخەریە مامناوەندیەکە لە نێوان دوو بوونەوەری زەمکراو یەکێکیان کەمتەرخەمی و لەدەست چوونە وە دووەمیان پەلەکردنە پێش هاتنی کاتەکە، وە لەبەر ئەمە پەلەکردن لە شەیتانەوەیە، لەبەر ئەوەی لاساری و هەڵەشەیی یە لە بەندیەکدادایە قەدەغەی دەکات لەسەر سەقامگیری و دڵنیایی و شکۆمەندی، وای لێدەکات شتەکان لە شوێنی نەگونجاو دابنێت ، وە ڕای دەکێشێت بۆ جۆرەها شەڕو تاوانکاری ، وە قەدەغەی دەکات لە جۆرەها خێرو چاکەکردن.



**( لەبارەی جیاوازای نێوان هەواڵدان بە باروگوزەرانی وە سکاڵاکردن )**

بۆ جیاوازی لەنێوان هەواڵ گەیاندن و سکاڵاکردن: لە ڕاستیدا هەردوو وێنەو بابەتەکە لەیەك دەچن کەوا هەواڵ گەیاندن و زانیاری لەسەر حاڵ و گوزەران مەبەستی هەواڵ دارەکە پێی هەواڵێکی یاخوود مەبەستێکی درووستە لەبارەی زانینی هۆکاری ناڕەزایی دەربڕین یاخود داوای بەخشین و لێبوردن بۆ برایەکەی لەو شتەی داوای لێکردووە ، یاخود ئاگاداری دەکاتەوە لە ڕووداوی لەو جۆرە کەوا ئەو تێیکەوتووە ، یاخود دەبێتە ئامۆژگارکارێك بە هەواڵ گەیاندنی یاخود سەبرو ئارامی دەداتێ لەو ناخۆشییەی تووشی هاتووە ، هەروەك لەبارەی ئەحنەف باسدەکرێت کەوا پیاوێك هاتە لای و سکاڵای خۆی لەلای کرد جا ووتی : ئەی کوڕی برام لە ڕاستیدا من ماوەی ساڵێکە ڕووناکی لە چاومدا نەماوە تاوەکو ئێستا بەهیچ کەسێکم نەووتوە جا لەناو ئەو هەواڵەدا لەبارەی هەڵگرتنی خەم و خەفەتی سکاڵاکەرەکەیە لەسەر سەبرو ئارامی یە لەوەی بە بیری هەواڵ پێدەرەکە بێنێتەوە ، لەوانەیە لەبارەی ئەو فەرموودەی پێغەمبەرەﷺ فەرمووی: ((بل وأنا ورأساه)) [٣٦٠]، واتە: (( بەڵکو من ئای سەرم)) بە مانای : ئەو ژانە سەرە بەهێزەی لە مندایە من بەبێ تۆ خەم و خەفەت دەخۆم جا سکاڵا مەکە.

ئەوەی بۆم دەرکەوتووە مانایەکی دیکەی تێدایە ، ئەویش ئەوەیە کەوا عائیشە خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بووە، بەڵکو خۆشەویسترین خێزانیشی بووە ، جا کاتێك سکاڵای بۆلای ئەو هێناوە لەبارەی ژانی سەری پێغەمبەریشﷺ خەبەری دایێ کەوا هەمان ئێش و ژانیش لەسەری موبارەکی ئەودایە ، وە ئەمەش مەبەست و زانیاری ڕێکەوتنە لە خۆشەویستێکەوە بۆ خۆشەویستیەکەی تووشی ئێش و ژان دەبێت بە ئێش و ژانی ئەو دڵخۆشیش دەبێت بە دڵخۆشی ئەو ، هەتا

(٣٦٠) ابن ماجة : (١٤٦٥).

ئەگەر خۆشەویستەکەی ئەندامێك لە ئەندامەکانی ژان بکات ئەوا خۆشەویستەکەی دیکەی هەمان ئەندامی ژان دەکات، وە ئەمەش لە ڕاستگۆیی خۆشەویستی و دەروون پاکی و بەزەییە .

بەڵام سکاڵاکردن هەواڵ گەیاندنێکی ڕووت و نەبیستراوە لەبارەی مەبەستێکی درووست ، بەڵکو چاوگەکەی دەبێتە دڵڕەقی و توونەدو تیژی ، و سکاڵاکردنێکی تاقیکردنەوەشە بۆ ئەوەی دەیکە ، لەبەر ئەوەی سکاڵا بوونی خوای گەورە ئەو سکاڵا بردنە نی یە بەڵکو سۆزو خوو پێوەگرتن و هۆگر بوون و ڕەحك کردنە پێی ، وەك لە فەرمودەی ئەیوب: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾(الأنبياء:٨٣)، واتە: (( بەڕاستی من ئازارو ناخۆشیم تووش بووە ، وە تۆش لەهەموو کەس دڵۆڤان تریت )) وە فەرموودەی یەعقوب: ﴿ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ ﴾(یوسف:٨٦)، واتە: (( بەڕاستی من سکاڵاو غەم و پەژارەم هەر بۆلای خودا دەبەم ))، وە فەرموودەی موسا: پەروەردگارا هەموو سوپاسگوزاری هەر بۆتۆیە ، وە سکاڵاو هانا بردنیش هەر بۆلای تۆیە ، وە هەر تۆش یارمەتیدەرو پشتیوانی ، وەهەر تۆش فریاد ڕەسی و پانگیری دەکرێت، دەستکەوتنیش هەر بەدەست تۆیە ، وە هیچ هێزو توانایەك نیە تەنها بۆتۆ نەبێت.

جا هاناو سکاڵابردن بۆلای پەروەردگار لە ڕوویەکدا پێچەوانەی سەبرو ئالرام گرتن نیە ، لەبەر ئەوەی خوای گەورەو میهرەبان لەبارەی ئەیوب دا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِراً نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾(ص:٤٤) واتە: (( ئێمە بینیمان بە ڕاستی خۆگرو ئارامگر بوو بەندەیەکی چاك و ڕێك پێك بوو بێگومان ئەو تەوبەکاردو هەمیشە دڵی لەلای پەروەردگارە ))، لەگەڵ ئەوەیش سکاڵای بۆ کرد بە هەواڵ پێگەیاندنی وەك فەرموویەتی: ﴿مَسَّنِيَ الضُّرُّ﴾ واتە: (( من ئازارو ناخۆشیم تووش بووە)) وە خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەرەکەی یەعقوب خەبەری داوە: کەوا ئەو پەیمانی لە دەروونی خۆی وەرگرتووە بە ئارامگرتنێکی جوان، کاتێکیش پێغەمبەر

یەعقوب فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللّهِ﴾ واتە: (( بەڕاستی مـن سكاڵاو غەم و پەژارەم هەر بۆلای خودا دەبەم ))، ئا ئەمـە نـەیكردووە بـە كـەم و كوڕیەك بۆ ئارامگرتنەكەی، جگە لەوەش شتێكی وای نەكرد ببێتە سەر ئێشە بـۆ قەومەكەی، كاتێكیش تووشی ئازارو ناخۆشی بـوو حـەزرەتی ئـەیوب نەیفـەرموو: خودایە ڕەحم پێبكـە، بـەڵكو فـەرمووی: پـەروەردگارا تـۆش لەهـەموو كەسـێك بەڕەحمترو دلۆڤانتریت، جا لەمە زیاتر باسی حاڵی خۆی نەكرد وە خوای گەورە بـەم جۆرە وەسفی كردووە.

هەندێكی دیكەش دەڵێن: لە ڕاستیدا كاتێك سكاڵای ئـازارو ناخۆشـی خـۆی كـرد لەوكاتە بوو كە زوبانی لاواز بوو لە زیكرو یادكردنەوەی خوای گەورە، جا سـكاڵای لای پەروەردگار كرد لەبەر لاوازی یادكردنەوەكە نەك لەبـەر ئـێش و ئـازارو دەردو نەخۆشی.

هەندێكی دیكەش دەڵێن: كە ئەم ووتەی دەربڕیوە بۆ ئەوەی ببێتـە پێـشەنگێك بـۆ لاوازەكـان لـەو ئومەتـەدا، وەك ئـەوە بێـت ئـەو دەربڕینـە كـە سـكاڵای بـۆ لای پەروەردگار بردووە پێچەوانەی سەبرو ئارامگرتنە ، ئەمـەش هەڵەیـەو ناشـرینترین هەڵەشە ، لەبەر ئەوەی سكاڵا كردن و شكایەت كردن پێچەوانەیە بـۆ سـەبر كـردن نـەك سـكاڵاو هانـا بـردن بـۆ پـەروەردگار، جـا خـودای گـەورەش بەنـدەی خـۆی تاقیدەكاتەوە بۆ ئەوەی گوێی لە ملی كەچی و داواو سكاڵا بردن بۆلای ئەو بێت.

***

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان بەندەكانی خوا وە دووژمنەكانی )

ئەمەش بابەتێكە لە جیاوازیە درێژەكێشراوەكانە، كەسی زرنگ و ژیریش بەسە بۆ ئەم بابەتە، ئاینیـشش هـەموو جیاوازیـە، كتێبـی خـواش كـە قورئانـە فـەرق و

جیاوازی لە نێوان خەڵکی باش و خراپ دەکات، هەرکەسێ لەخوا بترسێت ئەوا لـە ناحەقیـەکان جیادەکرێتـەوە: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا إِنْ تَتَّقُـوا اللَّـهَ يَجْعَـلْ لَكُـمْ فُرْقَاناً﴾(الأنفال:٢٩)، واتە: (( ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگـەر تـەقوای خوا بکەن و پارێزگاری بکەن ئەوا خـوا بەرچـاو ڕۆشـنیەکی تـەواتان بـۆ فەراهـەم دەهێنێت، کە بتوانن هەق و ناهەقی بەئاسانی لەیەك پێ جیابکەنەوە)).

ڕۆژی بەدریش ناونرا بە: ڕۆژی جیاکردنەوە، لەبەر ئـەوەی نێـوان بەنـدەکانی خـواو دووژمنـەکانی خـوای جیـاکردەوە، جـا ڕێنـوێنی هـەمووی جیاکردنەوەیـە، وە گومڕاییـش بنچینەکەی کۆبوونەوەیە هەروەك کافرەکانوە لە نێوان خواپەرستی و بت پەرستی و خۆشەویستی پەروەردگارو خۆشەویستی بتەکان، جیای کـردەوەو دیـاری کرد ئەوەی خۆش دەوێـت و ڕەزابـوونی ئـەوی دەوێـت وە لـەنێوان قـەزاو قـەدەرو چارەنووسدا ، ئینجـا کردیانـە یـەك کـارو فـەرمان، بۆیـان دەرکـەوت بـە قـەزاو قەدەرەکەی لەسەر خۆشەویستی خواو ڕەزامەندبوونی پەروەردگار وە لەنێوان ڕیبـاو فرۆشـتندا کۆیـان کـردەوە جـا ووتیـان: ﴿إِنَّمَـا الْبَيْـعُ مِثْـلُ الرِّبـا﴾(البقـرة:٢٧٥)، واتـە:((ئـەوان دەڵـێن: کـڕین و فرۆشـتن وەك سـوو ڕیبـا وایـە ))، وە سـەربڕین و مردارەوەبوویان کۆکردەوەو خستیانە سەر یەك وە ووتیان : چۆن دەبێت شتێك بخـۆن کەوا ئێمە کوشتومانە وە شـتێکیش نـاخۆن کـەوا خـوای گـەورە کوشـتویەتی، وە داماڵراوەکان نێوان حەڵاڵ و حەرامیشیان تێکەڵ کردووە، جا ووتیان : ئەو ئـافرەت خوا درووستی کردووە وە ئو ئافرەتەش خوا درووسـتی کـردووە، وە ئـەو گیانلەبـەر خوا درووستی کردووە وە ئەو گیانلەبەرەش خوا درووستی کردووە، جـا چـۆن ئـەوە حەڵاڵ دەکرێت و ئەوەش حەرام دەکرێت؟

گومـان و شتە لێك چووەکان دەکەوێتە ناو ووتەو دەربڕینەکان و کارو کردەوەکـان و بارو گوزەرانەکان ، وە لەڕاستیدا زیاتر زاناکان لەو شتەدا دەکەونە نـاو گومانـەکان ، جیاکەرەوەی هەق و ناهەقیش دەست ناکەوێت تـەنها بـ[illegible]ـك کـەوا خـوای

گەورە دەیخاتە ناو دڵێك کە ئەو دەیەوێت لە بەندەکانی ئەو کاتە لـە ڕووناکیەکـەی کارو بارە ڕاستەقینەکان دەبینێت ، ئینجا هەق و ناهەقی لێك جیادەکاتەوە: ﴿وَمَنْ لَمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ﴾(النور:٤٠)، واتە: (( بێگومـان ئـەوەی خـوا نووری پێنەبەخشێت، هەرگیز نووری دەست ناکەوێت)).

جیاوازی لە نێوان بەندە چاکەکانی خوای گەورە وە لەنێوان بەندە چاکەکانی شەیتان ، جیاوازی لە نێوان حاڵی ئیمانداریکی خوایی وە حاڵی کەسێکی شەیتانی کـافر و حاڵی دەروون نەخۆشێك .



## ( لەبارەی جیاوازی نێوان باوەڕ کردن بە یەکبوونی پەیامبەران وە یەکبوونی لەکارکەوتووان )

ئێمە کۆتایی بە کتێبەکە دەهێنین بە هێماکردنێکی جوان بـۆ جیاوازیـەکانی ئـەو کاروبارە کاتێك هەر جیاوازیەك لەوانە پێویستی بە کتێبێکـی گـەورە هەیـە ، جـا جیاوازی لە نێوان باوەڕبوون بە بەکریزی و یەکبوونی پێغەمبەران وە بـاوەڕبوون بـە بێ کاران و بێ باوەڕان ، کەوا باوەڕ بوون بە پێغەمبەران ئیسپات کـردو سـەلماندنی تەواوی سیفەتەکانە بۆ پەروەردگار لەهەموو ڕوێکەوە، عیبادەت و پەرستنی بەوەی تاك و تەنهایە و هیچ هاوبەشـێکی نیـە و لەمەسـت و لـە خۆشەویـستی و تکـاو پاڕانەوەو و دەربڕین و سوێند خواردن و نەزرکردندا هیچ هاوبەشێکی بۆ دانانرێت.

بـەڵام بـاوەڕ بـوون بـەبێ بـاوەڕان و لـەکار کـەوتووان ڕاتـسی نـاوە جوانـەکانی پەروەردگارو سیفەتەکانی دووردەخاتەوەو لەکاری دەخـات و پەکیـدەخات ، ئـەوەی لەهەموویان توانای زیاترە لە زوبانیدا لەکاری دەخات و پـەکی دەخـات جـا یـادی خوای پێناکات و تەنها یەك ئایەتیش بـاس ناکـات هـەتا حەدیـسێکیش لـەبارەی

شتێك باس ناكات ، وە ئەگەر نەیتوانی باسكردنەكەی پەك بخات ئەوا پەلاماری دەدات و یادكردنەوەكەی دەوەستێنێت بە هەڵگێرانەوەو لادانی وە دوور خستنەوەو لابردنی ڕاستایەكەی ، وە ناوێكی بەتاڵ و بۆش دادەنێت كەوا نە مانای بۆی هەبێت یاخوود ماناكەی لە ڕەگەزی مەتەڵ و شتی پڕوو پوچ و شتومەك بێت.

مەبەستیش لێی ئەوانە لە ڕاستیدا ناوی ئەو پەكخستنەیان ناوە باوەڕ هێنان بە خوا، لە ڕاستیدا ئەمە گومڕایی و باوەڕنەمانە بەناوە پیرۆزەكانی پەروەردگارو سیفەتەكانی و لەكارخستن بۆ ڕاستیەكانی .



**( لەبارەی جیاوازی نێوان ڕاستگۆیی پێغەمبەران و ڕاستگۆیی بێ باوەڕان )**

جیاوازی نێوان ڕاستگۆیی و داوێن پاكی پێغەمبەران وە ڕاستگۆیی بێ باوەڕان: كەوا خوای گەورە پێغەمبەرانی پاكو بێگەرد ڕاگرتووە لە هەموو كەم و كوڕیەك و نەنگیەك كەوا دەروونی لێی پاك و خاوێن كردەوە، وە ئەوەی دژكارە بۆ تەواوكاری و تەواوی خودایەتی وە گەورەو مەزنیەكەی وەك خەوو بێئاگایی و مردن و شەكەت و هیلاك بوون، وە ستەم و ئیرادەو مەبەستەكەی، و هاوبەش و هاوڕێیەتی و منداڵ و تكاكارو ئەوە بۆی هەیە هەڵیگرێتەوە بەبێ مۆڵەتی ئەو، وازبهێنێت لە بەندایەتی خوای گەورە بە خۆڕایی و پشت گوێ خستن، وا دەبینێت بە خۆڕایی درووست كراون، وابزانێت درووست كردن ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیان دایە هەروا بە نارەواو بەبێ كاری و بەبێ پاداشت و سزاو كردنی چاكەو نەكردنی خراپە درووست كراوە ، وە نێوان پیاوە چاكەكانی خواو پیاوە خراپەكان و دووژمنەكانی یەكسان دابنێت ، وە نێوان بێ تاوانان و گوناهكاران وە نێوان كافران و ئیماندارانیش، وابزانێت كە پەروەردگار پێویستی بە كەسێكی دیكەیە لە ڕوویەك لە ڕووەكان و لەكارو فەرمانەكاندا جگە لەخۆی كەسێكی دیكەش هەیە،

هەروەها پێچەوانەی وەعدو بەڵێنەکانی بێت یاخود قسەو ووتەکانی بگۆڕێت یاخود ناوێکی شەڕ یان وەسفێك یان کردارێکی بۆ بخاتــە ســەر، بــەڵکو نــاوە پیرۆزەکـانی هەمووی نەرم و نیان و میهرەبانن، وسیفەتەکانی هەمووی تەواون و دوورن لە کـەم و کوڕی ، و کردارەکانی هــەمووی خێــرو حیکمــەت و بەرژەوەنـدی یــە جـا ئەمــە ڕاستگۆیی و پاکی پێغەمبەرانە بۆ پەروەردگاریان.



## ( لەبارەی جیاوازی نێوان سەلماندنی ڕاستیەکانی ناوەکان و سیفەتەکان و لێکچووەکان )

جیاوازی نێوان سەلااندنی ڕاستیەکانی نـاوە پیرۆزەکـان و سـیفەتەکان وە لـەنێوان لێکچوون و باسکردن و لاسایی کردنەوەی ئەوەی ئیمام ئەحمەد ووتویــەتی و ئــەوەی پەسەندی کردووە لە پێشەوایانی ڕێنمونی کراوە کەوا لێکچوون و لاســایی کردنــەوە کە بڵێیت : دەستێك وەك دەست من یــاخود بیــستنێك وەك بیــستنی مــن یــاخود بینینێك وەك بینینی من وە نموونەی ئەمانە، بەڵام ئەگەر وتــت: بیــستن و بیــنین و دەستێك و ڕوخسارێك وە ئیستوایەك بۆ سەر عەرش هیچ پێی ناچێت و لەو ناچێت لە سیفەتی درووستکراوەکان ، بەڵکو لــەنێوان سـیفەتێك و ســسفەتێکدا جیــاوازی هیە هەروەك لە نێوان باسکراوو باسـکردنێکی دیکــە جیــاوازی هەیــە ، جـا ئایــە لێکچوون و لاسایی کردنەوەوەیەك لێرەدا هەیە؟

ئایە چ لێکچونێك هەیە تەنها ئەگەر تێهەڵکێشانی بێ باوەڕان نەبێت؟

جا مەدارو خولگەی ڕاستی کەوا پێغەمبەران لەســەری ڕێککــەوتن لەســەر ئــەوەی کەوا وەسفی خوای پێدەکات بەوەی خوای گەورە خۆی وەسفی پێدەکات ، وە بەوەی پێغەمبەرەکەی وەسفی پێکردووە بەبێ لادان و پەك خستنێك ، و بەبێ لێکـچوون

و لاسـایی کردنەوەیـەك، سـەلماندنی سـیفەتەکان وە دوورخـستنەوەی لێکـچوو درووستکراوەکان .

جا هەرکەسێك خوای گەورە بە درووستکراوێك بچوێنێت ئـەوا کـافر بـووە ، هـەر کەسێك ئەو ڕاستیانەی کە خوای گەورە وەسفی خۆی پێدەکات بەدرۆ بخاتـەوە ئـەوا کافر بووە ، و هەر کەسێك ڕاستیەکانی ناوە پیرۆزەکان و سیفەتەکانی بۆ سـەلماندن و جێگیری کردەوەو دروستکراوەکانی دوورخستەوە لە لێکچوونی خوای گەورە ئەوا خوای پەروەردگار ڕێنمایی کردووە بۆ ڕاستە ڕێی دروستی ئیسلام.

## ( جیاوازی نێوان داماڵینی یەکتا پەرستی وە نێوان هەرسکردنی خوایە جۆراوجۆرەکان )

جیـاوازی لـە نێـوان دامـاڵین و بـێ بـەش کردنـی یـەکتا پەرسـتی وە لـە نێـوان هەرسکردنی خوایە جۆراوجۆرەکاندا: کەوا داماڵین و بێبەشـکردنی یـەکتا پەرسـتی ئـەوە کـەوا درووسـت کـراو هـیچ حـەقێك نـادات لەهـەقی درووسـتکراوو تایبەتمەندیەکانی، نەی پەرستێت و نوێژی بـۆ نـەکات و کڕنۆشـی بـۆ نـەبات ، وە سوێند بەناوی پـیرۆزی ئـەو نـەخوات، نـەزر بـۆ ئـەو نـەکات، و پـشت بـە ئـەو نەبەستێت، وە شتەکان بۆلای ئەو نەگەڕێنیتەوە وە سوێند بـە زاتـی الله نـەخوات، وا عیبادەت نەکات بۆ ئەوەی نزیك بێتـەوە لـە خـوای پـەروەردگار، وە یەکـسانی نەکات بە خودای هەردوو جیهان بەو ووتەیەی کە دەڵێت: ئـەی محمـد ﷺ ئـەوەی خوای گەورە دەیەوێت و مەبەستیەتی و ئەوەی تـۆ دەتـەوێت و خواسـتت لەسـەرە ئەمە لەتۆوەیە وە لە خواوەیە ، وەمن هانا بۆ خوادەبـەم وە بۆتـۆش دەبـەم و مـن پشت بە خوا دەبەستم پشت بەتۆش دەبەستم ، وە خوای گەورە لە ئاسمانەوە پشت و پەنای منە، تۆش لە زەویدا پشت و پەنای منی ، و ئەمەش لە بەخشندەکانی تۆیە وە لە بەخشندەکانی پەروەردگارە ، من توبە دەکەم بۆ لای پـەروەردگار وە بـۆ لای

تۆش ، وەمن لـە پەناگـەی خـوای گـەورەم ود لـە پەناگـەی تـۆم جـا سـوژدە بـۆ دروستکراو دەبات هەروەك كافرەكان سوژدە بۆ گەورەكانیان و بتەكانیان دەبـەن ، سەری خۆی دەتاشێت لەپێناو كەسێكی دیكە جگە لەخوا وە سـوێند بـەناوی ئـەو دەخوات، قوربانی بۆ ئەو دەكات ، سوژدە بـۆ گۆڕەكـەی دەبـات پـاش مردنـی، داوای یارمەتی لە پێداویستیەكانی و گرنگیـەكانی دەكـات، لـە كەسـەكە نزیـك دەبێتەوە زیاتر لەوەی كە لەخوا نزیك دەبێتەوە ، وە خۆشی دەوێت و لێی دەترسێت و لێی دەپاڕێتەوە زیاتر لەوەی خوای خۆش بوێت و لێی بترسـێت و لێـی بپاڕێتـەوە یاخود یەكسانی بكات.

جا ئەگەر دروستكراو تایبەتمەندیەكانی خودایەتی هەرس كرد وە دایبەزاند بە پلەو پایەی بەندەیەكی ڕووت و بێ دەسەلات ، كـەوا هـیچ چـاكەیەكی بـۆخی نیـە بـۆ كەسێكی دیكەش زەرەرو سوودی نیە وە نەمردن و نە ژیان و نە زینـدوو بوونـەوە ، هەروەك كافرەكان پێداگیری لەسەر دەكات.

هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت : (( لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم فانما انا عبد فقولوا عبد الله ورسوله)) [٣٦١]، واتە: (( بەسـەر شـان و بـاڵی منـدا هەڵمەدەن هەروەك دیانەكان بەسەر شان و باڵی كوڕی مەریـەمیان دا هەڵـدەدا لـە ڕاستیدا من بەندەیەكم جا بڵێن بەندەی خواو پێغەمبەری خوا ))، وە دەفەرموێت : ((أيها الناس ما احب ان ترفعوني فوق منـزلتي)) [٣٦٢]، واتە : (( ئـەی خەڵكینـە حەز ناكەم لە پلەو پایەكی خۆم زیاتر بەرزم بكەنەوە ))، دەفەرموێت (( لاتتخذوا قبري عيداً)) [٣٦٣]،واتە : (( گۆڕەكەم مەكەنە شوێنی ئاهەنگ گێران و كۆبوونـەوە ))، دەفەرموێت ((اللهم لا تجعل قبري وثناً يعبد)) [٣٦٤]، واتە: (( ئەی پەروەردگارا

(٣٦١) مسند احمد : ٢٣/١.

(٣٦٢) سەرچاوەی پێشوو ٢٤١/٣

(٣٦٣) مسند أبي داود (٢٠٤٢) ، وە مسند أحمد : ٣٦٧/٢.

(٣٦٤) الموطأ : ١٧٢/١، مسند أحمد : ٢٤٦/٢.

گۆڕەکەم مەگێڕە بە بتێك بپەرسترێت ))، دەفەرموێت : (( لا تقولوا ماشاءالله وشاء محمد)) [٣٦٥]، واتە: (( مەڵێن ئەوەی خوا خواستی لەسەرەو دەیەوێت ئەوەی محمد خواستی لەسەرەو دەیەوێت))، پیاوێك بە پێغەمبەرﷺ ووت : ئەوەی خوا دەیەوێت و خواستی لەسەر ئەوەی تۆ دەتەوێت و خواستت لەسەرە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی : (( أجعلتني لله نداً)) [٣٦٦]،واتە: (( ئایە تۆ من دەکەیتە هاوبەشی خوای گەورە )) پیاوێك بە پێغەمبەرﷺ ووت: لە ڕاستیدا ووتی : ئەی پەروەردگارا من داوای تەوبەو لێخۆشبوون لە محمد ناکەم ، جا پێغەمبەر فەرمووی : (( عرف الحق لأهله))، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ : ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأمْرِ شَيْءٌ ﴾(آل عمران:١٢٨)، واتە: (( بێگومان تۆ هیچ شتێکت لە کاروباری بەندەکان بەدەست نیە)) ، وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ الأمْرَ كُلَّهُ لِلَّهِ﴾(آل عمران:١٥٤)، واتە: (( ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ بێگومان هەموو شتێك بەدەست خوایە ))، هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ لا أمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرّاً وَلا نَفْعاً إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ﴾(یونس:٤٩)، واتە: ((پێیان بڵێ من تەنها پێغەمبەرم توانای ئەوەشم لەدەست نیە ك زەرەرێك یان قازانجێك بەخۆم بگەیەنم مەگەر ئەوەی کە ویستی خوای لەسەر بێت ))، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنِّي لا أمْلِكُ لَكُمْ ضَرّاً وَلا رَشَداً ۞ قُلْ إِنِّي لَنْ يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَداً﴾(الجن:٢١-٢٢)، واتە: ((هەروەهاپێیان بڵی من هیچ جۆرە زەرەرو زیانێکم بەدەست نیە ، هەروەها هیدایەتیش بەدەست من نیە، بڵێ: بەڕاستی من هەرگیز هیچ کەسێك لە خوا پەنام نادات ئەگەر خوا بیەوێت تووشی زیانێکم بکات و هەرگیز پەناگەیەکم دەست ناکەوێت جگە لای خوا نەبێت))، واتە جگە لەو هیچ کەسێك نیە من پەنای بۆ ببەم و پشتی پێ ببەستم ، وە پێغەمبەرﷺ بۆ کچەکەی فاتیمەو مامی

(٣٦٥) مسند احمد : ٧٢/٥.

(٣٦٦)سەرچاوەی پێشوو ٢٨٣/١.

عەباس و پوورەکەی صەفیە دەفەرموێت: (( لا أملك من الله شيئاً)) واتە: (( مـن لەلای خواوە هیچ شتێکم بەدەست نیە)).
لە ووتەیەکی دیکە لە سەحیحدا هاتووە ((لا أغنـي عـنكم مـن الله شـيئاً)) [٣٦٧]، واتە: (( من بۆ ئێوە لەلایەن خواوە هیچ شتێکم بەدەست نیە ))، جا ئەمـە لـەلای کافرو بێ باوەڕەکانەوە گـەورە کـراوە لەلایـەن گەورەکانیانـەوە وە خوایـەکانیان وە پشت و پەنایان هەمووی بۆلای ئەوانە، وە تکاو پاڕانەوە بۆ گەورەو پەرستراوەکانمان دەکەن ، بەپێچەوانەی هەموو ئەمانە ، خوای گـەورە لـە بارەیانـەوە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِالْـآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِـرَ الَّـذِينَ مِـنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾(الزمر:٤٥)، واتە: (( کاتێکیش ناوی خوا برا، ئەوانەی کە باوەڕیان بە قیامەت و ڕۆژی دوایی نیە دڵیان دەگیرێـت و بێـزاری دایـان دەگرێـت (بەڵام) کاتێکیش باسی شتی دیکە بکرێت جگـە لـە خـوا دەسـتبەجێ دڵخـۆش و کەیف خۆش دەبن وە حەزی پێدەکەن)).



## (لە بارەی جیاوازی نێوان داماڵینی بەدواداچوونی بـاڵاو بێگەردی پێغەمبەرﷺ وە پێچەوانەی زانـایان)

جیاوازی لە نێوان داماڵین و بـێ بـەش کردنـی بەدواداچـوونی پـاك و بێگـەردی و بێتاوانی پێغەمبەرﷺ بە فیرۆبردنی ووتەکانی زانایان و هەڵوەشاندنەوەی ، کـەوا بێبەشکردن و نەمانی بەدواداچوون کەوا بـاس کـراوە لەسـەر ئـەوەی بـە گووتـەی یەکێك یـاخوود ڕاوبۆچـوونی کەسـێکەوە هاتبێـت ، بـەڵکو یەکـەم جـار سـەیری درووستی حەدیسەکە دەکرێت ، جا ئەگەر بـۆت ڕاسـت بـووەوە ئـەوا جـاری دووەم

(٣٦٧) مسند أحمد : ٢٠٦/١..

چاوی پیا بخشێنەوە ، جا ئەگەر بۆت دەرکەوت و ئاشکرا بوو ئەوا لێی مەگۆڕە ئەگەرچی لە نێوانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا بەرهەڵستکاریان کردی.

پەنا بەخوا لەوەی کەوا ئومەت لەسەر ئەوە ڕێکبکەوێت کەوا پێچەوانەبێت لەوەی پێغەمبەرەکەی هێناویەتی ، بەڵکو پێویستە ئومەت ئەوە بکات کەوا پێی ووتوە ، وەهەرچەند ئەگەر نەشیزانێت ، جا نەزانینی خۆت دامەنێ لەسەر ووتەیەك کەوا نارەزایی هەیە لەسەر خواو پێغەمبەرەکەی ، بەڵکو بچۆرە بۆ لای دەقەکەو لاوازی و بێهێزی مەنوێنە ، بزانە ئەوەی ڕاستە ئەوەی ووتوە بەلاَم نەگەیشتۆتەلای تۆ ، ئەمەش لەگەڵ پاراستنی پلەو پایەی زانایان و پشتگیریەکانیان، ڕێزنان لە بیرو باوەڕەکانیان وە ئەمانەت وراسپاردەو حەق و تێگەیشتن و کۆششیان لەبارەی لەبەرکردن و پاراستنی ئاین و کۆنترۆڵکردنی .

لێرەدا جیاوازی دەردەکەوێت لە نێوان لاسایی کردنەوەی جیهان لە هەموو ئەوانەی ووتراوە ، وە لەنێوان داوای یارمەتی کردن بە تێگەیشتنی وە ڕووناکی کردنەوەی بە نووری زانستەکەی ، جا یەکەمیان ووتەکەی وەردەگرێت لە هیچ تێڕامانێك و لەهیچ هێنانی بەڵگەیەك لە کتێب و سوننەتدا ، بەڵکو ئەوە دەبێتە پەتێك دەئاڵێت لە گەردنی ئەو کەسەی لاسایی پێدەکاتەوە ، بۆیەش ناونراوە لاسایی کردنەوە، بە پێچەوانەوە لە یارمەتی وەرگرتن بە تێگەیشتن و ڕووناك کردنەوە بە نووری زانستەکەی لە گەیاندنی بۆ پێغەمبەرﷺ.

❊ ❊ ❊

## ( لەبارەی جیاوازی خۆشەویستانی خوا وە خۆشەویستانی شەیتان )

جیاوازی لە نێوان چاکان و خۆشەویستانی خوای میهرەبان وە خۆشەویستانی شەیتان : کەوا چاکان و خۆشەویستانی خوای گەورە: ﴿لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ

يَحْزَنُونَ﴾(يونس:٦٢)، واته: (( نه ترس وبيم روويـات تێـدەكات نەغـەم و پـەژارەو دڵتەنگی دایان دەگرێت ))، وە ئەوانە: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَكَـانُوا يَتَّقُـونَ﴾(يـونس:٦٣)، واتە: (( ئەو بەختەوەرانە ئـەو كەسـانەن بـاوەڕی بـەتین و دامـەزراوو پـڕ سـۆزیان هێناوەبە پەروەردگاریان و خۆشیان دەپارێزن لە خەشم وقینـی خـوا))، وە ئـەوا لـە سـەرەتای سـورەتی ((البقـرە)) باسـكراون تـا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿هُـمُ الْمُفْلِحُـونَ﴾(الأعـراف:١٥٧)، واتـە: (( ئەوانـە سـەرفرازو ڕزگـارن )) وە لەناوەڕاستەكەیدا خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿وَلَكِـنَّ الْبِـرَّ مَـنْ آمَـنَ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِرِ﴾(البقرة:١٧٧)، واتە: ((بەڵكو كرداری چاك و كاری باش بریتی یە لەوەی كـە ئادەمیزاد باوەڕی هێنابێـت بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی ))، تـاوەكو دەفـەرموێت: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِـكَ هُـمُ الْمُتَّقُـونَ﴾(البقـرة:١٧٧)، واتـە: (( ئـا ئەوانـە كەسانێكن ڕاستیان كردووەو هەر ئەوانەش پارێزگارو خواناس و دیندارن )).

لەسەرتای سورەتی ((الانفـال)) دا تـاكو دەفـەرموێت: ﴿لَهُـمْ دَرَجَـاتٌ عِنْـدَ رَبِّهِـمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾(الأنفال:٤)، واتە: (( چەندەها پلەو پایـەی بـەرزیان هەیـە لای پەروەردگاریان و لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزی هەمیشەیی لەگەڵ ڕێزدا )).

لەسەرەتای سوورەتی (المؤمنون)) تا دەفەرموێت: ﴿هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾(البقـرة:٣٩)، واتە: (( ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن و بۆ هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە )).

لـەكۆتایی سـورەتی (( الفرقـان )) دا وەلـە فەرموودەكـەی: ﴿إِنَّ الْمُـسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ﴾(الأحزاب:٣٥)، تاوەكو كۆتایی ئایەتەكە .

لە فەرمودەیەكدا: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ۝ الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾(يونس٦٣:٦٢)، واتە: ((ئاگـادارین كـە بەڕاسـتی چـاكان و خۆشەویستانی خوای گەورەو میهرەبان نە ترس و بـیم ڕوویـان تێـدەكات نـە غـەم وپەژارەو دڵتەنگی دایان دەگرێت، ئەو بەختەوەرانە ئەو كەسانەن باوەڕشـی بـەتین و

دامەزراوو پڕسۆزیان هێناوە بە پەروەردگاریان، وە خۆشیان دەپارێزن لـە خەشـم و قینی خوا)).

لـە فەرمووەدەیەکـدا: ﴿وَمَـنْ يُطِـعِ اللَّـهَ وَرَسُـولَهُ وَيَخْـشَ اللَّـهَ وَيَتَّقْـهِ فَأُولَئِـكَ هُـمُ الْفَائِزُونَ﴾(النـور:٥٢)، واتە: (( جا ئەوەی فەرمانداری خواو پێغەمبەرەکەی بکـات و لەخوا بترسێت و لەسەر پێچی و نا فەرمانی خۆی بپارێزێت جا ئەوانەسەرفرازو بە ئاوات گەیشتوون)).

لە فەرمووەدەیەکدا: ﴿إِلَّا الْمُصَلِّينَ ۞الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ﴾(المعـارج٢٢: ٢٣)، واتە: (( تەنها ئەو نوێژ کەرانـە نـەبێت، ئەوانـەی کـە لەسـەر نوێـژەکانیان بەردەوامن ، ئا ئەوانە لە باخەکانی بەهەشتدا ڕێز لێنراون )).

لـــە فەرموودیـــەکی دیکـــەدا دەفـــەرموێت: ﴿التَّـائِبُونَ الْعَابِـدُونَ الْحَامِـدُونَ﴾(التوبة:١١٢) تاوەکو کۆتـایی ئایەتەکـە، واتـە: (( تەویـەکاران و لەهەڵـەکانیان پەشیمانن، خواپەرستن لەهەموو هەڵس و کەوتیاندا، سوپاسگوزارن لەسـەر هـەموو نازو نیعمەتێك)).

جا بەندە چاك و خۆشەویستەکانی خـوای پـەروەردگار ئەوانـەن کـەوا دڵـسۆزن بـۆ خواکانیان کە یاسـای بـۆ پێغەمبـەرەکانی دانـاوە لـە حـەرام و حەڵاڵـدا، ئەوانـە بەرهەڵـستکاری کەسـێکی دیکـە دەکـەن وە بیدعـەو شـتی تـازە دادەهێـنن، وە بانگەوازیش ناکەن بۆ بیدعە خۆیان بۆلای هیچ کۆمـەڵێك دا نـادەن جگـە لـەخواو پێغەمبەرەکەی وە هاوەڵەکانی نەبێت، وە ئایینی خۆیان بە شتی سووك و بێ مانـا وەرناگرن ، وە گوێگرتنی شەیتان لەسەر گوێگرتنی قورئان بە خۆشەویستر دانانێن، بارانی فیتنەو خراپەکاری کاریان تێناکات لەسەر ڕەزابوونی خوای گەورە.

برئنا الى الله من معشر ❊ بهم مرض مورد للضّنا[٣٦٨]

وكم قلت ياقوم انتم على ❊ شيفا جرف من سماع الغنا

---

(٣٦٨) الضنى : نەخۆشی

فلما استهانوا بتنبيهنا ❊ تركنا غويا وما قد جنى
وهل يستجيب لداعي الهدى ❊ غوي اصار الغنا ديدنا؟
فعشنا على ملة المصطفى ❊ وماتوا على تاتنا تنتنا

هەرگیز چاکەو خۆشەویستانی خوای گەورە بەخۆشەویستانی شەیتان ناچێت تەنها لەسەر ئەو کەسەی ڕووناکی و پەشیمانی لێ وون بوبێت ، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾(الأنفال:٣٤)، واتە: (( ئەوانەهەر شایستەی ئەوە نین کە سەرپەرشتیارین هیچ تاقمێك سەرپەرشتیاری کەعبە نیە بێجگە لەخواناس و پارێزکاران، بەلاّم زۆربەشیان لەم ڕاستیانە بێئاگان )).

جا خۆشەویستانی خوا دەست دەگرن بە پێشەوا و خۆشەویستانیان خۆش دەوێت، وە بانگەوازی بۆ دەکەن، وەشەڕ دەکەن لەبەرامبەر ئەو کەسەی لێی دەرچووە وە خۆشەویستانی شەیتانیش دەست دەگرن بەوەی خۆشەویستانیان خۆش دەوێت بە ووتەو بە کردار، وە بانگەوازیشی بۆ دەکەن ، وەشەڕیش دەکەن لەگەڵ ئەو کەسانەی خەڵکی لێ دووردەخەنەوە، جا ئەگەر پیاوێکت بینی گوێگرتن لە شیەتان و بانگدەری شەیتان و برایانی شەیتانی خۆش ویست وە داوای کرد بۆ ئەو شتەی کە شەیتان خۆشی دەوێت ، لە بەهاوبەش دانان و بیدعەو خراپەکاری بزانە ئەوە لە خۆشەویستانیشەیتانە ، جا ئەگەڕ گومانت لەسەری برد ئەوا لەسێ شتدا تاقی بکەرەوە، لە نوێژەکەیو خۆشەویستنی بۆ سوونەت و خاوەنی، وە ڕاکردنی لە پیاو خراپەکانیان، وەبانگەوازکردنی بۆ خودای پەروەردگار و پێغەمبەرەکی و یەکتا پەرستی و بەدواداچوون و دادوەری و کارپێکردنی سوونەت.

❊❊❊

## ( لەبارەی جیاوازی نێوان حاڵی ئیمانداری و حاڵی شەیتانی )

بەمەدا جیاوازی نێوان حاڵی ئیماندارو حاڵی شەیتانی دەزانرێت، کەوا حاڵی ئیماندار بەرهەم و ئەنجامی بەدوا داچوونە بۆ پێغەمبەرﷺ وە دڵسۆزی لە کارو کردەوەدا ،وە یەکتاپەرستی و ئەنجامەکەشی سوودو قازانجی موسڵمانەکانی تێدایە لە دین و دونیادا، ئەمەش لە ڕاستیدا درووستی دەکات لە بەردەوام بوونی لەسەر سوونەت و وەستان لەگەڵ فەرمان بە چاکەو دوورخستنەوە لە خراپە.

حاڵی شەیتانیش تێکڕاییەکەی یان هاوبەشی دانانە یاخود تاوان و خراپەکاریە ، ئەمەش دادەمەزرێت لە نزیك کەوتنەوەی شەیتانەکان و پەیوەندی پێکردنیان وە خۆشویهاندن بەوان، ئەم حاڵەتەش بۆ بت پەرستەکان و خاچ پەرست و ئاگر پەرست وشەیتان پەرستەکان دەبیچت، جا لەبەر ئەوەی کاتێك هاوڕێیەکەی شەیتانی پەرست ئەوا حاڵەتی ئیمانداری لێ دادەماڵدرێ ئەوا عەقڵە بێ هێزەکان و ئیماندارە بێ هێزەکان ڕاو دەکات و لا إله الا الله چەند کەسی لەو بوونەوەرانە بە هیلاك بردووە: ﴿لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا فَعَلُوهُ﴾(الأنعام:١٣٧)، واتە: (( بۆئەوەی لەناویان بەرن وئایینی یەکتاپەرستیان لێ بشێوێنن ، خۆ ئەگەر بیویستایە ئەوە نەیدەتوانی کاری وا بکەن))، جا هەر حاڵەتێك خاوەنەکەی لە یاسای قورئان و ئەوەی پێغەمبەر هێناویەتی کە سوونەتەکەیەتی دەرچوو ئا ئەوە شەیتانە هەر بوونەوەرێك بێت، وە بێگومان گوێت لێ بووە لە بارەیجادووگەران و ئاگر پەرست و خاچ پەرستان وەزۆرێك لەوانە تەنها لە دیوی دەرەوە دا خراونەتە پاڵ ئیسلام، وە لەدیوی ناوەوەیدا ئیسلام لێی دوورە، ئەوا پشکی لەو حاڵەتدا هەیە بەگوێرەی پشتگیری کردنی بۆ شەیتان وە دژایەتی کردنی بۆ پەروردگار وە دەکرێت پیاوێکی ڕاستگۆ بێت بەڵام بە نەزانینی خۆی لەسەری بەکارهێنراوە ، جا حاڵی دەبێتە شەیتانی لەگەڵ ئەوەش ئەگەر بەخوا پەرستی و دڵسۆزی بیکات.

کەسانی دیکەش لەوان و لەوان قسەی کردووە لەوانەی لەوان نین، بەڵکو ئەوە لێکچووەو ڕێك وەکو بیرکەرەوەکان و خەیاڵاویەکان و درۆزنەکانن، وەخەڵکیش لەو بەڵاو کارەساتەدا تێکەوتووە بەهۆی جیانەکردنەوە لەنێوان ئەوان و ئەوانـدا، جـا وا دەزانن هەموو ڕەشێك خورمایە وە هەموو سپیەکیش بەزە.

قورئانیش خۆشەویسترینە لەوەی لەو جیهانە دا هەیە، وە ئەمـەش نوورێکـە خـودا دەیخاتە ناو دڵ کەوا هەق و ناهەقی پـێ جیادەکاتـەوە، وە ڕاسـتیەکانی کاروبـاری خێرو شەڕی وە بەرژەوندیو خراپیەکەی پـێ دەپێوڕێـت، جـا هەرکەسـێ قورئـانی وونکرد ئەوا تێکەووت و دەبێتە هاوبەشی شەیتان ، جا خـوای گـەورە پـشتیوان و یارمەتیدەرە .



## ( لەبارەی جیاوازی نێوان یاسای دابەزێنراو ویاسای لێکدەرەوە المئوّل )

جیـاوازی نێـوان یاسـای دابـەزێنراوی واجبـی شـوێن کـەوتن و یاسـای تـەئویل و لێکدەرەوەکان، کەوا مەبەستی درووستی شوێن کەوتن بێت، کەوا حـوکم و یاسـای دابەزێندراو ئەوەیە کـەوا خـوای گـەورە دایبەزانـدووە لەسـەر پێغەمبەرەکـەی وە لەنێوان بەندەکانی خۆیدا حوکمی پێکردووە ، وە ئەمەش حوکم و یاسای ئەوە کەوا هیچ حوکم و یاسای دیکە نیە جگە لەو نەبێت.

بەڵام حوکمن و یاسای لێکدەرە و ڕاڤەکاران بریتیە لە ووتەی زانایان و تێگەیشتووە ئاینیەکان بەجیاوازی بیرو بۆچوونەکانیانکەوا پێویست نیە شوێنیان بکەویت وە نـە کوفرو گومڕاییشی بکەیت ئـەوەی جیـاوازی بـوو یـاخوود سەرپێـچی کـرد لەبـەر ئەوەیخاوەنەکەی نەیویستووە: ئای: ئەمە حوکمی خواو پێغەمبەرەکەیتی، بـەڵکو ووتویانە: بە ڕاو بۆچوونی خۆمـان خـەبات و تێکۆشـانمان کـردووە جـا ئەوەیحـەز

دەكات با وەری گرێت، وە ئەوەی حەز ناكات با وەری نەگرێت، واجب نەكراوەبۆ گەل و ئوممەت، بەڵكو ئەبو حەنیفە دەڵێت: ئەووە ڕای منە هەركەسێك بە خێرو چاكە بۆمانی هێنابێت لێمان وەرگرتووە.

وە ئەمەش شافعیەهاوەڵەكانی قەدەغە دەكات لەبارەی لاسایی كردنەوەی ووەسیەتیان پێ دەكات ڕایان دەسپێرێت كەوا لە ووتەكەی بهێنن ئەگەر فەرموودەیەك هات بە پێچەوانەی ووشەكەی ئەو.

شافعییە ئیمام ئەحمەد ناڕازیە لەسەر ئەوەی هەركەسێ فەتواكانی بنووسێتەوە بەبێ ئەو دەڵێت لاسایی من مەكەنەوە، وە لاسایی فلان و فلانیش مەكەنەوە، وە پەیڕەوی ئەو شتە بكەن كە وەرگیراوە.

بەلأم حوكم و یاسای گۆڕاو بریتیە لەویاسایەی جگە لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە جا حەلأڵ نیە جێ بەجێ بكەیتو كاری پێ بكەیت، ناشبێت باسی بكەیت و شوێنی بكەویت، وە خانەكەشی لە نێوان كوفرو گومڕایی و ستەم دایە.

مەبەستیش ئاگاداركردنەوەیتی لەسەر هەندێك حاڵی دەروونەكان لە دەروونی پڕ لە ئارامی و ئاسوودەیی وەلۆمەو زەمكراو وە فەرماندەر بە تاوان و گوناح و خراپەكاری ، وەئەوسێ دەروونە تێیدا كۆنابێتەوە وەكارو كردەوەی هەر یەكێك لەوانە وە جیاوازیەكانی وە مەبەستەكانی وە نیەتەكانی تێدا جیادەكرێتەوە وە لەوەشدا ئاگادار كردنەوەیە لەسەر ئەوەی لەپێشتردا بڕیارمان لەسەر داوە .

ئەمەش دەروونێكە جارێك دەبێتە فەرماندەری تاوان و گوناح و جارێكی دیكە لۆمەكارو زەمكراو، جارێكی دیكە پڕ لە ئارامی و ئاسوودەیی و زۆربەی خەڵكی تاوان و گوناح بەسەریدا زاڵە بەلأم دەروونی پڕ لە ئارامی ئەمەیان كەمترینی دەروونی ژمارەی مرۆڤایەتیە وە لەلایەن پەروەردگاریشەوە گەورەترین ڕێزی هەیە ، ئەمەیە كە لە بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً۝ فَادْخُلِي فِي عِبَادِي۝ وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾(الفجر٢٨: ٣٠)، واتە: (( بگەڕێوە بۆلای

پەروەردگارت کەتۆ لەو ڕازیت و ئەویش لەتۆ ڕازیــە، دەبــچۆ ڕیــزی بەنــدە چــاکەو بەڕێەکانمەوە، بچۆ بەهەشتە خۆش و ڕازاوەکەمەوە )).

خوای پاك و بێگەردو میهرەبانیش بەرپرسیارو تکا لێکراو و وەڵامدەرەوەیە کـەوا دڵ و دەروونمان پڕ لە ئارام وئاسوودەیی بکات بـۆلای خـۆی گۆشـەگیری بکـات بـە نیازو مەبەستەکەی وە هەوڵدان و کۆششەکەی پێویستە لێی بترسێت ئارەزوو مەنـد بێت لەوەی لە دەستیەتی و پەنامان بدات لە شەڕو شۆڕی دەروونمان و کارو کـردەوە خراپەکانمان وەدامان نەنێت لـەو کەسـانەی دڵـی بێئاگایـە لـەزیکرو یادکردنـەوەی وەشوێن کەوتەی هەواو ئارەزووی خۆی نەکەوێت و نەمانگێڕێت لەو کەسانەی کـە: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً۝ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً﴾(الكهف١٠٣: ١٠٤)، واتـە: (( ئـەی محمـدﷺ پێیان بڵێ : ئایە هەواڵی ئەو کەسەتان بدەمێ کـە لـەکارو کردەوەیانـدا زۆر زەرەر مەند بوون وە خەسارەت مەندن ، ئەوانە ئەو کەسانەن کـە هـەوڵ و کۆشـشیان لـە ژیانی دونیادا بە زایەوبەهەدەر چووە بەمەرجێك وایانـدەزانی کـە بەڕاسـتی کـاری چاك دەکەن وە کردەوەی ڕەوا ئەنجام دەدەن ))، بەڕاستی خـوای میهرەبـان گـوێگرو بیسەری نزاو پاڕانەوەیە ، وە خاوەنی هیواو ئومێدە و ئـەویش خـواو پـەروەردگاری ئێمەیە و باشترین بڕیار دەریشە .

| | سەرە باس | |
|---|---|---|
| ١ | • پێشەكی: | ٥ |
| ٢ | یەكەم: ژیاننامەی ابن القیّم | ٦ |
| ٣ | دووەم: كتێبی (ڕۆح) | ٨ |
| ٤ | سێ یەم: ئیش و كارەكانمان لەو كتێبەدا | ٩ |
| ٥ | پێشەكی كتێبەكە | ١١ |
| ٦ | ئایا مردووەكان دەزانن كە زیندووەكان سەردانیان دەكەن و وە سەلامیان لێ دەكەن یاخود نا؟ | ١٢ |
| ٧ | {لە پەسندكردن و باشزانینی تەلقین كردنی مردوو لەناو گۆڕدا} | ٢١ |
| ٨ | ئایا ڕۆحی مردووەكان بە یەكتر دەگەن وە سەردانی یەكتر دەكەن و یەكتر دەدوێنن یاخود نا؟ | ٤٠ |
| ٩ | ئایا ڕۆحی زیندووەكان و ڕۆحی مردووەكان بەیەكتر دەگەن یاخود نا؟ | ٤٧ |
| ١٠ | ئایا ڕۆح دەمرێت یاخود مردن تەنها بۆ لاشەكەیە؟ | ٧٨ |
| ١١ | كاتێك ڕۆحەكان پاش جیابوونەوەی لاشەكانیان، ئەگەر خۆیان خەریك كرد بەهەر شتێك هەندێك پەسەندتر دەكات تاوەكو خۆیان بەیەكتر بناسێنن و بەیەكتر بگەن، وە ئایا كێشە دروست دەكات ئەگەر خۆی تەرخانكرد بەهاوشێوەی لاشەكەی كەوا تێیدا بووە و ئایا داوای وێنەكەی دەكات؟ یاخود ئایا حاڵی چۆن دەبێت؟ | ٨٧ |
| ١٢ | ئایا ڕۆح لەكاتی پرسیاركردن دەگەڕێتەوە بۆلای مردووەكە لەگۆڕەكەیدا یاخود نا؟ | ٩٤ |
| ١٢ | (مردوو لەخۆشی و ئاسوودەییدایە یاخود لەئازارو ئەشكەنجەییدا)؟ | ١٢١ |
| ١٤ | (لەحەدیسەكاندا باسی سزای ناوگۆڕ هەیە) | ١٢١ |
| ١٥ | (سزای گۆڕ هەق و ڕەوایە لەلای ئەهلی سوننە) | ١٣٢ |
| ١٦ | (سزای گۆڕ ئەوكەسەی شایانیەتی دەستی دەكەوێت) | ١٣٤ |
| ١٧ | ئەمەش وتەی پرسیاركارانە: وەڵاممان چییە بۆ بێ باوەڕان و گومڕاوان و ئەوانەی نكوڵی دەكەن بۆ سزای گۆڕ و فراوانی و تەنگ و ناخۆشی ژیان تێیدا، وە بوونی دۆڵێك لەدۆڵەكانی ئاگر یاخود باخێك لەباخەكانی بەهەشت، وە ئایا مردو لەناوی دادەنیشێت یاخود دانانیشێت؟ | ١٤١ |
| ١٨ | (هەواڵ گەیاندنی پێغەمبەران ژیرو تێگەیشتووان شایەدی بۆدەدەن) | ١٤٢ |
| ١٩ | (لە پێویستی تێگەیشتنی مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ). | ١٤٤ |
| ٢٠ | (ژیان و مەنزڵگاكان سێ بەشن) | ١٤٥ |
| ٢١ | (حیكمەت كردنی ڕۆژی دوایی فەرمانێكی شاراوەیە) | ١٤٧ |
| ٢٢ | (ئاگری دونیا لەئاگری ڕۆژی دوایی جیاوازە) | ١٥٠ |
| ٢٢ | (توانایی خودا لەسەر داهێنانی ڕووداوی سەرسوڕهێن) | ١٥٨ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٤ | ( توانینی گەڕاندنەوەی رۆح ) | ١٦٠ |
| ٢٥ | ( لەڕاستیدا سزای گۆڕ ناونیشانێکە بۆ سزای بەرزەخ ) | ١٦٤ |
| ٢٦ | ( گەڕانەوەی مردو وە زیندوبوونەوەی یەکەم ) | ١٦٥ |
| ٢٧ | ئەمەش وتەی پرسیارکارێکە : حیکمەتی سزای گۆڕ لە قورئاندا باس نەکراوە لەگەڵ ئەوەی پێویستی زۆر هەیە بۆ ئەوەی بیزانیت و باوەڕی پێ بهێنیت بۆ ئەوەی لێ ئاگادار بکرێیتەوە و لێی بترسیت؟ | ١٦٧ |
| ٢٨ | ئەمەش وتەی پرسیارکارێکە : ئەو هۆکارانە چین کەوا خاوەنی گۆڕەکان پێی سزا دەدرێن؟ | ١٧٣ |
| ٢٩ | ئەو هۆکارانە چین دەبێتە هۆی رزگار بوون لە سزای گۆڕ؟ | ١٧٨ |
| ٢٠ | پرسیار کردن لە گۆڕدا ئایا شتێکی گشتییە لەهەمبەر موسڵمانان و دووڕووەکان و کافرەکاندا یاخود تایبەتە بە کەسی موسڵمانی دووڕوو؟ | ١٨٧ |
| ٣١ | پرسیارکردنی مونکیر و نەکیر ئایا ئەو تەنها تایبەتە بەو ئوممەتە؟ یاخود بۆ ئەم و ئوممەتی دیکەشە؟ | ١٩٤ |
| ٢٢ | ئایا منداڵان لە گۆڕەکانیاندا تاقی دەکرێنەوە؟ | ١٩٧ |
| ٣٢ | ئەمەش ئاخاوتنێکە : ئایا سزای گۆڕ هەمیشەیە و بەردەوامە یاخود پچڕ پچڕە؟ | ١٩٩ |
| ٣٤ | رۆحەکان لە نێوان مردن تاکو رۆژی قیامەت لەکوێ جێگیر دەبن؟ | ٢٠٣ |
| ٢٥ | کێیە وتوویەتی : رۆح لە بەهەشتدایە | ٢٠٩ |
| ٢٦ | ( بۆ ئەوانەی دەڵێن : بەوەی رۆح لە بەهەشتدا نییە ) | ٢٢١ |
| ٢٧ | ( ئەوانەی دەڵێن : رۆحەکان لەسەر لێوارو حەوشەی گۆڕەکانیەتی ) | ٢٢٤ |
| ٢٨ | ( کاروباری رۆح جیاوازە بەگوێرەی رۆحەکان ) | ٢٢٩ |
| ٢٩ | ( ئەوانەی دەڵێن : رۆحی ئیمانداران لەلای پەروەردگارە ) | ٢٣١ |
| ٤٠ | ( ئەوانەی دەڵێن : رۆحی ئیمانداران لە ( جابیە ) دان ) | ٢٢٥ |
| ٤١ | ( ئەوانەی دەڵێن : رۆحەکان لەسەر زەوی کۆدەبێتەوە ) | ٢٣٧ |
| ٤٢ | ( ئەوەی دەڵێت: رۆحی ئیمانداران لە ئاسمانی حەوتەم دایە ) | ٢٣٨ |
| ٤٣ | ( بۆ ئەوانەی دەڵێن : رۆحی ئیمانداران لە بیری زەمزەم کۆدەبێتەوە ) | ٢٤٠ |
| ٤٤ | ( بۆ ئەوانەی دەڵێن : رۆحی ئیمانداران لە ژیانی بەرزەخی زەویدایە ) | ٢٤٠ |
| ٤٥ | ( بۆ ئەوانەی دەڵێن : رۆحی ئیمانداران لەلای دەستە راستی ئادەم و هی کافرەکانیش لەلای چەپیەتی ) | ٢٤١ |
| ٤٦ | دەربارەی راو پێشنیاری ئیبن حزم لە بارەی جێگیربوونی رۆح | ٢٤٢ |
| ٤٧ | ( بۆ ئەوانەی دەڵێت: کەوا جێگیربوونی رۆح بە ویست و ئارەزووی خۆی نیە ) | ٢٤٥ |
| ٤٨ | ئەوانەی دەڵێن : کەوا سەقامگیربوونی رۆح لە دوای مردندا لەناو لاشەیەکی دیکەیە؟ | ٢٤٨ |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٩ | ئایا رۆحی مردووەكان سوود بە شتێك لە هەوڵ و كۆشیی زیندوەكان دەبینێت یاخود نا؟ | ٢٥٧ |
| ٥٠ | بەڵگە لەسەر سوود وەرگرتنی مردوو بە نزا و پاڕانەوە | ٢٥٩ |
| ٥١ | ( لە گەیشتنی پادداشتی خێر و چاكە كردن بۆ مردوو ) | ٢٦٣ |
| ٥٢ | لە گەیشتنی پاداشتی رۆژوو گرتن بۆ مردوو | ٢٦٤ |
| ٥٣ | ( لە پێگەیشتن و دەستكەوتنی خێرو پاداشتی حەجكردن ) | ٢٦٧ |
| ٥٤ | ( لەبارەی سزانەدانی بەندە بە كردەوەی یەكێكی دیكە ) | ٢٨٤ |
| ٥٥ | ( لەبارەی دەرخستن و ساخبوونەوەی كەسانی كەوتوو ) | ٢٨٥ |
| ٥٦ | ( لەبارەی گواستنەوەی دروستكراو لەسەر دروستكراو ) | ٢٨٦ |
| ٥٧ | لەبارەی ووتەكانیان: خەڵك خوایی بە هۆكاری پاداشت ڕق و قین و بێزراوە ) | ٢٦٨ |
| ٥٨ | لەبارەی ووتەكانیان : ئەگەر بەخشین بۆ مردوو بكرایە ئەوا بۆ زیندوو دەكرا | ٢٨٨ |
| ٥٩ | ( ئەگەر چاكە بەخشین بكرایە ئەوا نیوەی وە چارەگێكی پاداشتەكەی دەبەخشرا ) | ٢٨٨ |
| ٦٠ | ( لەبارەی ووتەكانیان : ئەگەر پاداشت بۆ مردوو بچووایە ئەوا هێشتا كردەوەی بۆ خۆی دەكرد ) | ٢٨٩ |
| ٦١ | ( لەبارەی بەخشینی پاداشتی واجبەكان كەوا واجبە لەسەر زیندوو ) | ٢٩١ |
| ٦٢ | ( لەبارەی ووتەكانیان : ڕاسپاردنەكان تاقیكردنەوەن لەجیاتی بوون وەرناگیرێت ) | ٢٩٢ |
| ٦٣ | ( لەبارەی ووتەكانیان : ئەگەر چاكەی كەسێكی دیكە سوودی بۆیان هەبوایە ئەوا تەوبەو لێخۆشبوونەكەی بۆ ئەوان سوودی دەبوو ) | ٢٩٤ |
| ٦٤ | ( لەبارەی ووتەكانیان : عیبادەت و خوا پەرستی دوو جۆرە ) | ٢٩٥ |
| ٦٥ | ( لەبارەی بەرپەرچدانەوەی حەدیسێكی پێغەمبەرﷺ ) | ٢٩٧ |
| ٦٦ | ( لەبارەی ووتەكانیان : كەوا ئیبنو عەباس ئەو ڕیوایەتی حەدیسی ڕۆژوو دەكات لەجیاتی مردوو ) | ٢٩٩ |
| ٦٧ | ( لەبارەی ووتەكانیان : كەوا حەدیسێكی جیاوازە لە ئیسنادەكەی دا ) | ٣٠٠ |
| ٦٨ | ( لەبارەی قسەی شافعی : لە بەهەڵەدابردنی گێڕانەوەی حەدیسی ئیبنو عەباس دا ) | ٣٠٣ |
| ٦٩ | ( ووتەو بۆچوونەكانی زانایان لەبارەی ڕۆژوو گرتن لەجیاتی مردوو ). | ٣٠٥ |
| ٧٠ | ( ئایا پاداشت بە مردوو دەگات كەوا بە زوبان و قسە ببەخشرێت یاخود تەنها نیەت بەسیەتی؟ ) | ٣٠٧ |
| ٧١ | دەربارەی : ئایا ڕۆح دروستكراوێكی كۆنە یاخود نوێ یە؟ | ٣١١ |
| ٧٢ | ( لەبارەی سەلماندنی دروستكردنی ڕۆح ) | ٣١٧ |
| ٧٣ | ( لەبارەی ماناو مەبەستەكانی ڕۆح لە قورئاندا ) | ٣٢٥ |
| ٧٤ | ڕۆحیش لە قورئاندا لەسەر ژمارەیەك ڕووداو هاتووە. | ٣٣١ |
| ٧٥ | ( لە بارەی ساخبوونەوە و دەركەوتن لەسەر زیادكردن ( خستنە سەر )ی ڕۆح بۆ خودای گەورە ) | ٣٣٤ |
| ٧٦ | ئایا دروستبوونی ڕۆحەكان كەوتۆتە پێشەوە لەسەر جەستەكان یاخود دروستبوونی كەوتۆتە | ٣٣٧ |

| | | |
|---|---|---|
| | دواوەی جەستەكان؟ | |
| ٧٧ | ( لەبارەی بیانوو و ناڕەزایی بەوەی ئیبن مەندە ڕیوایەتی كردووە ) | ٣٤٦ |
| ٧٨ | ( لەبارەی كێشە و گرفت و ناكۆكی لە مانای ئایەتی قورئانی ) | ٣٥٣ |
| ٧٩ | ( لەبارەی هەندێ قسەی پێشینە و پاشینە لە مانای ئایەتەكە ) | ٣٦٧ |
| ٨٠ | ( لەبارەی كەوا درووستبوونی ڕۆح دواكەوتووە لە درووست بوونی لاشە ) | ٣٧٠ |
| ٨١ | ڕاستی دەروون چی یە ؟ | ٣٧٧ |
| ٨٢ | لە بەڵگەكانی حەدیسی ئەبو موسا | ٣٩٠ |
| ٨٣ | ( لە بەڵگەی حەدیسی ئەبو هورەیرە ) | ٣٩١ |
| ٨٤ | ( لەبەڵگەی حەدیسێكی دیكەی ئەبو هورەیرە ) | ٣٩٢ |
| ٨٥ | ( لەبارەی ڕۆحەكان كەوا وەك سەربازی وان ) | ٣٩٣ |
| ٨٦ | ( لەبارەی بەیەك گەیشتنی ڕۆحی مردووەكان و پرسیار لەیەكتر كردنیان ) | ٤٠٠ |
| ٨٧ | ( دەر بارەی ئەوەی كەوا ڕۆحی ئیماندار لە بەهەشتدایە ) | ٤٠٦ |
| ٨٨ | ( لە بارەی وەڵامدانەوە بۆ بەڵگە هێنانی ناكۆك و دژكارەكان ) | ٤١٢ |
| ٨٩ | ( لەبارەی وەڵامدانەوە لەسەر گومانی دووەم ) | ٤١٩ |
| ٩٠ | ( لە بارەی كەوا وێنەكانی بیرو ئەقڵ و هۆشی پەتی و بێلایەن نیە ) | ٤٢٤ |
| ٩١ | ( لەبارەی ئەوەی كەوا هێزی كرداری كاریگەری دەبێت لەسەر كردارە بێ سنوورەكان ) | ٤٢٥ |
| ٩٢ | ( لەبارەی ئەوەی كەوا هێزی ژیری جیانابێتەوە لە ئەندامێكی جەستەیی ) | ٤٢٧ |
| ٩٣ | ( لەبارەی خەیاڵكردن و دەروونذا ) | ٤٢٩ |
| ٩٤ | ( لە بارەی تەندروستی و جەستەییدا ) | ٤٣٠ |
| ٩٥ | ( لەبارەی ئەوەی كەوا هێزی ژیری و تەندرووست دەوڵەمەند نیە لە جەستەدا ) | ٤٣٣ |
| ٩٦ | ( دەربارەی كەوا هێزی جەستەیی و قەبارەیی بە زۆربوونی كردارەكان لاواز نابێت ) | ٤٣٤ |
| ٩٧ | ( لەبارەی ووتەكانیان : ڕەشی دژكارە بۆ سپیتی ) | ٤٣٥ |
| ٩٨ | ( لەبارەی ئەوەی كەوا جەستە شوێنێك نیە بۆ هەستیارەكان ) | ٤٣٥ |
| ٩٩ | ( لەبارەی نەخشەدانان و داتاشینی جەستەیی و داتاشینی ژێریدا ) | ٤٣٦ |
| ١٠٠ | ( لەبارەی ووتەكانیان : ئەگەر هاتوو دەروونیش جەستە بوایە ) | ٤٣٦ |
| ١٠١ | ( لەبارەی ئەوەی كەوا ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا دابەش دەبوو ) | ٤٣٧ |
| ١٠٢ | ( لە بارەی دەروون و جەستەدا ) | ٤٣٩ |
| ١٠٣ | ( لە بارەی گومان بردن كەوا دەروونیش جەستەیە ) | ٤٣٩ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٠٤ | ( لەبارەی ئەوەی كەوا ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا لەژێر هەستكارەكان دەوەستا ) | ٤٤١ |
| ١٠٥ | ( لەبارەی ئەوەی كەوا ئەگەر دەروون جەستە بوایە ئەوا دووریەكانی دەبوو ) | ٤٤٢ |
| ١٠٦ | ( لەبارەی ئەوەی لەتایبە تمەندیەكانی جەستە كەوا دابەش بوون پەسەند دەكات ) | ٤٤٣ |
| ١٠٧ | ( لەبارەی پێویستی لاشە بۆ دەروون ) | ٤٤٤ |
| ١٠٨ | ( لەبارەی گەیاندنی دەروون بە جەستەدا ) | ٤٤٥ |
| ١٠٩ | لەگەڵ ئەوەش ئایا دەروون و ڕۆح یەك شتە یاخود دوو شتی جیاوازن؟ | ٤٤٦ |
| ١١٠ | ( لەبارەی ووتەكانیان: ڕۆح دەروون نیە ) | ٤٤٩ |
| ١١١ | لەم بارەیەوە: ئایە دەروون یەكێكە یاخوود سێ شتە ؟ | ٤٥٢ |
| ١١٢ | ( لەبارەی ئاسوودەیی دەروون ونیماندا ) | ٤٥٥ |
| ١١٣ | ( لەبارەی مانای دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی و ئاسودەیی ) | ٤٥٧ |
| ١١٤ | ( لەبارەی درووست بوون و پێكهاتنی دڵنیایی و ئاسوودەیی ) | ٤٥٨ |
| ١١٥ | ( لەبارەی تۆبەكردن و پەشیمانی و لێپرسینەوەدا ) | ٤٦١ |
| ١١٦ | ( لەبارەی دڵ و دەروونی لۆمەكار ) | ٤٦٢ |
| ١١٧ | ( لەبارەی دڵو دەروونی نیشانەی گوناهو تاوان ) | ٤٦٤ |
| ١١٨ | ( لەبارەی دەروونی پڕ لە ئارامی ) | ٤٦٨ |
| ١١٩ | ( لەبارەی وەستانی گوناهو تاوان لە بەرامبەر ئاسوودەیی ) | ٤٦٩ |
| ١٢٠ | ( لەبارەی وێناكردنی دیمەنێكی دڵسۆزی ) | ٤٧١ |
| ١٢١ | ( لە بارەی وێناكردنی وێنەیەك ڕاستگۆبێت لەگەڵ خوای گەورە ) | ٤٧٢ |
| ١٢٣ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان ملكەچی ئیمان و ملكەچی دووڕوویی ) | ٤٧٧ |
| ١٢٤ | ( لەبارەی پاراستن و چاككردنی دەروون لە پیسی و ڕیسواییەكان ) | ٤٧٩ |
| ١٢٥ | ( لە بارەی جیاوازی نێوان لووت بەرزی وە ڕەقە بەرایەتی ) | ٤٨٠ |
| ١٢٦ | ( لەبارەی تواناو هێز لەكارو فەرمانی خوا ) | ٤٨٠ |
| ١٢٧ | ( ئەوانەی دەڵێن: ڕۆحەكان لەسەر لێوارو حەوشەی گۆڕەكانیەتی ) | ٤٨٢ |
| ١٢٨ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان بەخشندەیی و بەفیڕۆدان ) | ٤٨٣ |
| ١٢٩ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان ترسان لەخواو خۆ بە گەورە زانین ) | ٤٨٤ |
| ١٣٠ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان پاراستن و چاككردنەوە وە خۆ بەزلزانین و لووت بەرزی ) | ٤٨٦ |
| ١٣١ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان ئازایەتی و جوامێری وە جوورئەت و نەترسان ) | ٤٨٦ |
| ١٣٢ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان بڕیاردان وە ترسنۆكی ) | ٤٨٧ |
| ١٣٣ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان پاشكەوت و ڕەزیلی ) | ٤٨٨ |
| ١٣٤ | ( لەبارەی جیاوازی نێوان پاراستن و ئاگادارکردنەوە وە بەد گومانی ) | ٤٨٩ |

